ناوی کتێب: فەلسەفەی بوونگەرایی

نووسینی : جۆن ماکواری

وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی

بابەت: فەلسەفە

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان فەرەج

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

نرخ: ٦٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ٨٠٣ ی ٢٠٠٤

چاپخانەی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٥/بەشی بڵاوکردنەوەی نەوا

چاپی دووەم ساڵی ٢٠٠٧

کوردستان - سلێمانی

www.sardamco.com

# پێڕست

# پێشەکی

هەندێ لە خوێنەران کە چاویان بەم کتێبە دەکەوێت، ڕەنگە یەکەم پرسیار کە لایان بووروژێت ئەوە بێت کە ئاخۆ بۆچی وەرگێڕەکە ئەم کتێبەی بۆ وەرگێڕان هەڵبژاردووە؟ ئاخۆ سوودی فەلسەفەیەکی وەکو فەلسەفەی بوونگەرایی بۆ خوێنەری کوردو مرۆڤی کورد چی بێت؟

هەڵبەت بەر لە هەموو شتێك دەمەوێ ئاماژە بەوە بدەم کە نەك هەر جێی ئەفسووسە، بەڵکو کارەساتیشە کە ئەگەر بێتو چاوێك بە ژمارەی ئەو کتێبە فەلسەفیانەدا بخشێنین کە بە زمانی کوردیو لە کتێبخانەی کوردیدا هەن، بە نووسراوو وەرگێڕراوەوە، ئەوا دەبینین کە لە ژمارەی پەنجەکانی هەردوو دەستمان تێناپەڕن.

خۆ گەر فەلسەفە بە بەرهەمی هزرو ئەقڵو ئەقڵانیەت لە قەڵەم بدەین، ئەوا ئینجا پەی بە قەوارەی هەژاریی هزرو ئەقڵی کوردی دەبەینو بە خەوشو بۆشاییەکی گەورە لە کەلتووری کوردیداو، لە سەردەمێکدا کە تا ئێستاش فەلسەفە ڕۆڵی کاریگەری تیا دەبینێتو زۆر جار ئاراستەی ڕووداوەکانی دونیا دەگۆڕێت.

بە هەرحاڵ ئەوە ڕاستییەکەو نکوڵیی لێ ناکرێ کە کورد نە خاوەنی فەیلەسووفەو نە خاوەنی هزری فەلسەفیش بووەو گەر لێرەو لەوێ هەندێ بۆچوونی فەلسەفیمان بینیبێتەوە، ئەوە بە مانای ئەوە نییە خاوەنی ئەو بۆچوونە فەیلەسووف بوو بێت، چونکە دواجار فەلسەفە میتۆدەو چەمك و ئامرازی خۆی هەیە بۆ خوێندنەوەی دونیاو دیاردەکان. هەر لێرەوەو لە تێگەیشتنمانەوە لە گرنگیی هزری فەلسەفیو ئەو ڕۆڵە کاریگەرەی کە لە مێژووی هزری مرۆڤایەتیدا بینیوویەتیو دەیبینێت، زەرورەتی وەرگێڕانی سەرچاوەکانی ئەو هزرە بۆ سەر زمانی کوردی بە ئەرکێکی فرە گرنگ ئەزانین. خۆ ئەگەر بێتو ئەمە ببێتە پرۆژەیەکی فراوانو لەسەرەتاکانی بیری فەلسەفییەوە دەستپێبکات تا سەرەتای سەدەی بیستو یەك، ئەوا زۆر باشتر. بەڵام دیارە پرۆژەیەکی لەمجۆرەش کارێکی هەروا سانا نییەو هەم هەلومەرجی تایبەتو هەم دەزگاو وزەو توانای تایبەتو هەم ساپیتەیەکی زەمەنیی درێژخایەنیشی دەوێت تا بێتەدی. کەواتە تا وەدیهێنانی ئەم خۆزیایە ئەوەی کە دەکرێ بە تەنها هەندێ هەوڵی شەخسین بە چاوپۆشین لە کەموکورتیەکانیان. ئەم هەوڵە شەخسیانەش مەرج نییە ملکەچی میتۆدو بەرنامەیەکی دیاریکراوبن، بەڵکو پەیوەندیی هەم بە باکگراوەندی ڕۆشنبیریو هەم بە ئاقارو بیروبۆچوونی ئەو نووسەرە یان وەرگێڕەوە هەیە.

جگە لەم هۆیەی سەرەوە ڕەنگە یەکێك لەو هۆیە گرنگانەی تر کە منیان بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە هان دا ئەوە بێت کە بزاڤی "بوونگەرایی – وجودیەت" لە ناوەڕاستەکانی سەدەی بیستەمداو تا دەیان ساڵی دواتریش کاریگەرییەکی بەرچاوی نەك هەر لەسەر بوارە جۆراو جۆرەکانی کەلتوورو فەرهەنگی خۆرئاوایی (بەتایبەت)و جیهان هەبوو، بەڵکو ئەو کاریگەرییە چووە ناو بوارەکانی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤیشەوە. هەر لێرەشەوە لەڕێی وەرگێڕە عەرەبەکانەوە بەشێك لەو کاریگەرییە هاتە ناو دنیای ڕۆشنبیریی ئێمەشەوەو هەندێ لە ئەدیبانو نووسەرانو ڕۆشنبیرانمان خۆیان بە نوێنەری ئەو ئاقارە دەزانی، گەرچی بەداخەوە جگە لە چەند کارێکی ئەدەبی ئەم ئاقارە چ وەك

جیهانیی فەلسەفیو چ وەك روانینێكی جیدییانە بۆ بوونو ژیان لە گوتارێكی یەكگرتوودا خۆی نەبینییەوەو نەیتوانی دەقی گەورەو داهێنەرانە بەرهەم بهێنێت. بەڕای من هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە تێگەیشتنێكی قوولّ نەبوو بۆ ئەو فەلسەفەیەو زۆربەی لێكدانەوەكانی شێوەیەكی رواڵەتیانەو بگرە هەندێ جار شێوەیەكی زۆر خراپیشیان بەخۆوە دەگرتو بە جۆرێك بانگەشەیان لەقەڵەم ئەدا بۆ دەرچوون لە هەموو جۆرە ئیلتیزامو بەهاو ئاكارێكو بە سەنتەركردنی خود بە رادەیەك كە دەبووە جۆرێك لە خودشەیدایی (نەرگسیەت)و خۆپەرستییەكی نەخۆشانەو گاڵتەكردن بە هەموو بەهایەكو گەلێكی تر لەم جۆرە تۆمەتانە كە نووسەری ئەم كتێبە لەدوا بەشدا سەبارەت بە هەندێكیان ئەدوێت. ئەمە لەكاتێكدا كۆمەڵێك فەیلەسووفو بیرمەندیی جیددی نوێنەرایەتیی ئەم بزاڤەیان كردووەو خۆیان لە قەرەی مەسەلە زۆر قووڵەكانی بوونی مرۆڤو مرۆڤایەتی داوەو بە شێوەیەكی راستەوخۆو نا ڕاستەوخۆ لە رووداوەكانی سەردەمەكەیاندا بەشداربوونو هەندێكیان هەڵوێستی سیاسیی دیاریشیان هەبووە.

هەروەها هۆیەكی تری هەڵبژاردنم بۆ ئەم كتێبە ئەوەیە كە "بوونگەرایی" وەكو مانیفێستێكی نارەزایی هاتە ئاراوە بۆ لایەنگیریی فەرد (تاكەكەس) دژ بە هەموو ئەو بزاوتانەی كە دەیانویست خەڵكەكان هەموو بخەنە چوارچێوەو قاڵبێكی ئایدۆلۆجییەوەو هەموویان لەرووی بیروباوەڕو بیركردنەوەو رەفتارو شێوازی ژیانەوە چوونیەك بكەن تا وەكو "مێگەل"ێكیان لێ بێت، بەبێ رەچاوكردنی دونیای تایبەتمەندی هەر فەردێكو ئازادیو خولیاو خۆزگەكانی. لە كاتێكیشدا تا ئێستا فەردی كوردی بە مانای تەواوی ئەم وشەیە دروست نەبووە، من وای دەبینم كە تێگەیشتنمان لە گوتاری فەلسەفیی بوونگەراییو شیكردنەوەكانی فەیلەسووفانی بوونگەرا بۆ بوونی مرۆڤو خوێندنەوەیەكی نوی بۆ ئەو گوتارەیان، زیاتر هانی مرۆڤی كورد ئەدا كە بەرەو ناسینی "تاكێتی – فەردیەت"ی خۆی بچێتو بتوانێت ئاستە قووڵەكانی بوونی خۆی بناسێتو بیانخوێنێتەوەو پتر لە توانایدا بێت لە ئاست مەسەلەكاندا هەڵوێستی وردو جیددی

وەربگرێتو هەروا بە ئاسانی تەسلیمی هێزەکانی دەرەوەی خودی خۆی نەبێت، هەڵبەت ئەمە بەدەر لە کەوتنە ناو ئەو بە سەنتەرکردنی خودە بەو رادە زێدەڕۆو نەخۆشانەیەی کە ئاماژەم پێدا. ئەمە جگە لەوەی کە خوێندنەوەی تازەمان بۆ بوونگەرایی هانمان ئەدات خوێندنەوەی تازە بۆ پەیوەندییەکانمان بە کەلتوورو دابو نەریتو ئاکارو زۆربەی زۆری ئەو چەمکانە بکەین کە بەسەر ژیانماندا باڵادەستنو بەمەش هەوڵی کرانەوەیەکی زیاتر بەڕووی ژیانماندا بدەین.

هەڵبەت دەمەوێ لێرەدا ئاماژە بەوە بدەم کە منیش لەگەڵ نووسەری ئەم کتێبەدا هاوڕام کە ئاقاری بوونگەرایی لە کۆمەڵێك خاڵی لاوازیو لایەنی سەلبی خاڵی نییە، بەڵام پێدەچێ لایەنە ئیجابیەکانی زیاتر بن.

ئەم کتێبە کتێبێکی مێژوویی نییە لەسەر "بوونگەرایی". واتە نووسەرەکەی نەهاتووە بەشێوەیەکی مێژوویی، باسیان لێ بکات (گەرچی بەشێکی کتێبەکە بە کورتی بۆ ئەمە تەرخانە). بەڵکو نووسەر هاتووەو لەسەر هێڵە گشتیەکانو چەمکە سەرەکیەکانی وەکو ئازادیو دڕدۆنگیو هەڵبژاردنو بوونو ماهیەتو مەرگو کۆتابوونو هەر لە سەرهەڵدانی فەلسەفەکەوە تا دوا نوێنەرەکانی.... هتد قسە دەکات. گەرچی بۆ روونکردنەوەی ئەمانەش دواجار هەر دەچێتەوە لای نووسراوەکانی ئەم فەیلەسووفو بیرمەندانەی کە نوێنەری ئەم بزاڤە بوون.

دواجار من نامەوێ لێرەدا باس لەوە بکەم "بوونگەرایی" چییە، چونکە ئەمە بابەتی سەرەکیی ئەم کتێبەیەو خوێنەر لەمیانی خوێندنەوەیەوە بۆ کتێبەکە وێنەیەکی روونی ئەم ئاقارەی لا دروست دەبێت. بەڵام لێرەدا دەمەوێ بەکورتی ئاماژە بۆ کێشەیەك بکەم کە کەم تا زۆر هەموو کاری وەرگێڕانێك لەبواری فەلسەفەدا دوچاری دەبێت، کە ئەویش کێشەی زاراوەیە. یەکەم زاراوەش کە دەمەوێ لێرەدا قسەی لەسەر بکەم ئەو زاراوەیەیە کە ناوی ئاقارەکە خۆیەتی، واتە زاراوەی "بوونگەرایی".

دەشێ گەلێ لە خوێنەران بپرسن کە بۆچی من زاراوەی "بوونگەرایی"م بەرامبەر بە "Existentialism" ی ئینگلیزیو "الوجودیة" ی عەرەبی (فلسفه وجودی — یان اصالت وجود)ی فارسی داناوە، لەکاتێکدا هەندێ زاراوەی تری وەك "بوونایەتی"، "بوونخوازی"و "بوونگەری" لەزمانی کوردیدا هەن، بەڵام پاشگری "گەرایی" لە کوردیدا نییەو لە بنەڕەتدا فارسییە.

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێم:

*بوونایەتی: راستە ئەمە لە سەر داتاشین.

"کوردایەتی"، "پاشایەتی"، "مەردایەتی"یە، بەڵام "بوونایەتی" زاراوەی تری تایبەت بەو ئاقارەی لێ داناتاشرێ بۆ نموونە ئەگەر بەرامبەر (الوجودیة — Existentialism) بوونایەتی دابنێین، ئەی بەرامبەر بە(الوجودي — Existentialist) بوونایەتی چی دابنێین؟

*بوونخوازی: ئەم وشەیە پتر دەلالەت لە خۆزیاخواستن دەکات. کە تۆ دەڵێیت "ئازادیخواز" واتە کەسێك کە هەڵوەدای ئازادییەو دەخوازێ ئازاد بێتو لەو پێناوەدا خەبات دەکات. زاراوەی "وجودیەت"یش دەلالەت لەبزاوتێك دەکات کە لە "وجود — بوون"ەوە دەست پێدەکات، واتە بوون لە وجودیەتدا حاڵەتێك نییە بخوازرێ، بەڵکو حاڵەتێکە هەیە.

*بوونگەری: دیسانەوە ئەم زاراوەیەش پتر دەلالەت لە پیشەکاری دەکات. دەگوترێ "ئاسنگەری" "مسگەری" "زەڕەنگەری" هتد...

لەکاتێکدا "بوونگەرایی" ئاقارە نەك پیشە.

کەواتە من بۆیە "بوونگەرایی"م پەسەند کرد، لەبەر ئەوەی "گەرایی" هەرچەندە وەکو وتم پاشگرێکە لە زمانی کوردیدا نییە (بەڵام گەر پێویست بێت ئەوە خەوش نییە کە خۆمان لە دەمارگیریی زمانەوانی بەدوور بگرین) بەڵام دەلالەت لە ئاقار دەکاتو بەرامبەر بە پاشگری "ism" ی ئینگلیزیو "یە"ی عەرەبییەو ئەوکات دەتوانین بە

پەیڕەوکاری ئەو ئاقارەش بڵێین "بوونگەرا". هەڵبەت ئەمە هەوڵێکی شەخسییەو من لێرەدا وام بەپەسەند زانیوەو قابیلی گفتوگۆکردنیشە لەسەریو با وا دابنێین کە ئەم زاراوەیە کاتییە تا زاراوەیەکی لەبارتر دەچەسپێت.

بە هەمان شێوە سەبارەت بە زاراوەکانی تری ناو ئەم کتێبە، ئەمە لەکاتێکا زاراوەی وا لای هەندێ فەیلەسووفی بوونگەرا هەیە کە نەك بۆ کوردی بەڵکو بۆ هیچ زمانێك تەرجەمە ناکرێت، هەر بۆ نموونەش زاراوەی "دازاین" لای هایدیگەر کە چەند جارێك لەم کتێبەدا دووبارە بۆتەوە.

کەواتە من لاف ئەوە لێنادەم کە ئەو زاراوە کوردییانەی لەم کتێبەدا دامناون یا دامتاشیون دوا شێوەی ئەو زاراوانە بێتو بەڵام من لە ئێستادا ئەمانەم لا پەسەند بوونو دەشێ لە داهاتوودا هەوڵی باشتریان بۆ بدرێ.

ئێستاش دەمەوێ ئاماژە بەوە بدەم کە ئەم وەرگێڕانە بە بەراورد لەنێوان هەردوو وەرگێڕانە عەرەبیو فارسیەکەدا ئەجام دراوە، وەرگێڕانە عەرەبیەکە هی (دکتۆر ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام)ە و (د. فوئاد زەکەریا)ش پیایدا چووەتەوە، کە هەردووکیان لەبواری فەلسەفەدا پسپۆڕنو دەیان کاری نووسراوو تەرجەمەکراوی فەلسەفییان هەیەو وەرگێڕانەکانیان جێی متمانەیە. وەرگێڕانە فارسیەکەش هی (محەمەد سەعید حەنایی کاشانی)یە، کە دیسانەوە ئەمیش لە فەلسەفەدا پسپۆڕەو چەندەها کتێبی دانراوو وەرگێڕدراوی لەبواری فەلسەفەدا هەیە. ئەوەی جێی سەرسووڕمانی من بوو ئەوە بوو کە لەکاتی بەراورد کردنی ئەم دوو کتێبەدا هەستم بە هیچ جیاوازییەك نەکردو ئەمەش بەڵگەیەکی تری وردیی کارەکانی ئەو دوو وەرگێڕەیە، تەنها ئەوە نەبێت کە لە فەسڵی چواردەیەمدا بەشێك هەیە تایبەتە بە پەیوەندیی نێوان بوونگەراییو تیۆلۆجیا، لە فارسیەکەدا هەیەو لە عەرەبیەکەدا نییە، بەڵام بۆ ئەمەش وەرگێڕە عەرەبەکە پاساوی خۆی هەیەو کە وەرینەگێڕاوەو لەبەرئەوەی زیاتر پەیوەستە بە تیۆلۆجیای خۆرئاواییو مەسیحیەوە، بەپێویستی نەزانیوە تەرجەمەی بکات، هەرچەندە ئێمە پەیڕەویمان لەو

نەکردووەو ئەو بەشەشمان بۆ کوردی وەرگێڕاوە کە زۆریش نییەو بیرتییە لە چەند لاپەڕەیەك.

دواجار لەکۆتایی ئەم پێشەکییە کورتەدا ئەمەوێ بڵێم کە خۆ قەرەدان لە وەرگێڕانی کتێبێکی فەلسەفیی لەمجۆرە کارێکی ئاسان نەبووەو دەشێ مرۆڤ دوچاری هەندی کەمو کورتیش بێت، کە هیوادارم خوێنەرانو پسپۆڕان لە کەمو کورتیەکانم ببوورنو لە تێبینیو سەرنجەکانی خۆیان ئاگادارم بکەنەوە، تا لە چاپەکانی داهاتوودا کتێبەکە بەشێوەیەکی پوختتر بەکەوێتە بەردەستی خوێنەران.

**ئازاد بەرزنجی**

**کانونی دووەمی ٢٠٠٥**

# بەشی یەکەم

## شێوازی بوونگەرایانە لە فەلسەفاندندا

١-بوونگەرایی (وجودیەت) چییە؟
٢-هەندێ بابەتی دووپاتکراوە لە بوونگەراییدا.
٣-جۆراوجۆری لە نێو فەیلەسووفە بوونگەراکاندا.
٤-بوونگەرایی و فینۆمینۆلۆجی (دیاردەگەرایی).
٥-جیاوازیی نێوان بوونگەرایی و هەندێ جۆری فەلسەفەی پەیوەندیدار بە بوونگەراییەوە.

## ١–بوونگەرایی چییە؟

کاتێ دەمانەوێ وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە: "بوونگەرایی چییە؟" ڕووبەڕووی جۆرێك لە ئاڵۆزی دەبینەوە، ئەم کێشەیەش لە سەرێکەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو شتەی مەبەستی بووە وەکو فەلسەفەیەکی جیددی سەیر بکرێ، زۆرجار دابەزیوەتە ئاستی "مۆد"ەوە و وای لێهاتووە نازناوی "بوونگەرا – وجودی" دراوەتە پاڵ کەسان و کارو کردەوەی وەها کە پەیوەندییەکی ئەوتۆیان بە فەلسەفەی بوونگەراییەوە نەبووە، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر لە بنەڕەتدا ئەو پەیوەندییە هەر هەشبووبێت.

هەروەکو ژان پۆل سارتەریش وتوویەتی: "ئێستا ئەم وشەیە بەشێوەیەکی وا ناڕێك بەسەر هەموو شتێکدا دادەبڕن کە وای لێهاتووە هیچ مانایەکی نەماوە"[(١)]. بەڵام لەسەرێکی تریشەوە، کێشەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە جۆرێك لە ئاڵۆزی لەناو خودی بوونگەرایی خۆشیدا هەیە. لایەنگرانی ئەم فەلسەفەیە نکووڵی لەوە دەکەن کە بتوانرێ ڕاستی **Reality** بخرێتە ناو وێنا و چەمکی وردەوە، یان لە ڕێبازێکی داخراودا قەتیس

بکرێ. هەر لێرەشەوە سۆرین کیرکەگۆر کە باوکی بوونگەرایی نوێیە، ناوی مەغزاداری لە دوو کتێبی خۆی نا، کە ئەوانەش: "برِگە فەلسەفیەکان" و "پاشکۆیەکی کۆتاییهێنی نازانستی"ن و لەگەڵ ڕێبازی گشتگیری فەلسەفەی هیگڵیدا کەوتە ململانێوە. لەبەرئەوەی لە ڕوانگەی بوونگەراکانەوە بەردەوام شتەکان ڕێکوپێك و سنووردار نین، ئەزموون و زانستی ئێمە هەمیشە برگەی تەواونەکراون و بەتەنها مەگەر ئەقڵێکی خودایی بتوانێت وەکو گشت "کل"ێك جیهان بناسێت، تەنانەت گەر ئەقڵێکی واش هەبێت، هێشتا هەر مەعریفەکەی لە کەلێن و کەلەبەر خاڵی نابێت.

بەڵام ئێمە نابێ لەوەدا زێدەگۆیی (مبالغە) بکەین کە بوونگەراکان بەشێوەیەکی گشتی ڕەخنەیان لە ڕێبازە میتافیزیکیەکان گرتووە، چونکە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەوان هیچیان لایەنگری ڕێبازێکی ئایینی نەبوون، یان تەنانەت هەندێکیان جۆرێك لە میتافیزیکای تایبەت بە خۆیان نەبووە.

هەروەکو "هیرمان دیم" دەڵێت: (ئەگەر کیرکەگۆر سەد ساڵ دواتر بژیبایە، واتە لەم سەردەمەی ئێمەدا کە بە شێوەیەکی کراوەتر لەوسا سەیری "ڕێباز" دەکرێ.. دەیتوانی ڕێبازێك لە دیالەکتیکی بوونگەرایانەدا دابمەزرێنێت کە لەگەڵ ڕێبازی هیگڵیدا کێبەرکێی پێبکات)[٢]. پۆڵ سپۆنهایم لێکۆڵینەوەیەکی نووسیوە کە تیایدا ئەوە ڕووندەکاتەوە کە: (پەیوەندییەکی سیستمئاسای ناوەکی لە نێوان ئەو بابەتە سەرەکیانەدا هەیە کە کیرکەگۆر بایەخی پێداون). گەرچی ئەم پەیوەندییە لە جۆرێکی تایبەتەو "ئەو جەختکردنەوانە هێمای بۆ دەکەن کە تانوپۆی زیندووی ئەم بایەخپێدانانە پێکدەهێنن.."[٣] مارتین هایدیگەریش بڕوای وابوو کە ئەو شیکردنەوە بوونگەرایانانەی لە کتێبەکەیدا "بوون و زەمەن" ئەنجامی داون، مۆرکێکی زانستییان بەخۆوە گرتووە[٤]. تۆماس لانگان حوکمێکی ڕاستی داوە کاتێ دەڵێت کە هایدیگەر هەڵگری تێڕوانینی کەسیو نائەبستراکتی فەیلەسووفە بوونگەراکانە(بەبێ ئەوەی قوربانی بەو پەیوەندیسازیو مەنهەجیەتە بدات کە لەگەڵ شیکردنەوە فەلسەفییە سیستمدارە

سوننەتییەكاندا هاوشانە)[٥]. جگە لەوەش، زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراكان، گەرچی سیستمە میتافیزیكییە باوەكانیان ڕەتكردۆتەوە، بەڵام هەندێ حوكمیانداوە كە مۆركی ئۆنتۆلۆجی و میتافیزیكییان بەخۆوە گرتووە.

هەرچۆنێك بێت ئەوە ڕاستە كە تیۆرەیەكی گشتی نییە هەموو بوونگەراكان پێوەی بەند بن و بۆ نموونە بەراورد بكرێ لەگەڵ ئەو بیروباوەڕە سەرەكییانەی كە ئایدیالیستەكان یان تۆماسیەكان (ئەوانەی سەر بە تۆماس ئاكویناس (١٢٢٥–١٢٧٤) بوون) لە قوتابخانەیەكی تایبەتیدا پێكەوە كۆدەكاتەوە، هەر بۆیەشە ئێمە لە ناونیشانی ئەم بەشەدا بوونگەراییمان بە "فەلسەفە" وەسف نەكردووە، بەڵكو گوتوومانە "شێوازێك لە فەلسەفاندن". هەر بۆیە بوونگەرایی شێوازێكە یان شێوەیەكە لە فەلسەفاندن كە ئەو كەسە بەرەو كۆمەڵێك بیروڕای تەواو جیاواز دەبات سەبارەت بە جیهان و ژیانی ئادەمیزاد. ئەو سێ بوونگەرا گەورەیەی ئێستاش باسمان كردن، واتە – كیركەگۆر و سارتەر و هایدیگەر– باشترین نموونەی ئەم جیاوازییەن.

بەڵام سەرباری ئەو جیاوازییە لە جیهانبینییاندا، ئەو لێكچوونەش لە نێوانیاندا دەبینینەوە لە شێوازی "فەلسەفاندن"یاندا كە دەشوبهێتە سەر لێكچوونی كەسانی ناو خێزانێك هەر ئەم شێوازە هاوبەشەش لە فەلسەفاندنیاندا وامان لـێ دەكات پێیان بڵێین "بوونگەراكان".

كەواتە تایبەتمەندییە گشتیەكانی ئەم شێوازەی فەلسەفاندن چین؟ یەكەمین و دیارترین تایبەتمەندی ئەوەیە كە ئەم شێوازەی فەلسەفاندن لە مرۆڤەوە دەستپێدەكات، نەك لە سروشتەوە. فەلسەفەی "خود"ە نەك فەلسەفەی "بابەت". بەڵام لەوانەشە بگوترێ كە ڕێبازی ئایدیالیزمیش هەر لە خودەوە دەستپێدەكات. لەبەرئەمە پێویستە هەڵوێستی بوونگەرایی زیاتر دیاری بكەین بەوەی كە خود لای فەیلەسووفی بوونگەرا بریتییە لە بوونەوەر بە تەواوی بوونییەوە، واتە ئەم بوونەوەرە بە تەنها خودێكی بیركەرەوە نییە و بەس، بەڵكو كردەوەسازە و سەنتەری هەست و ویژدانیشە. كەواتە ئەو

شتەی بوونگەرایی دەیەوێ تەعبیری لێ بکات ئەم ڕەهەندە کامڵەی بوونە کە ڕاستەوخۆ و بەرچاوانە لە کرداری بوون خۆیدا دەناسرێ. هەربۆیە هەندێ جار ئەم شێوازەی فەلسەفاندن وا دێتە بەرچاو کە دژ بە ئەقڵ بێت **Anti-intellectualist**. فەیلەسووفی بوونگەرا بە جۆش و خرۆشێکی تەواوەوە بیردەکاتەوە، وەك کەسێك کە لەناوجەرگەی ڕووداوەکانی بووندایە. میگیل دۆ ئۆنامۆنۆ دەڵێت (فەلسەفە بەرهەمی ئینسانیەتی هەر فەیلەسووفێکە. هەر فەیلەسووفێك مرۆڤێکە لە گۆشت و خوێن و ڕووی دەمیشی لە خەڵکانێکە کە هەر لە گۆشت و خوێنن. چ کاری فەلسەفاندنی و چ هەر کارێکی تریشی، هەر لە ئەقڵیەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو لە ئیرادەو هەست و سۆز و گۆشت و خوێن و تەواوی ڕۆحی و تەواوی جەستەشیەوە، ئەو مرۆڤێکە دەفەلسەفێنێت..)(٦) گەرچی هەندێ لە بوونگەراکانی دی لە "ئۆنامۆنۆ" زیاتر بایەخیان بە ئەقڵ داوە، بەڵام هێشتا ئەوە ڕاستە کە هەموویان دەیانەوێ فەلسەفەکەیان لەسەر بنەمایەکی بوونگەرایانەی فراوان دابمەزرێننو لە هەر جۆرە ئەقڵگەرایی **Rationalism** یێك یان ئەقڵپەرستی **intellectualism** یێکی بەرتەسك دوور بکەونەوە. وا پێویست دەکات دواتر بە وردەکارییەکی زیاترەوە قسە لەسەر چەمکی "بوون" **Existence** بکەین، بەڵام تەنانەت ئێستاش گەر بمانەوێ لە شەقڵی جیاکەرەوەی شێوازی فەلسەفاندنی بوونگەرایانە بگەین، دەبێ شتێك لەبارەی ئەم چەمکەوە بڵێین. ئەوە بوو پێشتر گوتمان کە ئەم فەلسەفەیە لە مرۆڤەوە دەستپێدەکات، مرۆڤ بەو پێیەی بوونەوەرێکە، نەك بەو پێیەی خودێکی بیرکەرەوەیە.

جەختکردنیش لەسەر بوون بەو مانایە دێ کە ئێمە ناتوانین "سروشتێك" یان "ماهیەت"ێك بۆ مرۆڤ دیاری بکەین و پاشان لە بارەیەوە ئەنجامگیری بکەین. دەشێ لە بنەڕەتدا هەر ئەم تێڕوانینە بوونگەرایانەش بێت کە خەسڵەتێکی ناجێگیرانەی پێ دەبەخشێت. بەو شێوەیەی کە سارتەر تەعبیری لەم مەسەلەیە کردووە، دەڵێت:بوونی مرۆڤ پێش ماهیەتی دەکەوێت، پاشان دەڵێت: "مەبەستمان لەوەیە کە لە پێشداو بەر لە هەر شتێك مرۆڤ هەیە و، ڕووبەڕووی خۆی دەبێتەوەو، دەچێتە ناو جیهانەوە، پاشان خۆی

دەناسێنێت. هەروەکو فەیلەسووفە بوونگەراکان دەڵێن، مرۆڤ کە پێناسە ناکرێ، هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەو لە سەرەتادا هیچ نییە. ئەو ناتوانێت شتێك بێت، مەگەر دوایی ببێت، ئەوساش بەو شێوەیە دەبێت کە خۆی خودی خۆی دروست دەکات"[٧].

ڕەنگە ئەم سەرنجانە بەس بن بۆئەوەی وێنەیەکمان سەبارەت بە شێوازی فەلسەفاندنی بوونگەرایانە لا هەبێت. لە بەشەکانی داهاتووشدا و پاش باسکردنی وردەکارییەکانی ئەم فەلسەفەیە لە شێوە جۆراوجۆر و پەرەسەندووەکانیدا، تێگەیشتنێکی کامڵترمان سەبارەت بەم شێوازەی فەلسەفاندن لا دەبێت.

## ٢-*هەندێ بابەتی دووپاتکراوە لە بوونگەراییدا*

وێڕای ئەوەی کە ئێمە وتمان بوونگەرایی شێوازێکە لە فەلسەفاندن زیاتر لەوەی بریتی بێت لە کۆمەڵە دەستوورێك یان تیۆرەیەك، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە ئەم ئاڕاستە تایبەتییە لە فەلسەفەدا جەختی زیاتر لەسەر هەندێ بابەت دەکات وەك لە هەندێکی دی، تەنانەت دەبینین ئەم بابەتانە لای زۆربەی بیرمەندە بوونگەراکان دووپات دەبنەوە. هەڵبەتە ئەم بابەتانە جیاوازن لەو بابەتانەی کە فەیلەسووفانی پێشین بەگوێرەی نەریتی فەلسەفی بایەخیان پێ دەدا. هەر بۆ نموونە، لە کاتێکا کێشەی لۆژیك "مەنتیق" و ئەپستمۆلۆژیا "تیۆرەی زانین" دوو کێشەی گەورەن لە قوتابخانە فیکرییە کۆنەکانی بەر لە بوونگەراییدا، دەبینین فەیلەسووفی بوونگەرا بە جۆرێك لە بەکەمزانییەوە ئەم کێشانە پشتگوێ دەخات. بگرە دەتوانین بڵێین کە هەندێ لە بوونگەراکان بە سووکایەتی پێکردنەوە چاو لەم کێشانە دەپۆشن و بە بابەتگەلێکی "ئەکادیمی"ی پەتیی دەزانن. بەڵام تەنانەت ئەو بوونگەرایانەش کە ناتوانین ئەم گلەییەیان لێ بکەین، زیاتر بایەخیان داوە بەو کێشانەی کە وا دێتە بەرچاو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بە بوونی ڕاستەقینەی مرۆڤەوە پەیوەست بن، نەك ئەو کێشە تیۆری یان ئەبستراکتانە. دواتریش دەبینین کە هەندێ مەسەلە هەن کە

لەلایەن بوونگەراکانەوە گرنگییان پێدراوە، بەڵام تا ئێستاش زەحمەتە ئەو بابەتانە بۆ فەلسەفە، بابەتی گونجاو بن.

ئەو بابەتانەی لای هەموو فەیلەسووفە بوونگەراکان جێی بایەخن بابەتگەلێکی وەکو ئەمانەن: ئازادی، هەڵبژاردن و بڕیاردان، هەستکردن بە بەرپرسیارێتی. ئەم بابەتانەش گەوهەری بوونی تاکەکەس پێکدەهێنن، لەبەرئەوەی ئەوەی مرۆڤ لە هەموو بوونەوەرەکانی تری سەر زەوی جیادەکاتەوە کردەوەی ئازادی و توانای پێکەوەنانی ئایندەیەتی و لە ڕێی بڕیاری ئازادانەو هەستکردن بە بەرپرسیارێتییەوەیە کە مرۆڤ خودی ڕاستەقینەی خۆی دەخوڵقێنێت. هەروەکو "جۆن ماکمواری"یش دەڵێت "خود بەو سیفەتەی بکەرە" دەستەبەری بابەتە سەرەکیەکانە لە فەلسەفەی بوونگەراییدا، لە کاتێکا کەلەپووری فەلسەفەی خۆرئاوا، بەتایبەتیش لە "دیکارت"ەوە، بایەخی بە خودی ناوەوە داوە، کە مەبەستیش لێی لێرەدا "خودی بیرکەرەوە"یە[٨].

ڕەنگە پێویست بکات ئەوە بڵێین کە لەو هۆیانەی وایکردووە توێژینەوەی بوونگەرایانەی بوونی تاکەکەس سنووردار بکات، ئەوەیە کە بەزۆری ئەم توێژینەوەیە سەبارەت بە تاکەکەسە. ڕاستە هەندێ لە فەیلەسووفە بوونگەراکان یان نیمچە بوونگەراکان (وەکو مارتن بوبەر و گابریل مارسیل) بەو دواییە لە پێشڕەوانی لێکۆڵینەوەی پەیوەندییەکانی نێوان کەسەکانن. هەروەها دەشێ زۆربەی فەیلەسووفە دیارەکانی بوونگەرایی "گەرچی بە قسەش بێت" لانی کەم بایەخ بەو ڕاستییە بدەن کە مرۆڤ وەکو کەسێك تەنها لە ناو کۆمەڵێك کەسدا بوونی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان بایەخی سەرەکی بە تاکەکەسەکە دەدەن کە گەڕان بە دوای خودی ڕەسەنی خۆیدا، کرۆکی مانای بوونی تاکەکەسییەتی.

هەندێ بابەتی تریش هەن کەلای بوونگەراکان دووپات دەبنەوە، لەوانە: هەست بە کۆتابوون، گوناه، نامۆبوون، نائومێدی و مەرگ. ئەم بابەتانە لە فەلسەفەی سوننەتیدا

بایەخێکی ئەوتۆیان پێ نەدراوە، بەڵام لای فەیلەسووفە بوونگەراکان بە وردی قسەیان لەسەر دەکرێ.

لێرەدا ناتوانین بە سادەیی سەبارەت بە گەشبینی و بەدبینی بدوێین. هەندێ لە فەیلەسووفە بوونگەراکان دان بە بەدبینیی خۆیاندا دەنێن، لە کاتێکا هەندێکی تریان باسی گەشبینی یان لانی کەم باسی ئومێد دەکەن. لەگەڵ ئەمەشدا، پێدەچێ هەموویان دەرکیان بە توخمە تراژیکەکانی بوونی مرۆیی کردبێت.

ئازادیی مرۆڤ و هەوڵ و تەقەللای لە پێناوی گەیشتن بە بوونێکی تاکەکەسییانەی ڕەسەندا، ڕووبەڕووی بەرەنگاری و هەندێ جاریش تێکشکان دەبێتەوە. بەهەرحاڵ، هێندەی مەسەلەکە پەیوەندیی بە تاکەکەسەوە هەیە، بوون بە مەرگ کۆتایی دێت. دەشێ بڵێین کە لایەنی تراژیك لە بوونگەراییدا هەر لە خاڵی سەرەتاوە دەستپێدەکات، کاتێ بوونی مرۆیی بەرامبەر بە بوونی شتە بێ گیانەکان دادەنرێ. جاری وایە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دوو شێوەیەی بوون دەگاتە ڕادەیەك کە بوونگەرایی خەریکە شێوەی جۆرێك لە دوالیزم Dualism *[1] بەخۆوە دەگرێت. تەنانەت لەو کاتانەشدا کە ڕووبەڕووبوونەوەکە زۆر توند نییە، هەر ناسینەوەی ململانێ و ئەزموونەکانی گوناه و نامۆبوون لەئارادایە، لەبەرئەوەی مرۆڤ لای فەیلەسووفی بوونگەرا هەرگیز بەتەنها بەشێك نییە لە گێتی Cosmos، بەڵکو بەردەوام لە پەیوەندییەکی گرژدایە لەگەڵ دونیایەکی پڕ لە ئیمکاندا بۆ ململانێیەکی تراژیك.

هەروەها لەوانەیە یەکێك لە حوکمەکانی وەچەکانی ئایندە ئەوەبێت کە درەوشاوەترین کاری فەلسەفەی بوونگەرایی و بەردەوامترینیان لە توێژینەوەیاندا بێت بۆ بابەتێکی دی کە تا ئێستاش لە نووسینەکانی بوونگەراکاندا دووپات دەبێتەوە، ئەویش: ژیانی عاتیفیی مرۆڤە، ئەمەش یەکێکە لەو بابەتانەی کە بەشێوەیەکی گشتی فەیلەسووفانی ڕابردوو پشتگوێیان خستووە، یان داویانەتە دەست دەروونناسی، بۆیە هەرکات جۆرە بەرتەسکەکانی ئەقڵانیەت Rationalism بەسەر فەلسەفەدا زاڵ بووە، هەست و سۆزە

نائارامەکان و حاڵەتە دەروونیەکان و جۆش و خرۆشەکانی زەینی مرۆیی بە بابەتی ناشایستە بۆ ئەرکی فەیلەسووف لەقەڵەم دراوە، بگرە وەکو کۆسپیش لەبەردەم گەیشتن بە مەعریفەی بابەتیی نموونەیی سەیرکراوە. بەڵام بوونگەراکان باوەڕیان وایە کە هەر ئەم بابەتانەن وامان لێ دەکەن بە تەواوی بوونمانەوە بچینە ناو جیهانەوەو کۆمەڵێك شتی وا لەبارەیەوە فێربین کە زەحمەتە بە تەنها لە ڕێی بینینی بابەتیانەوە فێریان بین. فەیلەسووفە بوونگەراکان، هەر لە کیرکەگۆرەوە تا هایدیگەر و سارتەر، کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی درەوشاوەیان خستۆتە بەردەستمان سەبارەت بە کۆمەڵێك حاڵەتی ویژدانیی وەکو: نیگەرانی و بێزاری و هێڵنج، ویستوویانە ئەوە پیشانبدەن کە ئەم حاڵەتانە لە مەغزای فەلسەفی خاڵی نین.

ئێمە لێرەدا ئاماژەمان بۆ هەندێ لەو بابەتانە کرد کە زۆرجار لەسەر لاپەڕەی نووسەرە بوونگەراکان دووپات دەبنەوە. دەشێ کەشفکردن و پەرەدان بەم بابەتانەش کە بە زۆری لە توخمە ویژدانی و مەیلە خرۆشێنەرەکانی ژیانی شەخسیەوە وەرگیراون، گەورەترین و گرنگترین هەنگاوی سەرکەوتووی بوونگەراکان بێت. بەڵام بێگومان لە پەنا ئەم بابەتانەدا، لەگەڵێ بابەتی تریشیان کۆڵیوەتەوە، کێشەکانی زمان و مێژوو و کۆمەڵگا و تەنانەت مەسەلەی هەبوون Being یش بووەتە باسی ئەم یان ئەو فەیلەسووفی بوونگەرا و ئاسۆی فراوانی تیا کردۆتەوە. بەڵام باس وتوێژینەوەکانی بە هەرچیەکی گەیاندبێت، دەبینین کە ئەم فەیلەسووفە بوونگەرایە دواجار هەر لە پەیوەندییەکی توند و تۆڵدا دەمێنێتەوە لەگەڵ ئەو مەسەلە شەخسییە سەرەکییانەی کە پێشتر لێیان دواین.

## ٣- جۆراوجۆری لە نێو فەیلەسووفە بوونگەراکاندا

گەرچی ئێمە سەرنجی خوێنەرمان بۆ ئەوە ڕاکێشا کە ناومان نا "لێکچوونی خێزانی" لە نێو بوونگەراکاندا، هەروەکو لە شێوازی فەلسەفاندن و لەو بابەتانەدا دەبینرێ کە لێیاندەکۆڵنەوە. بەڵام دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە بە هەمان ڕادە جیاوازیش لە

نێوانیاندا هەیە. لە ڕاستیشدا شتێکی ئاسان نییە ژمارەیەکی زۆر لە فەیلەسووفان بدۆزینەوە کە ئامادەبن دان بەوەدا بنێن کە بوونگەران، هەروەها ئەوانەی کە ئێمەش بە بوونگەرایان سەیر دەکەین، گەرچی بەو ناولێنانە قایل نین، ناتوانین بڵێین کە بە مانای باوی وشە "قوتابخانە"یەك پێکدەهێنن. ئەوە بوو پێشتر سەرنجی ئەوەماندا کە سارتر چۆن گلەیی لەوە دەکات کە وای لـێ هاتووە "بوونگەرایی" لە هەموو مانایەك داماڵراوە. گەرچی هایدیگەر و یاسپەرز و مارسیل بە دڵنیاییەوە ناویان لە هەر لێکۆڵینەوەیەکدا دێت کە سەبارەت بە بوونگەرایی بێت، بەڵام هەموو ئەمانە نازناوی بوونگەرایی ڕەتدەکەنەوە. "ڕۆجەر. ل. شین" سەرنجی ئەوەی داوە کە "هەر بوونگەرایەك ڕێز لە خۆی بگرێت، نایەوێ پێی بڵێن بوونگەرا، لەبەرئەوەی کە وتی "من بوونگەرام" واتە "من یەکێکم لەو دەستەیە لە خەڵك کە بە بوونگەرا ناسراون" لەکاتێکدا بوونگەرای ڕاستەقینە دەیەوێ بڵێت: "من بریتیم لە خودی خۆم – و پێم خۆش نییە خۆتان ماندوو بکەن و پۆلێنم بکەن.."[٩]

بەڵام ئەو نووسەرانەی کە دەربارەی بوونگەرایی دەنووسن، زۆربەی کات ئاماژە بۆ دابەشکردنی ئەم فەیلەسووفانە دەکەن بۆ بوونگەرایانی مەسیحی و بوونگەرایانی بێ باوەڕ، وەکو بەڵگەیەك بۆ جیاوازی لەم شێوازەی فەلسەفاندندا. بەڵام گەر ئەوەش ڕاست بێت کە لەناو بوونگەراکاندا هەم جۆری مەسیحیی باوەڕدار و هەم بێ باوەڕ هەیە، ئەوا ئەم دابەشکردنە زۆر یاریدەمان نادات لەو فەیلەسووفانە بگەین، لەبەرئەوەی ئەم دابەشکردنە ئاسانکردنەوەیەکی زیاد لە پێویستە، چونکە هەندێ فەیلەسووفی بوونگەرا (یان فەیلەسووفی مەیلدار بەلای بوونگەراییدا) هەن کە ناخرێنە چوارچێوەی ئەم پۆلێنکردنەوە، بۆ نموونە یەکێکی وەکو مارتین بوبەر **M.Buber** جوولەکەیە، هایدیگەریش لافی ئەوە لێدەدات کە نە باوەڕی بە خوا هەیە و نە باوەڕیشی پێ نییە. بگرە لەوەش زیاتر، دابەشکردنی بوونگەراکان بۆ مەسیحی و بێ باوەڕ ئەو ڕاستییە گرنگە فەرامۆش دەکات کە پەیوەندیی نێوان فەیلەسووفی بوونگەرا و مەسیحیەتەکەی، یان بێ باوەڕییەکەی، عادەتەن پەیوەندییەکە مۆرکی ناودژێتی "مفارقە – **pardox**" بەخۆوە دەگرێت، واتە

پەیوەندییەکە تێکەڵ لە خۆشەویستی – و ڕق، کە توخمی باوەڕ و بێباوەڕیشی تیا کۆبووەتەوە.

با بۆ تاوێك لە هەڵوێستی هەریەك لە کیرکەگۆر و نیچە رابمێنین: عادەتەن کیرکەگۆر بە فەیلەسووفێکی بوونگەرای مەسیحیی گەورە لە قەڵەم دەدرێ و هیچ گومانێکیش لە پەیوەندیی پڕ جۆش و خرۆشی ئەو بە ئیمانی مەسیحییەوە ناکرێ. بەڵام لە هەمانکاتدا و بە هەمان ڕادە دوژمنایەتیەکی بەجۆش و خرۆشیش لای ئەو دەبینینەوە لەگەڵ شێوە باوەکانی مەسیحیەتدا لە سەدەی نۆزدەیەمدا، کە بەڕای ئەو دابەزیونەتە ئاستێکی نزمەوە. ئەم دوژمنایەتیەش دەگاتە لووتکە وەختێ هێرشێکی سەرتاسەری دەکاتە سەر ئەو کلێسایەی کە ئەو دەیناسی، ئەوەتانێ دەڵێت: "ڕەگوڕیشەی هەموو مەسیحیەتێك وا لە ناودژێتیدا Paradoxical، ئیدی مرۆڤ لەبەرئەوەی باوەڕدارە قبوڵیدەکات، یان لەبەرئەم ناودژێتییەی ڕەتیدەکاتەوە. ئەسپی ڕەسەن و پڕتاو، وەختێ عەرەبانچییەکی ناشی بەکرێ دەیگرێ و سواری دەبێت، چیدی غیرەتی لانامێنێت و شانازی بە عەرەبانەکەیەوە ناکات"[١٠] خۆ ئەگەر کیرکەگۆری بوونگەرای مەسیحی، هەڵوێستێکی ناودژێتیئاسای نارووانمان بۆ بخاتە ڕوو، ئەوا دەتوانین لای نیچەش پەیوەندییەکی تێکەڵ لە "خۆشەویستی – ڕق" ببینینەوە. باوەڕنەهێنانی بە مەسیحیەت و نکوڵیکردنی لێی بەهەمان ئەندازەی تەقەللاکەی کیرکەگۆر لە پێناوی ئیماندا، ڕاستگۆیانە و بەجۆش و خرۆش بوو. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا مەسیحیەت کاریگەرییەکی ئەفسووناویی لەسەر ئەو هەبوو. وەکو کارل یاسپەرزیش ئاماژەی پێداوە: وێڕای هێرشە دڕندانەکانی نیچە بۆ سەر مەسیحیەت، بەڵام جۆرێك لە دوودیوی Ambiralence لە تێڕوانینیدا دەبینینەوە: "دوژمنایەتیکردنی ئەو بۆ مەسیحیەت وەکو ڕاستییەك و وابەستەیی پێیەوە وەکو بەڵگەنەویستێك لێك جیاناکرێنەوە، ئەو خۆیشی بە چاوێکی پۆزەتیڤانەوە دەیڕوانییە ئەم وابەستەییە و نەك هەروەکو شتێك کە پێویستە ڕزگاری بێت لێی"[١١].

ڕەنگە بتوانین بڵێین کە لای زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراکان کۆمەڵێك توخمی کەلەپووری ئایینی یان کەلتوورییان لە هزری بوونگەرایاندا تێکەڵ بووە، یان بگرە ئەو توخمانە بۆ فەلسەفاندن هانیداون. ئەوەتا سەرباری ئەو ڕەخنە توندوتیژ و زۆرانەی کە کیرکەگۆر ئاراستەی "لۆتەر"ی کردوون، بەڵام ناتوانین بوونگەراییەکەی لە ڕێبازی پرۆتستانتی جیابکەینەوە. هەروەها فەلسەفەکەی مارتین بوبەریش تێکەڵ بە کەلەپووری هاسیدی Hassidic [*٢]ی یەهودی بووە، هەروەها ڕەگوڕیشەی بوونگەراییەکەی دۆستۆیڤسکی و بێردیاییڤ بە قووڵی ڕۆچووەتە ناو ڕۆحی ئەرتۆدۆکسی ڕووسیەوە. پەیوەستبوونی "ئۆنامۆنۆ"ش بە "دۆن کیخۆتێ" و "دۆن کیخۆتی"یەوە بەشێوەیەکی گشتی، هێندەی پەیوەستبوونێکی بوونگەرایانەیە، ئەوەندەش پەیوەستبوونێکی ئیسپانیانەیە. هەربۆیە ئەو جۆراوجۆرێتییە دەوڵەمەندەی لای ئەم کەسانە دەبینینەوە ڕەنگدانەوەی جۆراوجۆرێتیی ئەو زەمینانەیە کە لەناویاندا وەڵامی پەیامە فەلسەفیەکانی خۆیانیان داوەتەوە.

بەردەوام لە کەلەپووری کاسۆلیکی ڕۆمانیدا توخمێك هەبووە سەر بە سانت ئۆگەستین و توخمێکی تریش سەر بە تۆماس ئەکویناس، دەشێ ئەمەش لە پەیدابوونی بوونگەرای کاسۆلیکی وەکو گابریل مارسیل دا یارمەتیمان بدات. وشەی "بوونگەرایی" لە هەندێ کۆڕ و کۆبوونەوەی کاسۆلیکدا باونەبووە، بەتایبەتیش پاش بڵاوبوونەوەی گوتە دوژمنکارانەکانی بڵاوکراوەکەی پاپا پیوسی دوانزدەیەم لە ١٩٥٠دا لەژێر ناوی "سەبارەت بە ڕەگەزی مرۆیی"[*٣]دا.

لەگەڵ ئەوەشدا نووسەرە کاسۆلیکە ڕۆمانییەکان کاتێ باس لە ڕێبازی کەسێتیگەرایی personalism [*٤] دەکەن، جۆرێك لە فەلسەفەیان لەبەرچاوە کە ئەوەندە لە بوونگەراییەوە دوور نییە.

بەڵام کارل یاسپەرز و مارتین هایدیگەر تاڕادەیەك لە بوونگەراکانی دی جیاوازن، ئەمانە مەسیحی نین بە مانا باوەکەی ئەم وشەیە، بەڵام لە هەمانکاتدا بێباوەڕیش نین. یاسپەرز

پەیوەندیی نزیکی لەگەڵ جۆرێك لە ڕێبازی کراوەی پرۆتستانتی لیبراڵ هەیە. بەڵام پێدەچێت وەسفکردنەکەی خۆی باشترین دەربڕین بێت بۆ ئەو دۆخەی کە پێی دەڵێت "ئیمانی فەلسەفی". بەڵام لە هەڵوێستی "هایدیگەر"دا بۆ بوون کۆمەڵێك توخمی تەسەووف و ئیستاتیکی دەبینینەوە[١٢]. هەرچۆن هایدیگەر ماوەیەك پەیوەندی بە نازییەکانەوە کرد، گەرچی تا ئەندازەیەك دەکرێ هۆی ئەوە بگەڕێنرێتەوە بۆ کاڵبوونی هوشیاریی سیاسیی ئەو، بەڵام نکوولّی لەوەش ناکرێ کە هەندێ توخم هەن لە هزری ئەودا کە دەشێ بە ئاراستەی گونجاو لەگەڵ ناسیونالیزمی ئەڵمانیدا پەرەیان پێبدرێ[١٣].

کاتێکیش دەگەینە لای فەیلەسووفانێك کە بە ئاشکرا دان بە بێ باوەڕیی خۆیاندا دەنێن، وەکو سارتەر و کامۆ، پێدەچێ گەیشتبینە بوونگەرایی لە پەتیترین شێوەیدا. چونکە لەوە دەچێت ئەم دووانە بە ڕەتکردنەوەیان بۆ هەر مەسەلەیەکی ئایینی، سەربەخۆیی تەواو و بەرپرسیارێتیی تەواوی تاکەکەسیان بەدیهێنابێت. بەڵام تەنانەت لێرەشدا ناودژێتی دەبینینەوە: بۆ نموونە پەیوەندیی سارتەر لەگەڵ مارکسیزمدا چۆن لێکبدەینەوە؟ ئەم پەیوەندییە هەم پۆزەتیڤە و هەم ڕەخنەگرانەشە، گەرچی بەڕواڵەت زۆر بەجۆش و خرۆش نییە، بەڵام لە پەیوەندییەکەی کیرکەگۆر بە مەسیحیەتەوە کەمتر ناودژێتیئاسا نییە.

دواتریش دەتوانین پرسیارێکی گرنگ بکەین: ئایا بوونگەرا دەتوانێ پێمان بڵێت کە ئاخۆ وەدیهێنانی خودی ڕەسەنی مرۆڤ لە ڕێی هەڵبژاردنییەوە بۆ مەسیحیەت یان مارکسیزم و یان بێباوەڕی و یان تەنانەت نازیەت، مەسەلەیەکی پەسەندکردنی تاکەکەسییە؟ دەشێ بەلای تۆوە هەڵبژاردنێك ڕاست بێت لە هەڵوێستی تایبەتی خۆتدا، لە کاتێکا دەشێ هەڵبژاردنێکی دی بۆ من ڕاست بێت لە هەڵوێستی تایبەتی خۆمدا. بە دڵنیاییەوە هەندێ لە بوونگەراکان لە وەڵامدانەوەیاندا بۆ ئەو پرسیارەمان، لەم وەڵامەی دوایی نزیك دەبنەوە. ئەوان هەموو دان بە ڕێژەیی (یا نیسبیەت)ی هەڵوێستەکاندا دەنێن. لەگەڵ ئەوەشدا من زۆر گومان لەوە دەکەم کە ئەمە بە تەنها مەسەلەی پەسەندکردنێکی

شەخسی و ڕەسەنێتییەکی تاکەکەسی بێت، گومانیشم هەیە لەوەی کە کەسێکی خاوەن هەڵوێستی لەمجۆرە هەق بدات بە خۆی و ناوی فەیلەسووف لە خۆی بنێت، فەلسەفە پێویستی بە تێفکرینە، سارتەریش بۆ نموونە هۆیەکانی بێباوەڕیی خۆیمان پێ دەڵێت، هەرچۆن یاسپەرزیش لە ڕێی شیکردنەوەیەکی سەرسوڕهێنەوە "ئیمانی فەلسەفی"ی خۆیمان بۆ دەخاتە ڕوو، تەنانەت گەر بشوترێ کە ئەم ئیمانە ناسەلمێنرێ.

کاتێکیش تۆ ڕێگە بە پاساوەکانی دڵ دەدەیت قسەی خۆیان بکەن، ئەمە مانای ئەوە نییە کە تۆ بە تەواوەتی دەسبەرداری حوکمەکانی ئەقڵ دەبیت، یان هەموو دیدگاکان لە ڕووی بەهاوە وەك یەك سەیر دەکەین. ئەو ڕاستییەش کە جیاوازیی زۆر لە نێوان دیدگای ئەو فەیلەسووفانەدا دەبینینەوە کە پێیان دەوترێ بوونگەراکان، ئەوە پیشاندەدات کە بوونگەرایی لە چارەسەرکردنی کێشە میتافیزیکی و ئۆنتۆلۆژیەکاندا، ڕێگایەکی کورت ناگرێتە بەر. ئەمەش حەقیقەتێکە کە بوونگەراکان بە هەستی بەرپرسیارێتی و بە هوشیارییەوە دەرکی پێ دەکەن، هەربۆیە هەوڵ و تەقەللا فەلسەفیەکانیان لە سنووری پێداویستییەکانی تاکەکەس و ئەو شتانەدا ناوەستێت کە تاکەکەس پەسەندی دەکات.

## ٤–*بوونگەرایی و دیاردەناسی*

***(فینۆمینۆلۆجی Phenomenology)***

زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراکان باوەڕیان بە فینۆمینۆلۆجی (دیاردەناسی) هەیە، گەرچی زۆر لە دیاردەناسەکان هەن کە بوونگەرا نین. هۆی ئەم پەیوەندییە توندوتۆڵەی نێوان ئەم دوو جۆرەی فەلسەفەش ئەوەیە کە پێدەچێ دیاردەناسی ئەو میتۆدی لێکۆڵینەوەیە بخاتە بەردەست بیرمەندی بوونگەرا کە لە توێژینەوەکانیدا دەربارەی بوونی مرۆیی پێویستی پێیەتی.

وشەی دیاردەناسی/ فینۆمینۆلۆجی لە فەلسەفەدا مێژوویەکی درێژی هەیە، هەندێ جار کانت – **Kant** بەکاریهێناوە بە مانای لێکۆڵینەوەی دیاردەکان **Phenomena** یان

ڕواڵەت Appearance بەرامبەر "شتەکان لە خودی خۆیاندا" کە بە گریمانەی ئەو لە پشتی دیاردەکانەوە خۆیان حەشارداوە[*٥]. هەر چۆن "هیگڵ"یش لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا "دیاردەناسیی زەین یان ڕۆح – Phenomenology of Mind" ئەم وشەیەی بەکارهێناوە بە مەبەستی خستنەڕوویەکی وردی دەرکەوتنە "تەجەللا"کانی ڕۆح یان ئەقڵ، کاتێ بەشێوەیەکی دیالەکتیکی خۆی لە هوشیارییەکی هەستیی ساویلکانەوە لە سادەترین ئاستیدا، بەرەو دەرك کردن و تێگەیشتن و کۆمەڵێك شێوەی هوشیاری تا دەگاتە بەرزترین چالاکیە رۆحی و ئەقڵیەکان، دەبات.

لە دواتریشدا وشەی "دیاردەناسی" دابڕا بەسەر ئەو فەلسەفەیەدا کە "ئەدمۆند هۆسێرل"[*٦] لە نووسینە جۆراوجۆرەکانیدا پەرەی پێدا کە دەشێ گرنگترینیان کتێبی "بیروڕاکان، دەروازەیەکی گشتی بۆ دیاردەناسیی پەتی". "هۆسێرل" ئەو کێشانەی کە پەیوەستن بەڕاستی Reality یەوە، یان بە دروستبوونی بابەتەکانی هوشیاری، وەلای نان یان خستنییە "بەینی دووکەوانە"وە، هەولیدا میتۆدێك بۆ وەسفێکی وردو درشتی جۆرە جیاوازەکانی بابەت لە ماهیەتی پەتیی خۆیاندا، دابمەزرێنێت. لێرەدا نامانەوێ بەوردی باسی ڕێبازی دیاردەناسی بکەین لای هۆسێرل. بەڵام تەنها پێویستە سەرنجی ئەوە بدەین کە کرۆکی ئەم ڕێبازە "وەسف"ە، لەبەرئەوەی وەسفێکی وردی ماهیەتی دیاردەمان بۆ دەکات بەو شێوەیەی کە بە هوشیاری دەدرێ. بۆ دڵنیابوونیش لە وردیی وەسفەکە پێویستە بەر لە هەموو شتێك هۆش لە تەواوی پێشگریمانەو پێشداوەرییەکان پاك بێتەوە. هەروەها پێویستە هۆش لە ناو سنووری وەسفدا بمێنێتەوەو بەرامبەر مەیلی چوون لە وەسفەوە بۆ ئەنجامگیری بەرەنگاری بکات.

کاتێکیش ئەم سەرنجانە ڕەچاو دەکەین بۆمان دەردەکەوێ کە دیاردەناسیی پەتی کارێکی گەلێك سەختە و پێویستی بە دیسپلینێکی ئەقلّیی ورد هەیە: مرۆڤ چۆن دەتوانێ دڵنیا بێت لەوەی کە توانیویەتی تەواوی پێشگریمانەکانی خۆی سەبارەت بە بابەتێك لە هۆشی خۆی دوور بکاتەوە؟ یان چۆن دڵنیابێت لەو حاڵەی کە تیایدا وەسف دەگاتە

کۆتایی و ئەنجامگیری یان لێکدانەوە دەستپێدەکات؟ لە ڕاستیدا "هۆسێرل" پەرەی بە میتۆدۆلۆژیایەکی سەخت و ئالۆز دا بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو دژواری و کۆسپانەی کە دێنەڕێی گەیشتن بە مەعریفەیەکی پەتی و ورد.

کارەکانی "هۆسێرل" کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیان لەسەر هەندێ فەیلەسووفی بوونگەرا کردووە. هەر بۆ نموونە هایدیگەر یەکێك بووە لە قوتابیەکانی لە زانکۆی فرایبۆرگ و کارە گەورەکەی خۆیشی، واتە "بوون و زەمەن"ی پێشکەش بە مامۆستا کۆنەکەی کردووە. بەڵام نە "هایدیگەر" و نە فەیلەسووفە بوونگەراکانی تریش فینۆمینۆلۆجییان بەو شێوەیە وەرنەگرت کە خۆی دەیوتەوە. بەڵکو بوونگەراکان پەرەیان بە جۆرێك لە فینۆمینۆلۆجی داوە کە خزمەتی مەبەستەکانیانی کردووە. لە ڕاستیشدا هۆسێرل ڕەخنەی لە چۆنێتیی بەکارهێنانی بیروڕاکانی گرتووە لای هایدیگەر.

سەربارى ئەمەش شێوازێکی گشتی لە وەسفکردنی میتۆدۆلۆژیانە هەیە کە دەکرێ ناوی بنێین وەسفی فینۆمینۆلۆجی، گەرچی دەشێ خاوەنەکەی هەرگیز هیچی هۆسێرلی نەخوێندبێتەوە. هەر بۆ نموونە بەڕای من زۆر شیاوە وشەی "فینۆمینۆلۆجی" بەسەر زۆر لە وەسفکردنە قووڵەکانی "کیرکەگۆر"دا دابڕین، گەرچی ئەم وەسفکردنانە بەر لە سەرهەڵدانی فەلسەفەکەی "هۆسێرل"ن.

جیاوازییەکی گەورەی تر لە نێوان هۆسێرل و بوونگەرا فینۆمینۆلۆژیستەکاندا ئەوەیە کە لە کاتێکا هۆسێرل جەخت لەسەر گرنگیی ماهیەت Essence دەکاتەوە و بڕوای وایە کە دیاردەناسی زانستێکی وردە، دەبینین کە بوونگەراکان جەخت لەسەر گرنگیی بوونی مرۆیی Existence دەکەنەوە. پێشتریش سەرنجی وتە بەناوبانگەکەی سارتەرمان دا کە دەڵێت: بوون پێش ماهیەت دەکەوێت، شتێکی ئاشکراشە ئەگەر ئەوە ڕاست بێت کە بوونەوەری مرۆیی خۆی ماهیەتی خۆی دەخوڵقێنێت، یان تەنانەت گەر ماهیەتی لە بوونیدا خۆی حەشاردابێت، هەروەکو هەندێ جار وا دەڵێن، ئەوا هەڵپەساردنی پرسیارکردن لە بوونی مرۆیی هیچ مانایەکی نابێت. لەسەرێکی تریشەوە بوونگەراکان لەگەڵ هۆسێرلدا

لەوەدا یەکدەگرنەوە کە ئەنجامگیریی ئەوەی پێی دەڵێن "شت لە ناوخۆیدا" لەودیو دیاردەوە شتێکی ئەستەمە، لەبەرئەوەی ئەوان ئەو دوالیزمە کانتییە ڕەتدەکەنەوە کە گریمانەی بوونی نۆمین "شت لە ناوخۆیدا"ی شاراوە دەکات، بەجۆرێك کە دیاردەکە بە تەنها ڕواڵەتێکی ئەو دەبێت و بەس. هەروەها ئەوان بایەخ بە هەوڵەکەی هیگڵ نادەن بۆ چۆنێتیی کەشفبوونی دیاردەکە بە شێوەیەکی دیالەکتیکی، (هەر چۆن کەمتر بایەخیان بە ڕۆحی پەنهانی پشت دیاردەکان داوە). ئەوانیش وەکو "هۆسێرل" ئەوەندەیان بەسە کە وەسفی دیاردەکە بکەن بەو شێوەیەی کە خۆی پیشاندەدات، لەگەڵ ئەمەشدا بوونگەراکان ڕقیان لەوە دەبێتەوە کە پەیڕەوی لە هەندێ ئاقاری ئایدیالیستی دەکەن کە لە فەلسەفەی هۆسێرلدا خۆیان خستۆتە ڕوو، ڕاستە هۆسێرل جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە هۆش هەمیشە "مەبەستگەرا **Intentional**" یە، واتە ڕاستەوخۆ بایەخ بە بابەتێك دەدات کە تێیدەپەڕێنێت، بەڵام هەوڵیشی داوە کە وا لە هۆش بکات هەموو شتەکان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت. هەروەکو دواتریش بەشێوەیەکی ڕوونتر بۆمان دەردەکەوێ، بوونگەراکان ئایدیالیزم **Idealism** ڕەتدەکەنەوە، لای ئەوان نابێ بابەتەکانی هوشیاری لەگەڵ هوشیاری بە بابەتەکاندا تێکەڵ بکرێ. ئەم تێکەڵکردنەش لەوێوە سەرچاوە دەگرێ کە بە هەڵە هۆشی بیرکەرەوە بکەین بە خاڵی دەستپێکردن لە فەلسەفەدا، نەك پانتایی فراوانی بوون.

ئێستاش با هەوڵبدەین بە شێوەیەکی کامڵتر لەو وەسفە بگەین کە فینۆمینۆلۆجیی بوونگەرایی دەیخاتە ڕوو. گەرچی ئێمە جەختمان لەسەر مۆرکی وەسفگەریانەی فینۆمینۆلۆجی کرد، بەڵام ئەمە بە هیچ کلۆجێك ئەوە ناگەیەنێت کە بەشێوەیەکی ئاسان و شێوازێکی سادە وەسفی هەر شتێك بکات کە دەخرێتە بەردەم هۆش. گرنگ ئەوەیە فینۆمینۆلۆجی وەسفێکی قووڵمان دەداتێ، گەر ئەم دەربڕینە ڕاست بێت، وامان لێ دەکات سەرنجی ئەو تایبەتمەندییانە بدەین کە عادەتەن لە تواناماندا نییە سەرنجیان بدەین، هەروەها ئەو کۆسپانەش لەناو دەبات کە ڕێ لە بینینمان دەگرن و، ئەوەی

گەوهەرییە دەیخاتە ڕوو نەك ئەوەی ڕووکەشە و، پەیوەندییە بە ناویەکداچووەکانی ناوەوەمان پیشاندەدات کە دەشێ بەرەو ڕایەکمان بەرێت زۆر جیاواز لەو ڕایەی کە پێی دەگەین کاتێ بە ئەبستراکتی سەیری دیاردەیەك دەکەین.

بەسەرنجدانی هەندێ لە ڕاکانی هایدیگەر و سارتەریش لەم بارەیەوە، دەتوانین زیاتر لەم تایبەتمەندییانەی فینۆمینۆلۆجی بگەین. هایدیگەر هەر بەو شێوازەی لە کتێبەکانیدا گرتوویەتیەبەر فینۆمینۆلۆجی شی دەکاتەوە: ئەو لە ڕیشەی زمانەوانیی وشەکە دەکۆڵێتەوە، وشەی فینۆمینۆلۆجی Phenomenology لە هەردوو وشەی یۆنانی Phainomenon فاینۆمینۆن و Logos لۆگۆس–ەوە هاتووە. وشەی Phainomenonیش لە فرمانی Pheinein وەرگیراوە کە بە مانای "دەریدەخات و دەیخاتە بەر ڕۆشنایی" دێت. ئەمەش فرمانێکە کە دەتوانین بۆ گەڕان بەدوای ڕەگوڕیشەیدا بگەڕێینەوە بۆ ڕیشەیەکی هیندو – ئەورووپی کە "فا – pha"یەو پەیوەستە بە چەمکی ڕۆشنایی و ڕوونییەوە. دیاردەش ئەو شتەیە کە دەردەکەوێ و دەکەوێتە بەر ڕۆشنایی. ئاشکراشە کە بەکارهێنانی ئەم وشەیە شێوەی جۆراوجۆری هەیە. ئێمە جاری وایە باسی "ڕواڵەتی پەتی mere appearance" دەکەین و مەبەستمان لێی ئەوەیە کە ئەوەی دەردەکەوێ بە جۆرێك لە جۆرەکان ناڕاست یا ناواقیعییە Unreal، بەڵام ڕاستی Reality یە کە پەنهانە. بێگومان هایدیگەر نکووڵی لەوە ناکات کە زۆر شت هەن زیاترن لەوەی کە "چاو دەیانبینێت". هەموو جۆرە ئەگەرێکی پەنهان بوون و شێواندن هەیە، دەبێ "بە زۆر" حەقیقەت لە دیاردەکان هەڵێنجین.

بەڵام ئەو ڕوون و ئاشکرا ئەو بیرۆکەیەی ڕەت دەکردەوە کە دەڵێت دەشێ لە پشت دیاردەکانەوە "شتێك لە خودی خۆیدا" هەبێت کە هەرگیز پێی ناگەین. چونکە ئەوەی دەتوانین بیزانین هەر دیاردەکانە وەکو ئەوەی لە خودی خۆیاندا خۆیان بەدەردەخەن.

کاتێ دەچینە سەر بەشی دووەمی وشەی فینۆمینۆلۆجی کە "Logos"ە، دەبینین هایدیگەر بۆمان ڕووندەکاتەوە کە ئەم وشەیەش هەر بە مانای "دەرکەوتن" دێ. وتن/

Legein مانای دەرکەوتنە apophainesthai. (بەم بۆنەیەوە وشەی یۆنانی "Phanai" کە مانای "دەڵێت"ە هەمان ڕیشەی هەیە کە فرمانی Phainesthai هەیەتی کە بەمانای "دەردەکەوێ" دێ و ئەویش "Pha"یە. چونکە وتن واتە چوونە دەرەوەی قسە بۆ ناو ڕووناکی). کاتێکیش "لۆگۆس" و "فاینۆمینۆن" پێکەوە کۆدەکەینەوە، دەگەینە ئاستی دووەمی دەرکەوتن، وتن دیاردەکە ڕووندەکاتەوە، بەجۆرێك کە فینۆمینۆلۆجی ڕێگە دەدات ئەو شتە ببینین کە خۆی دەخاتە ڕوو، وامان لـێ دەکات دوور لە کۆسپەکان دیاردەکە ببینین، سەرنجی بونیاد و ئەو پەیوەندییە بەناویەکداچووانە بدەین کە تا ئێستا پەنهان بوون یان نەکەوتوونەتە بەر ڕۆشنایی(١٤).

ژان پۆڵ سارتەریش وەکو هایدیگەر ئەو دوالیزمە ڕتدەکاتەوە کە دیاردە و "شتێك لەناو خودی خۆیدا"یەکی نهێنی ئامێز بەرامبەر بەیەك دادەنێت. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا دیاردە بە تەنها ئەو بەدەرکەوتنە بەشەکی (جزئی)یە نییە کە لەهەر ساتێکی دیاریکراودا دێتە بەرچاوم. بەڵکو دیاردە زنجیرەیەك دەرکەوتەی ڕێکوپێکە، لەگەڵ هەر دەرکەوتەیەکی بەشەکیشدا شتێك هەیە کە سارتەر ناوی دەنێت ئاماژەی "سەروو دیاردەیی" (یان ئاماژە بۆ پەیوەندیی نێوان دیاردەکان) Trance Phenomenal reference. لە کاتێکیشدا فەلسەفەی کانتی هەوڵی دەدا دیاردە Phenomenon وەکو ڕواڵەت appearance ێك بەڕاستی Reality یەکەوە ببەستێتەوە کە هەرگیز بەدەرناکەوێ، ئەوا ئەرکی فینۆمینۆلۆجی ڕوونکردنەوەی پەیوەندییە بونیادییە بەناویەکداچووەکانە لەو ساتانەدا یان لەو لایەنە دانسقانەدا کە دیاردەیان لـێ پێکدێ. چونکە "بوون"ی دیاردە لە هەر ڕواڵەتێکی بەشەکیی دیاردەکە گەورەترە، ئەرکی "ئۆنتۆلۆجیی فینۆمینۆلۆجی Phenomenological ontology"[*٧]یش پەردەهەڵماڵینە لەسەر ئەم بوونە(١٥).

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە فینۆمینۆلۆجی میتۆدێك نییە بۆ سەلماندن، بەڵکو ئەوەی دەبینرێ وەسفی دەکات. جگە لەوە دەشێ خەڵکە جیاوازەکان بە جۆری جیاواز شتەکان ببینن. هەڵبەتە ئامرازە تەکنیکیەکانی فینۆمینۆلۆجی و هەروەها گرنگیدان بە

ماهیەت و بونیادە گشتییەكان لە ڕادەی كاریگەریی پەسەندكردن و حەز و مەیلی تاكەكەسی (شەخسی) كەمدەكەنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمانەدا و بەتایبەتیش لە مەسەلەیەكی وا شەخسیدا كە دەمانەوێ فینۆمینۆلۆجی یەك بۆ بوونی مرۆیی بەدەستەوە بدەین، هاوكێشەی شەخسی لە وەسفكردن و هەڵوێستە شەخسیەكانی توێژەرەوەدا ئامادەگیی دەبێت.

بێگومان ئەمەش تاڕادەیەك جیاوازیی نێوان بوونگەراكانمان بۆ ڕوون دەكاتەوە. بەڵام سەرباری ئەمەش ئێمە تەسلیم بە مەیل و پەسەندكردنە تایبەتیەكانی فەیلەسووف نابین، فینۆمینۆلۆجی لەناو سنوورێكی دیاریكراودا، میتۆدێكی زانستیی متمانە پێكراومان پێ دەبەخشێت بۆ لێكۆڵینەوەی ئەم بابەتە سەرنجڕاكێشە، واتە: بوونی مرۆیی – Existence. چەند بە وردی پرنسیپەكانی فینۆمینۆلۆجی پراكتیك بكەین، ئەوەندە ئەگەرەكانی شێواندن و تاكبینی كەمدەبێتەوە. گەرچی فینۆمینۆلۆجی پشت بە بەڵگە و سەلماندن نابەستێ، ئەو ڕاستییەی كە ئیددیعای دەكات بە ڕووی تاقیكردنەوەدا كراوەیە، تاقیكردنەوەش واتە بەراوردكردنی ئەو وەسفەی كە فینۆمینۆلۆجی پێمان دەدات بە تێگەیشتنی ڕاستەوخۆمان بۆ بوونی مرۆیی، واتە ڕووبەڕووكردنەوەی وەسفی فینۆمینۆلۆجی بە دیاردەكان خۆیان بەو شێوەیەی كە لێیان نزیك دەبینەوە.

## ٥– جیاوازیی نێوان بوونگەرایی و هەندێ جۆری تری فەلسەفەی پەیوەست پێیەوە

شتێكی بەڵگەنەویستە كە سنووری جیاكەرەوەی نێوان بوونگەرایی و جۆرەكانی تری فەلسەفە زۆر ڕوون نییە، لەوانەیە هیچ فەیلەسووفێكیش ئەوەندە بە بوونگەراییەوە، بە مانا بەرتەسكەكەی، نەنووسابێت، بە ڕادەیەك كە نەتوانێ لەم خاڵەدا یان خاڵێكی تردا سنووری جیاكەرەوەی نێوان بوونگەرایی و بۆ نموونە كردارگەرایی (پراگماتیزم – Pragmatism) یان ئەزموونگەرایی (Empiricism) بشكێنێت. بەڵام لە ڕووی مەبدەئییەوە

دەتوانین هەندێ جیاوازی دابنێین و لە ئەنجامی ئەمەشەوە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی هەڵوێستی فەلسەفەی بوونگەرایی دیاری بکەین.

ئەو فەلسەفانەش کە پێدەچێ لەم خاڵە یان لەو خاڵەدا لە فەلسەفەی بوونگەراییەوە نزیك بن، بریتین لە: ئەزموونگەرایی، مرۆگەرایی (هیومانیزم Humanism) و ئایدیالیزم و پراگماتیزم و نیهیلیزم (هیچگەرایی – عەدەمیەت – Nihilism).

١–بە لێکۆڵینەوەی پەیوەندیی نێوان بوونگەرایی و ئەزموونگەرایی دەست پێ دەکەین. لەبەرئەوەی پێدەچێ ئەم دوو فەلسەفەیە لەم سەردەمەماندا باڵادەست بن. گەرچی لەبەر هەندێ هۆ کە دواتر باسیان دەکەین، بوونگەرایی لە بنەڕەتدا لە کیشوەری ئەورووپیدا گەشەی سەند، لە کاتێکا ئەزموونگەرایی لەو وڵاتانەدا بڵاوبۆوە کە ئینگلیزی زمانن. بوونگەراکان و ئەزموونگەراکان هەڵوێستێکی هاوبەشیان دژ بە ئەقڵانیەتی تیۆرەیی Speculative Rationalism هەیە کە لە سەردەمانی پێشتردا باو بوو. هەردوولایان متمانەیان بەو هەوڵانە نییە کە لە پێناوی دامەزراندنی فەلسەفەیەکی پێشوەخت apriori [*٨] دەدرێن و بگرە لەوەش زیاتر، هیچ هەوڵێك لە پێناوی دامەزراندنی ڕێبازی گشتگیر (یا سەراپاگیر)دا نایانورووژێنێت، بەڵکو لە پێناوی مەعریفەیەکی سنووورداردا هەوڵ دەدەن کە دەکرێ لەسەر بناغەی کۆمەڵێك پێدراودا بە دڵنیاییەوە دابمەزرێ.

بەڵام لێکچوونی نێوانیان لێرەدا کۆتایی دێت، فەیلەسووفی بوونگەرا بۆ ئەو پێدراوانە ڕوو لە ناوەوەی خۆی دەکات، لە کاتێکا فەیلەسووفی ئەزموونگەرای میانڕەو تاڕادەیەك بایەخ بە "ئەزموونی ناخ" دەدات، بەڵام فەیلەسووفی ئەزموونگەرای توندڕەو ئەزموون Experience بە هاوتای ئەزموونی هەستی Sense Experience دادەنێت و لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکانی بە ئاقاری جیهانی دەرەوەدا دەچێت، لای ئەو مرۆڤ دەبێ لە ڕێی سەرنجی ئەزموونگەرایانەوە بناسرێ، نەك لە ڕێی ئەزموونی خودییەوە. لەم خاڵەشدا بە ئاشکرا جیاوازیی نێوان بوونگەرایی و ئەزموونگەرایی دەردەکەوێ، وەکو دوو شێواز لە شێوازەکانی زانین (مەعریفە). بوونگەراکان جەخت لەسەر گرنگیی زانین لە ڕێی

بەشداربوونەوە دەکەن، بەڵام ئەزموونگەراکان لە ڕێی سەرنجدانەوە گرنگی بە زانین دەدەن، لەمەشدا فەیلەسووفی ئەزموونگەرا لافی ئەوە لێدەدات کە ئەو شێوە زانینەی ئەو هەوڵی بۆ دەدات خاوەنی بابەتێتی (مەوزوعیەت) و گشتگیرییە کە جۆرێك لە ڕاستی ودروستی Validityی پێ دەبەخشێت کە ئەمەش شتێکە ڕاپۆرتە خودییەکانی فەیلەسووفی بوونگەرا لێی بێبەشن. بەڵام فەیلەسووفی بوونگەراش لە وەڵامدا دەڵێت ئەوەندەی پەیوەندیی بە ناسینی مرۆڤەوە هەبێت، لانی کەم دەبینین کە ڕەهەندی ئەبستراکت و بابەتێتیی ئەزموونگەرایی، واقیعی زیندوو تێکدەشێوێنێت.

نیکۆلای بێردیاییڤ*[٩] بەتایبەتی ڕەخنەی ئاراستەی لایەنی بە بابەتیکردنی تێڕوانینی ئەزموونگەرایانە کردووە، وتوویەتی کە ئەوە ئەم ئەنجامانەی لێ دەکەوێتەوە: "نامۆبوونی بابەت لە خود، تووانەوەی هەرچی تاکەکەسی و شەخسییە و دووبارە نابێتەوە، لەناو ئەو شتە گشتییە و بەشێوەیەکی ناشەخسی گشتییە، هەروەها: سەروەرێتیی زەرورەت، حەتمیەتی دەرەکی، پێشێلکردنی ئازادی و ونبوونی. گونجان لەگەڵ شەقڵی گشتیی جیهان و مێژوو، هەروەها لەگەڵ مرۆڤی ئاسایی (مامناوەندی)داو، بەخشینی مۆرکێکی کۆمەڵایەتی بە مرۆڤ و بیروبۆچوونەکانی شەخسیەتی جیاوازی تاکە کەس.."[١٦].

هەڵبەت زۆر پێوەنان (موبالەغە) شتێکی زۆر ئاسانە، لێرەشدا سەبارەت بە ناکۆکی لەگەڵ بابەتێتیبوون Objectification موبالەغەکراوە، چونکە بەپێی پێویست ئەوەی لەبەرچاو نەگرتووە کە تێڕوانینی ئەزموونگەرایانەی بابەتیانە، تەنانەت سەبارەت بە مرۆڤیش، لە سنوورێکی دیاریکراودا لایەنی باشی خۆی هەیە. بەڵام بە دڵنیاییەوە بێردیاییڤ لەوەدا لەسەرهەق بووە کە سوور بووە لەسەر ئەوەی ئێمە پێویستمان بە زیاتر لە تێڕوانینی ئەزموونگەرایانە هەیە، ئەو بڕوای وایە کە تێگەیشتنی بوونگەرایانە بۆ مرۆڤ هەندێ مەسەلە ڕەچاودەکات کە بەسەر لایەنگرانی ئەزموونگەرایی پەتیدا تێپەڕیون: "وەك هەست و سۆز و بەشداریکردنی ویژدانیانە و خۆشەویستی و – زاڵبوون بەسەر نامۆبووندا و

شەخسگەرایی و دەربڕینی مۆرکی تاکەکەسی و تایبەتیی هەر بوونەوەرێکی مرۆیی و، پەڕینەوە بۆ جیهانی ئازادی و دیاریکردنی شتەکان لە ناوەوە و، زاڵبوون بەسەر زەرورەتی کۆیلەساز و، باڵادەستیی چۆنێتی بەسەر چەندێتیداو، داهێنان بەسەر شوێن پێ هەڵگرتندا.."(١٧).

ئەم باسەش یارمەتیمان دەدات تا جیاوازیی نێوان شیکردنەوە بوونگەراییە جۆراوجۆرەکان و ئەنجامەکانی هەندێ زانستی ئەزموونگەرای وەکو: دەروونناسی و کۆمەڵناسی ببینین. ئەم زانستانە پشت بەو پێدراوانە دەبەستن کە قابیلی سەرنجدانن، بەڵام فەیلەسووفی بوونگەرا بە درێژایی توێژینەوەکانی لەبەر ڕۆشنایی شیکردنەوەی فینۆمینۆلۆجیدا کاردەکات بۆ ئەو بوونەی کە تێیدا بەشدارە، لەبەرئەوەی ئەو لە مرۆڤ ناکۆڵێتەوە بەو سیفەتەی حاڵەتێکی ئەزموونگەرایانەیە لە حاڵەتەکانی بوونی مرۆیی، بەڵکو ئەو بایەخ بە بوونی مرۆیی دەدات بەو شێوەیەی کە لە بونیادە بنەڕەتییەکەیدایەتی. ئەم هەڵوێستە نائەزموونگەرانەیەی فەیلەسووفی بوونگەراش لەوەدا ڕەنگدەداتەوە کە زۆربەی کات بەشێوەیەکی گشتی قسە لەسەر "مرۆڤ" ناکات، بەڵکو هەندێ زاراوەی ئۆنتۆلۆژیی دەداتە پاڵ، وەکو زاراوەی "دازاین Dasein"*[١٠] (واتە بوون لێرە یان لەوێ) لای هایدیگەر و، "بوون بۆ خۆی" (یان بوون لە پێناوی خۆیدا) Pour - Soi لای سارتەر.

٢–ناتوانین بڵێین ڕێبازی مرۆگەرایی – هیومانیزم Humanism بە مانای وشە فەلسەفەیە، بەڵام بەهەرحاڵ یەکێکە لە ئاقارە باوەکانی ئەم سەردەمەمان. کەواتە دەبێ پەیوەندیی بوونگەرایی بە مرۆگەراییەوە چی بێت؟ سارتەر لە لێکچەر (موحازەرە)ە بەناوبانگەکەیدا، واتە: "بوونگەرایی مرۆگەراییە"Existentialism is a Humanism ئەم پرسیارەی خستۆتە ڕوو. ئەمەش پرسیارێکە کە ناتوانین هەروا بە ئاسانی وەڵامی بدەینەوە، لەبەرئەوەی زاراوەی "مرۆگەرایی" پتر لە مانایەکی هەیە. گەرچی بوونگەرایی بە مانایەکی دیاریکراو ڕێبازێکی مرۆگەرایە، بەڵام من لەو بڕوایەدا نیم بە مانایەکی دی ڕێبازێکی مرۆگەرا بێت. بوونگەرایی ڕێبازێکی مرۆگەرایە بەو مانایەی کە بایەخێکی زۆر بە

بەها مرۆیی و شەخسیەكان دەدات، هەرچۆن گرنگی بە وەدیهێنانی بوونی مرۆیی ڕەسەن — authentic دەدات و، ئەمەش زۆر بە ڕوونی لە لێكچەرەكەی سارتەردا دەردەكەوێ، گەرچی ئەوە ڕوون نییە كە ئەو چۆن لە ئاوات و خۆزگەكانی تاكەكەسەوە بەرەو جۆرێك لە بەرپرسیارێتیی دەستەجەمعی دەپەڕێتەوە. خۆ ئەگەر گریمان ئەوە شتێكە دەشێ ڕوویدات، ئەوا بە ئاسانی لەگەڵیدا هاوڕا دەبین و — لە ڕاستیشدا دەبێ لافی ئەوە لێبدەین — كە فەلسەفەی بوونگەرایی بەو مانا فراوانەی وەسفمان كرد، ڕێبازێكی مرۆگەرایە. هەروەها ئەمە بەسەر فەلسەفە بوونگەراییەكەی "بێردیاییڤ"یشدا دەچەسپێ كە پێشتر چەند بڕگەیەكی وتەكانیمان پوخت كردەوە.

بەڵام "مرۆگەرایی" مانایەكی تریشی هەیە. ڕۆجەر شین Roger shinn جیاوازییەكی سوودمەندی لە نێوان "مرۆگەرایی كراوە" و "مرۆگەرایی داخراو"دا خستۆتە ڕوو(١٨). مرۆگەرایی كراوە ئاماژەیە بۆ هەوڵدان لە پێناوی وەدیهێنانی بەها مرۆییەكان لە جیهاندا و بۆ ئەمەش مرۆگەراییەكەی بێردیاییڤ بە نموونە دەهێنێتەوە. بەڵام مرۆگەرایی داخراو مانای دی لە خۆ دەگرێت، لەوانە ئەوەیە كە مرۆڤ تاقە خولقێنەری مانا و بەهایە لە جیهاندا. ئاشكراشە كە سارتەر پەیڕەویی لەم جۆرە بێباوەڕییە كردووە، هەر بۆیەشە جەخت لەسەر ئەوە دەكات كە بوونگەرایی ڕێبازێكی نائایینییە، بوونگەرایی لای ئەو ڕێبازێكی بێ ئایینە، لەبەرئەوەی مرۆڤ دراوەتە دەست خۆی تا ئەو بەهایانەی دەیەوێ، لە جیهاندا بیانخولقێنێت و بەدییانبهێنێت.

بەڵام ئاخۆ دەكرێ بەم مانا تەسكەی دووەم تەواوی فەلسەفە بوونگەراكان بە مرۆگەرا لەقەڵەم بدەین؟ لێكچەرەكەی سارتەر وەڵامێكی بۆ ئەم پرسیارە تیایە كە لە "نامەیەك دەربارەی مرۆگەرایی"ی هایدیگەرەوە وەرگیراوە. هایدیگەریش هیچی كەمتر نییە لە جەختكردنیدا لەسەر بەرپرسیارێتیی مرۆڤ لە ڕووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ ئایندەیەكی كراوەدا. بەڵام ئەوەی كە هایدیگەر بەرگری لێ دەكات مرۆگەرایی كراوەیە نەك مرۆگەرایی داخراو، كە تیایدا ژیانی مرۆڤ دەچێتە پانتاییەكی فراوانتری بوونەوە. مرۆڤ بوونی گشتی

Being دروست ناکات، بەڵکو بوونی مرۆیی Existence خۆیشی لەم بوونە گشتییەوە وەردەگرێ و دەبێتە بەرپرسیار لەم بوونەو بەرامبەر بە بوون، بەر لەوەش کە بدوێت دەبێ بوون بیدوێنێت(١٩). لێرەدا پێویستمان بەوە نییە بەلای یەکێك لەم دوولایەنەدا بیشکێنینەوە، بەڵام دەتوانین ئەو تێبینییە بخەینە ڕوو کە وێڕای ئەوەی بوونگەرایی مرۆگەراییە بە مانای فراوانی ئەم وشەیە، بەڵام هەمیشە یان بە پێویست ڕێبازێکی مرۆگەرای داخراو نییە.

٣-ئێستاش دێینە سەر پەیوەندیی نێوان بوونگەرایی و ئایدیالیزم. بەر لە هەموو شتێك دەبێ وریا بین نەکەوینە هەڵەیەکی زۆر سادەوە. لەبەرئەوەی بوونگەراکان وشەی بوون Existence بەشێوەیەکی سنووردار بەکاردەهێنن، بە جۆرێك کە تەنها بەسەر ئەو شێوەیەی بووندا دەچەسپێ کە لە بوونی مرۆییدا دەیناسین. ئەمەش هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت کە بەتەنها مرۆڤ بوونێکی ڕاستەقینەیە — Real، ئەمەشمان بە چەند ڕستەیەکی هایدیگەر بۆ ڕووندەبێتەوە کە دەڵێت: "ئەو بوونەی کە شێوەی بوونی، بوونە لە دەرەوەی خودی خۆیدا (واتە بوونی کراوە Existence*١١)، مرۆڤە. چونکە بە تەنها مرۆڤ بەم مانایە بوونی هەیە، تاشەبەرد هەیە، بەڵام بوونی ئەو وەکو بوونی مرۆڤ نییە، هەروەها درەخت و.. ماین و.. فریشتە هەن، بەڵام نەك وەکو بوونی مرۆڤ، خواش هەیە، بەڵام نەك وەکو بوونی مرۆڤ. ئەو دەستەواژەیەی کە دەشڵێت "بە تەنها مرۆڤ لە دەرەوەی خودی خۆیدا هەیە" هەرگیز مانای ئەوە نییە کە بە تەنها مرۆڤ بوونێکی ڕاستەقینەی هەیە و بوونەوەرەکانی دی ناڕاستەقینەن Unreal، یان بریتین لە وەهمی مرۆڤ یان وێناکردنی"(٢٠). وشەی بوونی هەیە Exist، بوونگەراکان بە مانایەکی تایبەتی بەکاری دەهێنن، کە لە بەکارهێنانە سوننەتیەکەی جیاوازە. هەر بۆیە کە دەڵێن بە تەنها مرۆڤ بوونی هەیە، ئەم قسەیە زۆر دوورە لە هەموو جۆرێکی ئایدیالیزمی خودی*١٢.

بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە کە بوونگەرایی و ئایدیالیزم بەو شێوەیەی کە پێشتریش ئاماژەمان پێدا جیاوازییان هەیە. خۆ ئەگەر ئەوە ڕاست بێت کە ئەم دوو فەلسەفەیە، دوو

فەلسەفەی خودی مرۆیین پتر لەوەی هی بابەت بن، ئەوا ئەوەش ڕاستە كە بڵێین فەیلەسووفی ئایدیالیست لە مرۆڤەوە دەستپێدەكات بەو سیفەتەی كە خودێكی بیركەرەوەیە، لە كاتێكا فەیلەسووفی بوونگەرا لە بوونی مرۆڤەوە لەناوجەرگەی جیهاندا دەستپێدەكات.

هەروەها فەیلەسووفی ئایدیالیست (ئەگەر بۆمان هەبێت بەشێوەیەكی كاتی ئەم ناوەی بەسەردا دابڕین) لە بیروباوەڕەكانەوە دەستپێدەكات، لە كاتێكا فەیلەسووفی بوونگەرا دەڵێت كە ئێمە لە شتەكان خۆیانەوە دەستپێدەكەین. سارتەر لە ڕەخنەگرتنیدا لە ئایدیالیزمەكەی باركلی*[١٣] دەڵێت: "مێز لە هوشیاریمدا نییە، لە توانای وێناكردنیشیمدا نییە، مێز لە شوێندا هەیە، یەكەمین هەنگاوی ڕەوتی فەلسەفی دەبێ دووركردنەوەی شتەكان بێت لە هوشیاری، پاشان سەرلەنوێ بەستنەوەی ڕاستەقینەی بەجیهانەوە و هەروەها زانینی ئەوەی كە هوشیاری بریتییە لە هوشیاری بە جیهان بەو شێوەیەی لە پێگەی تایبەتیی خۆیدایەتی.."[٢١] بەمانایەكی دی هەموو هوشیارییەك مەبەستگەرایە و بەرەو بابەتێكی دەرەوەی ئەو هوشیارییە ئاراستەكراوەو، ڕواڵەت (یان دەركەوتە) شتێك نییە پەیوەست بێت بە هوشیارییەوە، بەڵكو شتێكە پەیوەستە بە دیاردەیەكی بابەتییەوە.

بەمجۆرە دەبینین كە وێڕای جەختكردنەوەكانی بوونگەرایی لەسەر گرنگیی خودی مرۆیی، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە بە هەمان ڕێگای ئایدیالیزمدا دەڕوات. بوون دەبێت ڕووبەڕووی جیهانی واقیعی و ڕاستەقینە بێتەوە.

٤-هەر كەسێك وتارە بەناوبانگەكەی "ولیەم جەیمس"ی خوێندبێتەوە كە ناوی "خواستی بڕوا"یە، قورسە گومان لەوە بكات كە لە نێوان بوونگەرایی و كردەوەگەرایی (پراگماتیزم)*[١٤]دا پەیوەندیی توندوتۆڵ هەیە. هەردووكیان لەگەڵ ئاقاری ئەقڵانیی ئەبستراكتدا ناكۆكن و، جەخت لەسەر گرنگیی پەیوەندیی نێوان بڕواو كردەوە دەكەنەوە. هەردوولاشیان دان بە ڕیسك (مخاطرە)ی ئیماندا دەنێن وەكو هەڵوێستێك كە ناچار دەبین

بە گوێرەی ئەو و لەسەر بنەمای پێداویستییەکانی بوون بڕیاربدەین، بەر لەوەی بگەینە هەندێ بنچینەی تیۆری بۆ ئەو بڕیارەی کە داومانە، هەردوولاشیان ڕادەی وەدیهێنانی مرۆڤایەتیمان یان کەمکردنەوە لێی لەڕێی ئیمانەوە، دەکەن بە بنچینەیەك بۆ جەختکردنەوە لەسەر ئیمان یان ساختەکردنی.

بەڵام سەربارى ئەم خاڵە هاوبەشانەی نێوان بوونگەراکان و کردەوەگەراکان، جیاوازیی قووڵیش لە نێوانیاندا هەیە. پێوەری ڕاستی لای کردەوەگەرا پێوەری بایۆلۆجی و سوودخوازانەیە و ئەو هەستە قووڵەی ناوەوە کە لای بوونگەراکان هەیە، لای ئەم زۆر کەمە. جگە لەوە عادەتەن فەیلەسووفی پراگماتیست (کردەوەگەرا) فەیلەسووفێکی گەشبینە و گرنگی بە سەرکەوتن دەدات لە زۆر مەسەلەدا و زۆر کەم هوشیاریی بەو لایەنە تراژیکەی ژیانە کە لە کارەکانی بوونگەراکاندا گوزارشتی لـێ دەکرێ.

بێردیاییڤ بە ڕوونی ئاماژە بۆ جیاوازیی نێوان ئەم دوو فەلسەفەیە دەکات. ئەو دوای ئەوەی کە دان بەوەدا دەنێت کە فەیلەسووفی پراگماتیست لەسەر هەقە وەختێ دەڵێت ڕاستی ئەرکێکی ژیانییە، هەروەها دان بەوەشدا دەنێت کە ئەم پێوەرە کاتێك قبووڵ دەکرێ کە مامەڵە لەگەڵ کێشە زانستی و تەکنیکییەکان Technicalدا دەکەین. بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دژی پراگماتیزمە، لەبەرئەوەی گەشەسەندنی زیندووی شتەکان و، سەرکەوتن و سوود، هەموو ئەمانە پتر نیشانەی درۆن تا ڕاستی. شتێکی بەڵگەنەویستە کە ڕاستی شتێکی سوودمەندو بەکەڵك نییە لەم دونیایەدا، ڕاستی هیچ خزمەتێکی لـێ ناوەشێتەوە، بەڵکو لەوانەیە تێکدەر و وێرانکەری ڕێکوپێکیی شتەکان بێت لەم جیهانەدا، ڕاستی پێویستی بە قوربانییە و تەنانەت دەشێ ببێتە مایەی شەهیدبوونیش"[٢٢].

لە ڕاستیدا هەندێ فەیلەسووفی بوونگەرا هەن کە لە جۆرێك لە جۆرەکانی پراگماتیزم نزیك بوونەتەوە. دەشێ هەندێ برگەی نووسینەکانی ئۆنامۆنۆی[*١٥] فەیلەسووف هەبن کە بشوبهێنە سەر پراگماتیزم، بەڵام دەبێ ئەم برگانە لە پەنا توخمە خودییە عاتیفیەکانی

ئەودا و تێگەیشتنی ئەودا بۆ تراژیدیا لە فەلسەفەکەیدا دابنرێن. هەرچۆن "خۆزێ ئۆرتیگا ئی گاسێت"[*١٦]ی هاونیشتمانیشی لە پراگماتیزم نزیك دەبێتەوە و هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هەواداریێتیی ئەو بۆ ئاقاری ژیانگەرایی Vitalistic کە وای لێ کرد زانست و کەلتوور پێکەوە بە "ئامرازی ژیان"[(٢٣)] لەقەڵەم بدات. بەڵام هەستکردنی "ئۆرتیگا" بە قەیران و بەسەرچڵیی شۆڕشگێڕانە، ئەوی خستە ڕیزی بوونگەراکانەوە.

ڕادەی نزیکبوونەوەی بوونگەراکان لە پراگماتیستەکان هەرچەندێ بێت، بەڵام ئەوەی لەوانیان جیادەکاتەوە ئەوەیە کە فەیلەسوفە بوونگەراکان بایەخ بە چڕیی ژیان و بگرە بە چڕییە تراژیکەکەی ژیانیش دەدەن، زیاتر لە بایەخدان بە فراوانکردن و سەرکەوتووییە دەرەکیەکانی.

٥-عادەتەن بوونگەراکان لە زۆر بواردا دژ بە دۆخی باو یاخی دەبن: لە لاهوت و سیاسەت و ئاکار و ئەدەبدا، هەروەها دژ بە دەسەڵاتە باو و یاسا و نەریتە باوەکان دەجەنگن. تەنانەت بوونگەرا مەسیحیەکانیش بە دەگمەن میانڕەون. ئەوەبوو کیرکەگۆر لە کۆتایی ژیانیدا هێرشێکی توندی کردە سەر دۆخی کڵێسای دانیمارکی لەو ڕۆژگارەدا. زۆربەی توێژەرەوانیش بڕوایان وایە کە ئەم قۆناغەی کۆتایی ژیانی لادانێك نەبوو لە بیرکردنەوەیدا، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەنجامێکی مەنتیقیی بیرکردنەوە سەرەتاییەکانی بوو. بەڵام بوونگەرا نائاینییەکان لە یاخیبوونیاندا بەرەو ئاسۆی زۆر دوورتر ڕۆیشتن، تا ئەو ئەندازەیەی کە هەندێ جار "هایدیگەر" و "سارتەر" و "کامۆ" یان بە نیهیلیست (عەدەمی) لە قەڵەم داوە[*١٧]. بەڵام ئاخۆ بوونگەرایی جۆرێکە لە نیهیلیزم..؟

لەو بڕوایەدام کە ژمارەیەکی زۆر کەم لە خەڵك دانیان بەوەداناوە کە نیهیلیستن، باوەڕیشم وایە کە هەمیشە نیهیلیزم لەسەر هەڵوێستێکی پۆزەتیڤی دیاریکراو دەوەستێت کە بە ئاشکرا ڕەتدەکرێتەوە.

پێدەچێ بیرۆکەی نیهیلیزمی تەواو بیرۆکەیەکی دژ بە خۆی بێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین حاڵەتێك لە نامۆبوون بەرامبەر بە سیستمی باو بهێنینە بەرچاو کە لە توندڕەویدا

لە نیهیلیزم نزیك دەبێتەوە. ڕۆمانەکەی تۆرگنێڤ "باوکان و کوڕان" یەکەم کار بوو کە زاراوەی نیهیلیزمی لەسەر ئاستێکی گشتی بڵاوکردەوە. نیچە ئەم کارەی بینیوە. ئەم ڕۆمانە باسی قوتابییەك دەکات کە ناوی "بازارۆڤ"ەو تا ڕادەیەکی زۆر نیهیلیستە، کە نکوولّی لە هەموو شتێك دەکات. بازارۆڤ چ لە هونەر و سیاسەتدا و چ لە ئاییندا، نکوولّی لە هەموو بەهاکان دەکات. جگە لەوەش ئەو دەڵێت کە ئەوەی لەسەر ئەو پێویستە بە تەنها نکوولّیکردنە و، ناچار نییە هیچ شتێکی بیناکەر لە جێی ئەو شتانە دابنێت کە دەیانڕووخێنێت. بەڵام سەرباری ئەمەش پێدەچێ "بازارۆڤ" بڕوای وابووبێت کە نیهیلیزم دۆخێکی تێپەڕ یا کاتییە، هەڵوێستێکی پێویستە بۆ پاکسازی لە بناغە و بنچینەکاندا، بەڵام دوا وشە نییە: "لە ئێستادا، پێدەچێ سوودمەندترین ئامراز نکوولّیکردن بێت، بۆیە پێویستە لەسەرمان نکوولّی بکەین!!"

پێمولیە ئەو فەیلەسووفە بوونگەرایانەی لە نیهیلیزم نزیك بوونەتەوە دانیان بە مۆرکە کاتییەکەیدا ناوەو هەوڵیانداوە تێیپەڕێنن. بەڵام "نیچە" بڕوای وابوو کە خۆرئاوا گەیشتووەتە قۆناغێکی نیهیلیستی، گەرچی ئەو بە قووڵی ئەفسووسی بۆ ئەو ڕاستییە دەخوارد، بەڵام ئەوانی تر دەیانوت کە نیچە خۆیشی کەوتۆتە ناو چنگی ئەو نیهیلیزمەوە. بە دڵنیاییشەوە ئەو بە دوای ڕێگایەکدا دەگەڕا تا لەو نیهیلیزمە قوتاری بکات: "ئەو خۆی دەیزانی کە وەکو نیهیلیستێك تاوانباری دەکەن، بەڵام ئەو بڕوای وابوو کە ئەم جیاوازە، لەبەرئەوەی نیهیلیزم تا دوا ئەنجامەکانی دەبات و بەوەش بەسەریدا زاڵ دەبێت"[٢٤]. ژان پۆل سارتەریش بە دوای کەنارەکەی تری نائومێدیدا دەگەڕا، لە کاتێکا ئەلبێر کامۆ دانی بەوەدا نا کە پێویستە بە دوای ئەو هۆیانەدا بگەڕێین کە بەرەو تێپەڕاندنی پووچی و نامەعقول **Absurdity**مان دەبەن. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا ڕەنگە هەموو ئەم فەیلەسووفانە بڵێن کە تا نکوولّیی تەواو لە بیروباوەڕو پێودانگە باوەکان نەکرێ، توانای تازە نایەتە ئاراوە، سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنەوەی بەهاکان نایەتەدی.

بەهەمان شێوە بوونگەرا مەسیحیەكانیش هەندێ جار شۆڕش دژ بە شێوە سوننەتییەكانی ئیمان بەرپادەكەن، دەڵێن كە ئیمانی نوێ نایەتە ئاراوە تا نكووڵی لەو شێوە سوننەتییانە نەكرێ و ڕەت نەكرێنەوە و بە ئەزموونێكی پڕ ئازاردا تێنەپەڕن كە تیایدا هیچ شتێك بۆ ئیمان نامێنێتەوە. بەمجۆرە تاكی مەسیحیش ئەگەری ئەوەی لەبەردەمدا دەبێت كە بە شێوەیەكی ڕیشەیی بەهاكان هەڵبسەنگێنێتەوە، ئەم كارەش دەشوبهێتە سەر ئەزموونی تاكی نیهیلیست.

هەڵبەت هەندێ ڕێبازی "نیمچە بوونگەرا"ش هەن كە زێدەڕۆیی لە "ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ عەدەم"دا دەكەن، بێگومان زۆر جار یاخیبوونی ساویلكانەش دژ بە كەلەپوور ڕوویداوە. بەڵام وروژاندنی پرسیار و ئامادەگی بۆ گومانكردن لە ناودڵی هەڵوێستی بوونگەراییەوە لەو حاڵەتانەشدا كە دواجار ئیمان سەرچاوە دەگرن و سەرهەڵئەدات، ئەو ئیمانە ئیمانێكی بەهێز دەبێت، لەبەرئەوەی پێشتر ئەم ئیمانە لە قووڵایی نشێوی نیهیلیزم ڕاماوە.

## پەراوێزەکان:

[١*] Dualism ئەو ڕێبازەی کە دەڵێت دونیا لە دوو توخم یا دوو گەوهەر پێك دێ کە ناتوانین بۆ یەکتریان بگەڕێنینەوە، وەکو: چاکە و خراپە، یان ماددە و ڕۆح، یان هزر و کشان لای دیکارت.

[٢*] هاسید Hassid: تیرەیەکن لە جوولەکە لە سەدەی دووەمی زایینیدا ژیاون و دژایەتیی کەلتووری یۆنانییان دەکرد و خۆیان تەرخانکردبوو بۆ بەجێهێنانی دەقاودەقی یاسا و شەریعەتەکانی یەهود.

[٣*] پاپا بیوسی دوانزدەهەم کە لە ساڵی ١٩٣٩ەوە پاپای ڕۆما بوو و هەروەها لە کاتی دووەمین شەڕی جیهانیدا کە زۆر هەوڵیدا ڕوونەدات، بەڵام هەوڵەکانی بێسوود بوون. لە ساڵانی ٤٣ و ٤٧ دا گەلێ بڵاوکراوەی دەرکرد، پاشانیش لە ساڵی ١٩٥٠دا ئەم بڵاوکراوەیەی دەرکرد کە گەلێ بیروبۆچوونی موحافەزەکارانە لە خۆی دەگرێت. لە ساڵی ١٩٥٨ دا کۆچی دوایی کرد.

[٤*] تەوژمێکی فەلسەفیی دینییە لە ساڵانی کۆتایی سەدەی ١٩ و سەرەتاکانی سەدەی ٢٠ دا لە فەرەنسا و ئەمریکادا سەریهەڵداو پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە "تاکە کەس" حەقیقەتی بنەڕەتی و یەکەم توخمی ڕۆحییە لە بووندا.

[٥*] فەیلەسووفی ئەڵمانی کانت (١٧٢٤–١٨٠٤) بڕوای وایە کە هۆشی ئادەمیزاد بە تەنها دەرك بە ڕواڵەتی شتەکان دەکات، ئەگینا سروشتی ئەم شتانە وەکو ئەوەی هەن (واتە شتەکان لە خۆیاندا)، پەی پێبردنیان ئەستەمە.

[٦*] هۆسێرل، فەیلەسووفێکی ئەڵمانییە (١٨٩١–١٩٣٨) ڕێبازی فینۆمینۆلۆجیی دامەزراند کە دەیویست فەلسەفە بکاتە زانستێکی ورد لە ڕێی دەستپێکردنێکی بێلایەنانەوە، یان وەلاوەنانی گشت زانیارییەکانی پێشوو و وەسفکردنی ماهیەتی دیاردەکە وەکو ئەوەی کە هۆش دەیبینێت.

*[٧] ئەمە ناونیشانی لاوەكیی كتێبە بەناوبانگەكەی سارتەرە، واتە "بوون و نەبوون: گوتارێك لەسەر ئۆنتۆلۆجیی فینۆمینۆلۆجی" كەوا لە بوون دەكۆڵێتەوە بەو شێوەیەی كە دەردەكەوێ، واتە سروشتێكی تری شاراوە نییە لە پشت ئەم ڕواڵەتەوە. بەمجۆرە ئەم وەسفكردنەش دەبێتە وەسفكردنێكی "ئۆنتۆلۆجی" بەو پێیەی دەربارەی بوونە، بەڵام ئۆنتۆلۆجییەكی فینۆمینۆلۆجی (دیاردەگەرا)یە بەو پێیەی كە بوون شتێكی تر نییە جگە لەو ڕواڵەتە.

*[٨] apriori واتە فەلسەفەیەك كە لە بیروبۆچوونەكانیدا بە تەنها پشت بە ئەقڵ ببەستێت، وەكو هەندێ فەلسەفەی ئایدیالیست كە پشت بە ئەزموون نابەستن و بەڵكو پشت بە مەعریفەیەك دەبەستن كە بەر لە "ئەزموون" بەدەست دێ. لە ڕێبازی "ئەزموونگەرا"ش جیاوازە كە پشت بە مەعریفەی پاشوەخت Aposteriori دەبەستێت، كە "پاش" ئەزموون بە دەست دێ.

*[٩] نیكۆلای بێردیاییف، فەیلەسووفێكی ڕووسیی بوونگەرایە (١٨٧٤–١٩٤٨) كە ویستی بوونگەرایی و دین لەگەڵ یەكدا بگونجێنێت. لە گرنگترین كتێبەكانی: "من و جیهانی شتەكان"، "ئەزموونی میتافیزیكای ئەو دنیایی"، "فەلسەفەی نایەكسانی".

*[١٠] دازاین زاراوەیەكە وەرگێڕانی ئاسان نییە، هیگڵ و هایدیگەر و زۆری تریش بەكاریانهێناوە. ئەم زاراوەیە لە دوو بڕگە پێكدێت: "Sein" واتە "بوون"، "Da" واتە "لێرە یان لەوێ" و دەلالەت لە بوونی بەشەكیی دیاریكراو دەكات، بۆ نموونە وەكو بوونی مرۆیی تاك.

*[١١] Existence، بوونگەراكان ئەم زاراوەیە بە مانا وەرگێراوە ئەسڵیەكەی بەكاردەهێنن كە لە دوو بڕگە پێكدێت، Ex واتە دەرەوە، Sistere واتە دەوەستێت، واتە ئەو بوونەی دەچێتە دەرەوەی خودی خۆی، واتە ئەو بوونەی كۆمەڵێك ئیمكاناتی پێیە كە لە ئایندەدا بەدییاندەهێنێت، ئەمەش بە مانا ڕاستەقینەكەی ئەم وشەیە بوونی مرۆیی دەگرێتەوە.

*[١٢] ئایدیالیزمی خودی، ڕێبازێكی فەلسەفییە كە دەڵێت ئێمە ناتوانین دان بەوەدا بنێین كە لە دەرەوەی چالاكیی مرۆڤ و وەسیلەكانی زانینیدا، جیهانێكی بابەتیی سەربەخۆ هەیە.

*[١٣] جۆرج باركلی (١٦٨٥–١٧٥٣) فەیلەسووفێكی ئایدیالیستی خودیی ئینگلیزە، دەیوت كە بوونی شت واتە یەكێك هەیە كە دەركی پێ دەكات، ئیدی ئەو یەكەیان ئەقڵی ئادەمیزادە یان ئەقڵی یەزدان.

*[١٤] پراگماتیزم Pragmatism ڕێبازێکی فەلسەفیی باوە لە ئەمریکادا و بەهای ڕاستگۆیی لە سوودە کردەییەکەیدا دەبینێتەوە و ناوی ڕێبازەکەش لە وشەیەکی یۆنانیەوە وەرگیراوە کە (pragma) یەو واتا کار.

*[١٥] میگیل دی ئۆنامۆنۆ ١٨٦٤–١٩٣٦ فەیلەسووفێکی بوونگەرای ئیسپانییە کە لە ژێر کاریگەریی بوونگەراییەکەی سۆرین کیرکەگۆردا بوو.

*[١٦] ئۆرتیگا ئی گاسێت (١٨٨٣–١٩٥٥) فەیلەسووفێکی بوونگەرای تری ئیسپانییە کە بایەخی بە کێشەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەدا، لە نووسینەکانی: "داڕمانی هونەر" ١٩٢٥، "یاخیبوونی جەماوەر" ١٩٢٩،

"کۆمەڵگای گەلە" کە مەبەستی لە هەرەسی دیموکراسی و بڵاوبوونەوەی بیرۆکراسی بوو.

*[١٧] لە وشەی لاتینیی "Nihil"ەوە وەرگیراوە کە بە مانای نەبوون (عەدەم) یان هیچ دێ. نیهلیزمیش جۆری هەیە، لەوانە ئەو فەلسەفەیەی کە دان بە هیچدا نانێت و دەڵێت هیچ شتێك نییە، وەکو ئەوەی گۆرگیاسی سۆفیست کردی، یان نکووڵی لە بەهاکان دەکات وەکو لای نیچە دەیبینینەوە، هەروەها نیهلیزمی سیاسی کە بە مانای وێرانکردنی دۆخە سیاسی و کۆمەڵایەتییە گەندەڵەکان، بەبێ بیرکردنەوە لە سیستمی ئەڵتەرناتیڤ، ئەمەش هاوواتای ئەنارشیزم (ئاشووبگەرایی)ە.

# بەشی دووەم

## بوونگەرایی و مێژووی فەلسەفە

١–لێکدانەوەی ئەفسانە و سەرهەڵدانی خودناسی.

٢–فەلسەفەی دێرین.

٣–لە سەرهەڵدانی مەسیحیەتەوە تا سەدەکانی ناوەڕاست.

٤–ڕیفۆرمی ئایینی، ڕینێسانس، چاخی ڕۆشنگەری.

٥–بوونگەرایی نوێ– سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم.

## ١–لێکدانەوەی ئەفسانە و سەرهەڵدانی خودناسی

گەرچی بوونگەرایی لە شێوە پەرەسەندووەکانیدا، دیاردەیەکە سەر بە چاخە نوێیەکانە، بەڵام ئێمە دەتوانین لە مێژوویەکی دوورتردا بە دوای ڕەگوڕیشەکانیدا بگەڕێین، چ لە مێژووی فەلسەفەداو چ لە هەوڵەکانی مرۆڤدا بەر لە سەرهەڵدانی فەلسەفە بۆ گەیشتن بە شێوەیەك لە شێوەکانی تێگەیشتن لە خودی خۆی. بەمجۆرە فەلسەفەی بوونگەرایی ئاقارێکی بۆ هۆش و شێوازێکی بۆ بیرکردنەوە خستەڕوو کە هێندەی بوونی مرۆڤ خۆی کۆنن و بە درێژایی مێژووی هزری مرۆیی بە پلەی جیاجیا خۆیان خستۆتە ڕوو.

هەندێ جار ڕوانینی فەیلەسووفی بوونگەرا و بایەخدانی بەو بابەتانەی کە سەبارەت بە بوونگەرایی دیاریمان کردن، لە هەندێ قۆناغی کەلتووریدا پتر قوت بوونەتەوە. هەندێ جاریش وا پێدەچێ کە خەڵك بایەخیان بەو مەسەلانە نەدابێت. بەڵام فەلسەفەی بوونگەرا شەجەرەنامەی تایبەت بە خۆی هەیە.

بۆ گەڕان بە دوای ڕەگوڕیشەی ئـەم چیرۆکەشـدا، دەتـوانین بگەڕێینـەوە دواوە، بـۆ قۆناغی بیرکردنەوەی ئەفسانەیی. بابەتی ئەفسانە و لێکدانەوەی گـەلێ لـە لێکۆڵـەرەوانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە، هەر لە "شیلینگ" و "شتراوس"ەوە تا "کاسـیرەر" و "یـۆنگ" و "بۆڵتمان" و "ئیلیاد" و زۆری تر. هەموو ئەمانەش هەوڵ و تەقەللای زۆریان لە بـواری هێرمنیۆتیکای ئەفسانەدا داوە.

لـە سـەدەی هەژدەیـەم و سـەرەتاکانی سـەدەی نۆزدەیەمـدا کۆشـشی زۆر کـرا بـۆ لێکدانەوەی ئەقلانیانەی ئەفسانەکان لە ڕێی ئەفـەرۆزکردنی توخمـە خەیاڵیەکانیانـەوە و گەڕانەوەی ڕاستەوخۆوە بۆ ئەو ڕووداوە مەعقولانـەی کـە لـە سـەرەتادا بناغـە بـوون بـۆ سەرهەڵدانی ئەم چیرۆکانە و، پاشـتر بـە ورد و درشـتی خەیاڵئەنگێزانـە ڕازێنراونەتـەوە. بەڵام ئێستا توێژەرەوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەم تێڕوانینە تێڕوانینێکی هەڵەیـە بـۆ لێکدانەوەی ئەفسانە و ناتوانێت جیاکـاری لـە نێـوان ئەفـسانەی ڕەسـەن و حیکایـەت و داستاندا بکات. ئەو هەولانـەی کـە بایـەخ بـە لایەنـە ڕەمزییەکـەی ئەفـسانە دەدەن بـەو پێیەی کە لە دووتوێی خۆیاندا کۆمەڵێك حەقیقەتی میتافیزیکیی وا لەخۆدەگرن کـە هـیچ زمانێکی دیاریکراو ناتوانێ تەعبیریان لێ بکات. گەرچـی ئـەم تێڕوانینـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەفلاتون، بەڵام دەکرێ ڕەخنەی ئەوەی لێ بگرین کە ئەم تێڕوانینـە بـیروڕای پێـشینە و پاشینەی وا لە ئەفسانەکاندا دەخوێنێتەوە کە زیاترن لـەوەی ئـەو ئەفـسانانە دەیانـەوێ تەعبیریان لێ بکەن. هـەروەها تیۆرەیـەك هەیـە کـە یەکێکـە لـە تۆکمـەترین تیۆرەکـانی لێکدانەوەی میتۆلۆجی Mythology (ئەفسانەناسی) و وا دادەنێـت کـە ئەفـسانە خـاوەن وەزیفەیـەکی هۆکارداریيـە، واتـە بـە جۆرێـك لـە زانـستی سـەرەتایی دانـاوە کـە بنـەما هۆکارییـەکانی ڕووداوە سروشـتییەکان و دامودەزگـا مرۆییـەکان ڕوون دەکاتـەوە. ئەمـە ڕاستە کە هەندێ توخمی هۆکاری لە میتۆلۆجیدا هەیە، بەڵام ئەمە ئـەوە ناگەیـەنێت کـە ئەوە لێکدانەوەیەکی گشتگیرە بۆ ئـەم دیاردەیـە. تـازەترین تیۆرەکـان لـە لێکدانـەوەی میتۆلۆجیـدا وایـدەبینێت کـە ئەفـسانەکان بـە شـێوەیەکی ڕەمـزی تـەعبیر لـە هەنـدێ

حەقیقــەتی تایبــەت بــە هــزری مــرۆڤ و ژیــانی دەكــەن، هەرچــۆن لێكدانــەوە دەروونناسیەكانیش سەرنجیان بۆ لێكچوونی نێوان ئەفسانەكان و خەونـەكان ڕاكێـشاوە و، وا ســەیری ئەفــسانەیان كــردووە كــە خــستنەڕوو و بەرجەســتەكردنی ئــارەزوو و ململانێكانی ناوەوەی ئادەمیزادن. بەڵام لێكدانەوە بوونگەرایانەكان

ئەفسانەكانیان بە هەوڵە سەرەتاییەكانی مرۆڤ لە قەڵەم داوە بۆ دۆزینەوەی شـوناس Identity، هەر بۆ نموونە گێڕانەوەی حیكایەتی بنەچەی ئادەمیزاد داننانە بە جۆرێك لـە تێگەیشتنی خوددا.

من لەو بڕوایەدا نیم كە هیچ یـەكێك لـەم شـێوازانەی لێكدانـەوەی ئەفـسانە بـە تـەنها بەس بێت. ئەفسانە دیاردەیـەكی ئـاڵۆزە و لەبەرئـەوەی سـەر بـە قۆنـاغێكی كـەلتووری مرۆڤایەتیشە كە هێشتا تیایدا شێوەی تایبەت و جیای زمان نەهاتبووە ئاراوە، بۆیە هەر ئەفسانەیەك بگریت كۆمەڵێك لێكدانەوەی جیاواز لەخۆ دەگرێـت. هـەر بۆیـە شـتێكی زۆر ڕەوایـە كـە لـە هەوڵەكانمانـدا بـۆ كردنـەوەی جفـرەی ئەفـسانەكان پـەنا بـۆ زیـاتر لـە شێوازێكی لێكدانەوە بەرین.

لەگـەڵ ئەوەشـدا پێدەچـێ لـە نێـوان شـێوازە شـیاوەكانی لێكدانـەوەی ئەفسانەدا، لێكدانــەوەی بوونگەرایانــە خــاوەن گرنگییــەكی بنــەڕەتی بێــت. لەبەرئــەوەی كێــشەی دۆزینەوەی شوناس بۆ ئادەمیزاد یان تێگەیشتنی لە خـودی خـۆی، پێدەچـێ كێـشەیەك بێت هەر لـە تـانوپۆی بـوونی ئـادەمیزاد خۆیـدا هـەبێت و، ئـەم كێـشەیەش كێـشەیەكی بنەڕەتیترە لە پرسیاركردن لە ئەسڵی شتەكان و چۆن دەستیان پێكرد. هەڵبەت شتێكی بەڵگەنەویستیشە كە جۆرێك لە حەزی زانینی هـزری لـە سروشـتی بـوونی مرۆیـی خۆیـدا هەیە و ئەرستۆش ڕاستی كردووە كە لە سەرەتای كتێبەكەیدا "میتـافیزیكـا" ئـەم ڕسـتە بەناوبانگەی گوتووە: "هەموو مرۆڤێك بـە گـوێرەی سروشـتی حـەز بـە زانـین دەكـات"، لەگەڵ ئەمەشدا هەڵە نییە گەر بڵێین حەز بە زانین لای مرۆڤ لە توخمـە بوونگەراییـەكانی ئـەون و، لـە مێـژووی مرۆڤایەتیـشدا چـەند بـەرەو دواوە بگەڕێینـەوە دەبیـنین كـە ئـەم

هاندەرە بوونگەراییە بەهێزترە. پێدەچێ حەز بە زانینی بێگەرد و بێ مەبەست کە لە بیرکردنەوەی سەربەخۆدا لای زانا و فەیلەسووف دەگاتە لوتکە، پێشکەوتنێکی زۆر درەنگ بێت لە مێژووی ئادەمیزاددا.

هەر بۆیە دەشێ بگوترێ کە پرسیاری سەرەکی سەبارەت بە خودی مرۆیی کە لە خەسڵەتەکانی شێوازی بوونگەراییە لە فەلسەفاندندا، لەو قۆناغەدا کە هزری مرۆیی مۆرکێکی ئەفسانەیی هەبووە، تەقەللای داوە گوزارشت لە خۆی بکات. ئەمەش بە ئاشکرا بە شێوەیەکی تایبەت لەو ئەفسانانەدا دەردەکەوێ کە سەبارەت بە ڕەچەڵەکی مرۆڤن و تا ڕادەیەکی زۆر لە زۆربەی کەلتوورەکاندا هەن. جیهانی خۆرئاواش لە نزیکەوە ئاشنایە بەو لێکدانەوە عیبرانییەی کە بۆ ڕەچەڵەکی ئادەمیزاد کراوە و بۆمان دەگێڕێتەوە چۆن ئادەمیزاد لە قوڕ دروستکراوە و پاشان ژیان و ڕۆحی کراوەتە بەر (کتێبی دروستبوون، ئیسحاحی دووەم، ئایەتی ٧). بەرلەوەی کەسیش ئەم چیرۆکە وا لێکبداتەوە کە ڕووداوێکە و لە ڕابردوودا ڕوویداوە، هەروەها بەرلەوەی کەس بڕوای وا بێت کە ئەم چیرۆکە بەرجەستەکردنێکە بۆ میتافیزیکای دوالیزمی سەرەتایی نێوان جەستە و ڕۆح، ئەم چیرۆکە تەعبیری لە کۆنترین بنەمای تێگەیشتنی خود کردووە لای مرۆڤ و ،هەروەها لە پەیبردنی بوونگەرایانەی بۆ ئەو گرژی و ناودژێتییانەی کە تان و پۆی بوونی لێ پێکدێ: ئازادی، هەست بە کۆتابوون، گوناه و توانستی مەرگ لە ناو خۆیدا بناسێت.

مرۆڤ لە ئەفسانە سەرەتاییەکاندا لە پێناوی ڕوونکردنەوەی ئەو تەمومژەدا ململانێ دەکات کە بوونی تەنیوەتەوە، تا وەڵام بۆ دژایەتییە ئاشکراکانی بوونی بدۆزێتەوە. هەموو ئەم هەوڵانەش هی بەر لە فەلسەفە و بەر لە فینۆمینۆلۆجین کە لە شێوەی وێنەی میتۆلۆژیدان بۆ تەعبیرکردن لە هوشیاریی مرۆڤ بە بوونی، کە هەر لە سەرەتای گێتییەوە لەگەڵیدا بووە.

دواتریش وەختێ ئەو توێژینەوە فەلسەفییانە هاتنە ئاراوە کە بایەخیان بە بوونی مرۆڤ داوە، لە پاڵیدا کاری شاعیران و درامانووسان و ڕۆماننووسان پەیدابوون کە جێی ئەو بیرکردنەوە ئەفسانەییەیان گرتەوە و، ئەوەتانێ هەروەکو ئەمڕۆش دەیبینین، دەتوانین ڕوانینی بوونگەراییانەی بنەڕەتی لە چیرۆکەکانی "دۆستۆیڤسکی" و "کافکا" و "کامۆ"دا بدۆزینەوە کە یەکسانن بە شیکردنەوە فەلسەفیەکانی هایدیگەر و سارتەر. بەهەرحاڵ ئەم دوو فەیلەسووفەی دواییش، خۆیان دەرکیان بە هێزی ئەفسانە و ڕۆمان و شیعر کردبوو لە گوزارشتکردن لە ناو دژێتییەکانی بوونی مرۆیی، کە هەروەکو ئەلێکساندەر پۆپ لە "وتارێك دەربارەی مرۆڤ"دا دەڵێت: "هێشتا دوودڵە لەوەدا کە خۆی بە خودا بزانێت یان گیانەوەر".

ئەو ئەفسانانەی کە دەربارەی ئەو دونیا و ژیانێکی دیکەش دەکەن بایەخی بوونگەرایانەی خۆیان هەیە. مرۆناسی (ئەنترۆپۆلۆجی)ی نوێ وا لە "هوشیاری بەمەرگ" دەڕوانێت کە توخمێکی سەرەکییە لە توخمە پێکهێنەرەکانی بوونی مرۆیی و یەکێکە لەو تایبەتمەندییە سەرەکییانەی کە لە گیانەوەری جیادەکاتەوە. لەبەرئەوەی هوشیاری بە مەرگ واتە هوشیاری بە ژیانێك کە بەرەو ڕووی کۆتایی دەبێتەوە. ئەو ئەفسانانەی کە باسی ئەو دونیاش دەکەن بریتی نین لە کۆمەڵێك ڕامانی سەرەتایی سەبارەت بە کۆتایی جیهان، بەڵکو هەوڵ و تەقەللان بۆ دۆزینەوەی چوارچێوەیەکی مانایی کە تیایدا جێیەك بۆ بوونی مرۆیی فانی هەبێت، چونکە ئەو دونیا تەعبیر لە ڕادەی تێگەیشتنی مرۆڤ دەکات لە بوونی بەو پێیەی "بوونێکە بەرەو کۆتاییەك دەچێت" وەکو هایدیگەر دەڵێت.

پراکتیك کردنی میتۆدەکانی لێکدانەوەی بوونگەرایانە بەسەر ئەفسانەکاندا قفڵی لەسەر گەلێ ناوچەی فراوانی مانا کردۆتەوە و پەردەی لەسەر ئەو ئالۆزییە هەڵماڵیوە کە بە دەوری تێگەیشتنی مرۆڤی سەرەتاییدا هەبووە بۆ خودی خۆی، گەرچی ئەو تێگەیشتنە هێشتا نەگەیشتبووە ئاستی هوشیاریی ڕوون و هێشتا لەناو ڕەمزەکاندا

شاراوە بووە. لێکدانەوەکانی بۆلتمان بۆ چاخی نوێ (ئینجیل) و لێکدانەوەکانی هانز جۆناس بۆ ئەفسانەکانی ڕێبازی گنۆسی* و لێکۆڵینەوەی پۆل ڕیکۆر لە ئەفسانەکانی "کەوتن" و ڕەمزێتیی خراپە، هەموویان نموونەی بەرزی لێکدانەوەی بوونگەرایانەن. ئەم لێکدانەوە و شیکردنەوانە ئەوە ڕووندەکەنەوە کە تەنانەت لە قۆناغی بەر لە فەلسەفە و بەر لە دروستبوونی هەستی ڕەخنەگرانەشدا ،هۆشی مرۆڤ سەرقاڵی ئەو مەسەلانە بووە کە ئێستاش مەسەلە سەرەکییەکانی فەلسەفەی بوونگەرایی پێکدەهێنن وەك: نهێنیی ئاڵۆزی بوونی مرۆیی، هەست بە کۆتابوون، گوناه، مەرگ. ئومێد، ئازادی و مانا. لەگەڵ ئەوەشدا نابێ سەرمان لەم ڕاستییە سووڕبمێنێت، لەبەرئەوەی ئەم مەسەلانە لە ناوجەرگەی بونیادی بوونی مرۆیی خۆیەوە سەرهەڵئەدەن.

## ٢–فەلسەفەی دێرین

ئێستاش لە هزری ئەفسانەییەوە دەچین بۆ سەرەتاکانی هزری تێڕامان. سەروەختێك هات کە تیایدا خەڵکەکە لەو جیهانی ئەفسانەیە بێداربوونەوە (گەر ئەم دەربڕینە ڕاست بێت) کە لە خەون دەچێت، وەختێك کە هوشیاری بەهێز بوو و، هەروەها توانای هزری ڕەخنەیی و وروژاندنی گومانە ڕیشەییەکان بوو بە شتێکی کردەیی. لەم ماوەیەشدا دەبینین ئەو بابەتە بوونگەرایانەیەی کە لە ئەفسانەکاندا شاراوە بوون، ڕاشکاو بوون.

---

* ڕێبازی گنۆسیGnosticism ڕێبازێکی ئایینیی فەلسەفییە کە خواناسیی مەسیحییانەی تێکەڵ بە ئایینە کۆنەکانی خۆرهەڵات کردووە بەو لافەی بەرەو مانای قووڵتریان دەبات . ناوەکەش لە وشەی "گنۆسیۆس"ی یۆنانی یەوە وەرگیراوە کە بە مانای زانین(مەعریفە) دێ .

کارل یاسپەرز بە بیرۆکەکەی سەبارەت بە "چاخی تەوەرەیی axial age" بەشدارییەکی گەورەی لە تێگەیشتنی سەرهەڵدانی هزری تێڕاماندا کردووە. بە ڕای ئەو لە مێژووی مرۆڤایەتیدا خاڵێکی وەرچەرخان هەیە، کە "کاریگەرترین خاڵە لە پێکهێنانی مرۆییدا".ئەم خاڵە دەکەوێتە دەوروبەری ساڵی ٥٠٠ پ. ز. گەرچی لە ڕاستیدا خاڵ نییە، ئەوەندەی ماوەیەکە بە دوو سێ سەدە بەر لەم مێژووە تا دوای ئەو مێژووە درێژدەبێتەوە. لەم ماوەیەدا جووڵەیەکی سەیر و بەربڵاو کەوتە ڕۆحی مرۆییەوە. ئەم چاخە چاخی پێغەمبەرە عیبرانییە گەورەکان بوو: هەر لە عاموس و هوشع و ئەشعیا و ئیرمیاوە تا دەگاتە چاخی پێغەمبەرەکانی تاراوگە.

هەر ئەم سەردەمە سەردەمی بووژانەوەی درەوشاوەی ژیاری یۆنانییە، کاتێ یەکەمین هەوڵەکانی فەلسەفاندن لە جیهاندا ڕێی گرتەبەر، هەر لە تالیس و هیراکلیتس و پارمنیدسەوە تا سوکرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ. درامانووسەکان و شاعیرەکانی یۆنانیش لە چارەنووسی مرۆڤ ڕادەمان و سەرنجەکانی خۆیان سەبارەت بە کۆمەڵگا و یاساکانی دەخستەڕوو. سیستمە سیاسیەکان پەرەیان سەند، زانستە سروشتیەکان و زانستە مێژووییەکان یەکەمین هەنگاوەکانی خۆیان نا. لە پاڵ هەموو ئەمانەشدا ئاقاری گومان و پرسیارە ڕیشەییەکانی سۆفیستەکان سەریهەڵدا. گەرچی کاتێ ئەقڵی خۆرئاوایی لەم قۆناغە دەڕوانێ کە پێی دەوترێ چاخی تەوەرەیی لە مێژوودا، یەکەمین شت کە جێی بایەخیەتی دەسکەوتەکانی یۆنان و یەهودە، بەڵام یاسپەرز لە چوارچێوەی بیرۆکەکەی دێتە دەرێ تا ئەوەمان بەبیر بهێنێتەوە کە ئەو لایەنە بە تەنها لایەنێکی چیرۆکەکەیە. لەبەرئەوەی دەتوانین لەگەڵ ژیاری تردا بە دوای ڕەگوڕیشەکانی ئەم ڕابوونە ڕۆحییە بەرچاوەدا بگەڕێین، هەر ئەم سەردەمە سەردەمی کۆنفۆشیۆس و لاوتسە بوو لە چین، سەردەمی زەردەشت بوو لە ئێران و، سەردەمی ئوپانیشاد و پاشانیش بوودا بوو لە هیندستان.

کەواتــە لــەم چــاخە تەوەرەییــەدا چــی ڕوویــدا؟ دیــارە کــە کۆمــەڵێك شــتی گــەورە ڕوویانداوە، کە ئەگەر بمانەوێ بە شـێوەیەکی ئاسـان پـوختی بکەینـەوە، ئـەوە دەبێتـە هــەوڵێکی دەبەنگانــە و تاکڕەهەندانــە. ئــەوەتانێ لــەم ســەردەمەدا و لــە یــەك کاتــدا ڕەگوڕیشەکانی ئەقڵگەرایی و بوونگەرایی و بێدینی و دینداری و لێکۆڵینەوە لـە سروشـت و لێکۆڵینەوە لە مرۆڤ پێکەوە دەبینینەوە. ئەم قۆناغە کۆتایی چاخی ئەفسانە بـوو، کـە تیایدا ئەو ڕوانینە زۆرانەی کە هەندێکیان دژ بە یەك بوون و تا ئێستا بـە شـێوەیەکی پـڕ پێچ و پەنا لـە ڕەوتـی جیانەکـەرەوە و ناڕەخنـەیی ئەفسانەدا گوزارشـتیان لـێ دەکرا، گەیشتنە ئاستی ئاشکرا و ڕاشکاوی هوشیاری، کە هەندێ جار بە یەکیاندا دەدا.

کارل یاسپەرز بە شێوەیەکی پوخت و ئەوەندەی پەیوەندیـدار بێـت بـە چیرۆکەکەی ئێمەوە سەبارەت بە پێشینەکانی فەلسەفەی بوونگەرایی، بـەم شـێوەیە باسـی گرنگیـی ئەم قۆناغە دەکات: "ئەوەی لەم چاخەدا نوێیـە ئەوەیـە کـە مـرۆڤ هوشـیاریی بـە بـوون وەکو گشتێك و بە خودی خۆی و سنوورەکانی، لا دروست بـوو. بـە ئـەزموونی تـرس لـە جیهاندا و ئەزموونی هەستکردن بە بێتوانایی خۆیدا تێپەڕی.کۆمەڵێك پرسـیاری ڕیـشەیی خــستەڕوو، کــاتێکیش ڕووبــەڕووی بۆشــایی Void بــۆوە، لــە پێنــاوی ڕزگــاربوون و قوتاربووندا هەوڵی دا، وەختێ بە هوشیاریشەوە سنوورەکانی خۆی زانی، ئامانجی باڵای بـۆ خـۆی دانـا و، خەسـڵەتی ڕەهـابوون (موتڵـەق)ی لـە سـامانڵی بـاڵایی و نـووردا تـاقی کردەوە"[1].

هەڵبەت ئەو تایبەتمەندییانەی کە یاسپەرز لەم بڕگەیەدا باسی کردوون، هەمیشە و لە هەموو شوێنێك و بە هەمان هێز و تینەوە ئامادەگییان نەبووە. هەر بۆ نموونە "ترس لـە جیهـان" لای هەنـدێ میللـەت هـەبووە، نـەك لای هــەموو میللەتــەکان و، لــە بــارودۆخی مێژوویی دیاریکراویشدا. تەنانەت لە چاخی هزری ئەفسانەییشدا جیـاوازی هـەر هـەبووە. هنری فرانکفۆرت بەم شێوەیە جیاوازیی مەزاجی نێوان گەلی میسر و گەلی عێـراق وەسـف

دەكات: "هەستكردن بە نائەمنیەت و بە لاوازیی مرۆڤ، كە هەستێكە لەنێو هەموو دیاردەیەكی ژیاری دۆڵی ڕافیدەیندا هەیە، لە میسر بوونی نییە"[٢].

هەروەها لە چاخی تەوەرەییشدا جیاوازیی گەورە لە نێوان ژیارەكاندا هەبوو:وەكو ڕووكردنە جیهانی دەرەوە لە فەلسەفەی سروشتیدا لای فەیلەسووفە دێرینەكانی یۆنان و، ڕووكردنە جیهانی ناوەوە (بەرەو ناوەوەی خودی مرۆڤ) لە هزری هیندیدا، هەروەها لە نێوان مۆركی ئاكارییانەی پێغەمبەرایەتیدا لە ئایینی یەهودی و ئەزموونەكانی سۆفییەكانی خۆرهەڵاتدا و، زۆر ڕواڵەتی تری دژایەتی كە لە ژماردن نایەن. بەڵام ئێمە لە هەموو ئەم ژیارانەدا و لە هەموو دۆخە جیاوازەكانیاندا، هەروەكو یاسپەرزیش باسی كردووە، ئەو ئادەمیزادە دەبینینەوە كە بە شێوازێكی نوێ ڕووبەڕووی خۆی دەبێتەوە و ململانێ دەكات تا بەسەر كێشەی تێگەیشتنی خودی خۆیدا زاڵ بێت.

چاوپیاخشانێكی خێراش بە هەر دەڤەرێك لە سێ دەڤەرە گەورەكەی كەلتووری چاخی تەوەرەییدا، ئەوەمان پیشاندەدات كە چۆن پرسیارە بوونگەراییەكان و سەرەتاكانی فەلسەفەی بوون لەم قۆناغە زووەدا فۆرمەلە بوون. ئەم سێ دەڤەرەش بریتین لە: هزری ئایینیی عیبرانی لە چاخی پێغەمبەرەكاندا، كەلتووری كلاسیكی یۆنان و، فەلسەفەی ئایینیی خۆرهەڵات.

مۆركی بەهێزی بوونگەرایانەی دەستوورەكانی پێغەمبەرانی یەهود شتێكی دیار و ئاشكرایە و مارتین بوبەر **Martin Buber** لە كتێبەكەیدا "باوەڕی پێغەمبەرانە **The Prophetic Faith**" لەمە دواوە و چەمكی سەرەكیش لەم دەستوورانەدا چەمكی **Teshuvah** كە وەكو بوبەر دەڵێت بە وەرگێڕانی ئەم وشەیە بە "تۆبە" یان "گۆڕانی تەواوی كەسێتی" بە شێوەیەكی بەرچاوتر لێی تێدەگەین تا وەرگێڕانی بە

"Repentance"* . بەهەرحاڵ تۆبە "گۆڕانێك" لە بوونی مرۆییدا دەگرێتەخۆی بەو سیفەتەی گەڕانە بە دوای بوونێکی مرۆیی ڕەسەندا.ئەمەش مانای داننانە بە گوناهداو هەڵگرتنی بەرپرسیاریو گەڕان بەدوای کامڵبوونی تاکەکەس و عەدالەتی کۆمەڵایەتیدا.

ئامۆژگاریی پێغەمبەرەکانیش بە شێوەیەکی تایبەتی بانگەشەیان بۆ "گەڕانەوە" لە بتپەرستی و ئەو ئایینانە دەکرد کە عادەتەن پەیوەندیی بەرپرسیارانەیان لەگەڵ خوا و کۆمەڵگادا لە ئادەمیزاد دادەماڵی.

پەیامی پێغەمبەرەکان بە تەنها ئەوە نەبوو کە ئامۆژگاریی خەڵك بکەن تا دەسبەرداری ئەو ئایینە بێهوودانە بن. بەڵکو دەکرێ واش لێکی بدەینەوە کە بانگەشەی خەڵك دەکات تا دەسبەرداری ئەقڵیەتی ئەفسانەییشیان بن، لەو ڕووەوە کە ئەم ئەقڵیەتە هەستکردن بە زەمەنی لانییە، بۆیە دەبینین کە زنجیرەیەك ڕووداو تا ئابەد خۆیان دووپات دەکەنەوە. هەر بۆیە ئایینی سروشتی کە لەسەر بنەمای وەرزەکانی ساڵ و کاتی تۆوکردن و دروێنە دامەزراوە، وێنایەکی هەیە بۆ زەمەن کە تیایدا هیچ شتێکی تازە ڕوونادات. ئەفسانەکانی ئایینی بتپەرستیش کە پێغەمبەرەکانی یەهود هێرشیان دەکەنە سەر، "ئەفسانەکانی گەڕانەوەی هەتاهەتایی"ن. ئەو گۆڕانەی کە پێغەمبەرەکانیش داوایان دەکرد، بە تەنها دوورکەوتنەوە نەبوو لەم ئەفسانانە، بەڵکو هەروەکو "بوبەر"یش دەڵێت "گۆڕان بەرەو ئایندە" بوو.

بە واتایەکی دی، پێغەمبەرەکان داوایان لە خەڵك دەکرد تا ڕووبەڕووی بوونی مرۆیی ببنەوە، بە لایەنە زەمەنی و مێژووییەکەیەوە و هەروەها لە منالّدانی نازەمەنیی هزری ئەفسانەیی بێنەدەرێ.

---

* کرداریrepent کە ناوی repentanceی لێوە وەرگیراوە لە ڕەگە لاتینیەکەیدا بە مانای "ئەفسوس"و"پەشیمانی"دێ و، بەپێچەوانەی وشەی تۆبەوە ،زیاتر مانای هەستێکی ناوەوەیی دەکات وەك لە بڕیاردان بۆ گۆڕانی ناوەکی.

مانای وایه که: گوناه و گۆڕان و بەرپرسیارێتی و گەڕان بە دوای بوونێکی مرۆییدا بە مانای ئەم وشەیە و دانانان بە حەقیقەتی زەمەن و مێژوودا– هەموو ئەمانە بابەتگەلێك بوون کە لە دەستوورەکانی پێغەمبەرەکاندا جێ و ڕێی گرنگی خۆیان هەبووە، بێگومان ئەم بابەتانە لای فەیلەسووفە بوونگەراکانیش جێی بایەخی زۆرن. ئێمە دەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کە لایەنێکی تر هەیە لە دەستوورەکانی پێغەمبەرەکاندا کە ئاماژە بۆ بابەتێك دەکات لای بوونگەراکان نامۆ نییە. بۆڵتمان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پێغەمبەرەکان وەختێ ئەو توخمانە ڕەتدەکەنەوە لە کەلتووری بتپەرستیدا کە لە پایەی مرۆڤ کەمدەکەنەوە، پەنا دەبەنە بەر وەسفکردنێکی ڕۆمانسیانەی ژیانی سادەی بیابان بەر لە سەرهەڵدانی دەوڵەت. ئەوان "نارەزاییان دژ بە هەر پێشکەوتنێکی سیاسی و ئابووری پەتی، ئاخنیوەتە ئامۆژگارییەکانیانەوە سەبارەت بە عەدالەتی کۆمەڵایەتی"[٤].

هەندێ بوونگەرا هاوچەرخەکانیش کەوتوونەتە بەر ڕەخنە لەبەرئەوەی پێدەچێ ئەوانیش لە هەندێ حاڵەتدا خۆیان لەبەرپرسیارێتیی چاخی تەکنۆلۆژیا دزیبێتەوە، چونکە شەوق و سۆزێکی زۆریان بۆ هەندێ بارودۆخی مرۆیانەتر و شەخسیتری ژیانێك هەبوە کە پێیان وایە بەر لە شۆڕشی پیشەسازی لە ئارادا بووە. ئەمەش مەسەلەیەکە کە لە شوێنی گونجاوی خۆیدا باسی دەکەین.

پێدەچێ کاتێ دێینە سەر کەلتووری یۆنانی، باس لە دیاردەیەك بکەین کە تەواو جیاوازە، دیاردەیەك کە تیایدا ئەو ئاقارە بوونگەرا بەهێزانە نابینینەوە کە لە هزری ئایینی عیبرانیدا هەن. ئەی ئێمە وا ناڕوانینە یۆنانییەکان کە نموونەی کاملی تێڕوانینی ئەقڵگەرایانە و ئەقڵپەرستانەن بۆ ژیان و جیهان؟

هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە دەسکەوتە ئەقڵانییەکانی یۆنان لە بواری فەلسەفە و زانستدا لە جیهانی کۆندا بێهاوتان. بەڵام زۆرجار ئەو جیاکارییە باوەی کە لە نێوان شێوەی بیرکردنەوەی یۆنانییەکان و جوولەکەدا کراوە، زۆری پێوە نراوە. چونکە ئەقڵگەرایی Rationalism و ئەقڵپەرستی Intellectualism هەموو چیرۆکی هۆشی یۆنان

پێکناهێنن. ئی. ئار. دۆدز لە لێکۆڵینەوەیەکی بەنرخیدا دان بەوەدا دەنێت کە ئێمە لەناو یۆنانییەکاندا و تەنانەت لە قۆناغێکی زووشدا وەکو قۆناغی هۆمیرۆس "ئاقارێکی ئەقڵپەرستانە بۆ شیکردنەوەی ڕەفتاری مرۆیی" دەبینینەوە و دەزانین کە ئەوە "شەقڵێکی هەمیشەیی بە هۆشی یۆنانی داوە" و پێشتریش پێشبینیی ئەو تیۆرەیەی کردووە کە چاکە زانینە (فەزیلەت مەعریفەیە) [*]. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دوای خستنەڕووی کۆمەڵێك بەڵگەی زۆر دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە: "ئەو خەڵکانەی بۆ یەکەمجار ئەقڵانیەتی ئەوروپیان داهێنا، هەرگیز- تەنانەت لە چاخی هیلینستیشدا- ئەقڵانیی ئەبستراکت نەبوون، مەبەستم لەوەیە کە ئەوانە بە قووڵی و بە خەیاڵێکی بالاوە هوشیارییان سەبارەت بە هێز و بالایی و مەترسیی نائەقڵانی Errational هەبووە[٥].

ڕاستە کە فەلسەفەی یۆنانی بەو فەیلەسووفانە دەستی پێکرد کە پێیان دەوترێ "فەیلەسووفە سروشتگەراکان"، واتە تالیس و ئەوانەی دوای ئەو، دیارە هەر لەبەرئەوەشە کە ڕووی بایەخی کردۆتە جیهانی ماددی لەبری ئەوەی ڕووبکاتە جیهانی ناوەوە و بوونی تایبەتیی مرۆڤ. بەڵام سەرباری ئەمە و تەنانەت لەنێو فەیلەسووفەکانی بەر لە سوکراتیشدا، هایدیگەر توانیویەتی سەرەتا ڕەسەنەکانی فەلسەفاندنی خۆرئاوایی بدۆزێتەوە، بە تایبەتیش تێڕوانینی ورد بۆ پەیوەندیی نێوان بوون و زانین (مەعریفە) یان نێوان بوون و بیرکردنەوە کە بە تایبەتی گەڕاندوویەتیەوە بۆ پارمنیدس و هەروەها هیراکلیتس[٦]. بە ڕای هایدیگەر هەر زوو ئەم تێڕوانینە وردەی سەرەتا فەوتا و، مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوایی بوو بە "فەرامۆشکردنی بوون" (یان لە بیرچوونەوەی بوون) و جۆرێك هزری حیسابکار هاتە ئاراوە نەك هزری بوونگەرا. بەڵام وێڕای ئەمەش پەیوەندیی نێوان بوون و هزر هەر بەرهەمی تێڕوانینێکی قووڵی یۆنانییەکان بووە. هەر

---

[*] تیۆرە ئاکارییەکەی "سوکرات"ە،کە وایدەبینێت چاکە زانینە و خراپەش نەزانین.لەبەر ئەوەی ئێمە خراپە لە نەزانینەوە ئەنجام ئەدەین. ئەم تیۆرەیەش ترۆپکی ئەقڵانیەتە لە بواری ئاکار و شیکردنەوەی ڕەفتاری مرۆییدا بە شێوەیەکی گشتی.

ئـەم پەیوەندییەشـە کـە فەیلەسـووفە بوونگـەرا هاوچـەرخەکان دەیانـەوێ سـەرلەنوێ دایبمەزرێننەوە.

سوکرات گرنگییەکی تایبـەتی لـە پێکهێنـانی جۆرێك لـە فەلسەفەی بوونـدا هـەبوو، لەبەرئەوەی لەگەڵ ئـەودا شۆڕشـێك لـە فەلسەفەی یۆنانیـدا بـەرپا بـوو و بایەخـدان لـە سروشتەوە گۆڕا بۆ بایەخدان بە مرۆڤ وەکو تەوەری باسی فەلسەفی و، پرسـیارکردن لـە خـودی مـرۆڤ بـوو بـە بەرنامـەی فەلـسەفە و ناسـینی ئـەم خـودەش بـوو بـە ئامـانجی فەلسەفە. هـەروەها سـوکرات ڕوونـی کـردەوە کـە بیروبـاوەڕە باوەکـانی وەکـو تـەقوا و ئازایەتی و دادپەروەری و شتی تری لەو بابەتانە بە تـەنها بـەس نـین و، داوای لـە خـەڵك کرد لە تێگەیشتنیاندا بـۆ ئـەو ژیانـەی کـە بـە شـێوەیەکی کردەیـی وەکـو مـرۆڤ تیایـدا بەشدارن، قووڵتر ببنەوە. لێرەوە بە ئاسانی تێدەگەین کە بۆچی کیرکەگۆر بـە سـوکرات سەرسـام بـوو. ئـەوەتانێ دەڵێـت: "سـوکرات بـە چ گونجـانێکی سەرسـوڕهێنەوە، بـە ڕاستگۆییەوە لەگەڵ خۆیدا مایەوە! ئەو دەوری مامانی بۆ خۆی هەڵبژارد و تا کۆتـاییش هەروا مایەوە. نەك لەبەرئەوەی هزری ئـەو "هـیچ نـاوەڕۆکێکی ئیجـابیی نـەبوو"، بـەڵکو لەبەرئـەوەی ئـەو دەرکـی بـەوە کردبـوو کـە ئـەم پەیوەندییـە بـەرزترین پەیوەندییەکـە بوونەوەری مرۆیی بە بوونەوەرێکی مرۆیی ترەوە ببەستێتەوە"[٧].

دەتوانین لـە سـوکراتدا دوولایـەنی لـە هـەمان کاتـدا دژ بـە یـەك ببینینـەوە: ئـەو لـە سەرێکەوە پاڵەوانی گەورەی بەرگریکردنە لە ئەقڵگەرایی و تا ئەو ڕادەیـەی کـە خەریکـە دەبێتـە قدیـسی پـارێزەری ئـەقڵ Reason. بـەڵام لـە سـەرێکی تریـشەوە لەبەرئـەوەی شەهیدی حەقیقەت بوو، گەورەترین بەرگریکاری بوون بوو لـە نێـوان ئەقڵگەراکانـدا و لـە هــەموو شــتێك زیــاتر لــە ئەقڵگــەرایی پــەتی Mere Rationalism دوور بــوو. ئەگــەر بوونگـەرایی هەنـدێ جـار کەوتبێتـە نـشێوی نائەقڵانیـەت Irrationalism ەوە بـە مانـا خراپەکەی ئەم وشەیە کە تیایدا ئـەقڵ Reason بـە کـەم سـەیر دەکـرێ، ئـەوا سـوکرات

شایەتی گەورەی ئەو حەقیقەتەیە کە ئەقڵگەرایی توخمێکی گەوهەرییە لەهەر بوونێکی مرۆیی و شەخسیی ڕاستەقینەدا.

لە "سوکرات"یشەوە تا "یاسپەرز" کەلەپوورێك هەیە لە فەلسەفەی بوون کە بە قووڵی ڕێ لە ئەقڵ دەگرێت.

هەروەها دەتوانین بەدەر لە فەلسەفە، بە کورتی ئاماژە بە هەندێ لایەنی گرنگ بدەین لە کەلتووری یۆنانیدا کە بەڵگەی ترمان سەبارەت بە سەرهەڵدانی سەرەتاکانی بوونگەرایی دەدەنێ. بۆ نموونە لەوانە ئایینەکانی نهێنییەکان کە لە پێناوی قوتاربوون و ڕزگاربووندا تێدەکۆشن، هەروەها ئەو دراما تراژیدییە بەرزانەی کە بەریەککەوتنی نێوان بوونی مرۆڤ و بوونی گێتی دەخەنەڕوو و لێیدتۆژنەوە.

ئەوەی وتمان بەسە بۆئەوەی بیسەلمێنین کە تەنانەت لە یۆنانی کۆنیشدا، کە یەکەم لانکی گەورەی ئەقڵگەرایی بووە، دیسانەوە بە ڕوونی مەسەلە بوونگەراییەکان لە چاخی تەوەرەییدا دەرکەوتوون.

سێیەمین دەڤەری ژیاری (یان باشتر وایە بڵێین زنجیرە دەڤەر) کە پێویستە ئاماژەیەکی تایبەتیی بۆ بکەین "خۆرهەڵات"ە. هەڵبەت لەنێو فەیلەسووفە بوونگەرا هاوچەرخەکانیشدا کارل یاسپەرز لە هەموویان زیاتر بە ڕووی بیروباوەڕەکانی فەلسەفەی ئاسیایی و ئایینی ئاسیاییدا کراوەتەوە و، لە هەمووشیان زیاتر درکی بەو لێکچوونانە کردووە کە دەکرێ لە نێوان بیروباوەڕە خۆرهەڵاتیەکان و بوونگەرایی لە خۆرئاوادا بیاندۆزینەوە.

ئەوەندەی پەیوەندیی بە خۆرهەڵاتەوە هەبێت، دەکرێ بڵێین کە توێژەرە بوودابیە ژاپۆنییەکان بە شێوەیەکی ڕوونتر لەوانی تر درکیان بە توانای گفتوگۆ کردووە. هەر بۆ نموونە ئەگەر یەکێك کتێبەکانی "د. ت. سوزوکی"* بخوێنێتەوە، زەحمەتە نەکەوێتە

---

* بوودایی چینی یان بووداگەرایی چینی zen buddhism شێوەیەکی کردەیی بووداگەراییە کە لە یۆگا وە نزیکترە،وشەی zen یش واتە ڕامان کە لە وشەی "cha an" ی چینی یەوە وەرگیراوە.

ژێر کاریگەریی بەهێزی ئەو لێکچوونە زۆرانەوە کە لە نێوان داڕشتنەکەی ئەودا بۆ بوودایی چینی (زن بوودیزم) و دەستوورەکانی بوونگەراییدا هەیە[٨].

یۆشینۆری تاکیوشی Yoshenori Takeuchi لە وتارێکیدا بە ناوی "بوودیزم و بوونگەرایی" (یان بووداگەرایی و بوونگەرایی): گفتوگۆ لە نێوان هزری خۆرهەڵاتی و خۆرئاواییدا، هەندێ لەم لێکچوونانەی ڕوونکردۆتەوە[٩]. ئەو وای بۆ دەچێت کە لەگەڵ سەرهەڵدانی بوونگەراییدا لە خۆرئاوا "شێوازە جۆراوجۆرەکانی بیرکردنەوەی فەلسەفیمان لە چەندەها سەدەی ڕابردوو زیاتر لێك نزیك بوونەتەوە". ئەو وایشی دەبینێت کە هەندێ بابەتی فەلسەفەی بوونگەرایی هەن دوو هەزار و پێنجسەد ساڵ لەمەوبەر جێی بایەخی فەلسەفەی خۆرهەڵاتی بوون، بە تایبەتیش بوودیزم. هەروەها تاکیوشی بە شێوەیەکی تایبەتی باسی کۆمەڵێك چەمك دەکات کە مانای تایبەتییان هەیە، وەکو چەمکی "بوون و نەبوون" و دیاردەی دڕدۆنگی (یان نیگەرانی) کە لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ نەبووندا سەرهەڵدەدات، ئەو دەڵێت کە بایەخدانی هاوبەش بەم مەسەلانە توانای تێگەیشتنی دوولایەنە زیاتر دەکات لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا.

بێگومان جگە لەم خاڵە هاوبەشانەی کە لە ئایینی بووداییدا هەن، گەلێ لایەنی تر هەن لە فەلسەفە و ئایینی خۆرهەڵاتیدا و، هەروەها لە فەلسەفەی خۆرئاواشدا، جگە لە بوونگەرایی گەلێ لایەنی تر هەن کە توانای زیاتری پێکگەیشتن لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا فەراهەم دەکەن. ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە بەر لە نیو سەدەش فەیلەسووفە هیندییەکان و ئایدیالیستە ئەوروپیەکان توانییان بناغەیەکی هاوبەش لە نێوانیاندا بدۆزنەوە، بەڵام مەبەستی ئێمە بە سادەیی ئەوەیە پیشانی بدەین کە بابەتە گەورەکانی فەلسەفەی بوونگەرایی بە شێوەیەکی کردەیی بۆ یەکەمجار لە هزری تێڕامانی هوشیارانەی یەکەمدا لە چاخی تەوەرەییدا گوزارشتیان لێ کراوە و، ئەم بابەتانەش لە هەندێ کەلتووری جۆراوجۆردا دەرکەوتوون، وەکو: کەلتووری عیبری و یۆنانی و هەروەها بوودایی.

## ٣–لە سەرهەڵدانی مەسیحیەتەوە
## تا سەدەکانی ناوەڕاست

دەستوور و ئامۆژگارییەکانی مەسیح درێژەپێدان و چڕکردنەوەی هەمان ئەو بە ئاگاهێنانەوەیە بوو کە یەکەمین جار لای پێغەمبەرەکانی جوولەکە خستبوویانە ڕوو. مەسیحیش وەکو ئەمان دژ بە شتە ڕووکەشەکانی ئایین وەستایەوە کە ئەوسا باو بوون و، بانگەشەی بۆ گوێهەڵخستن بۆ ناخ و بەرپرسیارێتی کرد. بەڵام پەیامەکەی ئەو لەو ڕووەوە لە پەیامەکەی ئەوان جیابوو کە دەچووە چوارچێوەی ئومێدێکی بەرفراوانترەوە بۆ بردنەوەی ئەو دونیا و، ژیان بوو بە بوونێك لە بەرامبەر کۆتاییدا. ئەم خەسڵەتەش زەرورەتێکی بوونگەرایانە و قووڵییەکی وای بە پەیامەکە بەخشی کە لای پێغەمبەرە کلاسیکەکان نەبوو. گەرچی دەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کە لە دەستوورەکانی پێغەمبەرە کۆنەکانیشدا مۆرکی زەرورەت و پێشبینیکردنی ئەو دونیا هەر هەبوو.

بۆڵتمان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دەستوورەکانی مەسیح لەو تێڕامانە خەیاڵاوییانە دوورکەوتەوە کە لای جوولەکە هەبوو. خەسڵەتی بوونگەرایانەی ئەم دەستوورانەش لە جەختکردنیدایەتی لەسەر چرکەساتی کۆتایی بەوپێیەی "چرکەساتی بڕیار"ە، چونکە ئیدی ئەوە چرکەساتی تۆبە و پەشیمانی و پەڕینەوەیە لە شکڵیاتەوە بۆ گوێڕایەڵیی ڕیشەیی، وەکو ئامادەبوونێك بۆ ئەو کۆتاییەی کە نزیك دەبێتەوە.

گەرچی مەسیحیش باسی لە پاداشت و سزا کردووە، هاندەری سەرەکی بۆ گوێڕایەڵی لەو ئارەزووەدا بینیوەتەوە کە مرۆڤ بوونی ڕەسەنی خۆی بدۆزێتەوە: "ئەوەی دەیەوێ گیانی خۆی ڕزگاربکات، هیلاکی دەکات و، ئەوەی هیلاکیشی کرد زیندووی دەکاتەوە" (ئینجیلی لۆقا– ئیسحاحی حەڤدەیەم– ئایەتی ٣٣)[١٠].

جگە لە دەستوورەکانی مەسیح، گەلێ شتی تر هەن لە "پەیمانی نوێ"دا کە دەکرێ باشترین ڕێگە بۆ تێگەیشتنیان ئەوە بێت بڵێین کە شێوازێکن بۆ تێگەیشتنی بوونی

مرۆیی و بۆ وەدیهێنانی ئەم بوونە. دەستوورەکانی "سانت پۆڵس"یش نموونەیەکی بەرزی ئەم جۆرەی خواناسی (تیۆلۆجی)ن، هەروەها بۆڵتمان "بە مەسیحی بوونی" سانت پۆڵس* وا لێکدەداتەوە کە ئەوە کاتێك روویداوە کە ئەو گەیشتۆتە تێگەیشتنێکی تازە بۆخودی خۆی و، پاشان بڕوای وایە کە خواناسییەکەی سانت پۆڵس ڕەنگدانەوەی ئەزموونێکی تازەی گۆڕانە لەلای، مادامەکی دەتوانین وا لێکی بدەینەوە کە تێگەیشتنێکی تازەیە بۆ مرۆڤ لەبەر ڕۆشنایی گەیاندنی پەیامی مەسیحی[11].

پێویست بە گوتنیش ناکات کە وشەکانی "تێگەیشتن" و "تێگەیشتن لە خود" لەم ڕوانگەیەدا مانایەکی ئەقڵیی بەرتەسکیان نییە، بەڵکو ئاماژە بۆ تێگەیشتنێك دەکەن کە پشت بە بەشداریکردن لە شێوازی ژیاندا دەبەستێت و ئەم تێگەیشتنەش لە هەڵوێستوەرگرتنێکی بوونگەرایانەی کۆنکرێتیدا کە هەڵوێستی ئیمانە، گوزارشت لە خۆی دەکات.

بەم جۆرە تێگەیتشنی سانت پۆڵس بۆ بوونی مرۆیی جیاوازە لە تێگەیشتنی مەسیح و بە زمانێکی تەواو جیاواز لە زمانەکەی مەسیحیش گوزارشتی لێدەکات. دەتوانین لە ڕێی دوو تێگەیشتنی دژ بە یەکیشەوە بۆ مرۆڤ بە باشی گوزارشت لە تیۆلۆجی کەی سانت پۆڵس بکەین: تێگەیشتنی یەکەم حاڵەتی مرۆڤە بەر لە ئیمان و، ئەوی تریشیان حاڵەتی مرۆڤە لە دوای ئیمان. سانت پۆلس بۆ گوزارشتکردن لە تیۆلۆجی بوونگەراکەی خۆی بێ ئەندازە وشەی لەبەردەستدا بوو: گوناە و جەستە و ڕۆح و دەروون و بەدەن (کە زیاتر بە مانای کەس دێ) و ژیان و ئەقڵ و ویژدان و دڵ و ئازادی و ئیمان و ئومێد و خۆشەویستی چ نین جگە لە بژاردەیەك لە زاراوە گرنگەکانی. لەوانەیە دەروونناسی

---

*Animism لە وشەی Anima ی لاتینی یەوە وەرگیراوە کە بەمانی "ڕۆح" دێ و بە شێوەیەکی گشتیش باوەڕێکە بەوەی کە ڕۆح لە هەموو شتێکدا هەیەو بەوجۆرە ژیان بە ماددەی بێگیان ئەبەخشێ. لە ڕاستیدا بیروباوەڕێکی سەرەتاییە و بەر لە سەرهەڵدانی فەلسەفە هەبووە و دواتر فەلسەفە ئەم باوەڕەی ڕەتکردەوە،هەروەها ئایینە ئاسمانییەکانیش.

هاوچەرخ و هەروەها فەیلەسووفی بوونگەرایی سەردەم بڵێت کە زاراوەکانی سانت پۆڵس ورد نەبوون و هەندێ لەم زاراوانە هێشتا هەڵگری بیرۆکەی ئەنیمیزم* ن. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا گەر بەراوردێك لە نێوان زمانەکەی سانت پۆڵس و زمانی کۆنی ئەفسانەکاندا بکەین، ئەو هەنگاوە گەورەیە دەبینین کە بەرەو پێش نراوە. لە سەردەمی سانت پۆڵسدا هەندێ وشە هاتنە ئاراوە کە دەکرا لە پرۆسەی وەسفکردنی فینۆمینۆلۆژیدا، لەبری شێوازی ئەفسانەیی، زیاتر بەکاربرێن، بۆ بونیادە بنەڕەتیەکانی بوونی مرۆیی و هەروەهات بۆ سروشتی ئەو تێپەڕینەی کە پێویستە لە پێناوی گەڕان بە دوای خودی ڕەسەن Authenticدا ئەنجام بدرێ.

لانی کەم ڕەنگە بەشێکی ئەو وشانەی کە لە دەربڕینی تێڕوانینی مەسیحیانەدا بۆ مرۆڤ لە "پەیمانی نوێ یان میساقی نوێ"دا بەکاربراون، لەو پێڕ (فیرقە)انەوە وەرگیرابن کە بە شێوەیەکی فراوان لە جیهانی هیلینیستیدا بڵاوبووبوونەوە و بە گنۆستیسیزم Gnosticismناسرابوون. بۆڵتمان سەرنجی داوە کە گنۆستیسیزم و ئەفسانەکەی زەخیرەیەکی وایان لە زاراوە خستۆتە ڕوو کە لای ژمارەیەکی زۆری خەڵك ناسراو بوون(١٢). گنۆستیسیزم لە سەدەکانی سەرەتادا ڕکابەرێکی ترسناکی مەسیحیەت بوو، بە هۆی ئەو لێکچوونانەوە لە نێوانیاندا هەبوو. لەبەرئەوەی هەردووکیان شێوازگەلێك بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ و تێگەیشتنی چارەنووسی و ئەو ڕزگاری (خلاص)ە چاوەڕوانکراوە دەخەنەڕوو لەو هێزانەی کە لە پلەوپایەی ئادەمیزاد کەم دەکەنەوە و ژیانە ڕاستەقینەکەی دەشێوێنن.

گەرچی گنۆستیسیزم بە پەیوەندییەکی توندوتۆڵتر لە مەسیحیەتی چاخی نوێ، بە بوونگەرایی نوێوە بەستراوەتەوە. خۆ ئەگەر لێکچوون لە نێوان گنۆستیسیزم و مەسیحیەتدا هەبێت، جیاوازیش لە نێوانیاندا هەیە. بە تایبەتیش گنۆستیسیزم بانگەشە بۆ جۆرە دوالیزمێکی ڕەها دەکات کە لەگەڵ بیرۆکەی خوڵقاندن (خەلق)ی کتێبی پیرۆزدا ناگونجێت. لای کەسێك کە باوەڕی بە گنۆستیسیزم هەیە جیهان بە تەواوەتی

بێگانه و ئەهریمەنییە و ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان بوونی مرۆڤ و بوونی جیهان بە ڕادەیەك توندوتیژ پیشاندراوە کە بەر لەو ڕووبەڕووبوونەوە هاوچەشنەیە کە دواتر لای هەندێ لە نووسەرە بوونگەرا هاوچەرخەکان دەخرێتەڕوو. هەروەها، گەرچی بیرۆکەی گەیشتنی مرۆڤ بە تێگەیشتنێکی ڕاستەقینە لە خودی خۆی لە "چاخی نوێ"شدا هەیە، بەڵام بەو ڕادەیە بایەخی پێ نەدراوە وەك لە گنۆستیسیزمدا دەیبینین، لەبەرئەوەی ڕزگاری لای گنۆسیست پشت بە گەیشتن بە گنۆسی ڕاستەقینە True gnosis (زانینی ڕاستەقینە) دەبەستێت، واتە گەیشتنی مرۆڤ بە زانینی شوناس و چارەنووسی خۆی.

هانزجۆناس لە کتێبەکەیدا: "ئایینی گنۆستیك" لێکدانەوەیەکی قووڵ بۆ ئەم ئامێتەیەی فەلسەفە و میتۆلۆجی دەکات کە کەلەپووری گنۆسی پێکدێنێت. پاشان لە چاپی دووەمی کتێبەکەیدا وتارێکی زیادکردووە کە ناونیشانی "گنۆستیسیزم، بوونگەرایی، نیهیلیزم"ە و، لەم وتارەدا پێماندەڵێت کە هەر ئەوەندە بۆ یەکەمجار لە گنۆستیسیزمی کۆڵییەوە، دەرکی کرد بەوەی کلیلی لێکدانەوەی دەستووره سەیرەکانی ئەم ئاینە وا لە چەمکەکانی فەلسەفەی بوونگەرادا. بەڵام لە سەرێکی ترەوە ئەوەشی بۆ ڕوونبۆوە کە گنۆستیسیزمیش بەلای خۆیەوە ڕۆشنایی دەخاتە سەر بوونگەرایی هاوچەرخ. بە ڕای ئەو ئەمەش ڕووداوات تەنها لەبەرئەوە نەبێت کە نزیکایەتیەکی قووڵ لە نێوان هەردووکیاندا هەیە و بە بۆچوونی ئەو بناغەی ئەم نزیکایەتیەش دەگەڕێتەوە بۆ بوونی جۆرێك لە نیهیلیزمی گەردوونی Cosmic Nihilism کە لە سەدەکانی یەکەمی چاخی مەسیحیدا مرۆڤ کەوتبووە ژێر کاریگەرییەوە و، ئەوەتانێ وا لە سەردەمی تازەشدا دیسانەوە کەوتۆتەوە ژێر کاریگەرییەوە. لە هەردوو ئەم قۆناغانەدا ئادەمیزاد هەستی بە ونبوون و تەنیایی کردووە لە جیهانێکی بێگانە و فراواندا. بەمجۆرە گنۆستیسیزم و بوونگەراییش بە دوو شێوازی جیا بەڵام لەیەکچوو، وەڵامی ئەم بێدەرەتانییەی مرۆڤیان لە جیهاندا داوەتەوە. جۆناس هەندێ دێڕی نیچە دەهێنێتەوە کە تا ڕادەیەکی زۆر دەتوانرێ بە برگەیەکی گنۆسی لە قەڵەم بدرێ:

"دونیا دەروازەیەکی والآیە

بە ڕووی بیابانە بێکۆتاییە سارد و خامۆشەکانا

هەرکەس بۆ جارێك ئەوە ون بکات کە تۆ کردووتە هەست بە ئارامی ناکات لە گشت جیهاندا"(١٣)

هەڵبەت دەبێ مرۆڤ خۆی لە مەترسیی زێدەڕۆیی لە سادەکردنەوەدا بپارێزێت، بەلآم بە دڵنیاییەوە بیانووی بەهێز هەیە بۆئەوەی وا سەیری گنۆستیسیزم بکرێ کە یەکێکە لە پێشینە مێژووییەکانی فەلسەفەی بوونگەرایی و بە تایبەتیش لە شێوە ڕەشبینەکانیدا.

ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەی سەرەکیی تیۆلۆجیی مەسیحی لە قۆناغە زووەکانی گەشەسەندنیدا، سەرنج ئەدەین کە خەسڵەتە بوونگەراکەی بەرەو پاشەکشێ دەچێت و تا وای لێدێت بایەخپێدانە دۆگماتیکی و میتافیزیکیەکان بە سەریدا زاڵ دەبن. لەوانەشە ئەوە ببێتە سادەکردنەوەیەکی زۆر گەر بڵێین هۆی ئەم گۆڕانە دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەرییەکانی فەلسەفەی یۆنانی لەسەر ناوەڕۆکی پەیامی سەرەکیی مەسیحییەت.

ئەو ڕستەیەی هارنۆك **Harnack**یش بەناوبانگە کە دەڵێت: "سەرچاوە و پەرەسەندنی دۆگما کارێکە لە کارەکانی ڕۆحی یۆنانی لە خاکی ئینجیلدا"(١٥) گەرچی پێدەچێ "هارنۆك" بڕوای وابێت کە ئەم "کارەی ڕۆحی یۆنانی" تا ڕادەیەك زیانبەخشە، بەلآم بە پێویستیشی زانیوە، ئەو دەڵێت "مەسیحیەت بەبێ دۆگما، واتە بەبێ گوزارشتکردنێکی ڕوون لە ناوەرۆکی، تەسەور ناکرێ"(١٦).

بەلآم تەنانەت گەر دانمان بەمەشدا نا، هێشتا هەر ناتوانین هۆی ئەوە ڕوونبکەینەوە کە بۆچی دۆگما شێوەیەکی میتافیزیکی و بابەتیی بەخۆوە دەگرت. بێگومان بە تەنها ئەوەش بەس نییە کە بڵێین ئەمە دژایەتیی نێوان "یۆنان" و "عیبرانیەکان"ی دەخستەڕوو، لەبەرئەوەی ئێمە پێشتر سەرنجی ئەوەمان دا کە هزری یۆنانی لە هاندەرە بوونگەراکان خاڵی نەبوو، دانانی یۆنانیەکانیش بەرامبەر بە عیبرانیەکان، وەکو ئەوەی باوە، شتێکە زێدەڕۆیی تیاکراوە.

گەرچی لە سەردەمی باوکانی کڵێساشدا تیۆلۆجیی دۆگماتیکی فەتوایی میتافیزیکی لە ترۆپکدا بوو، بەڵام لێکدانەوەی ئیمانیش لە ڕوانگەیەکی بوونگەرایانەوە هەر هەبووە. بۆ نموونە، دەتوانین لای کۆمەڵێك نووسەری وەکو سانت ئیگناتیۆس * و سانت ئەتناسیۆس ** ئەمە ببینینەوە. بەڵام لە سەروەختی سانت پۆڵسەوە تادواتر، کاتێ دەگەینە لای سانت ئۆگستین (٣٥٤–٤٣٠)، دەگەینە گەورەترین و بەهێزترین نمایشی "بوونگەرایانە"ی مەسیحیەت، کە ئەمەش نمایشێکە تا ئێستا مەغزای خۆی هەیە و، تەنانەت بوونگەراکانی ئەمڕۆش چ –مەسیحیەکان و چ غەیرە مەسیحی–دان بە پەیوەندیی نزیکیاندا لەگەڵ بیرمەندی گەورەی باکووری ئەفریقادا دەنێن.

سانت ئۆگستین خودی مرۆڤی بە نهێنییەکی هەمیشە ئاڵۆز دەزانی: "ئەگەر مەبەستمان لە خەرەند قووڵایی نادیار بێت، ئایا دڵی مرۆڤ خەرەندە نییە؟ ئاخۆ شتێکی تر هەیە لەم خەرەندە قووڵتر بێت؟! ئادەمیزادەکان دەشێ قسە بکەن، بە خوێن و گۆشتەوە بیانبینین، گوێمان لێیان بێت کاتێ دەدوێن، بەڵام کێ دەتوانێ بچێتە ناو هزریانەوە و پەڕەی دڵیان ببینێت؟ ئایا تۆ لەو بڕوایەدا نیت کە قووڵاییەك لە ئادەمیزادا هەیە کە تەنانەت ئەو ئادەمیزادە خۆیشی پەی پێنابات؟[17] پاشان حەقیقەت و تێگەیشتن لە مەسەلەکاندا نین، هێندەی لە کەشفکردنی ئادەمیزادا هەیە بۆ قووڵاییەکانی بوونی خۆی لە ڕێی ئەزموونە زیندووە ڕاستەوخۆکانی ژیانییەوە: "ئەگینا تێگەیشتن ئەبێ چی بێت جگە لەوەی کە لە ڕێی نووری ئەقڵەوە ژیانێکی کاملتر و درەوشاوەتر بژین؟[18]" بەڵام ئەمە بانگەشەیەك نییە بۆئەوەی ئادەمیزاد لە گۆشەگیریدا بمێنێتەوە، ئەوەی لە قسەکانی سانت ئۆگستینەوە دەردەکەوێ سەبارەت بە خود، ئەوەیە کە ئەمڕۆ فەیلەسووفی نوێی بوونگەرایی جەختی لەسەر دەکات، بەوەی کە خود بەردەوام ناسەقامگیرە، وەك ئەوەی هەمیشە لە خۆی دەربچێت.

* یەکێکە لە پاپاکانی سەردەمی کڵێسا لە هەردوو سەدەی یەکەم و دووەمی پاش زاییندا.
** لە ساڵانی (٢٩٣–٣٧٣) دا قەشەی کڵێسای یۆنانی بووە.

بەم جۆرە ئۆگستین توانی بڵێت: "لەنێو خودی خۆتدا مەمێنەرەوە، ئەم خودەش تێپەڕێنە و، خۆت فرێدەرە ئامێزی ئەوەوەی کە خوڵقاندوویتیت"[١٩]. ئەم دێرە ئاماژە بۆئەوە دەکات کە سانت ئۆگستین وا لە بالآبوون (تعالی)ی ئادەمیزاد گەیشتووە کە بەرەو خودا ئاراستەکراوە؟ لێرەشدا ئەو وشانەیمان دێتەوە یاد کە ئاراستەی خودای کردوون "تۆ ئێمەت بۆ خۆت دروستکردووە و، دڵی ئێمەش ئارام نابێت هەر لەناو خۆتدا نەبێت"[٢٠] یان بە شێوەیەکی تریش دەڵێت: "بە مامزەی شاراوە وام لێدەکەیت ئارام نەبم تا ئەو ڕۆژەی دیدەی ڕۆحم بە یەقینەوە دەتبینێت"[٢١].

ئەم دوو ڕستەیە لە کتێبەکەی سانت ئۆگستینەوە وەرگیراون کە ناوی "دانپیانەکان Confessions"ە و لە دەوروبەری کۆتایی کتێبەکەدا سانت ئۆگستین لە چوارچێوەیەکی زەمەنیدا تیۆرە فەلسەفیەکەی خۆی سەبارەت بە خودی مرۆیی خستۆتە ڕوو، بە جۆرێك کە بە ڕابردوو و ئێستا و داهاتووەوە بەستراوەتەوە. دیسانەوە ئەم تیۆرەیەش بە شێوەیەکی بەرچاو بەر لە بیروباوەڕە تازەکان سەبارەت بە خودی مرۆیی هاتووە. هەروەها مرۆڤ دەتوانێت دەربارەی کۆمەڵێك شتی تری هزری ئۆگستین بدوێت. بۆ نموونە ڕای سەبارەت بە خۆشەویستی، یان تێگەیشتنی لەوەی ناوی دەنێت: "ترسی توندوتیژ chaste Fear" کە زۆر دوور نییە لە چەمکی نیگەرانی Angstەوە لای کیرکەگۆر. بەڵام لەوانەیە ئەوەی وتمان بەس بێت بۆ سەلماندنی ئەو پایە دیارەی کە سانت ئۆگستین لەو کەلەپوورە فیکریەدا داگیری کردووە کە باکگراوەندی فەلسەفەی بوونگەرایی پێکدێنێت.

تیۆلۆجیی مەسیحی چەند زیاتر ڕۆچووە ناو سەدەکانی ناوەڕاستەوە، ئەوەندە زیاتر بوو بە ئەقڵگەرایانە و فتواییانە و میتافیزیکییانە. پێدەچێ ئەو توێژینەوە تۆماییە تازانە ڕاست بکەن کە دەڵێن نووسینەکانی سانت تۆماس ئەکویناس (١٢٢٥-١٢٧٤) لە کۆندا بە جۆرێك لێکدراونەتەوە کە تیایاندا جەخت لەسەر ماهیەتە نەگۆڕەکان کراوە و بایەخی پێویست بە لایەنی بوونگەرایانە نەدراوە لە فەلسەفەکەیدا. بەڵام تەنانەت گەر ئەمەش

ڕاسـت بێـت، دەبـێ وریـا بـین و ئـەو جیاوازییـە زۆرەی لـە نێـوان شـێوازی تۆمـایی و بوونگەرایی نوێدا هەیە بۆ چەمکی بوونی مرۆیـی، گومڕامـان نـەکات. بـۆ گـەڕان بـە دوای زەمینە ڕێخۆشکەرەکانی بوونگەراییـدا لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا، نابـێ بـچینەوە سـەر فەلسەفەکەی تۆمای ئەکوینی، بەڵکو دەبێ بچینەوە سەر هەندێ تـەوژمی هـزری کـە دژ بە ئەقڵگەرایی هاتە گۆڕێ، کە ئەو دەمـە بـاو بـوو. مـن لێـرەدا بـە شـێوەیەکی تایبـەتی ئامـاژە بـۆ جـۆرێکی نـوێ لـە تەسـەووف **Mysticism** دەکـەم کـە سـەرلەنوێ ئـاوڕی لـە قووڵاییـەکانی ژیـانی ئـادەمیزاد دایـەوە. نوێنـەرانی ئـەم تەوژمـەش زۆرن، بـەڵام ڕەنگـە "مایـستەر ئیکهـارت" (١٢٦٠–١٣٢٧) کەسـێتییەکی نموونـەیی بێـت بـۆ ئـەم جـۆرەی تەسەووف، جگـە لـەوەی یەکێکـە لـەو کەسـێتییانەی کـە کاریگەرییـەکی درێژخایـەنیان لەسەر فەلسەفەی ئەڵمانی هەبووە تـا سـەردەمی هایدیگـەر. چـەمکی وەکـو "بـوون" و "نەبوون" لە هزری ئیکهارتدا بایەخێکی زۆریان پێدراوە. هەروەها چـەمکی "مـرۆڤ"یـش بەوپێیـەی کـە بوونەوەرێکـە بـە ئـەزموونی تـەنیایی بیابانـدا تێدەپـەڕێت. ئـەو دەڵێـت: "ماهیەتی خودا لـە بـێ ماهیەتیدایـەتی"[٢٢] مادامـەکی مـرۆڤیش لەسـەر شـێوەی خـودا خەڵق کراوە، بۆیە کلیلێکمان دەداتێ تا پەی بە نهێنیی خودایی بەرین: "بۆئـەوەی مـرۆڤ بە گەوهەری حەزرەتی یـەزدانی بگـات لەوپـەڕی باڵاییـدا، سـەرەتا دەبـێ لانـی کـەم بـە گەوهەری خودی مرۆیی خـۆی بگـات، چـونکە ئـەوەی خـۆی نەناسـێت، خـوای خۆیـشی ناناسێت.."[٢٣] پێویستە ئەوەش بڵێین کە "ئیکهارت" زۆر جەختی لەسەر ئەوە کـردووە کە ئەو جۆرە تەسەووفەی ئەو بەرگریی لێدەکات، نابێ تێڕامان بێت لە پێناوی تێڕاماندا، بەڵکو دەبێ ڕۆڵی لە بەرکەماڵکردنی ژیانی مرۆییدا هەبێت.

ئاخۆ هۆیەکی دیاریکراو هەیە لە پشت سـەرهەڵدانەوەی بابەتـە بوونگەراییەکانـدا لـە کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا؟ مێژوونووسەکانی ئـەم قۆناغـە ئاماژەیـان بـۆ ئـەوە کـردووە کـە بڵاوبوونـەوەی تـاعوون و شـەڕ و هـەراوزەنای سیاسـی و ئـایینی کۆمەڵـە فاکتەرێك بوون کە متمانەیان بە ئەقڵگەرایی لاواز کرد، هەروەها بەو فەلسەفانەش کە بـە

ڕواڵەت وا دیاربوون زۆر تۆکمەن. ژیان شتی بێسەروبەری زۆرە و، هەر بۆیە لە چاخەکانی دواتری هزری خۆرئاوادا ململانێی نێوان فەلسەفە دژەکان توندوتیژتر بوو.

## ٤–ڕیفۆرمی ئایینی، ڕینێسانس، چاخی ڕۆشنگەری

لە دەستوورەکانی مارتن لۆتەر (١٤٨٣–١٥٤٦)دا بە شێوەیەکی ئاشکراتر لەهەر ڕیفۆرمیستێکی ئایینیی تر، بابەتە تایبەتەکان بە بوونگەرایی دەبینینەوە. ئەو هەوڵی ئەدا مەسیحیەت بگەڕێنێتەوە بۆ شێوە پاکژ و بێگەردەکەی. لەوەش دەچێت توخمە بوونگەراکانی ناو کەلەپووری مەسیحی کاریگەرییەکی زۆریان لەسەری هەبووبێت، بە تایبەتیش نووسینەکانی سانت پۆڵس و سانت ئۆگستین.

لۆتەر لە نووسینە سەرەتاییەکانیدا و لە بەرگێکی نوێدا، ئەو نارەزاییانەی پێغەمبەرەکان زیندوو دەکاتەوە کە بەشێکی گرنگی تانوپۆی چاخی کۆن و چاخی نوێ (واتە تەورات و ئینجیل) پێکدەهێنن. لۆتەر دژ بە سیستمی بە پیرۆز ڕاگرتن و ڕووکەشبازی و وشکیی سیستمی کڵێسا و گەندەڵیی ئایین دەوەستێتەوە و لەبری ئەوانە بەرگری لە هەڵبژاردن و ئازادیی مرۆڤی مەسیحی و بەرپرسیارێتیی بوونی تاکەکەس لەناو کۆمەڵگای مەسیحیدا دەکات.

تەوەری تێگەیشتنی نوێی ئەو بۆ مەسیحیەت لە بۆچوونی ئەودایە بۆ ئیمان، ئەم بۆچوونەشی توخمێکی بوونگەرایانەی زۆر ڕوونە لە دەستوورەکانیدا. بە ڕای لۆتەر ئیمان وایلێهاتبوو بایەخێکی زۆری بە قبوڵکردنی بیروباوەڕە ئایینییەکان ئەدا و، زۆر گرنگیی بە پەیوەندیی بوونگەرایانەی تایبەتی نێوان خودا و مرۆڤ نەدەدا. لێرەوە دەبینین کە هەردوو دەستەواژەی "لە پێناوی مندا" و "لە پێناوی ئێمەدا" کلیلی تێگەیشتنی لۆتەرن بۆ ئیمان. لەبەرئەوەی ئیمانی ڕاستەقینە وا لە کارەکانی خودا دەگات کە لە "پێناوی ئێمە"دایە و، وا دانی پیانانێت کە بەوپەڕی سادەییەوە بە تەنها

بریتین لە هەندێ ڕاستیی مێژوویەکی دەرەکی. دەکرێ واش بڕوانینە ئەم تێگەیشتنە بۆ ئیمان کە جەختکردنی لۆتەرە لەسەر گرنگیی ڕاناوی "تۆ" لە قسەکردنەکەی خوادا لەگەڵ مووسادا "من یەهووە، خودای تۆم". (کتێبی دەرچوون، بەشی ٢٠، ئایەتی ٢). کاتێ یەزدان ڕایدەگەیەنێت کە خوای تۆیە، مانای وایە گفت ئەدات و بەرامبەر گەلەکەی ئیلتیزام دەنوێنێت، کەواتە ئەم خودایە خودایەکی بە تەنها تیۆری یان میتافیزیکی نییە، بەڵکو خودایەکە ڕۆدەچێتە نێو بوونی ئادەمیزادەوە.

لەوانەیە ئەم تێگەیشتنە بوونگەرایانەیەی لۆتەر بۆ ئیمان و تیۆلۆجی زۆر بە ڕوونی لە گرنگیدانیدا بە مەسیحناسی **Christology** دەربکەوێ.

ئەو لە جیاکارییە سکولایی و ململانێ میتافیزیکیەکان بێزار بوو کە سەبارەت بە کێشەی خودا– مرۆڤ بوون. لێرەشدا دیسانەوە بیرۆکەی مەسیح "لە پێناوی ئێمەدا" چارەسەری کێشەکەمان بۆ دەکات. خاڵی دەسپێکردنیش لەو لێکۆڵینەوانەدا کە پەیوەستن بە کەسێتیی مەسیحیەوە ڕادەی جڵەوکردنی مەسیحە بۆ ژیانی ئیماندار. هاوڕێ لاوەکەی لۆتەر "فیلیپ میلانگتۆن" (١٤٩٧–١٥٦٠) بەم جۆرە گوزارشت لەم شێوە ناسینە بوونگەرایانەیەی کەسێتیی مەسیح دەکات: "ناسینی مەسیح واتە ناسینی بەخششەکانی". ڕاستە چ لۆتەر و چ میلانگتۆن لەو هێرشەیان پاشەکشێیان کرد کە کردیانە سەر تیۆلۆجیی بوونگەرا، بەڵام ئەوان شێوازێکیان لە بیرکردنەوە سەبارەت بە کەسێتیی مەسیح دەستپێکرد کە لە ئایینی پرۆتستانتیدا بەردەوام بوو و دەکرێ ئەو شێوازە لە بەرگە نوێکەیدا لای "ڕیشل" لە سەدەی نۆزدەیەمدا و لای "بۆڵتمان" لە سەدەی بیستەمدا ببینینەوە.

لای "لۆتەر"یش ڕەشبینترین توخمی هزری بوونگەرا دەبینینەوە: هەستکردن بە بێچارەیی مرۆڤ و گوناه و ئارەزووی بۆ ڕزگاربوون، هەندێ بیرۆکەی زاڵبوون لای. لە پاڵ ئەمانەشدا لۆتەر متمانەی بە ئەقڵ نەمابوو، ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی کە هەندێ جار لە پایەی ئەقڵ دابەزێنێت.

ئەم لایەنە تاریکەی هزری لۆتـەر بـووە مایـەی پێکدادانی لەگـەڵ ڕێبـازی مرۆگـەرای پەرەسـەندوودا لـە سـەردەمی ڕینێسانـسدا و، لـە ڕووبەڕووبوونەوەیـەکی بەناوبانگـدا "دێزیـدۆرس ئیرازمـۆس" (١٤٦٧–١٥٣٦) هەڵوێـستێکی دژی بەرامبـەر لۆتـەر هـەبوو سەبارەت بە کێشەی ئازادیی مرۆڤ و بەرپرسیارێتییەکەی، کە بە ڕای ئیرازمۆس ڕیفۆرمی ئایینی بە هیچ جۆرێك دانی پێدا نەدەنا و ڕەتـی دەکردەوە، بـەڵام وێـڕای ئـەوەش لـەو سـەردەمەدا ئیرازمـۆس و گـەورە بیرمەنـدانی مرۆگـەرایی (هیومـانیزم) شۆڕشـیان دژ بـە ئاقـاری سـکولایی بـەرپا کردبـوو، هەنـدێ تـوخمیش لـە دەسـتوورەکانیاندا هەیـە کـە دەتـوانین هاوسـۆزییان تیـا ببینینـەوە لەگـەڵ هەنـدێ لایـەنی بوونگـەرایی نوێـدا و بـە تایبەتیش ئەو جـۆرەی بوونگـەرایی کـە یاسـپەرز نوێنـەرێتی و جـەخت لەسـەر گرنگیـی ئازادیی مرۆڤ و کەرامەت و توانا ئەقڵییەکانی دەکات.

نموونەی ئەم مرۆگەراییەش لـەو برگـە بەناوبانگـەی "گوتارێـك دەربـارەی کەرامـەتی مـرۆڤ"دا دەبیـنین کـە توێـژەری ئیتـالی لـە چـاخی ڕینێسانـسدا جیۆڤـانی پیکـۆ دیلـلا میراندۆلا" (١٤٦٣–١٤٩٤)، تیایدا هێرشـی کـردە سـەر ئـەو بیرۆکـە سـکۆلاییەی کـە لـە چاخی سکۆلاییدا باو بوو و دەڵێت کە مرۆڤ سروشتێکی سـەقامگیر و نـەگۆڕی هەیـە. لـە ڕاستیـشدا لـەم ڕووەوە پـێش تێزەکـەی سـارتەر کـەوت لـەوەدا کـە مـرۆڤ خـۆی خـۆی دیاریدەکات، گەرچی ئەو لە چوارچێوەی پەیوەندیدا بە کەرامەت و ئەقڵانیەتی مرۆڤـەوە ئەوەی خستۆتەڕوو. ئەو وای هێناوەتە بەرچاوی کـە خـوا بـە مـرۆڤ دەڵێـت: "سروشـتی سنووورداری ئەو بوونەوەرانەی دی خراوەتە نـاو چوارچـێوەی ئـەو یاسـایانەوە کـە ئێمـە دامانناون. بەڵام لەبەرئەوەی تۆم سەرپشك کردووە، تۆ ناچیتە نـاو ئـەو چوارچـێوەیە و بەڵکو خۆت سنووری سروشتیی خۆت دیاری دەکەیت، تۆ وەکو ئەو قازیـەیت کـە لەبـەر پـاك و بێگـەردیی هەڵبـژێردراوە، تـۆ خـۆت خوڵقێنـەری خۆتیـت و دروسـتکەری خـودی خۆتیت و، دەتوانیت چۆنت بوێ وا خۆت بخەیتەڕوو"[٢٤].

بەڵام زانست لە چاخی ڕینێسانسدا فاکتەرێکی نوێی هێنایە ئاراوە کە کاریگەریی خۆی هەبوو بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ لە خۆی. مەبەستیشمان لەو زانستە کۆسمۆلۆژیا یان گەردووناسی Cosmologyی نوێیە کە لەسەر بناغەی کارەکانی "کۆپەرنیکۆس" و "گالیلۆ" و "کێپلەر" و "نیوتن" دامەزرا. وەختی ویست تا ناوەرۆکی ڕاستەقینەی لابردنی زەوی لە سەنتەری گەردووندا ئاشکرابوو، بەڵام تا دەهات ئادەمیزاد هوشیارتر دەبوو بە بچووکیی گرنگییە ڕووکەشەکەی لەم گەردوونە بەربڵاوە بێکۆتاییە لە شوێن و زەمەندا.

بلایز پاسکال (١٦٢٣-١٦٦٢) یەکەم کەس بوو کە لە ختوورەکانیدا Pensees تەعبیری "لەو هەستە تازەیەی مرۆڤی ڕێبواری ئەم گەردوونە" کرد. زۆریش هەن دەڵێن پاسکال لە زۆری بیروبۆچوونیدا پێش بوونگەرایی کەوتووە. لەبری ئەو متمانەیەی کە مرۆڤ هەستی پێدەکرد کاتێ وایدەزانی کە سەنتەری گەردوونە، ترسێك لە خامۆشیی فەزای بێکۆتایی جێیگرتەوە. ئەو بەڵگانەی کە بۆ سەلماندنی بوونی خوا و چارەنووسی ئەبەدیی مرۆڤ لە ئارادا بوون، قەناعەتپێکەر نەبوون، تەنانەت گەر واش بوونایە، ئایا ڕێێ تێدەچێت خوایەك کە بەم بەڵگانە بوونی بسەلمێنرێ ئەو خوایە بێت کە مرۆڤ بە ڕاستی پێویستی پێیەتی؟ یان ئەو خوایەی کە مرۆڤ پێویستی پێیە بە تەنها لە ڕێی ئیمانەوە هەیە و ئەویش "خواکەی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبە، نەك خوای فەیلەسووفان و زانایان". ڕای مرۆڤ هەرچییەك بێت لەسەر گرەوی باوەڕهێنان بە خوا لای پاسکال، کە پێی دەڵێن بەڵگەی گرەو (تا ڕادەیەکی زۆر ئەمەش پوختەکەیەتی: ئێمە دەبێ بە ژیانمان گرەو لەسەر بوونی خوا بکەین، لەبەرئەوەی ئەگەر ئێمە هەڵە بین، ئەوە هیچمان لەدەست ناچێت، خۆ ئەگەر ڕاستیش بین ئەوا پاداشتێکی هەتاهەتاییمان دەستدەکەوێ). لانی کەم دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئەم گرەوە تێگەیشتنێك بۆ گەردوون لە خۆی دەگرێت کە لە بنەڕەتدا گەردوون تەمومژاوییە و مرۆڤ ناچارە لە سای

سەرچڵی(ریسک)دا و بەبێ زانینێکی تەواو، گرنگترین بڕیارەکانی خۆی بدات. هەروەکو پاسکالیش دەڵێت: ئێمە دیوەکانی تری کاغەزی یاریەکە نابینین* .

لە دیکارت بەدواوە ڕەوتی سەرەکیی فەلسەفەی خۆرئاوا، ڕەوتێکی ئەقڵگەرا و ئەقڵپەرست بوو. هەندێ جاریش شێوەی ئەقڵگەراییەکی وەرگرتووە کە زۆر متمانەی بە خۆی هەبووە، وەکو چۆن لای "کریستیان ڤۆلف"* ڕابەری بزاڤی ڕۆشنگەری لە ئەڵمانیا دەیبینین. ئەو بڕوای وابوو کە تەنانەت حەقیقەتەکانی ئایینیش دەتوانین بە شێوەیەکی ماتماتیکانە دابڕێژین.

هەندێ جاری تریش، هەروەکو لای "داڤید هیوم" و "ئەمانۆییل کانت" دەیبینین، ئەقڵ ئاراستەیەکی گومانکارانەی هەبووە، گەرچی لە هەردوو ئەم حاڵەتانەدا سەروەری هەر بۆ ئەقڵ بووە.

سەرباری ئەمانەش، هەندێ دەنگ هەبوون و هەن کە هەر لایەنگری ئەو هەڵوێستە بوون کە ئەمڕۆ پێی دەڵێین هەڵوێستی بوونگەرا. لە دیارترین ئەم دەنگانەش یۆهان گیۆرگ هامان (١٧٣٠–١٧٨٨) بوو کە ڕەخنەی لە فەلسەفەکەی کانت و ئەقڵگەرایی سەردەمەکەی خۆی گرت، هەروەها کاریگەرییەکی زۆری لەسەر هزری کیرکەگۆر جێهێشت و لە زۆر خاڵدا پێش بیروڕاکانی کیرکەگۆر کەوت.

"هامان"یش وەکو کیرکەگۆر کەوتە ململانێوە لەگەڵ مەسیحیەتدا و هەروەها لەگەڵ کێشەی ئیماندا لە چاخی ئەقڵدا. هامان ئەو بیرۆکەیەی ڕەتکردەوە کە دەڵێت دەکرێ ئەقڵ پشتیوانی لە ئیمان بکات یان ڕێبازێك بۆ ئیمان دابمەزرێنێ کە هەموو مەسەلەکانی ئیمان لە خۆی بگرێت. "من تاقەتی حەقیقەتەکان و پرنسیپەکان و ڕێبازەکانم نییە،

---

* پاسکال لەبەرئەوەی بازرگانێکی گەورە بوو، هەروەها قوماربازیش بوو، بۆیە ڕەنگدانەوەی ئەوە لەسەر بیروباوەڕە تیۆلۆژی و فەلسەفیەکانی دەبینینەوە .

* کریستیان ڤۆن ڤۆلف(١٦٧٩–١٧٥٤)فەیلەسوفێکی ئەقڵانیی ئەڵمانیە کە ئاقاری سکولایی بووژاندەوە.

بەڵكو بە تەنها تاقەتی وردەواڵە و شتە پارچەكان و خەیاڵات و سرۆشە كتوپڕەكانم هەیە". هەروەها دەڵێت: "ئەگەر ئەوانە گێلەكانن كە لە دڵی خۆیاندا دەڵێن "خوا نییە"* من لەو بڕوایەدام ئەوانەش كە دەیانەوێ بوونی خوا بسەلمێنن لەوان گێلترن. خۆ ئەگەر ئەو سەلماندنەش لە ڕێی ئەقڵ و فەلسەفەوە ئەنجام دەدرێ، ئەوا كفركردنیش لە ڕێیانەوە گوناە نییە"[٢٦]. خۆناسین (مەعریفە بە خود) زیاتر لەگەڵ ئیماندا دەگونجێت وەك لە ئەقڵی ماتماتیكی، خۆناسینیش جۆرە زانینێكی عاتیفییە، بەڵكو هامان دەیتوانی دەربارەی "دۆزەخی خۆناسین"یش بدوێ[٢٧]. كتێبی پیرۆزیش خۆناسینمان پێدەبەخشێت: "مێژووی كتێبی پیرۆز چ نییە جگە لە پێشبینیكردنێك كە لە هەموو سەدەیەكدا و لە ڕۆحی هەموو مرۆڤێكدا دێتە دی.." من مێژووی ژیانی تایبەتیی خۆمی تیا دەخوێنمەوە"[٢٨].

هامان تا ڕادەیەكی زۆر سەیر خۆی بە نامۆ دەزانێت بەو جیهانە ئەقڵییە تۆكمەیە، جیهانی سەدەی هەژدەیەم، بەڵام ئێمە دەتوانین لە هاماندا بەردەوامبوونی ئەو نارەزاییەی بوونگەرایی ببینینەوە كە پاش ماوەیەك دەگاتە كیركەگۆر و، ئەویش بە شێوەیەكی بەهێزتر گوزارشتی لێدەكات.

## ٥–بوونگەرایی نوێ

## سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم

تا ئێرە قسەمان لەسەر ئەو ئاماژە و ئاقارە پەرشوبڵاوانە و ئەو فەلسەفە و بزاڤە ئایینیانە كردووە، كە خزمایەتییان لەگەڵ ئەو فەلسەفەیەدا هەیە كە ئەمڕۆ پێی دەڵێن: بوونگەرایی.بەڵام ناتوانین ناوی بوونگەرایی بەسەر ئەمانەدا دابڕین، ئەگینا دەكەوینە

* ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەو قسەیەی سانت پۆڵس كە دەڵێت: "گێلیش لە دڵی خۆیدا دەڵێت خوا نییە".

بەهەڵەداچوونی مێژوویی‌یەوە*. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵماندا ئەوە ڕوون بکەینەوە کە ڕەگوڕیشەی ئەم دیاردە نوێیە، لە ڕابردووی کۆنیشدا هەبووە و، کاتێکیش لەسەر شانۆی سەردەمی نوێدا بەدەرکەوت، دەزانین کە ماوەیەکی زۆر لە قۆناغی دووگیانی و ژاندا مایەوە و، هەروەها ئەوەش دەبینین کە شێوە جیاوازەکانی ڕەنگدانەوەی جیاوازییەکانی زوویەتی.

لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمدا ململانێ لە نێوان ئەقڵانیەتی چاخی ڕۆشنگەری و سەرهەڵدانی ڕۆحی ڕێبازی ڕۆمانتیسیزمدا هاتبووە ئاراوە. بەڵام ئێمە ناتوانین بوونگەرایی و ڕۆمانسیزم پێکەوە ببەستینەوە، مەگەر تەنها بەو مانایەی کە هەردووکیان دژایەتیی ئەقڵپەرستیی تەسکبینانەیان دەکرد. لەبەرئەوەی بوونگەراکان هەرچۆن دژایەتیی ئەقڵانیەت دەکەن، بە هەمان شێوە دژایەتیی ئاقاری جوانپەرستی Aestheticism** و عاتیفەگەرایی Sentimentalism*** دەکەن.

عادەتەن سۆرین کیرکەگۆر (١٨١٣–١٨٥٥) بە باوکی بوونگەرایی نوێ دەژمێردرێ. ئەو یەکەم فەیلەسووفی ئەوروپییە پێی بوترێ بیرمەندی بوونگەرا (ئێگزیستانسیالیست). کاتێ کە قسەمان لەسەر شێوە جیاوازەکانی بوونگەرایی کرد، بە کورتی ئاماژەیەکیشمان بەم دا.

ئێمە لێرەدا نامانەوێ پوختەیەکی چڕی بیروڕاکانی بخەینە ڕوو، لەبەرئەوەی کارەکانی هێند گەورە و فراوانن کە هەروا بە ئاسانی کورت ناکرێنەوە. بەڵام بەهەرحاڵ،

---

* anachronism واتە ناوێکی زۆر نوێ لە هەندێ مەسەلەی کۆن بنرێ کە چ پەیوەندییەکیان بە نوێوە نییە.

** ئەو ئاقارەیە کە بەها ئیستاتیکییەکان ئەخاتە سەروو هەموو بەهایەکی ترەوە،بۆ نموونە کارێکی هونەری چ پەیوەندییەکی بە ئاکارو سیاسەت و ئایینەوە نییە،لەبەر ئەوەی هەموو بەهاکانی دی لە بەها ئیستاتیکییەکانەوە وەرگیراون.

*** ئەو ئاقارەیە کە عاتیفەو سۆزو ویژدان ئەخاتە سەروو ئەقڵەوەو ئەمەش لە سیماکانی بزاڤی ڕۆمانتیسیزمە.

بە درێژایی ئەم كتێبە بەردەوام ئاماژەی بۆ دەكەین. لەگەڵ ئەمانەشدا، كیركەگۆر لە زۆر لایەنەوە وەكو بیرمەندێكی نموونەیی بوونگەرایی دەمێنێتەوە و، لەبەرئەوە ناچارین شتێك سەبارەت بە رۆڵی ئەو لە پەرەسەندنی مێژوویی فەلسەفەی بوونگەراییدا بڵێین.

بەر لە هەموو شتێك دەتوانین سەرنجی ئەوە بدەین كە بەلای زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراكانەوە پەیوەندیی نێوان ژیان و هزر (فیكر) پەیوەندییەكی گرنگە.

كیركەگۆر لە كەشوهەوایەكی ئایینیدا پەروەردە بوو، پێدەچێ هەستكردن بە گوناهێكیش بە سەریدا زاڵبووبێت كە خێزانەكەیان كردوویەتی. پاشان دەكەوێتە نێو ماجەرای خۆشەویستییەكی بەدبەختانەوە و، كیژۆڵەیەك نیشانە دەكات كە ناوی "رێژینا ئۆڵسن" دەبێت و دواتریش هەڵیدەوەشێنێتەوە. جگە لەمانە مەیلی بەلای لەخۆ وردبوونەوە و رەشبینیدا هەبوو. لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا لە یادەوەرییەكانیدا دەنووسێت كە "لە ناوەوە كەرت كەرت بووە" و "هیچ ئومێدێكی بەوە نییە كە ژیانێكی دونیایی بەختەوەرانە بژی"[٢٩]. لەبەرئەوە جێی سەرسوڕمان نییە لای كەسێكی وا چەمكی "تاكەكەس" و "مرۆڤی ئاوارتە" ببنە چەمكی سەرەكی لەبیركردنەوەیدا و، هەروەها خودێتی Subjectivity و هەستیارێتی ببنە پێوەری حەقیقەت و رەسەنایەتی لای ئەو.

بە پێی ئەم بۆچوونە ئێمە بە تەنها لەو چركەساتانەی بوونماندا دەگەینە راستی Reality كە چركەساتی قووڵ و چڕن، بە تایبەتیش چركەساتەكانی بڕیارە ژانابوییەكان. "لە كاتی هەڵبژاردندا ئەوەی گرنگە مەسەلەی هەڵبژاردنی راست نییە، هێندەی كە چالاكی و جۆش و خرۆش و ئەو سۆزە هەڵچووە گرنگە كە لەگەڵ ئەم هەڵبژاردنەدا هاوكاتە. بەم شێوەیە كەسێتی تەعبیر لە ناكۆتای ناوەوەی خۆی دەكات، هەروەها بەم شێوەیەشە كە كەسێتی پتەو دەبێت"[٣٠]. ئەم چركەساتانە چركەساتی نیگەرانیی قووڵیشن "گێژبوونی ئازادیی هەڵبژاردن، ئەم گێژبوونەش كاتێ روودەدات كە ئازادی لە توانستەكانی خوارەوەی خۆی دەڕوانێت"[٣١] ئەو ژیانەی كە لەم چركانەدا دەیناسین،

ناتوانین بۆ سیستمێك لە بیر و وێنای بگەڕێنینەوە، لەبەرئەوەی مۆرکی ژیان لە بنەڕەتدا پارچەپارچەبوونە، کە زەحمەتە پێکیانەوە ببەستینەوە، مەگەر واقیع بشێوێنین. هەر لێرەشەوەیە کە کیرکەگۆر هێرشێکی توند دەکاتە سەر "سیستم"ەکەی هیگڵ بەو شێوەیەی کە لێی تێگەیشتووە.

کیرکەگۆریش وەکو هامان سەرقاڵی کێشەی ئایین و چۆنێتیی بە مەسیحیبوون دەبێت و، دەڵێت کە "خود"ی مرۆیی لە سێ قۆناغدا بەرەو پێش دەچێت: قۆناغی هەستی جوانپەرستی (ئیستاتیکی)، پاشان قۆناغی ئاکاری و دواجاریش قۆناغی ئایینی. بەڵام ئەم قۆناغانە ناخرێنە ناو قاڵبی ئەقڵییەوە و شێوازی مەنتیقیانەی بەسەردا ناسەپێنرێ، مەسیحیەت خۆی ناودژ ئامێزە (موفارەقەیە) و پێویستی بە بازێك هەیە بەرەو ئیمان. ئەوەی کە لای خەڵکیش بە مەسیحیەت ناسراوە، کۆمەڵێك دەستووری وشك و مردوو و کۆمەڵێك سرووتە کە کڵێسای سوننەتی (تەقلیدی) ئەنجامی دەدات و، جگە لە گومڕابوون و لادان هیچی تر نییە.

کیرکەگۆر لە کۆتاییەکانی ژیانیدا، ڕۆژ دوای ڕۆژ هێرشی توندتری دەکردە سەر دامودەزگا مەسیحیەکان. ئەو لەو یادەوەرییانەی ساڵانی دوایی تەمەنیدا دەڵێت کە مەسیحیەت لە جاران زیاتر نکووڵی لە جیهان و بڕیارەکانی ناوەوەی تاکەکەس دەکات "ئەو مەسیحیەتەی کە چاخی نوێ (واتە ئینجیل) وێنای دەکات، لەگەڵ ئیرادەی مرۆڤدا مامەڵە دەکات، هەموو شتێك لەسەر گۆڕینی ئەم ئیرادەیە وەستاوە، هەر دەستەواژەیەکیش بگرین (وەکو تەرکی دونیا بکە، خودی خۆت نەوێت، گوێ بە دونیا مەدە، هەروەها بانگەشەکردن بۆئەوەی مرۆڤ ڕقی لە خۆی بێتەوە و خودای خۆشبوێت.. هتد) پەیوەستە بەو بیرۆکە سەرەکییەوەی کە مەسیحیەتی لەسەر بەندە، واتە گۆڕینی ئیرادە. بەڵام مەسیحیەت لە جیهانی مەسیحیدا گۆڕا بۆ کۆمەڵێك بۆچوونی ئەقڵی و، بەم جۆرە بوو بە تیۆری و، وامان لێهات هەموو بایەخدانمان تەنها بەوە بێت کە ئەقڵییە[٣٢]".

كیركەگۆر پێشینەی ڕاستەوخۆی نەبوو، بگرە كارەكانیشی لـە سـەدەی نۆزدەیەمـدا بەرز نەنرخێنران، بـەڵكو لـە سـەدەی بیـستەمدا گرنگییـان پێـدرا. لەگـەڵ ئەمەشـدا ئـەو ئاقارانەی كە ئەو خستنیە ڕوو هێندەی نەبرد كە لە شێوەی جۆراوجۆردا دەركەوتن.

بێگومان "فریدریش نیـچە" (١٨٤٤–١٩٠٠)ش لـە پێكهێنـانی فەلـسەفەی بوونگـەرای هاوچەرخدا بە ئەندازەی كیركەگۆر گرنگیی هەیە. هەم هایدیگەر و هـەم یاسـپەرزیش بـە وردی سەبارەت بە فەلسەفەكەی نیچە نووسـیویانە و لـە سـەرهەڵدانی بووونگەراییـدا بـە كەسێتیی سەرەكییان لـە قەڵـەم داوە. بگـرە لـە مێـژووی فەلـسەفەشدا بـە شـێوەیەكی گشتی، لەبەرئەوەی نیچە كۆتایی بە چاخی كلاسیك دەهێنێت لە فەلسەفەی خۆرئاوادا و دەبێتە ڕێنومایيكەرێك لە جیهانێكی نوێی نامۆدا كە جیهانی ئێستامانە.

"نیچە"ش وەكو كیركەگۆر زەمینەیەكی ئایینیی هەبوو. ئەویش سـەر بـە خێزانێكـی ڕۆحانی (ئیكلیریكی) بوو. هەستیارێتیی زۆری بەرەو شێتی ڕاپێچی كـرد. وێـڕای ئەمـە و سەرباری لێكچوونەكانی لەگـەڵ كیركـەگۆردا، بـەڵام مەبەسـتە بوونگەرایانـەكان لای ئـەم (گەر بتوانین ئەم دەربڕینـە بـەكاربهێنین) بـە شـێوەیەكی تـەواو جیـاواز دەركـەوتن. لـە كاتێكا كیركەگۆر بایەخی بە چۆنێتیی بە مەسیحیبوون ئەدا، نیچە بایـەخی بـە چـۆنێتیی دەرچـوون لـە مەسـیحیەت ئـەدا، لەبەرئـەوەی بـە بۆچـوونی نیـچە، ئیمـانی مەسـیحی "خۆكوشتنێكی لەسەرخۆی ئەقڵە"[٣٣].

لە كاتێكیشدا كیركەگۆر قایلدەبێت قوربانی بە ئەقڵ بدات، نیـچە ئـەم قوربانیكردنـە ڕەتدەكاتـەوە و وا دەڕوانێتـە مەسـیحیەت كـە قوربانیدانـە بـە ڕۆحـی مرۆیـی و بگـرە شێواندنی ئەم ڕۆحەشە و زەوتكردنی ئازادییەتی، بۆیە پێویستە مەسـیحیەت تێپـەڕێنین و تیـۆرەی بـاڵامرۆ Superman بخەینـە جێـی، واتـە ئـەو مرۆڤـەی كـە خـودی خـۆی تێدەپـەڕێنێت و ئەمـەش تیۆرەیەكـە جـەخت لەسـەر جیهـان و ژیـان دەكاتـەوە و بـەم جۆرەش بە پێچەوانەی تیۆرەی مەسیحیەتە كە بانگەشە بۆ تەركردنی دونیا دەكات.

زۆر شت دەربارەی "مەرگی خواوەند لە هزری نیچەدا" نووسراوە. ئەو دەڵێت "خواوەند مردووە، بە مردوویش دەمێنێتەوە و ئێمە کوشتمان"(٣٤). مەرگی خواوەند بە مانایەك لە ماناکان مرۆڤ ئازاد دەکات، بەڵام بە مانایەکی دی گوزارشتە لە لایەنی ڕەشبینی لە فەلسەفەکەی نیچەدا و، دەمانباتە ناوچاخی نیهیلیزم (عەدەمیەت)ەوە. پاشان جەختکردنەوەی مرۆڤ لەسەر خودی خۆی و سەلماندنی ئەو خودە لەسەر زەمینەیەك ڕوودەدات کە بریتییە لە جیهانێکی پووچی نامەعقول absurd کە یەزدانی تیا نییە و، ئەو یاسایەی تیاشیدا بالادەستە یاسای "گەڕانەوەی هەتاهەتایی"ە. هەروەکو فەلسەفەکەی کیرکەگۆریش، فەلسەفەکەی نیچە بە پارادۆکس "موفارەقە Paradox"ێك کۆتایی دێت کە دەتوانین بڵێین بووەتە مایەی وێرانکردنی فەیلەسووفەکە خۆی. یەکێك لە تۆژەرەوەکانی نیچە کە ناوی "م. م. بۆزمان"ە دەڵێت: "خواستی پەرستنی خواست و، خواستی سەرفرازی و سەرکەوتن و، خواستی وتنی "بەڵێ" و ئامین" بۆ ژیان تێکەڵ بوو بە بیروباوەڕی گەڕانەوەی هەتاهەتایی و ئەو تێکشکان و ئازارە زۆرەی نیچە خۆی، کە جاری وابوو، دەبوون بە ئازارێکی زەینیی ترسناك"(٣٥).. دەشتوانین بڵێین کە ئەم ئازارانە، بە مانایەك لە ماناکان ئازارەکانی ئەو سەردەمە و نیگەرانیی ئەو سەردەمەن کە لە ناخی فەیلەسووفەکەدا ڕەنگیانداوەتەوە، هەر ئەوەشە نیگەرانیی سەرەکیی فەلسەفەی بوونگەراییش.

پێدەچێ بەردەوامبوون لەسەر ئەو نیگەرانییەی نیچە شتێکی ئەستەم بووبێت، بەهەرحاڵ بوونگەرایی ئەڵمانیی دواتر (یان فەلسەفەی بوون وەکو نوێنەرەکانی ئەم ناولێنانەی بە پەسەند دەزانن) هەوڵی دا خۆی لەو تەنگژەیە قوتاربکات کە نیچە بۆ خۆی دروستکرد. کارل یاسپەرز (١٨٨٣-١٩٦٩) کە پزیشکێکی دەروونی بوو، ئەوەندەی نەبرد بایەخی بەوەدا کە خۆی ناوی نا "هەڵوێستە سنووردارەکان"* ی ژیان،

---

* هەڵوێستە سنووردارەکان: واتە ئەو هەڵوێستانە یان ئەو دۆخانەی کە "سنوورێك" لە بەردەم توانای مرۆڤدا دادەنێن و ناتوانێت لێیان قوتاربێت، وەکو: مەرگ و عەزاب و خەبات و گوناه و.. هتد .

كاتێك مرۆڤ ڕادەوەستێ و پشتی لە دیوارە، گەر ئەم دەربڕینە ڕاست بێت، ئیدی هەوڵەكانی بێهوودە دەبن و دەبێت بە "پارچە شكاوەكانی كەشتییەك" یان دوچاری "شكست" دەبێت. بەڵام ئەنجامەكە لێرەدا ئەنجامێكی نیهیلیستی نییە، بەڵكو هەروەكو یاسپەرز دەڵێت، لەم جۆرە هەڵوێستانەدایە كە حەقیقەتی باڵابوون **Transcendence** لە بەردەمی مرۆڤدا واڵا دەبێت. بەرهەمە زۆر و تا ڕادەیەك دووبارەبۆوەكانی یاسپەرز، هەم توێژینەوەن لەسەر پەیوەندییەكانی نێوان بوونەوەری مرۆیی و جیهان لە سەرێكەوە و، لە نێوان بوونەوەری مرۆیی و باڵابووندا لە سەرێكی ترەوە. لە كاتێكا تەواوی زانین (مەعریفە)ی ئێمە شێوەی "خود– بابەت" بە خۆیەوە دەگرێت، ئێمە لەم هەڵوێستە سنووردارانەدا پەی بە "سەراپاگیر" یان "گشتگیر" دەبەین، كە لە یەك كاتدا هەم خود و هەم بابەتیش لە خۆی دەگرێت:

بیركردنەوەكەی یاسپەرز ئەو بەرەو "ئیمانی فەلسەفی" دەبات كە ناسەلمێنرێ، لەبەرئەوەی زانینێكی بابەتیانە نییە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هەڵوێستە بە تەنها هەڵوێستێكی خودی نییە، گەرچی باڵابوونیش شتێكی زانراو نییە، بەڵام بە زمانی "جفرە **Ciphers**" قسەدەكات.. لە بەشەكانی داهاتوودا قسە لەسەر ئەم بیروبۆچوونانە دەكەین.

هەروەها "مارتین هایدیگەر" ( ١٨٨٩–١٩٧٦ )یش خۆی لەم تەنگژە نیهیلیستییە ڕزگار دەكات. گەرچی هەندێ هەڵوێست لە فەلسەفەكەیدا هەن كە وا نیشان ئەدەن بەرەو ئەو تەنگژەیە دەچێت. لەو فاكتەرانەی كاریگەرییان لە پێكهێنانی هزری ئەودا هەبوو: فینۆمینۆلۆجیی هۆسێرل و، بایەخدان بە كێشەی "بوون" كە لە برینتانۆ* وە وەریگرتووە، هەروەها كاركردن لەسەر زمان (كە دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو ڕۆژانەی لە خوێندنگەیەكی زانستیی یەسوعی دەیخوێند). هەروەها جێی ئاماژەپێدانە كە ئەو

---

* فرانزبرینتانۆ(١٨٣٨–١٩١٧) فەیلەسوفێكی نەمساوییە دژ بە ڕێبازە ڕەخنەییەكەی كانت بوو و بایەخی بە دەروونناسی ئەدا.بیروڕاكانی كاریگەریی زۆریان لەسەر هۆسێرل و هایدیگەر هەبوو.

بایەخی بە فەیلەسووفەکانی بەر لە "سوکرات"یش ئەدا. شتێکی سەیریش نییە کە لە سای ئەم بایەخدانە فراوانانەدا، هایدیگەر نازناوی "بوونگەرا" ڕەتبکاتەوە و بە تایبەتیش ڕێبازی بوونگەرایانەی مرۆگەرایانە لای سارتەر.

لەگەڵ ئەوەشدا کتێبە سەرەکیەکەی هایدیگەر، واتە "بوون و زەمەن" کە لە ساڵی ١٩٢٧دا نووسیویەتی، بە ڕای زۆربەی توێژەران گەورەترین شیکردنەوەیە بۆ بوونی مرۆیی کە بە درێژایی مێژووی فەلسەفەی بوونگەرایی ئەنجامدرابێت. دەشێ جەختکردنیشی لەسەر هەندێ چەمکی وەکو: بایەخ، نیگەرانی، گوناه، کۆتابوون و بەر لەمانەش: مەرگ، وا سەیر بکرێ کە ئاماژەیەکن بۆ جۆرێك لە نیهیلیزم لای هایدیگەر. ئەوەی کە دەشێ زیاتر بۆ ئەم بۆچوونەش پاڵپشت بێت، ئەو لێکچەرە (موحازەرە) بەناوبانگەیەتی کە لە ساڵی ١٩٢٩دا لە فرایبۆرگ وتییەوە و ناونیشانی "میتافیزیکا چییە؟" بوو، چونکە ئەو لەم لێکچەرەدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە میتافیزیکا لە عەدەم دەکۆڵێتەوە.

بەڵام هایدیگەریش وەکو یاسپەرز، بە ڕێبازی نیهیلیزم کۆتایی نایەت، بەڵکو بە کارامەییەکی وشەسازانەوە دەڵێت کە ئەو "عەدەم"ەی لە بارەیەوە دەنووسێ گەرچی هیچ نییە non-entity، بەڵام "بوون"ە. دەڵێت: "ئەم ئەوی ترەی کە تەواو جیاوازە" لە هەموو بوونەوەرەکانی دی، بێ بوونە non-entity یان نەبوون (عەدەم)ە، بەڵام ئەم نەبوونە بە شێوەیەکی بنەڕەتی بوونی هەیە"[٣٦]. بەم جۆرە دەرگا لەسەر فەلسەفەکەی قۆناغی دواتری هایدیگەر دەکرێتەوە، کە ڕامانێکی نیمچە سۆفیانە و نیمچە شاعیرانەیە، بەڵام ڕامانێکی فەلسەفیشە لە بوون و هزر و زمان.

هاوشان لەگەڵ ئەم "فەلسەفەی بوون" (Existenzphilosophie)ە ئەڵمانیەدا کە ئێستا لێی دواین، بزاڤێکی دی هەبوو کە زەحمەتە ناوی لێبنێین "بوونگەرایی"، بەڵام پەیوەندیی خزمایەتیی لەگەڵیدا هەبوو، دەشتوانین ڕەگوریشەکانی ئەم بزاڤە بۆ نیمچە نا،

بەڵکو بۆ فەیلەسووفانێکی وەکو "هێرمان لۆتزە"* (١٨١٧–١٨٨١) و ڕۆدۆڵف ئۆیکن* (١٨٤٦–١٩٢٦) بگەڕێنینەوە. ئەوەی ئەم فەلسەفەیەش بە بوونگەرایییەوە دەبەستێتەوە، بایەخدانی زۆرێتی بە کێشەی پەیوەندیی نێوان کەسەکان و، لەبەرئەوەی گەلێ لە فەیلەسووفە بوونگەراکانیش بەرەو تاکگەرایی Individualism چوون، ئەم ئاقارە ڕاستکردنەوەی پێویستمان لە تێڕوانینماندا بۆ ئەوە پەیوەندییانە بۆ دەخاتەڕوو.

ئەم ئاقارەش گەلێ نوێنەری هەبوو، وەکو "ئەبیرهارد گریزباخ" و "فردیناند ئەبنەر". بەڵام گەورەترین نوێنەری فەیلەسووفی جوولەکە "مارتین بوبەر" (١٨٧٨–١٩٦٥) بوو. لە کاتێکا بوونگەراکان گرنگی بە کێشەی پەیوەندیی مرۆڤ بە جیهانەوە ئەدەن، یان پەیوەندیی مرۆڤ بە خودا یان بە بوونەوە، "بوبەر" پتر بایەخی بە پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان دا لەگەڵ یەکدا و لەوەشدا لەسەر هەق بوو کە دەیوت هیچ بوونەوەرێك ناتوانێ بەبێ پەیوەندیی لەگەڵ بوونەوەرانی تردا بوونی هەبێت.

لەوە دەچێت بوونگەرایی فەرەنسی لە هەموو فەلسەفە بوونگەراکانی دی زیاتر ناوبانگی پەیداکردبێت. لقە نامەسیحییەکەی ئەم فەلسەفەیەش دەگەڕێتەوە بۆ بوونگەرایی ئەڵمانی و، بە تایبەتیش بوونگەرایی هایدیگەر، بەڵام دیسانەوە ڕەگوڕیشەیەکی قایمیشی لەناو ئەزموونی فەرەنسی (و ئەزموونی ئەورووپیدا بە شێوەیەکی گشتی) لە سەدەی بیستەمدا هەیە. "ف. تێمیڵ. کینگستۆن" کە یەکێکە لە قووڵترین شیکەرەوەکانی بوونگەرایی فەرەنسی، دەڵێت: "هەموو فەیلەسووفە بوونگەراکان دان بەوەدا ئەنێن کە لەم سەدەیەدا، فەلسەفە ئەبستراکتەکان و دەوڵەتە تۆتالیتارەکان و خراپ بەکارهێنانی دەسکەوتە زانستییەکان، هەڕەشەیان لە بوونی

* فەیلەسووفێکی ئەڵمانی بوو ویستی گونجانێك لە نێوان ڕوانگەی میکانیکیانەی زانست و پرنسیپەکانی ئایدیالیزمی ڕۆمانسیدا بسازێنێت.

* فەیلەسوفێکی ئەڵمانی بوو کە بایەخی بە" چەمکی ژیان" و ئەزموونەکانی ژیان و ئەو کێشانە ئەدا کە زانست ئەیخولقاندن.

خـودی مرۆڤـەكان كـرد. هوشـیاری بـەم حاڵەتـەش بـە ئاشـكرا و بـە تایبـەتیش لای فەیلەسـووفە فەرەنـسیەكان دەبینینـەوە، كـە هۆكەشـی دەگەڕێتـەوە بـۆ تێكـشكانی فەرەنسا لە دووەمـین جـەنگی جیهانیـدا و هـەروەها بـۆ ئـەو گرژییـەی لـە نێـوان بلـۆكی كۆمۆنیستی و دیموكراسیی ئەمریكیدا هەیە"[٣٧].

ئەم بوونگەراییە فەرەنسیە كە لای ژان پۆڵ سارتەر (١٩٠٥–١٩٨٠) دەبیینینەوە، لـە زۆر ڕووەوە لە فەلسەفەكەی نیچەوە نزیكە. لەبەرئەوەی ئەگەر جیهـان بـێ یـەزدان بێـت مرۆڤ تیایدا جێی یەزدان دەگرێتەوە، "مرۆڤ كە مەحكومە بە ئازادی باری هـەموو جیهـان لە ئەستۆی خۆی دەگرێت، لەبەرئەوەی بەرپرسیارە بەرامبەر بە جیهـان و، بەرپرسـیارە بەرامبەر بە خۆی، بەوپێیەی شێوەیەكی بوونە"[٣٨]. بەڵام هەروەكو لای نیچەش هەبوو، لەم هەڵوێستی ئازادییەدا لایەنێكی تاریك هەیە، لەبەرئەوەی حەز و تاسەی مرۆڤ بۆ بوون بە یەزدان، ناودژێتییەك و بێهوودەییەكی تێدایە.

دەتوانین لە پاڵ سارتەریشدا ناوی ئەلبێر كامۆ (١٩١٣–١٩٦٠) بهێـنین. ئـەو پـەرەی بە جۆرێك لە بوونگـەرایی دا كـە سـەبارەت بـە پووچـی و نامـەعقول **absurd** بـوو و واش وەسفی دەكرد كە دژی ئیمانە **anti-theist** پتر لەوەی بێ ئیمـان **atheist** بێـت. لای كـامۆ "سـیزیف"* ڕەمـزی ڕەگـەزی مرۆڤـە. سـیزیفیش قارەمـانێكی ئەفـسانەیی كۆنـە كـە خواوەندەكان حوكمی بەسەردا ئەدەن كە تاوێرە بەردێكی گەورە بەرەو ترۆپكی شاخێك بەرێت، بەڵام هەموو جارێك بەردەكـەی لەدەسـت دەردەچـێت و بـەرەو خـوارەوە خلـۆر

* سیزیف**Sisyphus** پاڵەوانی ئەفسانەیەكی یۆنانی یە،خواوەنـدەكان حـوكمی بەسـەردا ئـەدەن كـە بچێت بۆ دۆزەخ،بەڵام ئەو خواوەندی ئەودونیا"هادیس" دەخەڵەتێنێ و لەدەستی ڕادەكات.دواجار خواوەندەكان بەوە سزای ئەدەن كە تاشـەبەردێك بـۆ سـەر لووتكـەی شـاخێك سـەربخات و هـەموو جارێكیش تاشەبەردەكە خلۆر دەبێتەوەو دەبێ ئەمیش تا ئەبەد ئەو كارە دووبـارە بكاتـەوە.كـامۆ مرۆڤ بە سیزیف دەشوبهێنێت كە هەرچییەك دەكات بێهوودەیە.

دەبێتەوە، ئەمیش ناچاردەبێت سەرلەنوێ لە بناری شاخەكەوە كارەكە دووبارەبكاتەوە.

جۆرێكی تری بوونگەرایی فەرەنسیش هەیە كە پتر شەقڵێكی شەخسیی بەخۆوە گرتووە، واتە بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ لە سەرچاوە ئەڵمانیەكانەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵكو لە كەلەپووری نەتەوەیی فەرەنسییەوە. مۆریس بلۆندا (١٨٦١–١٩٤٩) گەرچی ناخرێتە ڕیزی بوونگەراكانەوە، بەڵام فەلسەفەكەی ڕێی بۆ جۆرێك لە بوونگەرایی كەسگەرایی (الشخصانيه) خۆشكرد. بلۆندل لە كتێبە بەناوبانگەكەیدا "كردارL,action" دەڵێت كە خاڵی سەرەتا لە فەلسەفەدا نابێ لە "من بیردەكەمەوە"دا بۆی بگەڕێین، بەڵكو لە "من دەكەم"دا. بلۆندا لەم خاڵی سەرەتایەوە فەلسەفەیەكی دیالەكتیكی بۆ كردار دادەمەزرێنێ.

یەكێك لە گەورەترین توێژەرە هاوچەرخەكانی لە بارەیەوە وتوویەتی: "گەرچی زاراوەی بوونگەرایی زۆر خراپ بەكاردەهێنرێ، بەڵام دەبێ لەسەر ئەوە كۆك بین كە بلۆندل بوونگەرا بوو"[٣٩].

گابریل مارسیل (١٨٩٩–١٩٧٣)یش دیارترین نوێنەری جۆرێكی تری بوونگەراییە. بەرامبەر بەو توخمە ڕەشبینانەی لەلای سارتەر و كامۆ هەن، مارسیل "میتافیزیكی هیوا" (ئەمە ناونیشانی دووەمی كتێبەكەیەتی "مرۆڤی گەڕۆك") پێشنیاز دەكات، كە لەسەر بناغەی تێڕوانینێكی ئیماندارانە بۆ جیهان دامەزراوە. هەروەها لەبری مەیلە تاكەكەسییەكان لای سارتەر، مارسیل هوشیاری بە كۆمەڵی مرۆیی دەخاتەڕوو، كە هیچی كەمتر نییە لە هوشیارییەكەی مارتین بوبەر بە پەیوەندییە مرۆییەكان.

لە كاتێكا بوونگەرایی لە ئەڵمانیا و فەرەنسادا تا ئەوپەڕی پەرەیسەند، شێوازی بیركردنەوەی بوونگەرایانە جگە لەم دوو وڵاتە لە وڵاتی تریش پەیدابوو. بۆ نموونە بیرمەندی ئیسپانی میگیل دۆ ئۆنامۆنۆ (١٨٦٤–١٩٣٦) و بیرمەندی رووسی نیكۆلای ئەلێكساندرۆڤیچ بێردیاییف (١٨٧٤–١٩٤٨) شایانی ئەوەن بخرێنە ڕیزی نوێنەرە گەورەكانی فەلسەفەی بوونگەراییەوە.

ئێمە بە تەنها ناوی ئەوانەمان هێنا کە بە پلەی یەکەم فەیلەسووف بوون، دەنا گەر ناوی ئەو ئەدیبانەش بهێنین کە ڕۆمان و شانۆنامە و شیعرەکانیان بە جیهانبینییەکی نزیك لە جیهانبینیی بوونگەرایانە ئەخەن ڕوو ،ئەوا لیستەکە زۆر فراوان دەبێت. بۆ نموونە ئەدیبانێکی وەکو: دۆستۆیڤسکی و کافکا و ئیلیوت و بێکیت و زۆری تر. بەڵام دەبێ توێژەر لەم خاڵەدا زۆر وریابێت و مانای وشەی "بوونگەرایی" بە ڕادەیەك فراوان نەکات کە هیچ مانایەکی نەمێنێت.

بەم جۆرە، فەلسەفەی بوونگەرایی هەر لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانیەوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغە سەرەتاییەکانی تێفکرینی مرۆیی، وردە وردە فۆرمەلە بوو تا لە سەدەی بیستەمدا بوو بە یەکێك لە شێوە سەرەکییەکانی فەلسەفە. بەڵام ئایا بۆچی لەم چاخەماندا گەشەی سەند؟ ئەی بۆچی لە ئەوروپادا خاکی بە پیتی خۆی دۆزییەوە؟

دیارە کە لەو چاوپیاخشانە مێژوویەی پێشووماندا وەڵامی ئەم پرسیارانەمان بۆ ڕوونبۆوە. لەوە دەچێت شێوازی بوونگەرایانە لەبیرکردنەوەدا کاتێ سەرهەڵبدات کە مرۆڤ هەستی کرد لە بەردەم هەڕەشەدایە و، هەروەها کاتێ کە پەی بە ئاڵۆزی و نهێنییەکانی جیهان دەبات و کاتێك بۆی دەردەکەوێ کە ژیانی لەم دونیایەدا کاتییە.

ئەمەش زۆر یارمەتیمان دەدات کە ڕوونیبکەینەوە بۆچی فەلسەفەی بوونگەرایی لەو وڵاتانەدا گەشەی سەندووە کە تیایاندا بونیادی کۆمەڵایەتی هەرەسی هێناوە و هەڵاوگێڕبووە و سەرلەنوێ بەهاکان هەڵسەنگێنراونەتەوە. بەڵام ئەو وڵاتانەی تا ڕادەیەك سەقامگیرن (بۆ نموونە وڵاتانی ئەنگلۆساکسۆن) بەو ئەزموونە تاڵانەدا تێنەپەڕیون و، هەر بۆیەشە ئەم جۆرە فەلسەفاندنەی کە لە بنەڕەتدا لەو ئەزموونانەوە سەرچاو دەگرێ، لەو وڵاتانەدا پەرەیان نەسەندووە.

# بەشی سێیەم

## چەمکی بوون

١-بوون و ماهیەت.
٢-هەندێ لە بوونگەراکان چۆن لە وشەی "بوون" دەگەن؟
٣-بونیادە سەرەکییەکانی بوون.
٤-توانای شیکردنەوەی بوونگەرایانە.

## ١–بوون و ماهیەت

جیاکاری لە نێوان بوون Existence و ماهیەت essenceدا یەکێکە لە کۆنترین ئەو مەسەلانەی کە فەلسەفە لێیکۆڵیونەتەوە. ئەم جیاکارییە بە شێوەیەکی فراوان بەکاربراوە و ئەنجامی سوودبەخشیشی هەبووە. کاتێ دەڵێین ئەو شتە بوونی هەیە، مەبەستمان لەوەیە کە "ئەو شتە هەیە". بوون سیفەتی بابەتی (مەوزوعی) و بەشەکی (جزئی) و پێدراوی بەخۆوە دەگرێت. سکەیەکی زیوین کە لەسەر مێزەکەیە، بەوپێیەی یەکێکە لە شتەکانی ئەم دونیایە "هەیە"، بوونیشی وەکو رووداوێکە کە دەبێ قبوول بکرێ. بە حەزی من نییە ئەم سکەیە هەبێت یان نەمێنێت. گەرچی دەتوانم ئەو شێوەیەی کە تیایەتی بیگۆڕم. بەڵام هەر ئەوەندە قسە لەسەر ئەو "شێوەیەی کە تیایەتی" دەکەین، واتە لە "بوون"یەوە چووینەتە سەر "ماهیەت"ی. ئەگەر بوونی شتێك بریتی بێت لەو حەقیقەتەی کە ئەو شتە "هەیە"، ئەوا ماهیەتی ئەو بریتییە لە "چییە..". ماهیەتی شتێك بریتییە لەو سیفاتە سەرەکییانەی کە وای لێدەکەن ببێتە ئەو شتە دیاریکراوە، نەك شتێکی دی. واتە ماهیەتی ئەو دراوە زیوە لە ڕێی ڕەنگ و بریسکەی کانزاکەی و پێکهاتەی

و کێشی و سەرنجڕاکێشییە تایبەتەکەی و شێوەی و ئەو نەخش و نیگارەوە و.. وەسف دەکرێ کە لە سەریەتی. بۆ وەسفکردنی ئەم دراوە زیوە، بۆ نموونە ئەگەر دۆلارێك بێت نەك شتێکی دی، پێویستە باس لە هەموو تایبەتمەندییەکانی بکەین. ئەوەش مانای وایە کە ماهیەت سیفەتێکی ئەبستراکت و گشتێتی (الكلیە)یانە بەخۆوە دەگرێت. جگە لەوە ماهیەتەکان وا دەخوازن کە پرۆسەی بیرکردنەوەی ئەقڵانی و شیکردنەوە و بەراورد و پێکهێنانیان بەسەردا ئەنجام بدرێ. لە کاتێکا بوون لەبەرئەوەی سیفەتێکی تێپەڕ و هەنووکەیی هەیە، زەحمەتە ئەو پرۆسانەی بەسەردا ئەنجام بدرێ.

لە سەرتاپای مێژووی فەلسەفەدا، هەندێ جار ماهیەت و هەندێ جاری تریش بوون بەسەر بیرکردنەوەی فەلسەفیدا باڵادەست بووە. تەواوی ئەو نەریتەی بە ئەفلاتوون دەستی پێکرد ماهیەتی لەسەر حیسابی بوون بەرزکردەوە. ئەم نەریتە وا سەیری "بوون"ی کردووە کە سەر بە بواری تێپەڕ و گۆڕاوە، بۆیە پێویستە ئەقڵ ڕووی لێوەربگێڕێت و بایەخ بە ماهیەتە نەگۆڕ و گشتیەکان و بە وێنە و ئایدیاکان بدات. تەنانەت دەشێ مرۆڤ لەم تەوژمەدا بگاتە ئەو ئەنجامە پێچەوانەیەی کە بوون ناڕاستە Unreal (یان گەر بتوانین بڵێین: لە ڕاستیدا بوون بوونی نییە) لەبەرئەوەی ڕاستی Reality سەر بە جیهانی ماهیەتەکان (essences)ە. بەڵام ئەقڵی فەلسەفیی ساغ هەمیشە بەسەر ئەم ئەنجامانەدا یاخیبووە و، بۆیە لە هەندێ قۆناغی مێژووی فەلسەفەدا گرنگی بە بوونەوەری کۆنکرێتیانەی بەشەکی دەدرێ، بەرامبەر بە ئەبستراکتی گشتیی ماهیەتی Essential. هەر بۆیە بوونگەرایی نوێ بە کیرکەگۆر دەستپێدەکات کە بەرگری لە کۆنکرێتیبوونی بوون دەکات بەرامبەر بەوەی کە بە ڕێبازی ماهیەت Essentialismی لە قەڵەم دا لای هیگڵ. بەڵام لە کاتێکا کە جیاکاری لە نێوان بوون و ماهیەتدا بە ڕادەی پێویست ڕوون و ئاشکرایە، دەبینین کە پەیوەندی لە نێوان بوون و ماهیەتدا زۆر ئاڵۆزە، "چەمکی بوون"یش وا ئاسان نییە کە یەکەمجار دێتە بەرچاو و، بە زۆر شێوەی جیاواز لێی تێگەیشتوون. گەرچی ئێمە دەزانین کە بیرمەندی بوونگەرای هاوچەرخ وشەی بوون

Existence بە مانایەکی تایبەتتر و سنووردارتر لەو مانایە بەکاردەهێنێت کە لـە کەلـەپووری فەلـسەفەدا هەیـە، بـەڵام پێویـست ناکـات زۆر بـیر لـەوەش بکەینـەوە کـە تەنانـەت لـەم کەلەپوورەشدا زاراوەی "بوون Existence" هەرگیز یەك مانای نەبووە.

با لە ڕیشەی زمانەوانیی وشەکەوە دەستپێبکەین: فرمانی هەیـە ex-sist یـان Exist (لـە فرمانی لاتینی "Ex-sistere)وە وەرگیراوە) لـە بنەڕەتـدا بـە مانـای "دەردەکـەوێ Stand outیـان دێتـە دەرێ emerge" هـاتووە. لـەوەش دەچـێت پێـشتر ئـەم فرمانـە هەسـتێکی پۆزەتیڤانەتری لای گوێگر و خوێنەر دروستکردبێت.

شتێك کە هەبێت مانای "دەردەکەوێ" یان لـە زەمینەیـەکی دیـاریکراوەوە دێتـە دەرێ بەو سیفەتەی شتێکە بوونێکی ڕاستەقینەی لەوێ هەیە. ئەگەر ئەم بیرۆکە بـە شـێوەیەکی فەلسەفیانەتر دابڕێژین، ئەوا دەڵێین شتێ: کە "هەبێت" وات لە عەدەمـەوە "بێتـەدەرێ". بـەڵام ئێـستا چـەمکی بـوون زۆر پاسـیڤ بـووە، زیـاتر بـە مانـای "فڕێـدراو لـە شـوێنێکی دەوروبەرماندا" دێ وەك لە "دەرکەوتن لە شوێنێکدا".

لە ڕاستیدا باوترین مانای "بوون" زۆر دوورنییە لەو قسەیەمانەوە کە دەڵـێین "فڕێـدراو لە شوێنێکی دەوروبەرماندا". کاتێ دەڵێین شتێك هەیە، واتـە لـە شـوێنێکی ئـەم جیهانـەدا دەیبینین. ئەگەر یەکێك وتی "کەرکەدەن هەیـە"، مەبەسـتی لەمـە ئەوەیـە کـە تـۆ ئەگـەر خۆت ماندوو بکەیت و بە پێی پێویست بگەڕێیت لە شوێنێکی ئەم جیهانەدا تووشت دەبێت بە تووشی کەرکەدەنەوە. ئـەم دەسـتەواژەیەش، واتـە دەسـتەواژەی "لـە شـوێنێکی ئـەم جیهانەدا" کە لەم بڕگەیەدا دووجار بەکارمانهێنا، هەروا بە ڕێکەوت نییـە. چـونکە پێدەچـێ وشـەی "هەیـە" دەلالـەت لـەوە بکـات کـە هـەموو شـتێك لـە جیهـانی ڕاسـتەقینە Realدا شوێنێك (و کاتێك)ی هەبێت.

فەیلەسووفانێکیش هەن کە هەندێ جار بە پێویستیان زانیوە لەبـەر هـەر هۆیـەك بێـت، بڵێن کە جیهان خۆیشی "هەیە" و بریتی نییە لە وەهمێـك یـان ڕووکەشـێکی پـەتی، بـەڵکو جیهـانێکی ڕاسـتەقینەیە. کاتـێ دەڵـێین "جیهـان هەیـە" مەبەسـتمان چییە؟ دیـارە لـەم

حاڵەتەدا وشەی "هەیە" وا لێکنادرێتەوە کە "بە ڕێکەوت لە جیهانی ڕاستەقینەدا تووشت ئەبێ بە تووشیەوە"، لەبەرئەوەی جیهان خۆی شتێك نییە لە جیهاندا هەبێت. من نیازم نییە ئێستا قسە لەسەر مانای وشەی **existence** بکەم بەو شێوەیەی لە دەستەواژەی "جیهان هەیە"دایە. (ئەو خوێنەرەی مەبەستی بێت بە دوای ئەم مانا تایبەتیەی وشەکەدا بچێت، لە کتێبەکەی "میلتۆن. ك. میونیتز"دا کە ناوی "نهێنیی بوون"ە، باسێکی بە نرخ دەبینێتەوە)[1]. لەگەڵ ئەوەشدا کە من بڕوام وایە ئەو قسەیەمان، واتە "جیهان هەیە" قسەیەکی ماناداره، بەڵام دەمەوێ لێرەدا خاڵێکی گرنگ بخەمەڕوو، ئەویش ئەوەیە کە ئەم جۆرەی بوون زۆر جیاوازە لە بوونی شتە بەشەکی (جزئی)یەکان، یان بوونی گیانەوەران، یانیش بوونی کەسەکان، لەبەرئەوەی ئەم جۆرەی دووەمی بوون تێگەیشتنێکمان دەداتێ کە ئەو بوونەوەرەی قسەی لەسەر دەکەین ڕووداوێکە لە جیهاندا.

کێشەیەکی تریش هەیە کە پەیوەندیی بە "بوونی خودا"وە هەیە. مەبەستمان لەوە چییە کە دەڵێین "خودا هەیە؟" وێنای ئێمە بۆ خودا هەرچییەك بێت، بەڵام خودا بابەتێك نییە وەکو شتێك لەناو جیهاندا بوونی هەبێت. تەنانەت گەر وتمان ئەوپەنهانە "**Immanent**"ە یان تا ڕادەیەك لە جیهاندا هەیە، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو شتێك نییە لە شتەکان. واتە کاتێ دەڵێین خودا هەیە، ئەمە مانای ئەوە نییە کە دەشێ بە ڕێکەوت لە جیهاندا ببینین، هەروەکو چۆن دەتوانین کەرکەدەن ببینین. هەندێ لە خودناس (تیۆلۆجیست)ەکان دەڵێن کە ئێمە دەبێ واز لە باسی "بوون"ی خودا بهێنین، لەبەرئەوەی ئەم باسە بۆچوونێکی وا لە زەیندا دەچەسپێنێت کە خودا شتێکی بەشەکییە و لە جیهاندا دەدۆزرێتەوە. بەڵام لۆژیك (مەنتیق)ی وشەی خودا لە هەندێ ڕووەوە دەشوبهێتە سەر لۆژیکی وشەی "جیهان". خۆ ئەگەر ئەم قسەیەمان، واتە "جیهان هەیە" مانای هەبێت، کەواتە ڕەوایە ئەم قسەیەشمان، واتە "خودا هەیە" مانای هەبێت، گەرچی مرۆ لە هەردوو حاڵەتەکەدا وشەی "هەیە" بە مانایەکی جیاواز لەو مانایە بەکاردەهێنێت کە بۆ بوونی شتێك لەناو جیهاندا بەکاریدەهێنێت. (گەرچی ئەم دوو مانایە لە هەمان کاتدا

پەیوەندیشیان پێکەوە هەیە)، بەڵکو من وایدەبینم کە مانای فرمانی "هەیە" کاتێ دەربارەی بوونی خودا بەکاریدەهێنین جیاوازە لەو مانایەی کە سەبارەت بە بوونی "جیهان" بەکاریدەهێنین. لەبەرئەوەی خودا و جیهان بە دوو شێوەی جیاواز هەن گەرچی ئەمە لای ئەو کەسانەی باوەڕیان بە یەکێتیی بوون (وحدە الوجود– Panthism) هەیە، جیاوازە. بەڵام ڕەنگە بوترێ کە هەردووکیان لەیەك خەسڵەتدا هاوبەشن، ئەویش ئەوەیە کە بە مانایەك لە ماناکان بوونی ئەم دووانە ڕێگە بە بوونی بوونەوەرە بەشەکیەکان ئەدات، کەواتە دەبێ وا لە وشەی "بوون" بگەین، بە تایبەتیش لە حاڵەتی بوونی خوادا، کە مانایەکی زۆر پۆزەتیڤی هەیە کە بەرامبەر ئەو جەمسەرە دژە ڕادەوەستێت کە بە مانای "لە شوێنێکی دەوروبەرمان فرێدراوە" دێت.

بەڵام هێشتا ئێمە هەموو ماناکانی وشەی "بوون"مان بەسەر نەکردۆتەوە. بۆ نموونە، مەبەستمان لە بوونی "نەفس" چییە؟! لە جیهانی خۆرئاوادا بیرۆکەی "شتبوون– Thinghood" بە جۆرێك بەسەر شێوازە باوەکانی بیرکردنەوەدا زاڵە کە وەکو تایپێکی نموونەیی بوونی لێهاتووە و ئەگەر قسەش لەسەر بوونی نەفس بکەین، ڕەنگە وا لێکبدرێتەوە کە مەبەست لە گەوهەرێکە کە هەرگیز خراپ نابێت. بەڵام ئەگەر وازمان لەم شێوازەی بیرکردنەوە هێنا و هەر جەختیشمان لەسەر ئەوە کرد کە نەفس هەیە، دەبێ تایپێکی تری بوون بهێنینە بەرچاومان کە لەگەڵ نەفس و خودەکاندا بگونجێت و بە شێوەیەکی شکڵی یا وێنەیی (صوری) وێنای بوون بکەین، نەك بە شێوەیەکی گەوهەری.

دەتوانین درێژە بەم بەکارهێنانە باوانەی وشەی بوون بدەین. ئایا ژمارەکان "هەن؟" بە دڵنیاییەوە ماتماتیکزان جیاوازی لە نێوان ژمارە ڕاستەقینەکان و ژمارە خەیاڵیەکاندا دەکات. بەڵام ئێمە دەتوانین چ جۆرە بوونێك بۆ ژمارەکان دیاریبکەین؟ ئایا پێشنیازکردنەکەی بیرتراند ڕاسڵ سەبارەت بەوەی کاتێ مرۆڤ قسە لەسەر ژمارەکان و پەیوەندییەکان دەکات، لەسەری پێویستە باسی بوونی زەینی Subsistence بکات لەبری بوونی کردەیی بابەتی Existence، ئاخۆ ئەمەش هەر زاراوەسازییە و هیچی دی؟

گرنگە ئەمە بزانین کە سەرباری ئەوەی بوونگەراکان بە مانایەکی تایبەتی وشەی "بوون" بەکاردەهێنن، و هەوڵێکی زۆریشیان داوە تا جیاوازی لە نێوان ئەم بەکارهێنانە و ئەو شێوازە سوننەتیانەدا بکەن کە وشەکەیان تێدا بەکارهێنراوە، بەڵام هێشتا هەندێ مانای سوننەتیی ئەم وشەیە تەنانەت لای هەندێ لە بوونگەرا هاوچەرخەکانیش ماوە، بەم جۆرە، لە کاتێکدا دەشێ ئەوە ڕاست بێت کە ئەو هەوڵانەی هەندێ نووسەری هاوچەرخی وەکو "ئیتین جیلسۆن" داویانە تا فەلسەفەکەی تۆماس ئەکویناس وا پیشانبدەن کە فەلسەفەیەکی بوونگەرایە (واتە بایەخ بە بوون ئەدات) پتر لەوەی فەلسەفەیەکی ماهیەتگەرا بێت، ئەم هەوڵانە پەنادەبەنە بەر وێنا سوننەتیەکەی بوون نەك وێنا بوونگەرایانە هاوچەرخەکە. بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو هەوڵانە ڕەتبکەینەوە یان بڵێین هەڵەن. لەبەرئەوەی پەیوەندیی نزیکی وا هەیە لە نێوان مانا سوننەتی و مانا هاوچەرخەکانی بووندا کە بەشێك لە ڕاستیی لێکدانەوەکەی جیلسۆن دەسەلمێنێت. بەڵام ئەم پەیوەندییە نزیکانە بەس نین بۆئەوەی بیسەلمێنین کە فەلسەفەکەی تۆماس بە مانای هاوچەرخەکەی وشەکە بوونگەرایە. هەروەها گلەییەکەی هایدیگەر لەوی کە سارتەر هەردوو چەمکی "بوون و ماهیەت"ی بە مانا سوننەتییە میتافیزیکیەکە بەکارهێناوە کاتێ ڕایگەیاند کە بوون پێش ماهیەت دەکەوێت[٢]، بەس نییە بۆ کەمکردنەوە لە بۆچوونەکەی سارتەر کە بە شێوەیەکی کردەیی جیاکارییەکی تەقلیدیی لە نێوان بوون و ماهیەتدا کردووە، بەڵام لەسەر ئەو ڕەوتە بەردەوام بوو تا لەو بۆچوونە نوێیەیدا ئاوێتەیان بکات کە بۆ چەمکی بوون لای دروستبوو.

ئەوەی شێوازی فەیلەسووفە بوونگەراکان جیادەکاتەوە لە بەکارهێنانیاندا بۆ وشەی "بوون" ئەوەیە کە ئەوان وشەکە لە جۆری مرۆڤدا سنووردار دەکەن، بەڵام لەوانەیە شتێکی بەسوود بێت گەر کەمێك لەسەر مانا تەقلیدییەکانی وشەکە ڕاوەستین، لەبەرئەوەی بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم مانایانە هێشتا بە ئەرێ بێت یان نەرێ، کاریگەریی خۆیان هەر ماوە لە دیاریکردنی چەمکی بوونگەرایانەی "بوون"دا. لەوەش زیاتر بۆمان

دەردەکەوێ کە ناسراوترین بوونگەراکانیش لەناو خۆیاندا بە تەواوەتی لەسەر مانای وردی ئەم زاراوە سەرەکییەی ناو فەلسەفەکەیان ڕێك نین.

## ٢–هەندێ لە فەیلەسووفە بوونگەراکان چۆن لە وشەی "بوون" دەگەن؟

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە وشەی "بوون" لە فەلسەفەی بوونگەراییدا تەنها بەو جۆرەی بوون دەڵێن کە تایبەتە بە مرۆڤ. ڕەنگە پێویست نەکات ئەوەش وەبیربهێنینەوە کە ئەگەرچی بە تەنها مرۆڤ (و هەر بوونەوەرێکی دی کە هەمان پێکهاتەی ئۆنتۆلۆجیەنەی مرۆڤی هەبێت) "بوونی هەیە"، بەڵام ئەوە هەرگیز بەو مانایە نایەت کە ئێمە لە بەردەم جۆرێك لە ئایدیالیزمی خودی Subjective Idealism داین. درەختەکان و شاخەکان و کارگەکان و ڕێگا گشتیەکان و دەکرێ بڵێین خوا و فریشتەکانیش هەموو "هەن" و حەقیقەت و بوونیان هەیە، بەڵام بە پێی زاراوەکانی بوونگەرایی، ئەمانە وەکو مرۆڤ بوونیان نییە. کەواتە ئەم "بوون"ە مرۆییە چییە، ئەو حاڵەتە تایبەتییەی بوون کە خۆمان بەو سیفەتەی بوونەوەری مرۆیین بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەیناسین؟!

ڕەنگە خستنەڕووی بیروڕای هەندێ لە فەیلەسووفە دیارەکانی بوونگەرایی سەبارەت بە "بوون" بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە یارمەتیمان بدات.

کیرکەگۆر، یەکەمین فەیلەسووفی بوونگەرای هاوچەرخ، نووسەرێك بوو کە وشەی "بوون– Existence" لای ئەو لە بنەڕەتدا مانای بوونی بەرچاوی دانسقەی کەسێتیی بوونەوەری مرۆیی دەبەخشی.

کەواتە لای ئەو بوونەوەر، بەشەکیەکی تێپەڕ (جزئی عارض) (Contingent)ە کە ناچێتە نێو چوارچێوەی ڕێبازێك یان سیستمێکی هزری ئەقڵانییەوە. بەڵام ڕێبازی ماهیەتگەرا Essentialismی هیگڵی، وەکو ئەوەی کیرکەگۆر دەیناسی، هەوڵدەدات ئادەمیزادەکان و شتەکان هەموو پێکەوە لە پێکهاتەیەکی ئۆرگانیدا کۆبکاتەوە، بە جۆرێك

کە دژایەتیەکان نەهێڵێت. بەڵام هۆشیاری بە بوون ڕێك هۆشیارییە بەو شتەی کە لە سیستم دابڕاوە و هەمیشەش ناودژێتی لەناو خۆیدا هەڵدەگرێت" Paradoxical". لەبەرئەوەی ئەوەی ڕاستەقینەیە (یان بوونەوەر) لەگەڵ سیستمێکدا ناگونجێت کە هزری ئەقڵانی دایدەمەزرێنێت: "ئەو دژوارییەی کە لەناو خودی بوونی مرۆییدایە و تاکەکەس ڕووبەڕووی دەبێتەوە، دژوارییەکە ئەستەمە بە زمانی هزری ئەبستراکت گوزارشتی لێ بکرێ، لەوەش ئەستەمتر ئەمەیە کە زمان بیەوێت لێکیبداتەوە، لەبەرئەوەی هزری ئەبستراکت هزرێکە لە دیدگایەکی ئەزەلیەوە (یان دیدگای بینەرێکی ڕەهاوە)یە، بۆیە گرنگی بە ئەوەی بەرچاوە و زەمانمەندە و بە ڕەوتی بوونگەرایانە نادات، هەروەها بە تەنگژەی تاکەکەسیش نادات بەو سیفەتەی پێکهاتەیەکە لە زەمانمەندی و ئەبەدی و لە ناوجەرگەی بووندایە[٣]".

ڕەنگە ئەم چەند وشەیەی دوایی ئەم برگەیە کە لە کیرکەگۆرەوە وەرمانگرتووە بەس بن بۆ کرۆکی تێگەیشتنی کیرکەگور لە بوون، مرۆڤ لەناو خودی خۆیدا و بە شێوەیەکی ناودژئاسایانە Paradoxical، کۆتادار و ناکۆتاو، زەمانمەند و ئەبەدی، پێکەوە کۆدەکاتەوە و هزریش ناتوانێ شتێکی "مانادار" لەمەدا ببینێتەوە، یان لە ئاوێتەبوونی ئەم دوولایەنە لەگەڵ یەکدا و پێکهاتەی مرۆڤ لە گشتێکی کامڵدا. بوونی مرۆیی بیرۆکەیەك نییە یان ماهیەتێك نییە تا بە شێوەیەکی ئەقڵانی لێی بتۆژینەوە. لە ڕاستیدا مرۆڤ ئەگەر ڕێبدات خۆی و بوونی بخرێتە ناو نەخشەیەکی ئۆرگانیکەوە یان سیستمێکی فیکریی ئەقڵانییەوە، ئەوا لە بەهای بوونی مرۆیی خۆی دەهێنێتە خوارەوە. لەبەرئەوەی مرۆڤ کاتێ بوونی خۆی وەدی دەهێنێت کە وەکو بوونێکی مرۆیی هەبێت و وا دەربکەوێت کە کەسێکی دانسقە Uniqueیەو، سەرسەختانە ئەوە ڕەتبکاتەوە کە بخرێتە ناو سیستمێکەوە.

هایدیگەر بە مەبەستی خۆپاراستن لە تێکەڵکردنی وشەی "بوون" (یان هاوواتا ئەڵمانیەکانی) سێ زاراوەی بەکارهێناوە. زاراوەی یەکەمیان دازاین Dasein (بوون لێرە یان لەوێ)یە.

ئەم زاراوەیە بۆ هەندێ شێوەی جیاوازی بوون بـەكاردەهێنرێ، بـۆ نموونـە زۆرجـار بـۆ بوونی خوا بەكارهێنراوە. بەڵام "هایدیگەر" "دازاین" بە تەنها بۆ ئەو بوونە بـەكاردەهێنێت كە لە مرۆڤدا بەرجەسـتە بـووە. گـەر بمانـەوێ وردبـین "دازایـن" هاوواتـای "مـرۆڤ" نییـە، لەبەرئەوەی "دازاین" زاراوەیەكی ئۆنتۆلۆژییـە ئاماژە بـۆ مـرۆڤ دەكـات لـە "گۆشـەنیگای بوونیەوە". خۆ ئەگەر ئەم جـۆرەی بـوون لای هەنـدێ بوونـەوەری تـری جیـا لـە مـرۆڤیش ببینینـەوە، ئـەوكات زاراوەی دووەمـیش زاراوەی بـاوی "Existentia"یـە كـە هایدیگـەر لـە جیاتی ئەو زاراوەی Vorhandenheit پێشنیاز دەكات كـە زاراوەیـەكی ئەڵمانییـە و دەكـرێ بە "حازربوونی ڕاستەوخۆ" یـان "حـازربوونی بەردەسـت" (Presence at hand) تەرجەمـە بكرێ. ئەم دەستەواژەیەش ئاماژە بۆ ئەو جۆرەی بوونی پاسیڤ دەكات كە پێشتر ناومـان نا "فڕێدراو لـە دەوروبەرمانـدا"، واتـە شـتێكە دەكـرێ مـرۆڤ لـە جیهانـدا ڕێكـەوتی بكـات. سـێیەمین زاراوەی هایدیگـەریش (Existenz)ە، ئـەو لـە نووسـینەكانیدا ڕایدەگەیـەنێت كـە زاراوەی Existenz بەوپێیەی سنووردانانە بۆ بوون، تەرخان دەكرێ بۆ دازایـن[٤]. هایدیگـەر لە درێژەی قسەكانیدا دەڵێت: "ماهیەتی دازاین لە بوونیدایە". ئەمەش وا لێكدەداتـەوە كـە مەبەسـتی لەوەیـە ماهیـەتی دازایـن لـە خەسـڵەتەكانی پێكنایـەت، بـەڵكو لـە شـێوە مومكینەكانی بوونی. لە شوێنێكی تردا ئەو بەم جـۆرە ئـەم ڕسـتەیە لێكدەداتـەوە: "مـرۆڤ ماهیەتێكی هەیە وای لێدەكات كە "لەوێ" بێت، واتە مەیـدانی بوونـە، هـەر بـە تـەنها ئـەم بوونەش كە "لەوێ"یە خەسڵەتی سەرەكیی ئـەو بوونـەی تیایـە كـە لـە دەرەوەی خۆیـدا دەردەكەوێ Ex-sistere، واتە ئەو حاڵەتی چوونەدەرەوەیەی كە لە ناوجەرگەی حەقیقـەتی بوونیدایـە"[٥]. دیـارە كـە ئـەم لێكدانەوەیـەش پێویـستی بـە لێكدانەوەیـەكی دی هەیـە كـە هیوادارین كاتێ تەواو چەمكی بوونمان ڕوونكردەوە، بیخەینـەڕوو. دەشـێ ئێـستا ئەوەنـدە بەس بێت سەرنجی ئەوە بدەین كە هایدیگەر هەوڵدەدات خۆی لـە لێكدانەوەیـەكی خـودیی پـەتی بپارێزێت، یان لێكدانەوەی ئەو دەسـتەواژەیەی "ماهیـەتی دازایـن لـە بوونیدایـە" بـە جۆرێك كە مانای "مرۆڤ پێودانی هەموو شتەكانە" بدات.

لە ڕاستیدا ڕێك ئـەم لێكدانەوەیەیـە كـە سـارتەر بـۆ ئـەو دەسـتەواژەیەی هایدیگـەری دەكات و لە فەلسەفەكەشیدا بووە بە "بوون پێش ماهیەت دەكـەوێت"[٦]. مـن لێـرەدا ئـەو مەسـەلەیە بەلامـەوە گـرنگ نییـە كـە هـەروەكو هایدیگـەر دەڵێـت سـارتەر بـە خـراپ لـەم دەستەواژەیەی گەیشتووە، لەبەرئەوەی سارتەر بۆچوونی تایبەتیی خۆی بۆ بوون هـەبوو، كە دەبێ وەكو خۆی لێی بكۆڵرێتەوە. دەشێ ئـەوە ڕاسـت بێـت كـە بـوون لای "سـارتەر" برێكی زیاتر لە مانا تەقلیدییەكە دەگرێتـە خـۆی وەك لای "هایدیگـەر". "هـازل بارنـەر" وا پێناسـەكەی سـارتەر بـۆ بـوون دەخاتـەڕوو كـە "بوونـە لێـرەدا و هەنووكـە"[٧]. بـەڵام سارتەریش وەكـو هایدیگـەر بـۆ ڕوونكردنـەوەی جیاوازییـەكانی ئـەم زاراوە بـاوە كۆمـەڵێك زاراوەی تایبەت بەكاردەهێنێت. بۆیـە زاراوەكـەی سـارتەر "بـوون بـۆ خـۆی– Pour- soi" هاوتـای زاراوەكـەی هایدیگـەرە "واتـە دازایـن" یـان بـوونی مرۆیـی "Existence"ە. بـەڵام زاراوەی "بوون بۆ خۆی" لای سارتەر لە میـانی هـەردوو بیرۆكـەی نـەفیكردن و ئازادییـەوە دەناسێنرێ.

"بۆ خۆی" بە جیاكردنەوەی خۆی لـە "لـەناو خۆیـدا" دێتـە ئـاراوە، "لەناوخۆیـدا"ش بوونی لە خۆیدایەتی و بوونێكی ماهیەتئامێزە. بەڵام "بۆ خۆی" لـە هەڵبـژاردنی ماهیەتیـدا ئـازادە: چـونكە بـوونی واتـە ئازادییەكـەی. بـەڵام لەگـەڵ ئەمەشـدا ئازادییەكـەی واتـە نەبوونیـــشی– ناودژێتییەكـــەش لێرەدایـــە–. لەبەرئـــەوەی لای ســـارتەریش، هـــەروەكو كیركەگۆر، لە بووندا نـاودژێتی هەیـە. دەتـوانین ئـەم بیرۆكەیـەی سـارتەر وا دەربـبڕین كـە بوون و ئازادی گونجانێكی پێچەوانەیان لەگەڵ یەكدا هەیە.

لای "كارل پاسپەرز"یش شـێوازێكی تـر بـۆ قـسەكردن لەسـەر "بـوون"[٨] هەیـە. ئـەو دەربڕینی "دازاین"یان "بوونی مرۆیی Existence" بۆ ئەو ڕاستییە بەكاردەهێنێت كـە ئێمـە خۆمـان لـە جیهانـدا دەبینینـەوە. بـەم مانایـەش "بـوون ئـەزموونێك نییـە بەنـدبێت بـە بیركردنەوەمانـەوە لـە ژیانمـان لـەناو جیهانـدا، بـەڵكو ئـەزموونێكی ڕاسـتەوخۆیە و بـێ پرسیاركردن لێی، ئەو واقیعە ڕاستەقینەیەیە كـە دەبـێ هـەموو شـتێك بـچێتە ناویـەوە تـا

بەلامانەوە ببێتە واقیعی. ئێمە هەرگیز ئەو سامە فەرامۆش ناکەین کە هەستی پێدەکەین کاتێ دەڵێین "هەم"، بەڵام نابێ ئەم جۆرەی بوون لەگەڵ ئەو جۆرەی بووندا تێکەڵ بکەین کە زاراوەی ئەڵمانیی "Existenz" ئاماژەی بۆ دەکات، ئەم زاراوەیەش زۆرجار لە وەرگێڕانە ئینگلیزییەکانی کارەکانی هایدیگەردا تەرجەمە ناکرێ و وەکو خۆی دادەنرێتەوە.

یاسپەرزیش سەبارەت بەم زاراوەیە ئاماژە بۆ سێ خاڵ دەکات:

١-بوون Existenz جۆرێك نییە لە بوون بە کردەوە، بەڵکو بوونێکی هێزەکی (وجود بالقوه)یە. واتە من نابێ بڵێم "هەم" بەڵکو دەبێ بڵێم من بوونێکی مومکینم. لەبەرئەوەی من ئێستا خودی خۆم نیم، دواتر دەبم بە خودی خۆم. لێرەدایە کە یاسپەرز وا سەیری بوونی مرۆیی دەکات کە وەدیهاتنی بوونی پەتیی (دازاین)ە، ڕێك بەو مانایەی کە بوون لای کیرکەگۆر دەشێ مانای وەدیهاتنی بوونی مرۆڤ بێت.

٢-بوون Existenz ئازادییە. ئازادیی خۆدروستکردن نا، بەڵکو بوون واتە ئازادی بەو سیفەتەی بەخششێکی باڵاڕەوی (یا باڵابوونە) Trancendence یە کە بەخشندەکەی خۆی دەناسێت. هیچ بوونێك بێ باڵابوون نییە". ئاماژەکردن بە بەخششی ئازادی و پەیوەندیی بە باڵابوونەوە، جیاوازییەکی زۆر لە نێوان بۆچوونی یاسپەرز بۆ بوون و بۆچوونی سارتەردا بۆ بوون دەخاتەڕوو.

٣-دواجار یاسپەرز پێماندەڵێت کە "بوون Existenz" واتە ئەو خودە تاکەکەسییەی کە هەمیشە بە تاکی دەمێنێتەوە و ئاڵوگۆڕی پێناکرێ".

من نامەوێ لێرەدا درێژە بە مەسەلەی جیاوازیی نێوان بوونگەراکان بدەم لە بەکارهێنانیاندا بۆ زاراوەی بوون. تەنانەت بە ڕەچاوکردنی تێکەڵکردن و هەڵەکانی وەرگێڕانیش، دەتوانین ئەو جیاوازییە ببینین. من لە بەشی داهاتوودا هەوڵدەدەم بۆچوونێکی پەیوەست بۆ بوون بە دەستەوە بدەم. ئەم بۆچوونە ئاوێتەیەك نییە لە بیروڕای ئەو فەیلەسووفانەی قسەمان لەسەرکردن، هەرچۆن هەوڵێکیش نییە بۆ

گونجاندنیان لەگەڵ یەکدا. بـەڵکو ناسـینێکە بـۆ گـرنگترین تایبەتمەندییـەکانی بـوون. ئـەم ناسینەش ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە هەندێ لەم جیاوازییانە چۆن هاتنەئاراوە.

## ٣–بونیادە سەرەکییەکانی بوون

ئەگەر ئێمە وشەی "بوون"مـان بـە تـەنها بەسـەر بـوونی ئـادەمیزاددا دابـڕی و پاشـان پرسیمان ئاخۆ تایبەتمەندییەکانی ئەمجۆرەی بوون دەبـێ چـی بـن و چـۆن لـە جۆرەکـانی تری بوون: وەکو ڕووەك و شاخ و گیانەوەر و شتی لەوجۆرە جیای دەکەینـەوە، لانـی کـەم دەبێ باسی سێ تایبەتمەندی بکەین:

١–پێشتر بینیمـان کـە فەیلەسـووفە بوونگـەراکان لـە ڕووی ڕیـشەی زەمانەوانییـەوە وا سەیری زاراوەی بـوون دەکـەن کـە دەلالـەت لـە "دەرکـەوتن" بـۆ دەرەوە **Standing out**" دەکات. ئەگەر ئەم بیرۆکەی دەرکەوتنە بە جیددی وەربگرین، کەمێك بیرکردنەوە ئـەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کـە ئەمـە زیـاتر لەگـەڵ ئـەو جـۆرەی بوونـدا دەگونجێـت کـە لـە مرۆڤـدا بەرجەسـتە دەبێـت. ڕاسـتە هـەموو بوونـەوەرەکان هـەن، بـەو مانایـەی لـە هیـچەوە "دەرکەوتوون"، بەڵام مرۆڤ بە مانایەکی دوورتر لەوە هەیە، لەبەرئەوەی ئەو لـەنێو هـەموو ئەو بوونەوەرانەدا کە دەشێ سەرنجیان بدەین لەسەر گۆی زەوی، تاقە بوونەوەرە کە نـەك هەر وەکو بوونەوەرێك "دەردەکەوێت"، بەڵکو بە هوشیارییەوە دەزانێ کێیە و چییە و کـێ دەبێت و چی دەبێت. ئەم بیرۆکەیەش ئاماژە بۆ مانایەکی گرنگتر دەکات لـە دەسـتەواژەی "دەرکەوتن بۆ دەرەوە **Standing out**"، چونکە مرۆڤ بە بـەراورد بـەو حاڵەتـەی کـە لەهـەر ساتێکدا تیایەتی، بەردەوام دەردەکەوێت، یـان دەردەچـێت. ڕەنگـە واش پێویـست بکـات "دەرچوون **goingout**" بەکاربهێنین لە جیـاتی "دەرکـەوتن **Standing**"، چـونکە عادەتـەن ئـەوەی لـە زەینماندایـە لـە بنەڕەتـدا شـتێکی دایـنـامیکی **dynamic**یـە واتـە ئـەو جووڵـە بەردەوامەی مرۆڤ کـە لـە ڕێیـەوە ئـەو حاڵەتـە تێدەپـەڕێنێت کـە لـە سـاتێکی دیاریکراودا تیایەتی، ئەو بـەردەوام لـە دۆخێکـەوە دەچـێت بـۆ دۆخێکـی دی. هەنـدێ وشـەی تـر کـە

دەكرێ بەكاربرێن و هەڵبەتە بەكاریش براون بریتین لە وەجدecstasy و بالآبوون Transcendence.

هەرچەندە تۆ كە وتت مرۆڤ بە شێوەیەكی وەجدئامێزانە ecstatically هەیە، هیچت نەوتووە جگ لە ئەنجامێكی دیار، لەبەرئەوەی ecstasis هاوواتای یۆنانیی وشەی "existence"ە (كە لە ئەسڵدا لاتینییە). بەڵام خستنەپاڵی وشەی وەجد Ecstatic بۆ جەختكردنەوە لەسەر سیفەتی داینامیكیانەی بوونی مرۆیی یارمەتیماندەدات. لەبەرئەوەی كاتێ مرۆڤ دەكەوێتە "حاڵەتی وەجد"ەوە، خودی خۆی تێدەپەڕێنێت. بوونگەراكان دەڵێن نابێ حاڵەتی "وەجد" تەنها بەسەر ئەو ئەزموونە دانسقانەی وەكو حاڵەتی كەشفی سۆفییانە یان نەشئەی ڕۆحیدا دابڕین، كە عادەتەن ئەو وشەیەیان بۆ بەكاردەبرێ، بەڵكو مەبەست لەوەیە كە مرۆڤ لە ناوجەرگەی بوونیدا هەست بەوە بكات كە لە حاڵەتی وەجدایە. هەروەها دەتوانین بڵێین كە مرۆڤ لە بوونیدا بالآڕەو (Transcendent)ە، بەبێ ئەوەی وشەی بالآڕەوی لێرەدا مانایەكی تیۆلۆژیی هەبێت، ئەمە وشەیەكە كە "سارتەر"یش وەختێ سەبارەت بە مرۆڤ دەدوێت، بەكاریدەهێنێت، قسەكردنیش سەبارەت بە "بالآڕەوی"ی مرۆڤ دیسانەوە مانای ئاماژەكردنە بۆ ئەو حەقیقەتەی كە دەڵێت مرۆڤ لەهەر ساتێكدا ئەو حاڵەتەی خۆی تێدەپەڕێنێت كە تیایەتی.

كەواتە یەكەمین تایبەتمەندیی بنەڕەتیی بوونی مرۆیی، سروشتە ناجێگیرە، هەڵچووە، بالآڕەوەكەیەتی. لە كاتێكا زۆربەی شتەكانی نێو دونیا بە چەند سیفەتێكی دیاریكراو و جێگیر وەسف دەكرێن، بۆ نموونە وەكو كانزاكان. ئەوا ناتوانین بە هەمان شێوە وەسفی ئادەمیزاد بكەین، لەبەرئەوەی كۆمەڵێك سیفەت لە ئارادا نییە كە بوونی دیاری بكەن، چونكە ئادەمیزاد بەردەوام خۆی فڕێدەداتە ناو ئیمكانەكانی بوونەوە.

بەڵام ئایا ئەمە سەبارەت بە گیانەوەر و ڕووەكیش ڕاست نییە؟ شتێكی بەڵگەنەویستە كە دۆخی ئۆنتۆلۆژیی بوونەوەرە زیندووەكان دۆخێكی مامناوەندە لە نێوان بوونی مرۆیی و شتە بێگیانەكانی وەكو شاخ و بەردا. بەڵام پێدەچێ ئادەمیزاد تەنانەت لەسەر ئاستی

بایۆلۆجیش جۆرێك لە كرانەوە و توانای باڵاڕەویی تایبەت بە خۆی هەبێت. تیۆدۆتیۆس دۆبژانسكی دەڵێت:

"پێدەچێ باوانی مرۆڤ لە ١,٧٠٠,٠٠٠ ساڵ لەمەوبەرەوە ویستبێتیان سروشتی گیانەوەرانەی خۆیان بگۆڕن". پاشان لەسەر قسەكانی دەڕوات و ڕای هاوڕێیەكی بە نموونە دەهێنێتەوە كە زانای بایۆلۆژیایە، بەڵام دەشیا ڕای فەیلەسوفێكی بوونگەراش بێت: "بە تەنها مرۆڤ دەتوانێت لە خودی خۆی ڕابمێنێت، واتە تاقە گیانەوەرە كە دەتوانێت وەكو بابەت سەیری خۆی بكات و مەودا لە نێوان خۆی و خودی خۆیدا وەربگرێت و، سەرنجی ئەوەبدات كە دەیكات و تەگبیر بۆئەوە بكات كە دەیەوێ چۆن بێت"[(٩)].

دەشتوانین بە شێوازێكی تر گوزارشت لەم بیرۆكەیە بكەین و بڵێین "بە مرۆڤبوون– Hominization" (وەك تیار دۆشاردان وەسفی سەرهەڵدانی مرۆڤی پێدەكات لەسەر زەوی) بە تەنها دیاردەیەكی بایۆلۆجی نییە كە ملكەچی سەرنجدانی تاقیكارییانە بێت، بەڵكو بە تەنها لە ڕێی فینۆمینۆلۆجییەكی دەروونبینانەوە دەتوانین ڕۆبچینە ناو مانای ئەم دیاردەیەوە. ئەوەی مرۆڤ لە پەرەسەندنی بایۆلۆژیی جیادەكاتەوە ئەوەیە كە ئەو لە ڕێی بەكارهێنانی "یاساكانی سروشت"ەوە ئەو دۆخەی خۆی تێناپەڕێنێت كە لە دەرەوەی مرۆڤ كاردەكەن، بەڵكو لە ڕێی ئەو وێنانەوە كە سەبارەت بە خۆی دروستیاندەكات و هەوڵ بۆ بەدیهێنانیان دەدات و، هەروەها ئەو لەو: "جۆری بوونە ڕادەمێنێت كە تیایەتی و، ئەوەی كە دەیەوێ بیكات و، ئەوەش كە دەیەوێ ببێت". ئایا مرۆڤ سروشتێكی هەیە؟ لەو شتانەوەی پێشتر وتمانن بۆمان دەردەكەوێ كە مرۆڤ سروشتێكی دیاریكراوی نییە، بەڵام ئەگەر وشەی "سروشت"مان بە شێوەیەكی كراوە بەكارهێنا، هیچ زیانێك ناكەین گەر دانمان بە بوونی "سروشتێكی مرۆیی"دا نا. لە ڕاستیدا هەندێ فەیلەسووف و تیۆلۆجیستی كاسۆلیك باسیان لە "سروشتێك"ی مرۆیی كردووە، بەڵام لە هەمان كاتدا پێیان لەسەر سروشتێكی "كراوە" داگرتووە كە دەیەوێ خودی خۆی تێپەڕێنێت. كاتێ

سەبارەت بە بوونی سروشتێکی مرۆیی دەپرسین، ناتوانین بەوە وەڵامی بدەینەوە کە ئاماژە بۆ "سروشتێك" بکەین کە لەگەڵ گیانەوەرانی شیردەردا تیایدا هاوبەشە. لەبەرئەوەی مرۆڤ لە ڕێی مرۆڤبوونی خۆیەوە تەنانەت ئەو سروشتەشی گۆڕیوە. بەهەرحاڵ ئێمە دەبێ لە گۆشەنیگایەکەوە پێناسەی مرۆڤ بکەین کە مرۆڤبوونی جیادەکاتەوە، نەك هاوبەشێتیی لەگەڵ گیانەوەراندا. دەتوانین بڵێین بە شێوەیەکی گشتی پرسیارکردن سەبارەت بە بوونی سروشتێك بۆ مرۆڤ، وەڵامەکەی نەگەتیڤانە دەبێت گەر سروشت بە شێوەیەکی وەستاو Static (ستاتیك) سەیریکەین، یان دایبڕین لە مرۆڤ خۆی، بەڵام وەڵامەکە پۆزەتیڤ دەبێت گەر مرۆڤ وێنایەکی دینامیکیی پێویستی بۆ سروشت هەبوو، بە جۆرێك کە لەگەڵ بوونەوەری مرۆییدا بگونجێت.

وشەیەکی تری باویش هەیە کە دەکرێ بە کورتی لێی بدوێین. ئایا مرۆڤ "ڕۆح" نییە؟ ئاخۆ ئەمە سیفەتی جیاکەرەوەی مرۆڤ نییە؟ بە دڵنیاییەوە مرۆڤ لەگەڵ ئەم گۆشەنیگایەدایە، بەڵام وشەی "ڕۆح" یەعنی چی؟ بێگومان دەبێ ئێمە زەینمان لەو تێڕوانینە بۆ ڕۆح بسڕینەوە کە بە جۆرێك لە گەوهەری پەنهانی لە قەڵەمدەدات (واتە تێڕوانینی animistic).

لەبەرئەوەی گرنگترین خەسڵەتی ڕۆح بەرەو پێشچوون و دەرکەوتنە. واتە ڕۆحیش بیرۆکەیەکی دینامیکییە کە نابێ لە قاڵبی هیچ سروشتێکی وەستاو Staticدا قەتیس بکرێ، مرۆڤی ڕۆحانیش زۆر لە وەستاوییەوە دوورە، لەبەرئەوەی ئەو بەرەو دەرەوە دەچێت ec-static، واتە لە دەرەوەی خودی خۆیدایە Exist و، ڕۆحانیەتیش (یان ڕۆحگەرایی) Spirituality شێوازێکە بۆ ڕاهێنانی دەروون کە بە هۆیەوە "بوونی مرۆڤ" باڵاتر دەبێت.

لێرەدا و لە ڕەوتی ئەو تێبینییانەی پێشوودا، کە تیایدا باسمان لە دینامیکیەتی مرۆڤ و باڵاڕەویی کرد بەسەر خودی خۆیدا، دیسانەوە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ کێشەی بوون و ماهیەت. پێشتر ئاماژەمان بە هەندێ جیاوازی لە بۆچوونی فەیلەسووفە بوونگەراکاندا دا

سەبارەت بەم کێشەیە: هایدیگەر رایدەگەیەنێت کە "ماهیەت"ی مرۆڤ لە بوونیدایە، بەڵام سارتەر دەڵێت بوون پێش ماهیەت دەکەوێت.

بە بۆچوونی من چ هایدیگەر و سارتەر و چ فەیلەسووفە بوونگەراکانی دی کۆکن لەسەر ئەوەی ئادەمیزاد ماهیەتێکی دیاریکراوی نەگۆڕ و پێشوەختی نییە. مرۆڤ لای سارتەر لە شتی دروستکراو ناچێت. کیرکەگۆریش هەمان بڕوای هەیە کاتێ دەڵێت ئێمە ناتوانین بوون بۆ کۆمەڵێك بیروڕای ئەقڵانیی پەتی بگەڕێنینەوە، هەروەها نیچەش، کاتێ دەڵێت مرۆڤ بەرەو باڵامرۆ هەنگاودەنێت. بۆیە لای هەموویان ئادەمیزاد ناکامڵ و ناتەواوە.

بەڵام ئەو ناکۆکییەی کە بە ناکۆکییەکی قووڵی لە قەڵەم دەدەن، پێدەچێ لەمەدا کورتببێتەوە: هەندێ لەم فەیلەسووفانە وایدەبینن کە هەندێ هێڵی ڕێنیماییکەر یان کلیلی ڕێپیشاندەر هەیە، تەنانەت دەشێ لە بوون خۆیشیدا هەبن، کە ئاماژە بۆ چۆنێتیی وەدیهاتنی بوونی مرۆیی دەکەن. لەوە دەچێ هایدیگەریش– بەو ڕستەیەی کە دەڵێت ماهیەتی مرۆڤ لە بوونیدایە– سەر بەم دەستەیە بێت، بگرە زۆر لەم دەستەیە نزیك دەبێتەوە بە تایبەتیش لە پەرەسەندنی دوایی فەلسەفەکەیدا کە تیایدا بوونی مرۆڤ دەگاتە قۆناغی کامڵبوون وەختێ بە دەم بانگەوازی بوونی گشتی (Being)یەوە دەچێت. کارل یاسپەرزیش هەر سەر بەم گروپەیە، دەتوانین ئەو دەربڕینەی بهێنینەوە یاد کە پێشتر بە نموونە هێنامانەوە کە دەڵێت: "هیچ بوونێکی مرۆیی Existenzی دابڕاو نییە لە باڵاڕەوی Transcendence". بێگومان ئەو فەیلەسووفە باوەڕدارانەش کەوا دەڕواننە بوونی مرۆیی کە لە ڕەوتیدا بەرەو خودا، خودی خۆی تێدەپەڕێنێت، هەر سەر بەم دەستەیەن. لە سەرێکی تریشەوە، نیچە و سارتەر و کامۆ وا سەیری بوونی مرۆیی دەکەن کە لە ڕەوتیدا بەرەو نەبوون (عەدەم) خۆی تێدەپەڕێنێت. یەزدانێك لە گۆڕێ نییە، هەر بۆیە مرۆڤ تەنیا و بێ پشت و پەنایە و دەبێ خۆی پێوەرە تایبەتیەکانی خۆی دابنێت و، بەهاکانی خۆی دیاریبکات و، بڕیار لەسەر ئەوە بدات دەبێت بەچی. هەر لێرەشەوەیە نارەزاییەکەی سارتەر لەوەی کە ئەگەر بە پێچەوانەوە بووایە، واتە ئەگەر یەزدان بە جۆرێك لە جۆران

"ماهیـەت"ی بەسـەر ئـادەمیزادا بسەپاندایە، لـەم حاڵەتـەدا مـرۆڤ بـوونێکی ڕاسـتەقینەی نەدەبوو، بەڵکو تەنها وەکو شتێکی دروستکراوی لێدەهات، گەرچـی ئـەو دروسـتکەرە لـەم حاڵەتـەدا خولقێنـەرێکی دابـڕاوە لـەم جیهانـەش. لێـرەدا دەتـوانین وا وەڵامـی سـارتەریش بدەینەوە کە مەسەلەکە پەیوەندیی بە "سەپاندن"ی ماهیەتێکەوە نییە بەسـەر مرۆڤـدا و، "هایدیگـەر"یـش ڕاسـتیکردووە کـە گوتوویـەتی "سـارتەر" چـەمکی بـوون و ماهیـەت بـە شێوازێکی زۆر سوننەتی بەکاردەبات.

بەڵام پێویستە گفتوگۆی ورد لەسەر ئەم کێشە دژوارە دوابخەین تـا دەگەینـە بیرۆکـەی ڕەسەنایەتی Authenticity و تا لە قۆناغێکی دواتـری ئـەم کتێبەشـدا لـە بونیـادی ئاکـاری بوونگەرا و توانای پراکتیزەکردنی ئەدوێین.

٢-دووەم خەسڵەتی سـەرەکیی بـوونی مرۆیـی دانـسقەیی "Uniqueueness"ی بـوونی مرۆییە، چونکە ئەو شـتێکی بـێ ئـەقڵ نییـە تـا کاتـێ باسـی دەکـەین بـە ئـەو "it" نـاوی بهێنین، بەڵکو ئەو بوونەوەرێکە دەڵێت "من..". کاتێکیش بـە ڕانـاوی یەکـەم قسەدەکات، هەر لافی ئەوە لێنادات کە پێگەیـەکی دانسقە و ڕوانگەیـەکی دانسقەی لـە جیهانـدا هەیـە، بەڵکو لە ڕێـی ئـەم ڕانـاوەوە ئامـاژە بـۆ بوونـەوەرێکی دانسقە Unique Beingش دەکـات. هەنـدێك هــەن جارجــار وشــەی Mineness (تایبەتمەنـدیی خـود)یـان بـەکارهێناوە بـۆ گوزارشتکردن لە هوشیاریم بەوەی کە مـن خـاوەنی بـوونێکی تـاك و جیـام لـە بـوونی هـەر مرۆڤێکی دی، من "نموونە"یەك نیم لە پۆلێك یان لە دەستەیەك، بـەڵکو مـن "مـن"م، ئـەم دەستەواژەیەش بە تەنها دووبارەکردنەوەیەك نییە، بەڵکو جەختکردنەوەیـە لەسـەر بـوونی تاکـە کەسـیی دانـسقە Uniqueم، بـەو پێیـەی کـە مـن وەکـو بوونـەوەرێکی بەرچـاو ئـەو بوونەوەرە بەرچاوەم نەك بوونەوەرێکی دی.

بێگومـان ئـەم سـەرنجانە هـەم پێویـستیان بـە ڕوونکردنـەوە و هـەم بـە جۆرێـك لـە مەرجبەندی هەیە، دەشێ بگـوترێ کـە هـەموو شـتێکی بەشـەکی لـە بوونـەوەرەکانی ئـەم دونیایە بوونەوەرێکی دانسقەیە، بـۆ نموونـە دوو نوسـخەی تـازە چـاپکراوی یـەك ڕۆژنامـە

دەشێ زۆر لە یەك بچن، گەرچی بە چاوپیاخشاندنی ورد هەندێ جیاوازیی کەممان بۆ دەردەکەوێ، بەڵام ئەوەی مەبەستە ئەوەیە کە ئەو جیاوازییانە بە لامانەوە گرنگ نین. ئەم نوسخەیەیان بخوێنمەوە یان ئەوی تریان وەکو یەك وایە. کە نوسخەیەکیشیانم خوێندەوە ئیتر بایەخ بە سەدان هەزار نوسخەی تری ئەو ژمارەیە نادەم. خۆ ئەگەر واز لە ڕۆژنامە بهێنین و دەربارەی گیانەوەران بدوێین، دەبینین کە لەمیاندا جیاوازییەکە گرنگتر و ئاشکراترە لە هی شمەکە دروستکراوەکان. ژیانی گیانەوەری جۆرێکە لە بوون کە دەکەوێتە مابەینی بوونی مرۆیی و بوونی شمەکەکانەوە. بەڵام تەنانەت لە حاڵەتی گیانەوەریشدا بە شێوەیەکی گشتی بەلای زیندەوەرزانەوە گرنگ نییە تاقیکردنەوە و توێکارییەکانی لەسەر کام نموونەی بەشەکی ئەنجام بدات. ڕەنگە بوونەوەری مرۆییش وەکو ئەم نموونانە سەیربکرێ، لە زانستگەلێکی سوودمەندی وەکو دەروونناسی و کۆمەڵناسیدا. بەڵام کاتێ بوونەوەری مرۆیی مامەڵەیەکی ئامار ئاسایانەی لەگەڵدا دەکرێ، لەم حاڵەتەدا گرنگترین تایبەتمەندی فەرامۆش دەکرێ کە ئەویش "مرۆڤبوون یان تاکێتی" individualityی وردی هەریەکێك لەو بوونەوەرانەیە. یاسپەرز لەو ڕستەیەدا ڕاستی گوتووە کە پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد: هیچ بوونەوەرێکی دی ناتوانێ جێی بوونەوەری مرۆیی بگرێتەوە، هەرچۆن ناگۆڕرێتەوە. مرۆڤ دەتوانێ بڵێت کە بوونەوەری مرۆیی تاك سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی بایەخپێدانە. ئەم سێ خەسڵەتەش: واتە "هیچ جێی ناگرێتەوە" و "ناگۆڕرێتەوە" و "سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی بایەخپێدان" دەبنە مایەی دانسقەیی بوونەوەری مرۆیی یان تایبەتمەندیی خودیی بوونەوەری تاکەکەسی و هەر ئەمانەش لە جۆرەکانی تری بوون جیای دەکەنەوە.

لە سەرێکی ترەوە ڕەنگە بوترێ کە دانسقەیی هەموو بوونەوەرێك تەنها دانسقەییە لە ڕووی مادییەوە و، لە بنەڕەتدا جیاواز نییە لەو جیاوازییە وردانەی کە لە نێوان پەپوولەیەك و پەپوولەیەکی تری هەمان ڕەگەزدا هەیە، یان لە نێوان دۆلارێکی زیو و دۆلارێکی تردا هەیە. ئێمە دەزانین کە جیاوازیی فیزیکی لە نێوان بوونەوەرێکی مرۆیی و بوونەوەرانی

مرۆیی تردا هەیە، هەموو بوونەوەرێك ڕوویەكی دانسقە و ڕواڵەتێكی دانسقەی خۆی هەیە. لەم ساڵانەی دواییشدا زۆر شت لە بارەی بنەمای فیزیكیی "دانسقەبوون Uniqueness"ەوە فێربووین. بۆماوەناسی فێری كردووین كە خانەكانی بۆماوەی هەر كەسێك (واتە جینەكانی) هەڵگری تایبەتمەندییەكانی ئەو كەسەن و ئامێتەبوون و گۆڕانكاریی شیاوی ئەو پێكهاتەیەی كە زاووزێشی لەسەر بەندە كۆمەڵێك ئەگەری بێ كۆتایین. بەڵام دۆزینەوەی ئەم بنەما فیزیكییەی "دانسقەیی"، "دیاردەی بوونگەرایانەی ئەم دانسقەییە بە تەنها ناگەڕێنێتەوە بۆ دیاردەیەكی فیزیكیی شوبهاو بەو جیاوازییە فیزیكیانەی كەوا لە هەر "گیانەوەر" و هەر "بلوور" و تەنانەت هەر شتێكی دروستكراو دەكات كە شتێكی دانسقە و بێ وێنە بێت. دانسقەبوونی بوونەوەری مرۆیی، بنەما بایۆلۆجی و سروشتی -كیمیاییەكەی هەرچییەك بێت، دانسقەبوونێكی جیاوازە، هیچ گیانەوەرێك یان شتێكی دروستكراو نییە بتوانێت بڵێت: "من".

دانسقەبوونی ئادەمیزاد لەو هەستەیدایە كە خاوەنی تایبەتمەندێتیی ئەو بوونەیە كە خۆی دەناسێت بەوەی كە "من"ە و لە دونیایەكی بچكۆلەكراو (مایكرۆكۆزم Microcosm*)یان لە مۆناد Monad (گەردیلەی ڕۆحی) دەچێت، وەك لایبنیتز** ناوی دەنێت، كە سەنتەرێكی دانسقەیە و لە هیچ بوونەوەرێكی تر ناچێت و، تەنیا و دابڕاوە لەوانی دی، بەڵام بە مانایەك لە ماناكان جیهان دەگرێتە خۆی و جیهانیش ئەو دەگرێتە خۆی، كاتێك دەڵێم من ئەم "من"ەم یەكێكی تر نیم، ئەم قسەیەم پێدراوێكی سەرەكی و

---

* مایكرۆكۆزم زاراوەیەكی بە ئەسڵ یۆنانییە كە لە دوو برگە پێكدێت Micro واتە بچووك و Cosmos واتە گێتی یان گەردوون، یۆنانییەكان ئەم ناوەیان بەسەر مرۆڤدا دابڕیبوو بەرامبەر جیهانی گەورە یان گەردوون Macrocosm.

** مۆناد Monad وشەیەكی یۆنانییە، واتە یەكەی سەربەخۆ، ئەم زاراوەیە لە فەلسەفەكەی فەیلەسووفی ئەڵمانی لایبنیتز ١٧١٦ -١٦٤٦ (Leibniz)دا باو بوو، لایبنیتز دەیگوت قسەكانی ئێمە "مۆناد"ن واتە گەوهەری تاكەكەسن یان جیهانێكی سەربەخۆن و سەر بە هیچ نین تەنها خودا نەبێت .

خەسڵەتێکی گەوهەریی بوونی مرۆییە. بەڵام بۆچی وایە؟ ئەمە نهێنییەکی ئاڵۆزە، لەوانەیە پرسیاری "بۆچی"یش بێمانا بێت، یان لەوانەیە ئەم وشەیە لەم ڕەوتگە (سیاق)ەدا بە تەنها گوزارشت لە جۆرێك سەرسوڕمان بکات و هیچی تر. لە لایەکی ترەوە خەڵك ڕاهاتوون بە مەزەنە وەڵامی ئەم پرسیاری "بۆچی"یە بدەنەوە، هەر بۆیە چیرۆکەکانی خوڵقاندن (خلق) و دۆنادۆنی ڕۆحەکان (تناسخ الارواح) هۆیەکەی تا ڕادەیەك بۆ ئەم "من" بوونە دەگەڕێتەوە. جارێکی تریش بۆ ئەم بابەتە دەگەڕێینەوە کاتێ لەو دیاردەیەمان کۆڵییەوە کە بوونگەراکان پێی دەڵێن Facticity.

٣-سێیەم تایبەتمەندیی سەرەکی پەیوەستبوونە بە خودەوە Self-relatedness، ئەمەش تایبەتمەندییەکە بەرەنجامی ئەو خەسڵەتانەی پێشووە کە باسمانکردن. ئێمە بینیمان کە بوونەوەری مرۆیی وەکو کەسێکی دانسقە بە ڕێگای خۆیدا دەڕوات. ئەو یان خودی خۆیەتی، واتە ئەو بوونەوەرە دانسقەیەی کە لە جیهانی شتەکان دەردەچێت و لەهەر حاڵەتێکی پێدراو دووردەکەوێتەوە، یاخود خودی خۆی نابێت و لەناو جیهانی شتەکاندا دەتوێتەوە (وەکو هەر شتێکی تر) و بۆ هیچ شتێکی خۆی بڕیار نادات، بەڵکو فاکتەرەکانی دەرەوە بڕیاری هەموو شتێکی بۆ دەدەن. ئاڵۆزیی زۆری بوون و خودێتی لە دەستەواژەی وەکو: "مانای بوونت وەکو خودێك" دەردەکەوێ (یان بە دەربڕینێکی باشتر: لە ڕێگاتدا بەرەو خودێتی) ئەمەش مانای ئەوەیە توانات هەبێت لەگەڵ خودی خۆتدا ببیت بە یەك و خودی خۆت بهێنیتە دی (گەرچی دەشێ مرۆڤ خۆی دەسبەرداری ئەمە بێت)، یان توانای ئەوەت هەبێت لەناو خودی خۆتدا دابەش بیت و لەوە دابڕێیت کە پێی دەڵێن "خودی ڕاستەقینە". هەندێ لە بوونگەراکان ئەم دوو توانایە (ئەم دوو ئیمکانە) ناودەنێن "بوونی ڕەسەن authentic و بوونی ساختە یان نارەسەن inauthentic". بەڵام ئەم زاراوانە بە ئینگلیزی کەمتر ئەو مانایانەمان پێ دەبەخشن کە لە ئەسڵە یۆنانیەکەدا هەن. چونکە وشەی authantic دەلالەت لە کەسێك دەکات کە شت بۆ خۆی بکات autos، واتە بۆ بەجێهێنەری کردارەکە. بەڵام لە بەکارهێنانماندا بۆ ئەو وشەیە،

بۆ نموونە سەبارەت بە تابلۆیەك دەڵێین ئەمە کارێکی "ڕەسەن"ی "ڕامبرانت"ە[*]، کە مەبەستمان لەوەیە ئەو تابلۆیە ڕامبرانت خۆی کردوویەتی. هاوواتا ئەڵمانییەکەش Eigentlich دەکرێ بە شێوەیەکی حەرفی بە Own-ly بۆ ئینگلیزی تەرجەمەی بکەین، واتە ئەو شتەی کە مرۆڤ بە هی خۆی دەزانێت.

مەسەلەی پەیوەستبوونی مرۆڤ بە خودی خۆیەوە و ئەو تەنگژەیەی کە تێیدەکەوێت لەوەدا کە (یان دەبێ جڵەوی بوونی خۆی بگرێتە دەست یان بەرەڵای بکات) دیسانەوە و لە شێوەیەکی تردا کێشەی بون و ماهیەت دەوروژێنێتەوە. ئێمە چۆن دەتوانین جیاوازی لە نێوان بوونی ڕەسەن و بوونی ساختە یا ناڕەسەندا بکەین؟ پێودانمان بۆ ئەوە چییە؟ پاشان ئاخۆ لە ڕاستیدا پێودان بۆ ئەوە هەیە؟

ئایا بوونی ڕەسەن بەندە بە بەهێزیی هەڵبژاردنەوە و ڕادەی خودێتی لە هەڵبژاردندا؟ هەروەها ئایا ئەمە بەو مانایە دێت کە تەبابوون لەگەڵ ڕێساکان و پەیڕەویکردنیان ڕەفتارێکی ناڕەسەنە؟ ئایا دەشێ مرۆڤ ئەو ئەنجامگیرییە بکات کە لەوانەیە کەسێکی دز و لادەر و یان دیکتاتۆرێکیش مرۆڤێکی ڕەسەن بێت، لەبەرئەوەی خۆی ئەو ڕێگایەی هەڵبژاردووە و، هاووڵاتییەکیش کە بە یاساوە پەیوەستە بوونێکی ناڕەسەنی هەبێت لەبەرئەوەی ئەو بەبێ بیرکردنەوە بە یاساوە پەیوەستە؟

بە گشتی فەیلەسووفە بوونگەرا بێباوەڕەکان هەستدەکەن ناچارن ڕێگای یەکەم لەم دوو ڕێگایە بگرنەبەر، گەرچی ئەوان لە ئەنجامە ئاژاوەگێڕی و ناکۆمەڵایەتیەکانی ئەو ڕێگایە خۆیان دەپارێزن. بۆ نموونە سارتەر بڕوای وایە کە ئێمە خۆمان لە ڕێی "هەڵبژاردن"ەوە بەهاکانی خۆمان دەخولقێنین و شتێك هەڵنابژێرین کە لە پێشدا بە چاکە دیاریکراوە و ناسراوە، بەڵکو ئێمە شتێك هەڵدەبژێرین لەبەرئەوەی بەلای ئێمەوە چاکەیە. بەڵام لە هەمان کاتدا سارتەر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئێمە شتێك هەڵنابژێرین لەبەرئەوەی "باشترین"ە "تا بۆ هەمووان باش نەبێت"[10]. شتێکی ئاشکراشە کە ئاسان

---

[*] ڕامبرانت (١٦٠٦–) Rambrandt یەکێکە لە هونەرمەندە شێوەکارە گەورەکانی جیهان.

نییە ئەوە بزانین چۆن ئەم پرنسیپە بە ڕواڵەت کانتییە لەگەڵ فەلسەفەکەی سارتەردا دەگونجێت. بەڵام بەهەرحاڵ من بڕوام وایە کە دەبێ هەر وا وەسفی ئەم پرنسیپە بکەین کە (تەنها بە ڕواڵەت) کانتییە. لەبەرئەوەی جیاوازیکردنی کانت **Kant** لە نێوان سەربەخۆبوونی ئیرادە و سەربەخۆنەبوونیدا، بە ڕواڵەت لە جیاوازیی نێوان بوونی ڕەسەن و بوونی ناڕەسەن دەچێت لای بوونگەراکان، بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە. ئەم دوو فەیلەسووفە هەردووکیان دژ بە قبووڵکردنی کوێرانەی ئەو یاسا ئەخلاقیانەن کە لە دەرەوەی خودی مرۆڤەوە بەسەریدا دەسەپێنرێن، بەڵام تێڕوانینەکەی سارتەر تێڕوانێکی خودییە کە لای کانت نییە، چونکە سارتەر نکووڵی لەوە دەکات "ئەقڵێکی کردەیی" هەبێت کە بە شێوەیەکی بابەتی جێی بڕوابێت.

بەرامبەر بەم ئاقارە خودییانە، فەیلەسووفە بوونگەرا مەسیحییەکان و فەیلەسووفە بوونگەرا ئەڵمانیەکان، هەوڵدەدەن ئەو قۆرتە لە نێوان ئازادیی تاکەکەس و سەربەخۆیی ئیرادەی و، خواستەکانی یەزدان یان خواستەکانی بووندا نەهێڵن. بەڵام ئەمە مەسەلەیەکی هەروا ئاسان نییە، بە تایبەتیش ئەگەر مرۆڤ بیەوێ نەکەوێتە هەڵەی پەنابردنە بەر "ماهیەتێکی مرۆیی"ی لە پێشدا ئامادەکراو بەو سیفەتەی پێودانێك بێت بۆ ڕەسەنایەتی. سێوێکی باش یان ڕاکێتێکی باشی تێنس بۆیە باشن لەبەرئەوەی پێودانێك هەیە بۆ باشێتییان، بەڵام ئەوەی کە بوونگەرا ڕەتیدەکاتەوە، مەسیحی بێت یان نامەسیحی، ئەوەیە کە مرۆڤ وەکو سێو یان ڕاکێت بپێورێ.

قسەکردنی ورد و درشت لەسەر ئەم مەسەلە دژوارانە بۆ بەشەکانی دواتری ئەم کتێبە هەڵدەگرین (بڕوانە بەشەکانی هەشت تا دوانزە). بەڵام ئێمە جگە لەو تایبەتمەندییە سەرەکییانەی بوون کە باسمانکردن، تایبەتمەندییەکی تریش دەخەینە سەریان کە ئەویش ئەوەیە "بوون بە تەنها ئەوە نییە "هەبیت **to be**"، بوون واتە ڕووبەڕووی هەڵبژاردن ببیتەوە "هەبیت یان نەبیت **To be or not to be**"، واتە بە مانای وشە خاوەنی بوون بیت، یاخود دەسبەرداری بیت.

## ٤–توانای شیکردنەوەی بوونگەرایانە

لـە بنەڕەتـدا ئـەم بەشـەمان بـۆ توێژینـەوەی چـەمکی "بـوون" تـەرخانکرد، لەگـەڵ ئاماژەپێـدانێکی تایبەتیـدا بـۆ شـێواز (یـان شـێوازەکانی) تێگەیـشتنی فەیلەسـووفە بوونگـەراکان لـەم چـەمکە. لـەم قۆناغەشـدا یەکـەمین هەڵسەنگاندنی بوونگـەراییمان بـۆ مەیـسەر دەبێـت. ئێمـە هـەمووومان بوونـەوەری مـرۆیین و بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆش پەیوەستین بـە مانـای وشـەی "بـوون"ەوە. بـەڵام ئـاخۆ ئێمـە، وەختـێ بـیر لـە بوونمـان دەکەینەوە، بەو وەسفە سەرەکییەی بوونگەراکان قایل دەبین کە ئەڵێن ئەم بوونـە ناكامـڵ و بێ سنوورە و هەر حاڵەتێکی دانسقەیە و، دەشـێ خـودی خـۆی بـەدیبهێنێت یـاخود لـە دەستی بدات؟ ئەگەر لەسەر ئەم شتانە لەگەڵیانـدا کـۆك نـەبین، لـەم حاڵەتـەدا وا باشـترە لەوە زیاتر لەگەڵیاندا نەڕۆیین.

بەڵام ئەگەر ئەم وەسفەمان بۆ حاڵەتی بوون بە وەسـفێکی ورد لـە قەڵـەم دا، بگـرە بـە وەسفێکی وروژێنـیش (بـە بـەراورد لەگـەڵ بیروبۆچـوونی ماهیەتگـەراکان Essentialistsدا)، ئەوکات ئەم پرسیارە دێتە پێشێ: "دوای ئەوە بەرەو کوێ دەچـین؟" ئایـا ئـەم وەسـفەی بونیادە بنەڕەتیەکـەی بـوون، نابێتـە مایـەی ئەسـتەمبوونی دامەزرانـدنی فەلـسەفەیەك بـۆ بوون؟ ئێمە لـەوە تێدەگـەین کـە چـۆن بوونـەوەری دانسقە، بـە هـۆی ئـەوەی کـە دەبـێ سەبارەت بە بوونی خۆی بڕیاربدات، ناچار دەبێت لە بوونی خۆی ڕابمێنێـت و بـەو جـۆرەی کە بۆی مەیسەرە لـەو بوونـە تێبگـات. بـە پێـی ئـەو زاراوەیـەی کـە هەنـدێ لـە نووسـەرە بوونگەراکان بەکاری دەهێنن، ڕەگوڕیشەی فەلسەفەی بوونگەرایی لەناو بـوونی بەرچـاودایە و سیفەتی "بوونگەرایی"یـش ئامـاژە بـۆ بونیـادە گـشتیەکانی بـوونی مرۆیـی دەکـات، لـە کاتێکا وشەی Existentiell ئاماژەیە بۆ بوونی بەرچـاوی بوونـەوەری تـاك. گەرچـی هەنـدێ نووسەر هەن ئەم جیاوازییە ڕەتدەکەنەوە. بەڵام دەشێ هەموو لەسـەر ئـەوە کـۆك بـن کـە

هاندەری بنەڕەتیی هەر فەلسەفەیەکی بوون لـە پێویـستیی تاکەکەسـەوە بـۆ گەیـشتن بـە تەباییەك لەگەڵ بوونی تایبەتی خۆیدا سەرچاوە دەگرێ.

بەڵام مرۆڤ چۆن دەتوانێت لە بـوونی مرۆیـی تاکەکەسـیی بەرچـاوەوە کـە لـە نزیکـەوە دەیناسێت ڕاستەوخۆ بەرەو جۆرێك لە لێکدانەوەیەکی فەلسەفی بـچێت کـە هەڵبـەت ئـەبێ لافی ئەوە لێبدات کە برێك لە ڕاستیی پێکاوە، تەنها لەبەرئـەوەی نـاوی "فەلـسەفی"ی لـە خۆی ناوە؟ بە شێوەیەکی تایبەتیش: ئەگەر بوونی مرۆیی بـەردەوام ناکامـڵ و نـاجێگیرە، مرۆڤ چۆن دەتوانێ لافی ئەوە لێبدات کـە وەسـف و لێکدانـەوەی تـەواوی بـۆی هەیـە؟ لـە سـەرێکی تریـشەوە، ئەگـەر هـەر بوونـەوەرێك تـاکێکی دانـسقە بێـت و وەکـو "نموونـە"ی دەستەیەك سەیر نەکرێ، مرۆڤ چۆن دەتوانێت حوکمێك بەسـەر بـوونی مرۆییـدا بـە گـشتی بدات؟ کە ئەمە کارێکی پێویستە بۆ هەر فەلسەفەیەکی بوونیش.

پاشان ئەگەر کۆمـەڵێك پێـوەری بابـەتی نـەبێت بـۆ جیاکردنـەوەی بـوونی ڕەسـەن لـە ناڕەسـەن، ئـاخۆ ئـەوکات ناکەوینـە ژێـر کاریگـەریی حـەز و ئـارەزووە تاکەکەسـیەکان و پەسـەندکردنی هەوەسـبازانەوە؟ ئـەی ئەمـەش نابێتـە هـۆی زیـادەڕەوی لـە ئازادیـدا لای سارتەر و، پووچیی قارەمانانە لای کامۆ و، مەسیحیەت لای کیرکەگۆر و باڵامرۆ لای نیـچە و مردن لای هایدیگەر و هەر بیرۆکەیەکی تری لـەم بابەتـە و بـە ڕەهـا کردنیـان؟ بـەڵام ئـەوە وەکـو فەلـسەفە هـیچ شـتێکمان پێنالێـت، بـەڵکو شـتمان سـەبارەت بـە حاڵەتـە سایکۆلۆژییەکانی هەریەك لەم نووسەرانە پێدەڵێت.

هەڵبەت ئەم ڕەخنانە ڕەخنەی توندن و، دەشێ لە ڕوانگەی هـەر توێـژەرێکی سـەر بـە ئەزموونگەرایی تەسك یان ئەقڵگەرایی بەرتەسکەوە بە گورزی کوشـندە بـۆ بوونگـەرایی لـە قەڵەم بدرێن، ئەو توێژەرەی کە وەکو هەر دیاردەیەك لـە دیاردەکـانی سروشـت لـە مـرۆڤ و کـردەوەی مرۆیـی دەکۆڵێتـەوە. بـەڵام دەشـێ ببێتـە هانـدەرێکیش و بـۆ پـەرەدان بـە میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی مرۆڤ هانمان بدات، لەبەرئەوەی لێکۆڵینەوە لە مرۆڤ پێویستی بـە میتۆدی کراوەتر و وردتـر هەیـە لـەو میتۆدانـەی کـە لـە لێکۆڵینـەوەی کانزاکـان و ڕووەکـدا

بەكاردێن. ئەو سێ پرسیارە رەخنەییەی كە لە كۆتایی برگەی پێشووشدا وروژاندمانن، دەتوانین بەم جۆرە وەلامیان بدەینەوە: گوتنی ئەوەی كە مرۆڤ "ناكاملێ"ە و بەردەوام لە رێگایدایە بەرەو ئەوەی كە دەیەوێ ببێت، مانای ئەوە نییە كە وەسفكردنی مرۆڤ ئەستەمە، بەلكو مانای ئەوەیە كە ئەم وەسفە دەبێ بایەخ بە "ئیمكان"ەكان بدات نەك هەندێ خەسلەتی نەگۆڕ، هەروەها گوتنی ئەوەی كە هەر تاكەكەسێك بوونەوەرێكی دانسقە و بێهاوتایە، مانای ئەوە نییە كە ئێمە رووبەڕووی كۆمەلێك تاكەكەس دەبینەوە كە نە شێوەیان هەیە و نە وەسف دەكرێن. لەبەرئەوەی كۆمەلێك سنوور و ئاسۆ هەن كە ئەم بوونەوەرە دانسقانەیان تێدایە و، كۆمەلێك بونیاد هەن كە بە هۆیانەوە ئەو تاكانە دەناسین. دواجاریش، كە دەگوترێ بوونی مرۆیی لە رێی جیاوازەوە خودی خۆی بەدیدەهێنێت، ئێمە دەتوانین پەی بەوە بەرین كە بۆ ئەوە هەندێ پێوەر هەن (گەرچی زیاتر پێوەری دەرەكین نەك ناوەكی) كە مرۆڤ بەرەو وەدیهاتنی رەسەن دەبەن.

بەم پێیە ئێمە دەبێ درێژە بە باسەكەمان بدەین، باسەكەشمان شێوەی شیكردنەوەی فینۆمینۆلۆجی لەخۆ دەگرێت بۆ ئەو جۆرە بوونەی كە پێیدەلێن بوونی مرۆیی Existence كە لە بەشی پێشوودا خاسیەتە سەرەكیەكانیمان خستەڕوو.

# بەشی چوارەم

## بوون و جیهان

١–بوون و دەورووبەر.

٢–جیهانی ڕۆژانە.

٣–جیهانی زانست و هونەر و ئایین.

٤–جەستە.

٥–شوێن و کات (زەمەن).

٦–سروشت.

## ١–بوون و دەوروبەر

گەرچی ئێمە زۆر لە بارەی "جیهان"ەوە ئەدوێین، بەڵام تۆزێك بیركردنەوە لەم وشەیە ئەوەمان پیشاندەدات كە گەلێ مانا دەگرێتە خۆی و، هەندێك لەم مانایانە ڕوون نین، كەواتە جیهان چییە؟ ڕەنگە پێمان خۆش بێت وەڵامی ئەم پرسیارە وا بدەینەوە كە: جیهان بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی كە هەن. بەڵام ئەم وەڵامە یەكسەر بەرەو ڕووی كۆمەڵێك كێشەمان دەكاتەوە، كەس ڕادەی فراوانی و ناوەڕۆكی ئەو شتانە نازانێت كە هەن، كەواتە ئیتر چۆن دەتوانێ حوكمێكی مانادارییان لە بارەوە بدات؟ پێدەچێ كاتێ یەكێكمان دەربارەی جیهان ئەدوێت، زیاتر مەبەستی لەو شتانە بێت كە دەكەونە سنووری دەرك پێكردنیەوە، یان هەموو ئەو شتانەی كە وێنایەكیان لە بارەوە دروستدەكات. بەڵام ئەو ناتوانێ لافی ئەوە لێبدات كە دەربارەی هەموو ئەو شتانە ئەدوێت كە هەن.

بەم جۆرە واژەی "جیهان" بەردەوام هەڵگری گۆشەنیگای ئەو كەسەیە كە دەربارەی جیهان ئەدوێت. واتە جیهان شتێكی تەواو سەربەخۆ نییە لەو كەسانەی لە

بارەیەوە ئەدوێن، بەڵام واتای ئەو دەوروبەرەیان دەگەیەنێت بەو جۆرەی دەیناسن و دەرکی پێدەکەن، کەواتە شتێکی بێمانایە دەربارەی "هەموو ئەو شتانەی کە هەن" و بەبێ دیاریکردنیان بدوێین. بەڵام جیهانیش بە تەنها بریتی نییە لە "هەموو ئەو شتانەی هەن"، بەڵکو بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی کە دەوروبەری (یان ژینگەی) مرۆیی‌و هەروەها ئەو مەیدانە Setting پێکدەهێنن کە ژیانی ئادەمیزادی تیا بەسەر دەبرێ.

وشەی جیهانیش لە زمانی ئینگلیزیدا "World" لە وشەیەکی ئینگلیزیی کۆن وەرگیراوە کە "Weor-old"وە تیایدا بڕگەی Weor بە مانای مرۆڤ دێ و بڕگەی oldیش واتە سەردەم یان چاخ. کەواتە وشەی جیهان لە ئینگلیزیدا بە گوێرەی پێکهاتە زمانەوانیەکەی بە مانای سەردەمی مرۆڤ یان چاخی مرۆڤ دێت.

کەواتە گەر بمانەوێ وردبین، پێویستە بڵێین جیهانێك نییە لە مرۆڤ دابڕاوبێت. بەڵام نابێ وا لەمەش تێبگەین کە مەبەستمان لە جۆرێك لە جۆرەکانی ئایدیالیزمی خودیی‌یە کە تیایدا بوونی گەردوونی ماددی لەسەر ئەو ئاوەزانە بەندە کە دەرکی پێدەکەن (کاتێ شتێك هەیە کە دەرکی پێبکرێ esse est percipi)

بێگومان گەر بوونەوەرە مرۆییەکانیش نەبن، هێشتا هەر کاکێشانەکان و درەختەکان و تاشە بەردەکان و شتی تری لەو بابەتە هەن و، دیارە کە لە چاخە دێرینەکانیشدا و بەر لە پەرەسەندنی جۆری مرۆیی هۆشمەند Homo Sapiens و بەر لە سەرهەڵدانی هەر جۆرێکی تری مرۆیی لەسەر زەوی هەر هەبوون. بەڵام هەموو ئەم شتانەش پێکەوە

*ئایدیالیزمی خودی ئەو ڕێبازەیە کە قەشەی ئێرلەندی جۆرج بارکلی (١٦٨٥–١٧٥٣) دایمەزراند و ئەو بڕوای وابوو کە شتەکان بوونیان نییە مەگەر ئەقڵێك هەبێت دەرکیان پێبکات، ئیدی ئەو ئەقڵە ئەقڵێکی مرۆیی بێت یان یەزدانی.

**مەبەست لە Homesapiens ئەو قۆناغەیە لە پەرەسەندنی ژیانی ئادەمیزاد کە تیایدا پەنای بردەبەر ئامرازەکان بۆ زاڵبوون بەسەر ژینگەدا و، ئەم قۆناغەش جیاوازە لە قۆناغی چاخی بەردین کە بەر لەم بوو.

جیهانێك دروست ناكەن، پێشتر بینیمان كە جیهان بە تەنها بریتی نییە لەو "شتانەی كە هەن". كاتێكیش دەڵێین جیهانێك نییە لە مرۆڤ دابڕاوبێت، ئەم قسەیەمان بریتی نییە لە دەستەواژەیەكی میتافیزیكی سەبارەت بە مۆركی ئەو شتە مادديیانەی پشت بە دەركی ئاوەزی مرۆڤ دەبەستن. بەڵام من تەنها ئاماژە بۆ خاڵێكی زمانەوانی دەكەم، ئەویش ئەوەیە كە: ئێمە كاتێ دەربارەی جیهان ئەدوێین، لە هەمان كاتدا واتە دەربارەی مرۆڤیش ئەدوێین، لەبەرئەوەی واژەی "جیهان" دیدگایەكی مرۆییانە دەگرێتە خۆی، كە لەم دیدگایەوە وەكو ژینگە (دەوروبەر)ێك دەڕوانینە هەموو شتەكان.

مرۆڤ جیهانی خۆی ڕێكدەخات، هەر بۆیە قسەكردن لەسەر "جیهان" جۆرێك لە یەكبوون دەگەیەنێت، لەبەرئەوەی جیهان ئاشووبێك نییە، یان تێكەڵەیەكی كوێر **Chaos** نییە.

هەر لەمەشەوەیە كە یۆنانییە كۆنەكان بە جیهانیان دەوت **Kosmos** واتە گەردوونی ڕێكوپێك. مرۆڤ دیاردەكان لە جیهاندا ڕێكدەخات. بەڵام دەشێ نەتوانێ جیهانەكەی خۆی بە تەواوی ڕێكبخات.

بەردەوام شتی بێسەروبەر لە ئارادا دەبن. ئەو پرسیارەی لێرەشدا قوت دەبێتەوە ئەوەیە كە ئاخۆ ئەم یەكبوونە (وحدە)یە لە لایەن هۆشی ئادەمیزادەوە سەپێنراوە، یان هۆشی ئادەمیزاد ناتوانێ سیستم (ڕێكوپێكی) و یەكبوون بسەپێنێت، بەڵكو ئەمانە خۆیان لە دیاردەكاندا هەن. ئەم پرسیارەش پرسیارێكی پێشووترمان بەبیردێنێتەوە كە لە بەشی پێشوودا ووروژاندمان سەبارەت بەوەی كە ئاخۆ بەهاكان و بیرۆكەی بوونی ڕەسەن دروستكراوی هۆشی مرۆڤن، یان ئەوە كاردانەوەی مرۆڤە بۆ مەسەلەیەكی ئەخلاقی كە سەرچاوەكەی دەرەوەی ئادەمیزادە. فەیلەسووفە بوونگەراكان وەڵامی جیاوازیان بۆ ئەم دوو پرسیارە هەیە، ئێمە لێرەدا بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری دووەم، هەمان پۆلێنكردن دەگرینە بەر كە لە وەڵامدانەوەی پرسیاری یەكەمدا گرتمانەبەر: فەیلەسووفە بوونگەرا بێباوەڕەكان جەخت لەسەر گرنگیی ڕۆڵی مرۆڤ دەكەنەوە لە

بەخشینی مانا و ڕێکوپێکی بە زۆر لەو شتانەی کە بێمانان. بەڵام ئەو فەیلەسووفە بوونگەرایانەی کە باوەڕدارن یان مەیلێکی ئایینییان لا هەیە، دەڵێن کە مرۆڤ ناتوانێت مانا بە دیاردەکان ببەخشێت و گەر بتوانێت لەبەرئەوەیە کە ئەو دیاردانە لەناو خۆیاندا ئەو مانایانەیان هەڵگرتووە. بەڵام بوونگەراکان هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە فاکتەرێکی مرۆیی گرنگ هەیە لە پێکهێنانی چەمکی "جیهان"دا و، ئێمە لە ڕوانگەیەکی مرۆییەوە دەڕوانینە جیهان.

"جیهان"ی زۆر هەیە و، هەریەك لەم جیهانانە لە ڕووی پەیوەندییەوە بە گۆشەنیگایەکی تایبەتیەوە، ڕێکخراوە. بەڵام "جیهان بە شێوەیەکی گشتی" چەمکێکی ناڕوونە. بۆ نموونە کاتێ لە ڕۆژنامەدا ئەوە دەخوێنینەوە کە گرژی "جیهان"ی لێکترازاندووە، دەزانین کە مەبەستی نووسەرەکە جیهانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانە. بەڵام کە چووینە سەر لاپەڕەی وەرزش، دەشێ تیایدا شتێك سەبارەت بە "جیهانی تۆپی پێ" بخوێنینەوە، هەروەها ڕەنگە لە لاپەڕەی ژنانیشدا شتێك دەربارەی "جیهان"ی مۆد بخوێنینەوە. کەواتە گەلێ جیهان هەن کە لە ڕووی فراوانی و گرنگییەوە لە یەك جیاوازن، هەمووشیان جیهانی "دەوروبەر"ن، واتە بوارن بۆ چالاکیی مرۆیی و لە ڕوانگەی ئەم چالاکیانەوە ڕێکدەخرێن. هەموو چالاکییەکی مرۆییش پێویستی بە "جیهان"ێك هەیە، بەم مانایەش چەمکی جیهان وەك چەمکێکی پێشوەختانە **apriori** دێتە بەرچاو، واتە جیهانێکی تایبەت و ناوەرۆکی جیهانێکی دیاریکراو ناگەیەنێت، بەڵکو چەمکی وێنایی بۆ جیهان دەگەیەنێت.

تا ئێرە هەوڵمداوە جەخت لەسەر گرنگیی فاکتەری مرۆیی یان فاکتەری بوونگەرایی لە مانای وشەی جیهاندا بکەم، تا ئەو ڕادەیەی کە وتم جیهانێك نییە دابڕاوبێت لە زەینی مرۆیی کە لە پێکهاتنیدا هاریکاری دەکات. هەروەها وتم کە ئەوە بە مانای تیۆرەیەك نییە لە تیۆرەکانی ئایدیالیزمی خودی، پێدەچێ کاتی ئەوەش هاتبێت کە تای تەرازووەکە ڕاست بکەینەوە و بە هەمان جەختکردنەوە بڵێین کە هیچ بوونەوەرێکی

مرۆییش نییە لەو جیهانە دابڕاو بێت کە تیایدایەتی. لەبەرئەوەی بوونەوەری مرۆیی سەنتەرێکی هۆشیاریی کامڵ و بەرکەماڵ نییە کە جیهان ببێتە پاشکۆی، چونکە دەڵێین بوون، واتە بوون لە جیهاندا. خۆ گەر ئەوە ڕاست بێت کە بوونەوەری مرۆیی جیهانەکەی خۆی ڕێکدەخات، ئەوا ئەوەش ڕاستە کە جیهانیش سەربەخۆیی خۆی هەیە. هەروەها کۆمەڵێك توخم هەن لە جیهاندا کە سەرسەختانە بەرهەڵستی هەموو ئەو هەوڵانەی مرۆڤ دەکەن کە بە مەبەستی ڕێکخستنی شتەکان لە یەکەیەکدا دەیدات. هەرچۆن مرۆڤ لە جیهاندا کرداری خۆی ئەنجامدەدات، جیهانیش لای خۆیەوە کاردانەوەی لەسەر مرۆڤ هەیە. سارتەر کە جەخت لەوە دەکات شتە پێکهێنەرەکانی جیهان "لە خۆیاندا" مۆرکێکی سەخت و پتەویان هەیە، بە شێوەیەکی باش لێککاریی نێوان خودی مرۆیی و جیهان پوخت دەکاتەوە و دەڵێت:

"بەبێ جیهان هیچ کەسێك و هیچ خودێکی مرۆیی بوونی نییە و بەبی خودی مرۆییش یان کەسان، هیچ جیهانێك نییە.." خۆ ئەگەر بە شێوەیەکی تر گوزارشت لەم بیرۆکەیە بکەین، دەکرێ بڵێین کە مرۆڤ بەبێ دەوروبەرەکەی هیچ نییە. گەرچی ئەوە ڕاستە کە کیرکەگۆر زۆر سەبارەت بە خودێتی دواوە، بەڵام بوونگەرایی فەلسەفەیەکی خودی نییە و، ڕێبازێك نییە بانگەشە بۆ "هەرمنی Solipsism" بکات، چونکە کە هەبیت مانای ئەوەی بەرامبەر شتێکی تری جیاواز لە خودی خۆت هەیت. ئەگەر بوونی مرۆیی کە خودی خۆی تێدەپەڕێنێت ex-sistence بە پێی پێکهاتە زمانەوانیەکەی مانای دەرچوون

* Solipsism لە دوو بڕگەی لاتینی پێکدێت: Solus واتە تەنها یان هەر، ipse واتە دەروون یان خود. ئەم ئاقارە فەلسەفییە وایدەبینێت کە هەر من (تەنها من) –واتە خودی مرۆڤ– هەیە و، جیهانی دەرەوە چ نییە جگە لە دەرکەوتەکانی من، ئەگینا بوونی سەربەخۆی نییە.

دوالیزمی مانەوی: ئایینی مانەوی ئایینی مانیی کوڕی فاتکە کە لە ساڵی ٢١٥ ز دا. لە بابل لەدایك بوو، لە ئایینەکەی زەردەشتەوە ئەو دوو پرنسیپەی جیهانی وەرگرت کە بریتین لە ڕووناکی و تاریکی یان چاکە و خراپە. خراپە لە ماددەدا بەرجەستە بوو و بووە توخمێکی بەرامبەر بۆ چاکە کە لە ڕۆحدا بەرجەستە بووە.

بێت، ئەوا ئەو دەوروبەرە (ژینگەیە)ی کە لێوەی دەردەچێت لەم حاڵەتەدا دەبێتە توخمێکی سەرەکی Primordial وەکو بوونەوەرەکە خۆی. دەکرێ لەگەڵ سارتەریشدا بڵێین کە بوونەوەر لە ڕێی کردارێك لە کردارەکانی جیابوونەوەوە خۆی دروستدەکات. بۆیە کێشەی حەقیقەتی جیهانی دەرەوە (دەشی بڵێین "کێشەیەکی دروستکراو"یشە) لەو کێشانە نییە کە جێی بایەخی فەیلەسووفی بوونگەرا بووبن بە قەدەر ئەوەی کێشەی فەیلەسووفانێکی تر بوون کە خودیان لە تەرەفێك داناوە و جیهانیش لە تەرەفێکی تر و پاشان هەوڵیانداوە پێکەوە کۆیان بکەنەوە. بەڵام فەیلەسووفی بوونگەرا لە بوونی بەرچاوەوە لە جیهاندا دەستپێدەکات. لەم یەکبوونە سەرەتاییەشەوە چ خودی مرۆیی و چ جیهان وەکو دوو حەقیقەتی بنەڕەتیی یەکسان سەرهەڵئەدەن.

لەگەڵ ئەوەشدا کە خودێکی مرۆیی نییە بەبێ جیهان، لەبەرئەوە مانای بوون واتە لە جیهاندا بیت و لە هەمان کاتدا لێشی دەربچیت، بەڵام بوونەوەری مرۆیی بەو پێیەی بوونێکە لە جیهاندا بە هیچ شێوەیەك ناکرێ بە بەشێك لە بەشەکانی جیهان بژمێردرێ. لێرەدا سەرنجی سێبەری مانایەکی تر ئەدەین کە بە وشەی "جیهان- یان دونیا"وە لێکنراوە، بە تایبەتیش لە زمانی ئایینیدا. ئایین هەندێ جار وا سەیری جیهان یان دونیای کردووە کە هەڕەشەیەکە بۆ سەر ڕەسەنایەتیی مرۆڤ. کاتێك بە مرۆڤێکیان وتووە "دونیایی- یا دونیاپەرست" مانای ئەوە بووە کە ئەو مرۆڤە لە پایەی ڕاستەقینەی مرۆڤ دوورکەوتۆتەوە. ڕاستە زۆربەی ئەم دەستەواژانە بە جۆرێك لە ئاییندارییەکی ساختە و بڕوای درۆزنانە بە ئاخیرەتەوە بەستراونەتەوە و، لە حاڵەتە توندڕەوانەکانیدا زۆر لە دوالیزمی مانەوی Manichaen Dualism نزیکبوونەتەوە، بەڵام تەنانەت لە چوارچێوەی ئەو ئیمانە ڕەسەنەشدا کە کتێبی پیرۆز باسی لێدەکات،

---

* ئایینی مانەوی ئایینی "مانیی کوڕی فاتك"ە کە لە ساڵی ٢١٥ دا لەبابل هاتە دونیاوە.لە ئایینی زەردەشتەوە هەردوو پرنسیپی ڕووناکیو تاریکی یان چاکەوخراپەی وەرگرت،خراپە لە ماددەدا بەرجەستە بوو و بووە توخمی دژ بە چاکە کە لە ڕۆحدا بەرجەستە دەبێت.

دەبینین لەپاڵ جەختكردنەوە لەسەر چاكێتیی دونیا بەو پێیەی دروستكراوی خودایە، ئاگاداركردنەوە بۆ ئادەمیزاد هەیە لەوەدا كە دەشێ لەم دونیایەدا گومڕابێت ئەگەر ڕێ بە جیهان یا دونیا بدات بەسەریدا زاڵ بێت. لە گەلێ شێوەی بوونگەراییشدا واژەی جیهان واژەیەكی ئاڵۆز و تەمومژاوییە. كەواتە گەرچی لە سەرێكەوە ئەو جەختكردنەوەیە دەبینین لەسەر ئەوەی كە جیهان فاكتەرێكی پێویستە لە دروستكردنی بوونەوەری مرۆییدا، بە جۆرێك كە خودێك نییە بەبێ جیهان، بەڵام لە سەرێكی ترەوە هوشیارییەك بەوە هەیە كە دەشێ دونیا (یا جیهان) خودی مرۆیی بگرێتە خۆی، ئەگەر ئەوەش ڕوویدات (گەرچی هەرگیز ئەوە بە تەواوی ڕوونادات) چیتر مرۆڤ وەكو بوونەوەرێك نامێنێتەوە كە خۆی تێدەپەڕێنێت Ex-sist و وەكو شتێك لە شتەكانی دەوروبەری خۆی لێدێت .لەم بارەیەوە هایدیگەر جیاوازییەكی سوودبەخشی كردووە لە نێوان "بوون- لە- جیهاندا" in-der-welt-sein و "بوونەوەر- لەناو جیهاندا" Das-innerweltlicheseiende، بوونەوەری مرۆیی بوونێكە لە جیهاندا و ئەمەش واتە جۆرێك لە باڵاڕەوی بەسەر جیهاندا لە سای "چوونە دەرەوە"ی لە جیهان، گەرچی بەردەوام ئاستی بوونەوەر لە بەردەم هەڕەشەی ئەوەشدایە كە دابەزێتە ئاستی بوونەوەر لەناو جیهاندا و ئەوكات بوونی تایبەتی خۆی لە دەستدەدات و دەچێتە ئاستێكی نزمتر لە ئاستی مرۆییەوە، واتە بوونێكی نابەرپرسیار و نابیركەرەوە. بەم جۆرە ناودژێتی (موفارەقە) Paradoxێكی سەرەكی لەناو بوونی مرۆیی خۆیدا هەیە، لەو ڕووەوە كە بوونەوەر بەبێ ئەو جیهانەی كە بەردەوام و بە پەیوەندیی توندوتۆڵەوە پێوەی پەیوەستە، بوونی نییە، كەچی هەر ئەو جیهانەش كە ڕێی بوونی پێدەدات، هەڕەشەی كەمكردنەوە لە بوونی یان تەنانەت لێسەندنەوەشی لێدەكات.

## ٢–جیهانی ڕۆژانە

پێشتر باسمان لەوە کرد کە گەلێ جیهان هەن و هەریەك لەم جیهانانە بە گوێرەی بایەخی تایبەت و ڕوانگەی بوونەوەری مرۆیی پێکدێت. ئێستاش لە "جیهانی ڕۆژانە" دەکۆڵینەوە. هایدیگەر شیکردنەوەیەکی بوونگەرایانەی دیاری سەبارەت بە جیهانی ڕۆژانە ئەنجامداوە، پاشانیش سارتەریش پەیڕەویی لە هەمان شێواز کرد. واژەی "ڕۆژانە"ش ئاماژەیە بۆ دۆخێکی بوون کە ئێمە زۆربەی ژیانمانی تیا بەسەردەبەین، واتە ئەو ئەرکە ڕۆژانانەمان کە زۆربەیان بە شێوەیەکی میکانیکیانە و وەکو خوو و بە پێی بەرنامەیەکی دیاریکراو ئەنجامیان ئەدەین. بوونی ڕۆژانەش شێوەیەکە لە بوون کە مەبەستی تێرکردنی پێداویستییە ئاسایەکانی مرۆڤە، لە ڕاستیشدا ئەمە باوترین شێوەی بوونیشە لەناو خەڵکدا، بەڵکو بە بەراورد لەگەڵ ئەوانی تردا ئەمە بناغەیە و جۆرەکانی تری بوون بەمەوە بەندن. لێرەوەیە کە جیهانی ڕۆژانە، ئەو جیهانەی کە بە پەیوەندییەوە لەگەڵ بوونی ڕۆژانەدا سیستماتیزە دەبێت. ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت.

عادەتەن بە هەندێ وشەی وەکو گوزەران Living یان Dwellingیش ئاماژە بۆ بوونی ڕۆژانەمان دەکرێ. کەواتە کاتێ دەڵێین ئێمە لە جیهاندا دەیگوزەرێنین، یان چی؟ دیارە کە دەستەواژەی لەم جۆرە مانایەکی زیاتر لەوە دەگەیەنێت کە ئێمە وەك جەستە لە جیهاندا جێمان گرتووە. ڕاستە ئەم "جێگرتنە" بەشێکە لە ماناکە و، کاتێك لە جێگاییبوونی بوون Spatiality of Existence ئەدوێین ئەگەڕێینەوە سەر ئەمە، بەڵام ژیان لە جیهاندا واتە پەیوەستبوون بەم جیهانەوە بە شێوازگەلێکی تر جگە لە پەیوەستبوونی جێگایی. ئەم مەسەلەیە تەنانەت سەبارەت بە چۆنێتیی ژیانی گیانەوەریش لە جیهانەکەیدا ڕاستە (گەر بکرێ لێرەدا واژەی جیهان بەکاربهێنین) لقێکی کامڵ و ئاڵۆزی بایۆلۆژیاش هەیە کە پێی دەڵێن ژینگەناسی Ecology و لە سروشتی

شوێن و پەیوەندیی زیندەوەر بەو ژینگەیەوە دەکۆڵێتەوە کە دەبێتە ماڵی (بە یۆنانی **Oikos**).

فەیلەسووفە بوونگەراکان زاراوەی بایەخپێدان **Concern** بەکاردێنن بۆ ئاماژەکردن بەو پەیوەندییە ئاڵۆزەی کە برگەی "لە" ئاماژەی بۆ دەکات لە دەستەواژەی "بوون لە جیهاندا". بایەخپێدانیش بە شێوەیەکی گشتی زۆربەی ئەو شێوازە بێشومارانە دەگرێتەوە کە لە ڕێگایانەوە مرۆڤ مامەڵە لەگەڵ بوونەوەرەکانی دەوروبەری خۆیدا دەکات: هەڵسوکەوت و، بەکارهێنان و، خواردن و خواردنەوە و بیناسازی و پیشەسازی و ڕێگادۆزینەوە و زانینی کات و هاتوچۆ و تۆوچاندن و دروێنە، هەموو ئەمانە بە تەنها بەشێکن لەو بایەخپێدانانەی کە مرۆڤ لە ڕێیانەوە بە دەوروبەرەکەیەوە دەبەسترێتەوە و بۆ خزمەتکردنی پێداویستیەکانی دەیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، کۆمەڵێك چالاکیی تریش هەن وەك وێرانکردن و دوژمنایەتی و کۆسپ و تەگەرە لابردن، کە نموونەی تری بایەخپێدانن، گەرچی نموونەی چالاکیی سەلبین. کەواتە بوونت لە جیهاندا، واتە مەشغووڵبوونت بە جیهانەوە و بایەخپێدانی و چوونە ناوجەرگەیەوە و کارلێکی بەردەوامت لەگەڵ ئەو شتانەدا کە لەناو ئەم جیهانەدایە.

کەواتە لە ڕوانگەی بایەخپێدانی کردەییەوە، لە ڕووی سوودی کردەییەوە سەیری "شت" دەکرێ، ئەمەش مانای وایە کە جیهانی ڕۆژانە جیهانێکی ئامرازی **instrumental**یە. یەکەمین پرسیار کە مناڵ دەربارەی شتێك دەیکات ئەوەیە کە: ئەم شتە بۆچی هەیە؟ بۆچی بەکاردێت؟ هەر بۆیە بیرۆکەی شتێکی لە خۆیدای پەتیی وەستا و بێلایەن وەکو بیرۆکەیەکی زۆر ئاڵۆز دێتە بەرچاو و، بێگومان بیرۆکەی وەهاش تەواو دوورە لە جیهانی ژیانی ڕۆژانەوە. ئێمە لە حاڵەتی "بایەخپێدان"دا بەردەوام ئاوڕ لە چواردەورمان ئەدەینەوە و ئەو شتەی کە دەیشیبینین هەرچییەك بێت، لە ڕوانگەی بایەخی کردەییەوە لێیدەڕوانین و بێگومان بە شێوازێك لە شێوازەکان دەیخەینە خزمەتی مرۆڤەوە.

لە باسێکی پێشووترماندا گوتمان کە واژەی بوون هەندێ جار لە مێژووی فەلسەفەدا بە مانایەك بەکارهێنراوە کە زۆر دوور نەبووە لە "فڕێدراو لە شوێنێکدا". بەڵام مرۆڤ، بەوپێیەی بوونە –لە– جیهاندا و، بایەخ بە جیهان ئەدات، قایل نابێت شتەکان بە فڕێدراوی لە شوێنێکدا بمێننەوە. بۆیە دەستیان دەداتێ بەو پێیەی شیاوی بەکارهێنانن لە پێناوی دابینکردنی پێداویستیەکاندا. ئەو بەردەوام جیهانەکەی خۆی فراوان دەکات و لە ڕێی هێنانی شتی تازەوە بۆ ناو بازنەی بایەخدانی، ئاڵۆزتری دەکات: ئامرازی تازە، بابەتی تازە، لەو ڕووەوە کە تا چەند ئامادەگییان بۆ بەکارهێنان تیایە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو ئامرازانەی کە مرۆڤ دروستیان دەکات تاقە شت نین کە لە بەردەستیدا بن، بەڵکو شتەکانی سروشت، تەنانەت ئەو شتانەش کە مرۆڤ ناتوانێ ڕکێفیان بکات، یان کەم زاڵە بەسەریاندا، دەبنە ئامراز: ڕووبارەکان دەبنە وەسیلەی هاتوچۆ، جگە لەوەی وەسیلەی ئاوەدانیشن. هەرچۆن خەڵك لە دێرزەمانەوە فێربوون سوود لە هەسارەکانی ئاسمان وەربگرن وەکو سەعاتێکی سروشت بۆ دیاریکردنی کات، جگە لەوەی وەکو ڕێنومایەکیش بۆ دەریاوانی سوودیان لێ بینیوە.

بە مانایەك لە ماناکان، مرۆڤ دەتوانێت بڵێ کە پێشکەوتنی ئادەمیزاد بەند بووە بە ڕادەی کۆکردنەوەی ئەو توخمانە لە جیهانی ئامرازیدا. بەڵام من مەبەستم ئەوە نییە کە مرۆڤ سەرەتا ڕووبەڕووی شتە وەستاو و سەربەخۆکان دەبێتەوە پاشان حاڵەتی بە ئامرازبوون بۆ ئەو شتانە دیاریدەکات (یان حاڵەتی ئامادەگییان بۆ بەکارهێنان). هەر لە سەرەتاوە بایەخپێدان هەیە. سارتەر دەڵێت: "شت لە سەرەتادا شت نییە تا دواتر ببێت بە ئامراز، ئامرازیش نییە تا دواتر ببێت بە شت. ئەم شتە شتێکی ئامرازییە" .

ئامرازەکانیش بە یەکترەوە پەیوەستن، هەریەکەیان بەوی ترەوە بەستراوەتەوە و کۆمەڵێك سیستمی سەرەکی و لاوەکی پێکدێنن، بۆ نموونە قەڵەم پێویستی بە کاغەزە، کاغەزیش بە پۆستە، پۆستەش بە شێوازێك بۆ پەیوەندی.. هتد ئێستاش هەروەکو دەیبستین، لە جیهانێکی زۆر ئاڵۆزدا دەژین، کە پێدەچێ هەموو شتەکان کاریگەرییان

لەسەر یەك هەبێت. ئەوەی جیهانیش دیاریدەكات و مانا و دەلالەت بە هەر توخمێك لە توخمەكانی دەبەخشێت، بایەخدانی مرۆییە. جیهانی ڕۆژانە بە سنووری بایەخدانی مرۆییەوە بەستراوەتەوە. هەر ئەمیشە كە توخمە جیاواز و شێوە جۆراوجۆرەكانی جیهان یەكدەخات و ڕێكدەخات. بەم جۆرە ئەو ڕۆڵە گەورەیە دەبینین كە فاكتەری مرۆیی لە پێكهێنانی جیهانی ژیانی ڕۆژانەدا دەیگێڕێت. هەروەها ئەوەش دەبینین كە چۆن بیرۆكەی بوونی جیهان **Worldhood** بە مانایەك لە ماناكان بیرۆكەیەكی پێشینە **apriori**، لەبەرئەوەی لەهەر ئامرازێكدا وێناكردنی جیهان شتێكی گریمانكراوە.

بگرە بیرۆكەی جیهان بەوپێیەی مەرجێكی "پێشین"ە بۆ هەر مامەڵەكردنێك لەگەڵ شتەكاندا، لە ڕووی بایەخدانەوە پێیان، زۆربەی كات جێی سەرنجی ئێمە نییە. چونكە جیهان شتێك نییە ئیزافە بكرێتە سەر ئەو شتانەی لە جیهاندا هەن، ئێمە چۆن هەوای دەوروپشتمان هەڵدەمژین، ئاواش لە جیهاندا دەژین، ئەم نێوەندەش هێند لێمانەوە نزیكە و هێند پێی ئاشناین، تا ئەو ڕادەیەی لێی بێئاگاین (هەستی پێناكەین). لەبەرئەوەی ئێمە بەئاگا نین لەو هەوایەی هەڵیدەمژین ئەو كاتە نەبێت كە مەترسیی بڕان و نەمانی دەبێت. بە هەمان شێوە هایدیگەر دەڵێت كە جیهان كاتێك لامان "ڕووندەبێتەوە" كە سەبارەت بە شتێك دەكەوینە هەڵەوە و، ئەگەر ئەم دەربڕینە ڕاست بێت، دووچاری هێدمە (صدمە)ی وامان دەكات كە دەرك بەو پێكهاتە ئاڵۆزەی ئامرازەكان بكەین، كە بە درێژایی كات بە شتێكی بەڵگەنەویستمان زانیوە. لەبەرئەوەی ئێمە سەرنجی نزیكترین ئامرازی بەردەستمان نادەین، بەڵكو زەینمان تەركیز دەخاتە سەر ئەو ئامانجەی لە ڕێی ئەو ئامرازەوە وەدیی دەهێنین.

بۆ نموونە كاتێك لە تەلەفۆندا قسەدەكەم، بایەخ بە تەلەفۆنەكە نادەم، بەڵكو بەو كەسەی كە قسەی لەگەڵدا دەكەم بەڵام كاتێك ئامێرەكە لە پڕێكا لەكاردەكەوێت، وەك ئەوەی تەلەفۆنەكە لە ناكاودا بێدەنگ بێت. ئینجا منیش لەپڕدا هەستی پێدەكەم. بەم جۆرە جاری وایە لە پڕێكا و بە وەڕسبوونەوە لەو دەزگا جیهانییە زەبەلاحە ئاڵۆزە

بەئاگا دێنینەوە کە ژیاری نوێمان پشتی پێدەبەستێت، وەك چۆن لە پرێکا زریانێکی توند هەڵدەکات، یان کرێکارانی بەندەرەکان لە شارێکدا ماندەگرن و شار لە جووڵە دەکەوێت .

بیرۆکەی جیهان بەو پێیەی سیستمێکە لە ئامراز. یەکبوون و مانای خۆی لە بایەخدانی سیستماتیزەسازی مرۆڤەوە وەردەگرێت، پێدەچێ بیرۆکەیەك بێت کە لە زۆر رووەوە بە "چاخی تەکنۆلۆژیا"وە بەندە. هەنووکە گۆی زەوی (بگرە گۆی مانگیش) رۆژ بە رۆژ دەبێتە جیهانێك لە دروستکراوی مرۆڤ و جیهانێك کە تەوەرەکەی مرۆڤە. شارەکان و دامەزراوە پیشەسازییەکان و فرۆکەخانەکان.. هتد، وردە وردە بوونەتە هۆی پاشەکشێی "سروشتی دەستلێنەدراو"، بگرە زەوییە کشتوکاڵییەکانیش. تەکنۆلۆژیا ئامادەیە بگاتە بنی ئۆقیانووسەکانیش. ئەو شوێنە گەورە کەمانەی کە کەم تا زۆر بە حاڵەتی سروشتیی خۆیانەوە ماونەتەوە، دیسانەوە ئەوانەش لە چوارچێوەی سیستمێکی ئامرازیدا کراون بە باخچە و سەیرانگا. بەم جۆرە جیهان (بە مانای جیهانی رۆژانە) رۆژ بە رۆژ مرۆڤزەدە دەبێت (واتە شەقڵی مرۆیی بە خۆیەوە دەگرێت). ئەگەر ئەو بیرۆکەیەی کە پێشتر لێیدواین، کە هیچ جیهانێك بەبێ خودی مرۆیی نییە، بە بیرۆکەیەکی خودی هاتبێتە بەرچاومان، ئەوا ئێستا زۆر روونتر ئەوە دەبینین کە چۆن رۆژ دوای رۆژ رۆڵی فاکتەری مرۆیی لە پێکهێنانی جیهاندا زیاتر دەبێت، گەرچی جیهانیش برێك لە سەربەخۆیی خۆی دەپارێزێت.

رەنگە زێدەرۆییش نەبێت گەر بڵێین کە جیهانی رۆژانە درێژبوونەوەی ئادەمیزادە. بێرگسۆن **H.Bergson** لە سەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا ئاماژەی بەوە داوە کە ئامرازەکان درێژبوونەوەی جەستەی ئادەمیزادن، پاشانیش مارشاڵ ماکلۆهان **Marshal Mcluhan** هەندێ بیروبۆچوونی تازەی لەو بارەیەوە خستەڕوو. بەڵام ئەم سیستمە ئامرازییە سەراپاگیرەش کە ئامرازەکان تیایدا جێی خۆیان دەگرن و مانای خۆیان بەدەست دێنن، واتە جیهان، ئەویش هەر درێژبوونەوەی ئادەمیزادە.

بـەڵام هـەر لـەم خاڵەشـەوەیە كـە نـاڕوونی و تەمومـژاوییبوون ambiguityی جیهـان سەرهەڵئەدات. من هەر ئێستا ئاماژەم بۆ ئەوە كرد كە ئەگەرچی تا ڕادەیـەكی زۆر مـرۆڤ خۆی جیهانی خۆی دروستدەكات، بەڵام جیهانیش بڕێك لە سەربەخۆیی خۆی دەپارێزێت و ئەو سەركەوتنە تەكنۆلۆژیانەش هەرچەندێك بن كـە مـرۆڤ بەدەسـتیان دەهێنێـت، ئـەو لـەم سـەربەخۆبوونەی خۆیـدا بـەردەوام دەبێـت. جیهـان كاروكاردانـەوەی لەسـەر مـرۆڤ دەبێت، مرۆڤیش لە باشترین حاڵەتیدا، لە خولْقاندنی جیهاندا بەشدارە. چونكە ماددەكـە دراوە بە مرۆڤ، گەرچی ئەو وێنەكەی بەسەردا دەسەپێنێت. دواتریش دەرفەتی ئەوەمان دەبێت كە سەرنجی خوێنەر بۆ "واقیعبوون Facitcity"ی بوونی مرۆیی و لایـەنی پێـدراو لـە دۆخـی مرۆییـدا ڕابكێـشین. بـەڵام ئێـستا هێنـدە بەسـە سـەرنجی ئـەوە بـدەین كـە پەیوەندییەكی كارلێكی دوولایەنە لـە نێـوان مـرۆڤ و جیهانـدا هەیـە. مـرۆڤ چـەند جیهـان دروست دەكات، جیهانیش ئەوەنـدە مـرۆڤ دروسـت دەكـات. لەبەرئـەوە گەرچـی جیهـان مەرجی پێویـستە بـۆ بـوونی مـرۆڤ، بـەڵام ڕەنگـە ببێتـە سەرچـاوەی هەڕەشـەش بـۆی. چـونكە دەشـێ هـەر ئـەو شـتانەی كـە مـرۆڤ خـۆی دروسـتیان دەكـات ببنـە مایـەی كۆیلـەكردنی. وابـزانم پێویـستیش ناكـات زۆر لەسـەر ئـەو تەنگژەیـە بـڕۆم كـە ئـەمڕۆ ڕووبـەڕوومان بووەتـەوە. پێـشكەوتنی تـەكنۆلۆژی زۆر خێرایـە، ئێمـەش دەكەوینـە بـەر تەوژمەكـە بەرلـەوەی توانیبێتمـان بڕیـاری ڕاسـت سـەبارەت بـەو ئاراسـتەیە بـدەین كـە دەمانەوێ بۆی بچین، یان بەرلەوەی ئەنجامی كارەكانمان بزانین، لـەوەش مەترسـیدارتر كاریگەریی دوولایەنەی هەموو پێشكەوتنێكەو، بەر لە هەمووشی، ئەگـەرە ترسـناكەكانی بەكارهێنانی وزەی ئەتۆمی لە وێرانكردندا.

بەڵام فەیلەسووفە بوونگـەراكان ئامـاژە بـۆ مەترسـیی شـاراوەتر لـە مەترسییەكانی لەوتان و جەنگی ئەتۆمی دەكـەن. مـرۆڤ جیهـانی ئـامرازیی خـۆی چـەند فـراوانتر بكـات، ئەوەندە زیاتر خۆیشی دەكەوێتە ناو ئەو جیهانەوە و ئەبێتە بەشـێك لێـی، بگـرە ئەبێتـە كۆیلەی و چیدی بە مانای وشە "بوون"ی نامێنێت، واتە بوونی وەكو كەسێك و مرۆڤێـك.

فەیلەسووفی بوونگەرا گابریل مارسیل زۆر بە وردی پەیوەندیی نێوان "دارابوون–موڵکداری" و "بوون"ی شیکردۆتەوە، بە تایبەتیش لە کتێبەکەیدا "بوون و دارابوون" Being and having. کاتێك تۆ ئەبیتە خاوەنی شتێك مانای ئەوە نییە کە تۆ پەیوەندییەکی دەرەکیت لەگەڵ ئەو شتەدا هەیە، بەڵکو بە خاوەنبوونی شتێك کاردەکاتە سەر خاوەنەکەی و نیگەرانی شتەکە دەبێت و وای لێدێت لەبری ئەوەی ئەو خاوەنی شتەکە بێت، شتەکە دەبێتە خاوەنی ئەو. کەواتە مەترسییەکی ڕاستەقینە لەسەر ئینسانیەتمان هەیە و تا پیشەسازی و کۆمپیوتەر و ئامێر ڕوو لە زیادبوون و پەرەسەندن بێت، ئەو مەترسییەش زیاتر دەبێت. هەڵبەت ناشبێت وەکو دوو شتی دژ بەیەك سەیری بوون و موڵك بکەین. چونکە بێبەشبوونیش لە موڵك بە هەمان ڕادەی زیادەڕەوی لە موڵکداریدا لە ئینسانیەتمان کەمدەکاتەوە. هەربۆیە موڵکدارێتی لە ئاستێکی نزمدا بۆ ژیانێکی مرۆیی ڕاستەقینە پێویستە، تا مرۆڤ بتوانێت بە کەرامەت و سەربەخۆییەوە بژی. تەکنۆلۆژیا توانیویەتی بۆ ژمارەیەکی باشی خەڵك ئەم ئاستە لە موڵکداری دابین بکات. بەڵام فرەیی دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی مەترسیی نوێ، دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی کۆمەڵگایەکی چاوچنۆك و بە تەماع و ئارەزوویەکی بەردەوام بۆ موڵکدارێتی. هەنگینێ بوونی مرۆیی لە پەیوەندیدا بە جیهانەوە و لە زۆر ڕووی تریشەوە، بە گرژی گەمارۆ ئەدرێ و، دەبێ بەردەوام لەگەڵ گوشاردا زۆران بکات.

## ٣–جیهانی زانست و هونەر و ئایین

جیهانی ڕۆژانە کە لە بەشی پێشوودا باسمان کرد تاقە جیهان نییە. ڕاستە جیهانی ڕۆژانە ئەو جیهانەیە کە زۆربەی کاتمان تیا بەسەردەبەین و گرنگپێدانە کردەییەکانمانی تیا بەرجەستە دەبێت. بەڵام فەیلەسووفە بوونگەراکان بڕوایان وا نییە کە "بوونی مرۆیی" بە شێوەیەکی باش خودی خۆی لەو تایپانەی ژیانی ڕۆژانەدا دەهێنێتە دی. ئەم تایپانە دەگۆڕێن بۆ عادەت و ڕۆتین و بیرنەکردنەوە، بە جۆرێك کە خەسڵەتە

تایبەتەكانی بوونی مرۆیی ون دەبن. بوونەوەری مرۆیی زیاتر لەو ساتانەی ژیانیدا و لەو چالاكییانەدا دەردەكەوێ كە ڕۆتینیان تیا دەشكێنێت و دەچێتە سەروو بایەخدانە ڕاستەوخۆكانییەوە. ئەم ساتانەش ساتەكانی داهێنانن لە بوونیدا، كە تیایاندا بە شێوازی نوێ پەی بە جیهان دەبات، گەرچی ئەم جیهانانەی لەسەر بنەمای كەشفی زانستی یا خەیاڵی هونەری و یان جیهانبینیی ئایینی دادەمەزرێن، گۆڕین و دەسكاریكردنی جیهانی سەرەكیی ژیانی ڕۆژانەن كە لە هەموو جیهانەكان بە ئێمە نزیكترە، بە دڵنیاییشەوە ئەو جیهانانە جیهانی خەون و خەیاڵات نین.

سەرەتا وادێتە پێشچاو كە ئەو جیهانەی زانستە جیاوازەكان وەسفی دەكەن خاوەن مەوزوعیەتێكی وایە كە جیهانی ژیانی ڕۆژانە نییەتی. ئەی جیهانی زانست ئەو جیهانە نییە كە خاڵییە لە خۆشەویستی و ڕق و نرخاندن و هەڵسەنگاندن و ڕێگەمان پێدەدات شتەكان خۆیان چۆنن وا بیانبینین؟ ئەی هەر ئەم جیهانە سەرەكییەش نییە كە جیهانی ژیانی ڕۆژانە ئەو شتانەی لێوەردەگرێت كە بە پێداویستییە مرۆییەكانەوە پەیوەستن؟

گەرچی تا ڕادەیەك ئەم لێكدانەوەیە بە جێیە، بەڵام فەیلەسووفی بوونگەرا ئاوەژووی دەكاتەوە و جەخت لەسەر ئەوە دەكات كە جیهانی زانست لە جیهانی ژیانی ڕۆژانەوە وەرگیراوە و ئەمەی دواییان جیهانە بنەڕەتییەكەیە. لەبەرئەوەی ئێمە لەسەرەتاوە هەڵوێستی بینەرێك یان سەرنجدەرێكمان نییە تا پاشتر بایەخ بەو شتە بدەین كە سەرنجی ئەدەین، بەڵكو ئێمە هەر لە سەرەتاوە لە ناوجەرگەی جیهاندا هەین و بە قووڵییەوە گرنگیی پێ ئەدەین. ئێمە پێویستمان بە بڕێكی زۆر لە كامڵبوون و قووڵبوونەوەش هەیە تا وا لەو گرنگیپێدانە بكەین بچێتە ئاستی گرنگیپێدانی بینەرەوە یان هیچ نەبێ لەوە نزیك بێتەوە. بەڵام تەنانەت ئەم ئاستەش پەیوەستە بە پلەوە. ئەوە جێی گومانە كە زانستێك هەبێت "لە دەرەوەی بەها– Value-free" بێت، چونكە زانستەكان خۆیشیان جۆرێكن لە گرنگیپێدان و پێویستیان بە تەكنیكی تایبەت بە خۆیان هەیە. بەڵام دەتوانین لەگەڵ ئەو ڕایەدا بین كە گرنگیپێدانی زانا جیاوازە لە

گرنگیپێدانی کردەیی کە مەبەست لێی سوودوەرگرتنە لە شت و چێژوەرگرتن لێی و شتی تری لەم بابەتە. بۆیە ئەو جیهانەی کە زانستە جیاوازەکان پەردە لە رووی هەڵدەماڵن بە بەراورد لەگەڵ جیهانی گرنگیپێدانی کردەییدا، مۆرکێکی مەوزوعی و ناشەخسیی هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا جیهانی زانست لە فاکتەری مرۆیی خاڵی نییە، ئەمەش هەر لە سەردەمی "کانت"ەوە بووەتە شتێکی روون و ئاشکرا، مادامەکی لە روویەك لە رووەکانیەوە زانست لەو بونیادە چەمکی و خەیاڵیانە پێکدێ کە پەیبردنە هەستیەکان رێکدەخات و بە هۆی ئەمانیشەوە جیهانێکی رێکخراو دروستدەکەین.

با بە راشکاوی ئەوە بڵێین کە گەلێ لە فەیلەسووفە بوونگەراکان بەرامبەر بە زانست بە ویژدان نەبوون. دیارە ئەمەش لەبەرئەوەی وا هەستیان کردووە کە ئەو گۆشەنیگا داماڵراو و تیۆرییەی کە لێکۆڵینەوەی زانستی پشتی پێدەبەستێت تا رادەیەك هەرەشەیە بۆ سەر ئەزموونی مرۆیی کامڵ سەبارەت بە جیهان. هەڵبەت لەم هەڵوێستەشدا ئاوارتە هەیە. پێویستە لێرەشدا لەناو ئاوارتەکاندا بە تایبەتی پەنجە بۆ کارل یاسپەرز درێژبکەین کە زۆر بەشدار نەبووە لەو ئاقارانەدا کە "دژایەتیی ئەقڵ"یان کردووە، کە هەندێ جار ئەم جۆرە ئاقارانە لای بوونگەراکانیش هەبوون.

وابزانم پێویست دەکات لێرەدا ئەوە بڵێم کە دەبێ فەلسەفەی بوونگەرایی بە شێوەیەکی روونتر دان بەوەدا بنێت کە چیی بەسەر مۆتیڤی ئەقڵیدا هێناوە لای مرۆڤ. ئێمە خۆمان ئارەزوویەکی بنەرەتیمان هەیە بۆ شت زانین و تێگەیشتن، دەشێ ئەم ئارەزووەش هێندەی بایەخپێدانی کردەییمان، تیاماندا رەسەن بێت. هەڵبەت ناتوانین ئەم دوو لایەنەش بە تەواوی لە یەکدی جوێ بکەینەوە. بەڵام ئەو رادەیەی کە ئەم یان ئەویان پێی دەگات و تیایدا سەرکەوتوو دەبێت، ئەو مەودا گەورەیە پێشاندەدات کە لە نێوان بایەخدانی جیهانی رۆژانە و جیهانی زانستدایە، بۆ ئەمەش دەتوانین ئەو

دەستەواژە بەناوبانگەی ئارتەر ئێدینگتۆن بهێنینەوە یاد کە تیایدا باسی دوو مێز دەکات : "یەکێکیان هەر لە منالیەوە لەگەڵیدا ڕاهاتووم، لەو دەوروبەرەدا کە من ناوم لێناوە "جیهان". ئەم مێزە مێزی ڕۆژانەیە کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا و بە شێوازێکی ئاسان و ئاسایی بەکاریدەهێنین. بەڵام مێزەکەی تر "مێزە زانستییەکەمە، کە دەمێك نییە دەیناسم و هەست ناکەم ئەوەندەی مێزی یەکەم پێی ئاشنام، لەبەرئەوەی سەر بەو جیهانەی پێشوو نییە، ئەو جیهانەی کە هەر ئەوەندە چاو هەڵئەهێنم لە چواردەورم دەردەکەوێ، گەرچی من لێرەدا لەوە ناکۆڵمەوە ئەم جیهانە چەندی بابەتییە و چەندی خودییە. ئەم مێزە بەشێکە لەو جیهانەی کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ سەرنجم ڕادەکێشێت". پاشان "ئێدینگتۆن" وەسفی ئەو "مێزە زانستی"یە جیاوازە دەکات، بەو شێوەیەی لەم "جیهانەی تر"ی زانستدا دەناسرێ و دەڵێت کە ئەم مێزە بە گشتی بریتییە لە پانتاییەکی بەتاڵ کە تەوژمی کارەبایی زۆری پێدا بڵاوبۆتەوە. ئینجا دێینە سەر جیهانی هونەر، ئیدی ئەو جیهانە بێت کە نیگارکێش وێنەی دەکات، یان شاعیر و یاخود هەر هونەرمەندێکی دی لە ڕێی هەر نێوەندێکی هونەریی ترەوە بێت.

پێدەچێ جیهانی هونەرمەند پێچەوانەی جیهانی زانست بێت. لە کاتێکدا زانا پەنا ئەباتە بەر ئەقڵانیەت و بابەتێتی، هونەرمەند پەنا ئەباتە بەر توانای خەیاڵ. پێدەچێ هەر هونەرمەندە و جیهانی تایبەتیی خۆیشی هەبێت، بەڵام هەر وەکو پێشتریش وتم، هەر جیهانێك لەو جیهانانەی لە بارەیانەوە ئەدوێین جیهانی خەیاڵاتی پەتی نین، ڕاستە هونەرمەند پەنا ئەباتە بەر خەیاڵ، بەڵام لەوانەیە ئەم پەنابردنەی بۆ خەیاڵ بە هیوای بووژاندنەوەی جیهانی واقیع بێت.

ئەو شێواز و ڕێبازە هونەرییانە زۆرن کە هونەرمەندان و شاعیران بۆ کارەکانیان دەیگرنە بەر. من لەو بڕوایەشدا نیم کە تەنها تاقە ڕێیەك بۆ وەسفی شێوازە جۆربەجۆر و

---

* سێرئارتەر ئێدینگتۆن (١٨٨٢–١٩٤٤) زانایەکی گەردوونناسی ئینگلیزە و کۆمەڵێك کتێبی هەیە کە هەندێکیان شەقڵی فەلسەفییان بەخۆوە گرتووە، وەکو کتێبی "سروشتی جیهانی فیزیکی".

جیاوازەکانی کاری هونەرمەندان هەبێت. بەڵام بڕوام وایە دەتوانین بڵێین کە ئەگەر زانا جیهانێکی دووەممان بۆ دەخوڵقێنێت کە ئەو مێزەی تیایە، ئەوا هونەرمەند جیهانێکی سێیەممان بۆ دەخوڵقێنێت کە تیایدا یەکتەرزیی ژیان لای خۆی و لای ئەوانەش دەشکێنێت کە لە هونەرەکەی دەگەن. هەروەها هونەرمەند دوورە لە جیهانی مامەڵەکردن و کەڵك لێوەرگرتنی ژیانی ڕۆژانە و، ئەو دەیەوێ گوزارشت لە جیهان و ئەوەی کە تیایەتی، بکات و بە ئێمەی بگەیەنێت. بۆ ئەمەش لەوانەیە لە ڕێی هونەرەکەیەوە وامان لێبکات سەرنجی کۆمەڵێك تایبەتمەندی بدەین لە شتەکان و لە جیهاندا کە پێشتر سەرنجمان نەداون، لەبەرئەوەی ئاگامان لە شوێنێکی تر بووە و ئەو شتانەی لامان شاراوە بوون. هەر بۆیە هونەرمەند قووڵایی و ڕەهەندی نوێی جیهان لەبەردەمماندا دەگاتەوە کە ئەو قووڵایی و ڕەهەندانە تێدەپەڕێنێت کە ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا یان لە جیهانی زانستدا پێیان ئاشناین.

بەڵام ئاخۆ دەتوانین قسە لەسەر جیهانێك بۆ ئاییینیش بکەین؟ واتە شێوازێکی جیاواز بۆ دەرککردنی جیهان لە ڕوانگەیەکی ئایینییەوە؟ بە بڕوای من شێوازێکی لەم جۆرە هەیە، بنەماکەشی لە هەڵوێستی بوونگەرایانەی مرۆڤدایە لە ئاست جیهاندا وەکو گشتێك. ڕاستە ئێمە دەبێ ئەوەمان لەبیرنەچێت کە پێبەپێی ئەو باسانەی پێشوومان، کەس ناتوانێت جیهان وەکو گشتێك بناسێت، واتە "هەموو ئەو شتانەی کە هەن" بزانێت. بەڵام ئێمە لە بواری ئاییندا پتر لە ئیمان ئەدوێین وەك لە زانین (مەعریفە). ئیمانیش ئەو شتە تێدەپەڕێنێت کە لە ڕێی یەقینی ئەقڵییەوە پێیدەگەین. لە بنەڕەتدا ئیمان هەڵوێستێکە لەسەر بناغەی متمانە **Trust** و پەیمان **Commitment**، بۆیە مرۆڤی ئیماندار کەسێکە کە ئەم هەڵوێستە لە ئاست جیهاندا وەردەگرێت. دواجاریش جیهان وەکو گشتێك نهێنییەکی ئاڵۆزە و تەنها بە شێوەیەکی پچڕپچڕ و بەش بەش دەتوانین دەری بکەین. بەڵام ئیمان دەچێتە ئەودیو ئەم لایەنی پچڕپچڕی و بەشبوونەوە تا متمانە و پەیمانی خۆی بەم نهێنییە ببەخشێت.

گەرچی ئیمان "باو" تێدەپەڕێنێت، بەڵام شتێکی کوێرانە نییە و شێوازی تێگەیشتنیشی لە دونیا بێ بنچینە نییە. ئیمان لە زەینڕوونییەکی بەشەکی Partial insight ەوە سەرچاوە دەگرێت و لەسەر ئەو بناغەیەش هەڵوێستی خۆی لە متمانە و پەیماندا بەرامبەر بە گشت دادەمەزرێنێت. گەلێ لە ئایینەکان باس لە سرۆش دەکەن، ڕووداوی سرۆشئامێزیش ئەزموونێکی زۆر کاریگەرە کە لە ڕەوتی باوی ئەزموونەکە دەردەچێت و ئەبێتە بنچینەیەك بۆ لێکدانەوەی گشت. بۆ نموونە لە ئایینی مەسیحیدا باوەڕێك لە ئارادایە بەوەی کە ڕووداوی سەرهەڵدانی عیسای مەسیح پەردە لەسەر مانای هەموو مێژوو هەڵدەماڵێت، بەم جۆرەش دەبێتە نموونەیەك بۆ لێکدانەوەی هەموو ئەزموونەکان. ئەم ڕووداوەش "جیهانێك" پێکدەهێنێت، لەبەرئەوەی گۆشەنیگایەکی بنەڕەتیمان ئەداتێ کە مرۆڤ لێیەوە دەڕوانێتە ئەزموون و هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەم گۆشەنیگایەشەوە ڕووداوەکان هەڵدەسەنگێنێت و ڕەفتاری خۆی ڕێکدەخات.

بێگومان ئیمانیش شێوەی زۆرە، هەر بۆیە بە درێژایی مێژووی مرۆیی، هوشیاریی ئایینی کۆمەڵێك "جیهان"ی درستکردووە، بگرە هەندێ جار جیهان خۆیشی شێوەیەکی خودایی بەخۆوە گرتووە و بووە بە بابەتی ڕاستەوخۆی ئیمان و پەیمانبەستن، هەروەکو لە ڕێبازی هەمەخودایی Pantheism دا دەیبینین. بەڵام لە کەلتووری یەهودی و مەسیحیدا جیهان وەکو "خوڵقاندن" لێکدراوەتەوە و متمانە و پەیمانیش بە خودایەك دراوە کە لە دەرەوەی جیهاندایە، بەڵام دەست لە کاروباری جیهان وەردەدات.

هەڵوێستێکی تریش هەیە کە ئەویش هەڵوێستی بێئیمانییە کە تیایدا جیهان وەکو بێدەربەست بەرامبەر بە مرۆڤ، یان وەکو دوژمنێك سەیردەکرێ. مادامەکی کەسی بێئیمانیش دەتوانێ لە دوا نهێنیی جیهان بگات –هەروەکو کەسی ئیماندار– کەواتە

---

[*] Pantheism ڕێبازێکە دەڵێت کە خوداییبوون هەموو بوونەوەرەکان دەگرێتەوە" هەروەکو ناوەکەش هێمای بۆدەکات، Pan واتە هەموو Theos واتە خودا و هەندێ جاریش بە "یەکێتیی بوون" تەرجەمە ئەکرێ بەوپێیەی کە بوونی خودا وبوونی جیهان یەك حەقیقەتن.

هەڵوێستی ئەمیش لە بازدان بەسەر مەعریفەی بەشبەشی جیهانەوە سەرچاوە ئەگرێت. لەم حاڵەتەشدا (حاڵەتی بێئیمانی) ڕووداوێکی دیاریکراو هەیە، بەڵام زۆر کاریگەرە (دەشێ زنجیرەیەك ڕووداویش بن، یان کۆمەڵێك پێدراو) کە دەبێتە نموونە.

کەواتە ئێمە دەبێ ئەو جیهانانەش کە لەم بەشەدا لێیاندواین، بخەینە سەر جیهانی ڕۆژانە، واتە: جیهانی ئەبستراکت کە میتۆدە ئەقڵییەکانی زانستەکان دایدەمەزرێنن، هەروەها جیهان لە ڕەهەندە ئیستاتیکیەکانیدا بەو جۆرەی کە هونەرمەندان و شاعیران دەیخەنەڕوو، پاشان جیهان لە نهێنیی ئاڵۆزیدا کە پێویستە ئادەمیزادەکان بۆ یەکلاکردنەوەی بابەخپێدانەکانیان، هەڵوێستی خۆیانی لە ئاستدا دیاری بکەن، واتە هەڵوێستی ئیمان، یان بێئیمانی. ئەوەی لێرەشدا گرنگە ئەوەیە کە ئێمە هەرچییەك بکەین و بیر لە هەرچییەك بکەینەوە، بەردەوام لە "جیهانێك"داین کە خۆمانی پێ ئاراستە دەکەین، گەرچی خۆمان لە پێکهێنانی ئەو جیهانەشدا بەشدارین.

هەڵبەت کاتێکیش دەڵێم پێویستە ئەم جیهانانە "بخەینە سەر" جیهانی ڕۆژانە، مەبەستم لەمە ئەوە نییە کە ئەم جیهانانە لێکدابڕاون و هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نییە. بەڵکو ئەمانە هەموو شێوازی جیاجیان بۆ لێکدانەوەی جیهانێك. یان ڕەنگە وا چاکتر بێت بڵێین ڕەهەندی جیاجیان. جیهان ڕەهەندی زۆرە. ئەم ڕەهەندانەش بە شێوازی جیاواز بە ڕووماندا دەکرێنەوە، بە جۆرێك کە جیهان لە شێوەی جیاجیادا دەردەکەوێ. بێگومان "جیهانی ڕۆژانە" جیهانی بنەڕەتییە و نزیکترین ئەزموونی ئێمەشە لەگەڵ جیهاندا. بەڵام ئەگەر ژیانی مرۆیی بە تەنها لە ئاستی ژیانی ڕۆژانەدا بمێنێتەوە ئەوا دەبێتە ژیانێکی فەقیر و کڵۆڵ. ئەگەر ژیان بە تەنها بریتی بێت لە زنجیرەیەك ئەرك و مامەڵە و حیسابات و چێژی کاتی و شتی تری لەم بابەتە، ئەوا دەکەوینە نزمترین ئاستی بوونی مرۆییەوە، ئەو بوونەی کە خۆی تێدەپەڕێنێت، ئەو بوونەی کە لە جیهان دەردەچێت و باڵادەبێت. لەم حاڵەتی کەوتنەشدا مرۆڤ دەکەوێتە بەر مەترسیی ملکەچی بۆ ستەمی جیهان و مەحفبوونەوە تیایدا. بەڵام بوونی

ڕاستەقینەی مرۆڤ بە تەنها کاتێك دێتەدی کە کۆمەڵێك ڕەهەندی نوێی جیهان و کۆمـەڵێك شێوازی نوێی بیناکردنی لە بەردەمیدا واڵابوون.

## ٤–جەستە.. The Body

بوونت لە جیهاندا واتە جەستەیەکت هەبێت، یان جەستە بیت و یان هەروەکو گابریل مارسیل دەڵێت "بەرجەستە بیت". بەشێکی زۆر کەم هەیە لەم دونیایەدا کە بتوانم بڵێم ئەمە ناوچە یان قەڵەمڕەوی منە (گەر ئەم دەربڕینە ڕاست بێت)، ئەم ناوچەیەش جەستەمە کە بریتییە لەو پانتاییەی داگیرم کردووە و پێکیدەهێنم. من ناتوانم لە جیهاندا بم تەنها لە ڕێی بوونمەوە نەبێت لە شێوەیەکی جەستەییدا، لە ڕێی جەستەوە دەرك بەو شت و کەسانە دەکەم کە جیهان پێکدەهێنن. هەر لە ڕێی جەستەشەوە دەتوانم کاریان لێبکەم، هەروەها ئەوانیش دەتوانن کارم لێبکەن.

فەیلەسووفی بوونگەرا دەڵێت کە بـوونی مرۆیـی واتـە بـوون –لـە– جیهانـدا، کەواتـە بوونێکی مرۆیی نییە بەبێ ژینگەیەك. لێرەشەوە بێگومان دان بەوەدا دەنێت کە جەسـتە پێکهێنەری بوونی مرۆییە. لەبەرئەوەی مرۆڤ ناتوانێ لـە جیهانـدا بێـت و لەگـەڵ ژینگـەدا کارلێك بکات، تـەنها لـە ڕێـی جەسـتەوە نـەبێت. لـە ڕاسـتیدا فەیلەسـووفە بوونگـەراکان هەموویان وەکو یەك تێڕوانینیان سەبارەت بە مۆرکی جەستەییانەی بـوونی مرۆیـی ڕوون و ئاشکرا نییە. پێشتر باسمان لەوە کرد کە بوونگەرایی نزیکایـەتیی لەگـەڵ گنۆسـتیزمدا هەیە. لەناو فەیلەسووفە بوونگەراکاندا هەیە کە جەستە فـەرامۆش دەکـات یـان گومـانی لێدەکات. ئەوەتانێ کیرکەگۆر –بەتایبەتیش لە دوا کتێبەکانیدا– بەرەو جۆرێك لە زوهـد دەچێت. هەروەها لە کاتێکا هایدیگەر شیکردنەوەیەکی تەواوی بـوونی مرۆیـی دەکـات و بڕوای وایە کە بوونی مرۆیی بوونە لە جیهاندا، کەچـی هـیچ لـە بـارەی ئـەو جەسـتەیەوە ناڵێت، کە من لە ڕێی ئەوەوە لەم جیهانەدا هەم. بەڵام گەرچـی هەنـدێ لـە بوونگـەراکان قـسەکردنیان لەسـەر جەسـتە فـەرامۆش کـردووە، دەبیـنین هەنـدێکی تریـان بابـەخێکی

تەواویان بەم کێشەیە داوە، لەناو ئەمانەشدا دەتوانین بە تایبەتی ناوی ئەمانە بهێنین: گابریل مارسیل، ژان پۆڵ سارتەر و میرلۆپۆنتی.

ڕەگوڕیشەی قووڵی هۆی پشتگوێ خستنی جەستەش لە فەلسەفەدا دەگەڕێتەوە بۆ کەلەپووری فیکری خۆرئاوایی. گەرچی بوونگەرایی دژی ئەم کەلەپوورەش (یان دژ بە گەلێ توخمی) یاخی بوو، بەڵام گەڕان بە دوای شێوازی نوێی بیرکردنەوەشدا پێویستی بە کات هەیە. هەر لە ئەفلاتوونەوە تا دیکارت و ئایدیالیزمی نوێ، بڕوای باو ئەوە بوو کە خودی ڕاستەقینە و مرۆڤی ڕاستەقینە، بە جۆرێك لە جۆرەکان لە ناوەوەدایە و، جەستە شتێکی زیادە، یان پەیکەر و چوارچێوەیەکە و هیچی تر. ئەم تێگەیشتنە بۆ مرۆڤ لە ئارادا بوو کە گیلبێرت رایل* لە کتێبەکەیدا "چەمکی زەین" ناوی لێناوە تیۆرەی "تارمایی پەنهانی نێو ئامێر". هەر ئەم تێگەیشتنەش بۆ مرۆڤ بووە مایەی گەلێ کێشەی فەلسەفیی بێ چارەسەر سەبارەت بە چۆنێتیی پەیوەستبوونی ئەم دوو بوونەوەرە لێکجودایە بە یەکترەوە، واتە: دەروون و جەستە* هەروەکو لای مرۆڤ هەیە. لە ڕاستیدا

---

* Gilbert Ryle فەیلەسووفی ئینگلیزی گیلبێرت رایل (١٩٠٠–١٩٧٦) یەکێك لە ڕابەرانی فەلسەفەی زمان، گەرچی کارە سەرەکیەکانی لە بواری فەلسەفەی ڕۆح و هۆشدان، لە ساڵی ١٩٤٩دا کتێبە سەرەکیەکەی خۆی واتە "چەمکی هۆش"ی بە چاپ گەیاند کە تیایدا ڕەخنەی لەو تیۆرەیە گرتووە کە ناوی ناوە "تارمایی پەنهانی ناو ئامێرەکە" کە پەیوەندیی نێوان هۆش و جەستە لێکدەداتەوە بەوەی کە جەستە ئامێرێکی بێگیانە و تارماییەکی پەنهان دەیبزوێنێت کە ئەوەش ڕۆحە یان دەروونە، ئیدی لە کەلەپووری خۆرئاوادا بەم جۆرە لە مرۆڤ گەیشتوون و بگرە لە کەلەپووری سێ ئایینە ئاسمانیەکەشدا.

* لە بەناوبانگترین نوێنەرەکانی ئەم دوالیزمەی نێوان دەروون و جەستە دیکارتە کە خۆیشی کەوتە تەڵەزگەی پەیوەندیی نێوان ئەم دووانەوە، ئەو بڕوای وابوو کە گەوهەری دەروون هزرە و گەوهەری جەستەش کشانە، بەڵام چۆن ئەم دووانە لە ئاوێتەیەکدا پێکدەگەن کە مرۆڤە، ئەو وتی لە ڕێی غوددەی سنەوبەرییەوە، کە ئەمەش جێی گاڵتەپێکردنی ڕەخنەگرەکانی بوو، غوددەی سنەوبەریش جێیەکی سەنتراڵی لەناو مێشکدا داگیرکردووە.

ئەگەر ئێمە لە دوو شتی دابڕاوەوە دەستمان پێکرد کە لەگەڵ یەکدا ناگونجێن، هەرگیز ناتوانین یەك یەکەیان لێ دروست بکەین. هەربۆیە پێویستە لە یەکەی "بوون –لە– جیهاندا"وە دەستپێبکەین، کە ئەویش مرۆڤە بەوپێیەی یەکەیەکی دەروونی– جەستەییە.

من دەتوانم جەستەی خۆم ببینم، یان لانی کەم بەشێکی، بەڵام ئەوە بە تەنها شتێك نییە لە جیهاندا، بەڵکو بەشێکە لە من، بۆ نموونە من ناڵێم: "جەستەم تینوویەتی" بەڵکو دەڵێم "من تینوومە". میرلۆپۆنتی سەرنجی ئەوە ئەدات "کاتێك دەستی ڕاستم بەردەستی چەپم دەکەوێت، من وەکو شتێکی "فیزیکی" هەستی پێدەکەم، بەڵام لە هەمان کاتدا دەتوانین بڵێین شتێکی نائاسایی ڕوودەدات، ئەویش ئەوەیە کە دەستی چەپم دەرك بە دەستی ڕاستم دەکات " ئەم جۆرە لێککارییە بە ئاشکرا ئەوە پیشاندەدات کە جەستەم بە تەنها شتێك یان ئامێرێك نییە "من" ژیانی پێ ببەخشم یان کۆنترۆڵی بکەم. بەڵام لە سەرێکی ترەوە ئەم "من"ە بە تەنها جەستە نییە، یان بە تەنها بوونەوەرێکی زیندووی فیزیکی نییە. ڕاستە فەلسەفەی هاوچەرخ دوورکەوتۆتەوە لەو بۆچوونەی کە دەڵێت دەروون "تارمایی پەنهانی ناو ئامێرە"، بەڵام بە هەمان ڕادە لەو بۆچوونەش دوورکەوتۆتەوە کە مرۆڤ تەنها بە ئامێرێکی ئاڵۆز دەزانێت، چونکە "لەودیو جەستەوە هیچ شتێکی دیکە نییە، بەڵام جەستەش هەمووی دەروونئاسایە Psychic" .

ئەو ڕاستییەی کە جەستە بەشێکە لە من، گەرچی من لەوە زیاترم کە هەر جەستەم بم، ئەم ڕاستیەیە وای لێکردم لە سەرەتای ئەم بەشەدا بڵێم کە بوونی مرۆڤ لە جیهاندا واتە جەستەیەکی هەبێت، یان جەستە بێت.

خۆ گەر بشپرسین کام دەربڕینە وردترە: ئەوەی کە بڵێم "من خاوەنی جەستەیەکم" یان "من جەستەم؟" وەڵامەکە وا دەبێت کە هەر یەکێك لەم دوو دەربڕینە پاساوی خۆی هەیە. ئەوە ڕاستە کە بڵێم "من خاوەنی جەستەیەکم –یان جەستەم هەیە"،

لەبەرئـەوەی دەتـوانم جەسـتەی خـۆم تێبپـەڕێنم، وەك چـۆن دەتـوانم لـە سـنووریێکی دیاریکراویـشدا "بیکـەم بـە بابـەت" Objectify it و وەکـو ئامرازێـك بـەکاری بهێـنم (و وا مامەڵەی لەگەڵدا بکەم کە بەشێکە لـە جیهـانی ئامرازەکـان). بـەڵام لـە سـەرێکی تـرەوە دەبێ بڵێم "من جەستەمم" لەبەرئەوەی من شتێکی سەربەخۆ نـیم لـە جەسـتەم، کاتێـك دەست لە جەستەم ئەدەم هەست ئەکەم شتێکم بەرکەوتووە، کاتێکیش جەسـتەم ئـازار یان چێژ دەبینێت، ئەوە منم کە ئازار و چێژ دەبینم.

لە ڕاسـتیدا دوو شـێوازی زۆر جیـاواز هەیـە کـە لـە ڕێیانـەوە جەسـتە وێنـا دەکرێ: شـێوازی یەکـەمیان ئەوەیـە کـە بـە شـێوەیەکی توێکارییانـە "ئەناتۆمیانـە" یـان فسیۆلۆژییانە وێنای جەسـتە بکـەین بەوپێیـەی بوونـەوەرێکی ئۆرگـانیی زینـدووی گـەلێ ئاڵۆزە کە لە: ماسوولکە و ئێسقان و دەمار و ئەندامی تـر پێکـدێت. بـەڵام ئێمـە لـە ڕێـی پرۆسەی توێکاریی جەستەی خەڵکی ترەوە (یان لە ڕێی ئەو کتێبانەوە کە وەسـفی ئـەم پرۆسەیە دەکەن) ئەم زانیارییانە بە دەست دەهێنین. واتـە لـە ڕێـی توێکـاریی کۆمـەڵێك جەستەوە کە بۆ ئێمە بوون بە بابەتی لێکۆڵینەوە، نەك بۆ خاوەنەکانیان. بەڵام من خۆم زۆربەی کات وێنایەکی تـری تـەواو جیـاوازم بـۆ جەسـتەم هەیـە و، بـە شـێوازێکی تـەواو جیـاواز تـاقی دەکەمـەوە. مـن زۆربـەی کـات هەسـت بـە جەسـتەم ناکـەم، لەبەرئـەوەی هەروەکو پێشتریش باسمـان کـرد، مـن جەسـتەی خـۆم تێدەپـەڕێنم و، بـەو ژینگەیـەوە سەرگەرم دەبم کە بەم جەستەیەوە دەمبەستێتەوە، پـتر لـە سـەرگەرمبوونم بـە خـودی جەستەمەوە.

بەڵام من کاتێك جەستەم تاقی دەکەمەوە، ئەم تاقیکردنەوەیـەم تـەواو جیـاوازە لـەو ئیدراکە هەستییانەم کە بنچینەی زانستی توێکاری و فیزیان. برسێتی یان هەرسـنەبوونی خـۆراك وام لێدەکـەن بـە گـەدەی خـۆم هوشـیار بم، بـەڵام ئـەم هوشـیارییە زینـدوو و ڕاستەوخۆیە جیاوازە لەوەی من شتێك دەربـارەی حاڵـەتی برسـێتی یـان هەرسـنەبوونی خۆراك بخوێنمەوە، بەو شێوەیەی زانای فسیۆلۆژی سەرنجی ئەدات.

بەم جۆرە فەلسەفەی بوونگەرایی لـە بایەخدانیـدا بـە جەسـتە بایـەخ بـە هوشـیاریی ڕاستەوخۆ بە جەستە ئەدات بەو پێیەی پێکهێنەری بوونـە لـە جیهانـدا، بۆیـە لـە هـەموو لێکۆڵینەوە فسیۆلۆژیەکان جیاوازە، بەڵکو لە هەموو ئەو توێژینەوە سایکۆلۆژییانەش کە تایبەتن بەو هەستانەی لە جەستەوە سەرچاوە ئەگرن. تەنانەت دەشێ جەستە لە ڕووی بوونگەراییـەوە شـتێکی مـاددی نـەبێت، گـەر بتـوانین جیهـانێکی نامـاددی بهێنینـە بەرچاومان، ئەوا لەم حاڵەتەدا جەستە دەبێتە "شێوازی ئامادەگیم" لە جیهانـدا. سـانت پۆڵس باسی لە "جەستەی ڕۆحی" کردووە و لەگـەڵ "جەسـتەی سروشـتی" دا بـەراورد کردووە.. هەڵبەت ئەمەش وێناکردنێکی گەلێ دژوارە، هەروەکو گشت ئـەو وێنانـەش کـە پێیەوە بەندن و پەیوەستن بە "زیندووبوونەوەی جەستە و هەڵسانەوەی". بەڵام ئەوەی گومانی تیا نییە ئەوەیە کە هەموو بوونێك لای سانت پۆڵس بوونە لە جەستەیەکدا، ئیدی ئـەم جەسـتەیە ئـەو جەسـتە ناسـراوە بێت کـە لـە جیهـانی شـوێن و کاتـدا هەیـە، یـان "جەستەی ڕۆحی" بێت کە ئامادەگیمان لە ژیانێکی تردا بۆ مەیسەر دەکات *.

کەواتە جەستە، لـە ڕووی بوونگەراییـەوە، بریتییـە لـە شـێوازی بەشـداریکردنمان لـە جیهاندا. لە یەك کاتدا بریتییە لەو تیشکۆیەی کە لێیەوە دەڕوانینە جیهان و بـە گـوێرەی بایەخدان و بەرژەوەندییەکانمان ڕێکیدەخەینەوە، هەروەها ئەو سەنتەرەشە کە دووبـارە وێنەی ئێمە تیایدا ڕەنگدەداتەوە، گەر ئەم دەربڕینە ڕاست بێـت، بـە شـێوەیەکی وا کـە هەریـەکێك لـە ئێمـە تیایـدا دەبێتـە جۆرێـك لـە جیهـانێکی بـچووك ..Microcosm، واتـە جیهانێکی بـچووککراوە. بـەڵام بوونگـەرایی بریتـی نییـە لـە مۆنادناسـی (Monadology) لەسەر شێوازەکەی لایبنیتز، لەبەرئەوەی فەیلەسووفی بوونگەرا لە کۆمەڵێك بوونـەوەری زۆری لـێکترازاو و بـەخۆدا داخـراوەوە دەسـتپێناکات کـە پاشـتر دەبـێ پێکـەوە

---

* بـەراوردێ بکـە: "جەسـتەی ئاسمـانی هەیـە و جەسـتەی زەمینـیش.. جەسـتەیەکی گیانـەوەری ئەڕوێنرێ و جەسـتەیەکی ڕۆحـانی ڕۆدەنرێ، جەسـتەی گیانـەوەری هەیـە و جەسـتەی ڕۆحـانیش هەیە.. هتد. نامەی سانت پۆڵسی یەکەم بۆ خەڵکی کۆرنتۆس.

ببەسترێنەوە، بەڵکو لە یەکەی (بوون —لە— جیهاندا)وە دەستپێدەکات، بە جۆرێك کە بوونەوەری مرۆیی دەچێتە دەرەوەی خودی خۆی.

لەو سەرنجانەی پێشووەوە لەسەر جەستە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بوونی مرۆیی کۆتادارە. تۆ کە جەستەیەکت هەبوو واتە تۆ بۆشاییەك لە زنجیرەی کاتی —شوێنی Spatio Temporalدا داگیردەکەیت. بوونی مرۆییش یان دازاین بریتییە لە بوون — لەوێ، هێندەی ئەوەی ئەو بوونەوەرە بریتییە لە جەستەی خۆی، لەوێیە. دواتر و کاتێك بە شێوەیەکی ورد و درشت تر لە کۆتابوونی بوونی مرۆیی دەکۆڵینەوە، بە فراوانی باس لەم خاڵە دەکەین. دواجار دەتوانین سەرنجی ئەوە بدەین کە هەمان ئاڵۆزی و ناڕوونی Amboguity کە لە قسەکردنماندا سەبارەت بە جیهان هاتە ئاراوە، لە حاڵەتی جەستەشدا هەمان شتە. بینیمان کە جیهان مەرجێکی پێویستی بوونی مرۆییە و، هەر ئەویشە کە ڕێ بە بوون ئەدات. بەڵام دەشێ بۆ بوون زیانبەخشیش بێت، ئەمەش لە کاتێکا کە بوون لەناو جیهاندا ئەتوێتەوە و لە "دەرکەوتن" بێبەری دەبێت کە لە ڕێیەوە ئەتوانێت گوزارشت لە ماهیەتی خۆی بکات. هەمان شتیش سەبارەت بە جەستە: جەستە فاکتەرێکی پێویستە بۆ بوونی مرۆیی، بەڵام دەشێ جەستەش ئەم بوونە بشێوێنێت، کاتێ دەبێتە دیکتاتۆرێکی ستەمکار، یان دەبێتە بێگار. گابریل مارسیل لە میانی پەیوەندیی دوولایەنەوە بە جەستەمانەوە ئاڵۆزیی بوون لێکدەداتەوە، چونکە ئێم لە یەك کاتدا: جەستەمان هەیە و، خۆشمان جەستەین. بەڵام دەشێ لە جەستەشمان نامۆ بین، هەروەها دەشێ ببینە خاوەنی جەستەمان وەك چۆن دەبینە خاوەنی شتێك لە دەرەوەی خۆمان و بە شێوازی جۆراوجۆر بەکاری دەهێنین. بەڵام دەشێ ئەو جەستە نامۆبووەش کاردانەوەی خۆی هەبێت بەرامبەر بە ئێمە و وێرانمان بکات، هەرچۆن بۆ نموونە لە حاڵەتی ئالوودەبون بە مادده بێهۆشکەرەکاندا ئەوە دەبینین. بێشك ئەم توانای نامۆبوونەش فاکتەرێکی گرنگە لەو فاکتەرانەی کە بوونەتە مایەی مێژوویەکی دوور و درێژی متمانەکردنی خەڵك بە جەستە. بێگومان برێك لەم متمانەکردنە تەنانەت

لای هەندێ فەیلەسووفی بوونگەراش هەیە، بەلاّم ڕێنماییەکانی بوونگەرایی لە بارەی جەستەوە بەو پێیەی فاکتەرێکی گەوهەرییە لە بوونی مرۆییدا، خەڵك هاندەدەن تا لەگەڵ جەستەیاندا زیاتر هەست بە هۆگری بکەن.

## ٥-کات و شوێن (یان زەمان و شوێن)

جیهان لە کات و شوێندا هەیە، ئێمەش هەر لە کات و شوێندا هەین. هەروەکو شتێکی چاوەڕوانکراویشە ئەو لێکدانەوەیەی کە فەیلەسووفە بوونگەراکان بۆ کات و شوێنی دەکەن لە گۆشەنیگای کات و شوێنی بوونەوەری مرۆییەوەیە. بەلاّم ئەمە مانای بەخشینی مۆرکێکی خودی نییە بە کات و شوێن. لە کاتێکا کانت Kant شوێن بە "شێوە Form"ێکی ئیدراك دەزانێت، واتە ئێمە شتەکان وەکو خۆیان نابینین، بەڵکو لە شێوەی شوێندا دەیانبینین، ئەوا هایدیگەر وەك دەردەکەوێ بە ئاشکرا جیاوازی لە نێوان هەڵوێستی خۆی و هەڵوێستی کانتدا دەکات کە دەڵێت: "شوێن لە ئیدراکی خوددا نییە و خود وا سەرنجی جیهان نادات (وەك ئەوەی) کە لە شوێندا بێت، بەلاّم ئەگەر لە گۆشەنیگایەکی ئۆنتۆلۆجیانەی دروستەوە دازاین بناسرێ، ئەوا "شوێنمەند-Spatial"ە" . لە سەرێکی ترەوە هایدیگەر وا پەسەند دەکات بڵێت کە شوێن لە جیهاندایە لەبری ئەوەی بڵێت جیهانە لە شوێندایە . مانای ئەمەش ئەوەیە کە ئەگەر جیهان نەبووایە شوێنیش نەدەبوو، چونکە شوێن بوونێکی بابەتیانەی نییە، وەکو ئەوەی شتی شوێنمەند هەیە: گەرچی لێرەدا وشەی "خودی" و "بابەتی" بە تەواوەتی لە ڕەوتی شیکردنەوەی بوونگەرایاندا بۆ شوێنمەندی Spatiality ناگونجێن، لەبەرئەوەی شوێنیش -وەکو جیهان- نە خودییەو نە بابەتی.خۆ گەر ئێمە لە یەکەی بوون لە-جیهانداوە دەست پێبکەین، لەم حاڵەتەدا لە بوونەوەری مرۆییەوە دەستپێدەکەین بەو پێیەی شەقڵی شوێنمەندی بە خۆیەوە دەگرێت.

لەو پەرەگرافەی پێشوودا قسەم لەسەر شوێن کرد و کات (زەمان)م خستە لاوە. لە ڕاستیدا زەمان لە فەلسەفەی بوونگەراییدا ڕۆڵێکی زۆر تایبەت دەبینێت و بە ڕەهەندێکی چوارەم ناژمێردرێ کە بخرێتە سەر سێ ڕەهەندەکەی تری شوێن. بە پێچەوانەی فەیلەسووفانی پەرەسەندن و پرۆسێس *وە، فەیلەسووفە بوونگەراکان باس لە شوێنکات Space-Time ** ناکەن، هەر بۆیە ئێمەش بە جیا باس لە کات (زەمان) و شوێن دەکەین.

تێگەیشتنی بنەڕەتیی ئێمە بۆ شوێن لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئێمە بوونمان بوونێکی شوێنمەندانەیە و بەرەو شوێنیش ئاراستە دەکرێین، ئەوەش لەبەرئەوەی ئێمە جەستەین و بەشێك لە شوێن داگیردەکەین و جێی تایبەتمان هەیە، بۆیە هەر لە سەرەتاوە و لە ڕوانگەی بەشداریکردنی جەستەییمانەوە لە شوێندا، شوێن ڕێکدەخرێ. بۆ نموونە هەردوو لای چەپ و ڕاست بە پێی جەستە دیاری دەکرێ، هەر بۆیە پێناسەکردنیشیان دژوارە و ئێمە کاتێ وەکو جەستەی ئاراستەدار بەرەو شوێن بوونمان دەبێت، ئەوە فێردەبین. بۆ نموونە "فەرهەنگی ڕاندۆم هاوس " The Random House Dictionary" وا پێناسەی چەپ دەکات: "لە تەنیشتەوە، یان سەر بەو تەنیشتەیە کە ڕووە و خۆرئاوایە لە کاتێکا کە ئەو کەسە یان ئەو شتە ڕووی لە باکوورە". گەرچی ئەم پێناسەیە پێناسەیەکی قورسە بەڵام ڕاستە، هەر لەبەر ئەمەش پێناسەیەکی بابەتییە، مادامەکی چەپ و ڕاست بە خۆرئاوا و خۆرهەڵاتەوە دەبەستێتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا

---

* جۆرێکە لە فەلسەفەی هاوچەرخ کە لەژێر کاریگەریی بیرۆکەی پەرەسەندن و جووڵەدا سەریهەڵدا و گەورەترین نوێنەریشی "ئەلفرێد نۆرت هوایتد" (١٨٦١–١٩٤٧)ە، بەڵام نوێنەری شێوە ئاینییەکەی "پیرتیاردی شاردان" (١٨٨١–١٩٥٥) بوو.

** زاراوەیەکە لە دروستکراوی تیۆرەی ڕێژەگەرایی لای ئینشتاین کە گوزارشت لە پەیوەندیی توندوتۆڵی نێوان کات و شوێن دەکات کە تیایدا کات دەبێتە ڕەهەندی چوارەمی شوێن لەم تیۆرەیەدا.

گومان لەوەدا نییە کە ئاراستەی بوونگەرایانە بۆ ڕاست و چەپ لە خاڵەکانی قیبلەنما گرنگترە. جێی سەرنجە کە لە هەندێ زماندا خاڵەکانی قیبلەنما بە پێی ڕاست و چەپ دەناسرێن. بۆ نموونە باشووری نیمچەدوورگەی عەرەب بە "یەمین yemen" (کە لێرەدا مەبەست لە وڵاتی یەمەنە. و. کوردی) ناسراوە، واتە ئەو وڵاتەی ئەکەوێتە دەستە ڕاستەوە، وەختێ ئادەمیزاد ڕووی لە خۆرهەڵاتە، بێگومان خاڵەکانی قیبلەنما بە گوێرەی ئەو شوێنەی کە جەستەی تیا بەوە دیاری دەکرا بە زەمانێکی زۆر بەرلەوەی ئەم پرۆسەیە ئاراستەیەکی دی وەربگرێت و هەندێ شێوازی "بابەتی– مەوزوعی"مان بۆ دیاریکردنی ئاراستەی بوونگەرایانە ئەداتێ. وشەگەلی وەکو: ڕاست، چەپ، سەروو، خواروو، پێش، پشت.. هتد شێوازە سەرەکیەکانی ڕێکخستنی شوێن پێکدەهێنن و، ئەمەش لە شوێنمەندیی تایبەت بە بوونی مرۆییەوە سەرچاوە ئەگرێت.

سەربارى ئەمە، بوونەوەری مرۆیی شوێنی خۆی لە شێوەی سیستمێك لە "جێگا" ڕێکدەخات، هەرچۆن جیهان بە گوێرەی بایەخپێدان و لە ڕێی سیستمێك لە ئامرازەوە ڕێکدەخرێ، بە هەمان شێوە شوێنیش بە گوێرەی هەندێ جێگا کە پەیوەستن بە بایەخدانەوە، ڕێکدەخرێ، جێگا بە تەنها جێ Locationیەك نییە، بەڵکو "جێگایەکە بۆ..": بۆ نموونە، لە کارگەدا یان لە نووسینگەدا هەموو شتێك لە جێگای خۆیدا دادەنرێ، ئێمەش دەزانین چۆن ئەو شتە ئەدۆزینەوە، جێگا جۆراوجۆرەکانیش لەناو خۆیاندا وا ڕێکدەخرێن کە هانمان ئەدەن کارەکانمان بە ڕێکی ئەنجام بدەین. هەروەکو پێشتریش لە حاڵەتی "جیهان"دا بینیمان، ئەم "شوێنی بایەخدانە" –وەك ئەتوانین وای ناوبنێین– زۆربەی کات هەیە بەبێ ئەوەی کەس سەرنجی بدات، سەرنجی نادەین تەنها ئەو کاتە نەبێت کە شتێك لە شوێنی خۆیدا نابێت یان بۆ شوێنێکی تر دەگوێزینەوە و ناچار دەبین سیستمێکی دی بۆ جێگاکان دابمەزرێنین.

بەڵام شوێن وەکو ئەوەی لە زانستی ئەندازەدا هەیە، یان ئەو شوێنەی کە دەکرێ بە وردی ئەندازەی بگیررێ، لە ڕووی گرنگییەوە دوای شوێنی بوونگەرایانەی تایبەت بە

بایەخدانی ڕۆژانە دێت، کاتێکیش بەم شوێنە دەگەین کە بایەخدانی ڕۆژانەمان دەخەینە "نێوان دووکەوانە"وە —گەر ئەم دەربڕینە ڕاست بێت— و لەو خاڵەش نزیك دەبینەوە کە بە شێوەیەکی بابەتیانەی ئەبستراکت لێیەوە دەڕوانینە شوێن. ئەمەش شێوازێکی تایبەتە لە تێگەیشتنی شوێندا. بەڵام ئێمە زۆربەی کات بە پێی بایەخدانمان مامەڵە لەگەڵ شوێندا دەکەین. بۆ نموونە ئەگەر لە کەسێك بپرسیت لە ئەمریکا، ماوەی نێوان دوو شار چەندە، بە زۆری وەڵامەکەی ئەو بە پێی سەعات و دەقیقە دەبێت، نەك میل، لەبەرئەوەی دیارە کە پرسیارەکە پەیوەستە بە بایەخدان بە ڕۆیشتن لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر، لەبەرئەوەی مەسەلەکە لێرەدا هێندەی پەیوەستە بە حاڵەتی خێراییەوە لە ڕێگادا، هێندە پەیوەست نییە بە حەقیقەتی بابەتیی مەودای درێژایی نێوان ئەو دوو خاڵە.

ئەگەر لە شوێنەوە بێینە سەر کات (زەمان)، دەبینین کاتیش پەیوەستە بە بایەخدانەکانمانەوە، کاتێك هەیە تیایدا ئەچین بۆ کار، کاتێك هەیە بۆ حەوانەوە، کاتێکیش بۆ خەو.. هتد ئادەمیزادیش لە ڕێی ڕیتمە سەرەکیەکانی ژیانیەوە لە جیهاندا هوشیاریی دەبێت بە کات، بەرلەوەی ئەم ڕیتمانە لە "کاتی سەعات"دا پێکەوە ببەسترێنەوە، ئەوکاتەی کە بۆ هەمووان وەکو یەکە و بە هۆیەوە چالاکییە جیاوازەکانمان ڕێکدەخرێن.

هەڵبەت بوونگەراکان یەکەم کەس نەبوون کە ئاماژەیان بە جیاوازیی نێوان کاتی بوونەوەری مرۆیی لە ئەزموونیدا و کاتی بە سەعات پێوراودا، بەڵکو خەڵك هەر لە زووەوە هەستیان بەوە کردووە کە کات لای مرۆڤ دەشێ زۆر خێرا تێپەڕێت و دەشێ زۆر خاوبێت، با میلی سەعاتەکەش بە ڕێکوپێکی بجوولێت. هێنری بێرگسۆن* زوو سەرنجی

---

* هێنری بێرگسۆن (١٨٥٩—١٩٤١) فەیلەسووفێکی هاوچەرخی فەرەنسییە کە بایەخی بە کات و هەستکردنی مرۆڤ بە کات دا و هەوڵی دا لە "ناوەوە" پەی بە شتەکان بەرێت، یان هەست بە

خەڵکی بەلای ئەوەدا ڕاکێشا کە کات مۆرکێکی لێکنەپچڕاوی هەیە لە هەستی مرۆڤدا، بەڵام لە سەعاتدا زنجیرەیەکی پچڕپچڕ "چرکەسات"ە .

بەڵام وا چاکە ئەم سەرنجانە لەسەر کات لێرەدا بوەستێنین، لەبەرئەوەی لێدوانی فراوان لەسەر تێگەیشتنی کات لە فەلسەفەی بوونگەرابیدا هاوتەریب لەگەڵ لێدوانی شوێندا ناڕوات و، دواتر دێینە سەر ئەو ڕۆڵە سەرەکییەی کە کات لە شیکردنەوەی بوونی مرۆییدا دەیگێڕێت.

## ٦–سروشت

ئێمە لەم بەشەدا و لە چوارچێوەی فەلسەفەی بوونگەرابیدا لەسەر چەمکەکانی: "جیهان" و "جەستە" و "شوێن" و "کات" دواین (گەرچی لێدوانمان لەسەر کات زۆر کورت بوو) دەمێنێتەوە ئەوەی شتێکیش دەربارەی چەمکی "سروشت" بڵێین.

بە شێوەیەکی گشتی فەیلەسووفە بوونگەراکان وا پیشان نادەن کە زۆر بایەخ بە سروشت ئەدەن، لەبەرئەوەی فەلسەفاندنەکەی ئەوان مرۆڤ ئەکاتە خاڵی سەرەتای خۆی، هەندێ جاریش لە مرۆڤ دوورتر ناڕۆن. خۆیشیان لەهەر جۆرە تێڕوانینێکی ڕۆمانسیانە بۆ سروشت بەدوور دەگرن. ئەمەش پێشتر لە لێدوانەکانماندا سەبارەت بە جیهان ڕۆژانە بە ڕوونی دەرکەوت، ئەو جیهانەی کە مرۆڤ بەردەوام تیایدا هەوڵی ئەوە ئەدات ئەو شتەی شتێکی "سروشتیی پەتی"یە بخاتە ناو ئەو سیستمی ئاڵۆزی ئامرازانەوە کە لەبەر ڕۆشنایی کردەیی تایبەتی خۆی بنیاتی دەنێت. بگرە تێڕوانینی زانستیانەش بۆ سروشت لە لایەن زۆربەی بوونگەراکانەوە بە گەرمی پێشوازیی لێناکرێ، لەبەرئەوەی ئەوان متمانەیان بە ئاقاری ئەقڵپەرستانەی زانست نییە، هەروەها بە پراکتیزەکردنی لێکۆڵینەوەی زانستیش. ئەوان بڕوایان وایە کە دەشێ ئەم دووانە بە

---

لێدانەکانی دڵی واقیع بکات بە پێی دەربڕینەکەی خۆی، لە کتێبە گرنگەکانی "کات و ئیرادەی ئازاد"، "هزر و بزۆک".. هتد.

ڕێگای جیاواز لە بەردەم گەشەسەندنی تەواوی بـوونی مرۆییـدا ببنـە کۆسـپ و تەگـەرە. فەیلەسووفی بوونگەرا لە کاردانەوەی توندیدا بەرامبەر بە متمانەی کوێرانە بە زانـست بـۆ پێشکەوتنی مرۆڤ لەگەڵ بێردیاییڤدا هاوڕا دەبێت کاتێ دەڵێت: "تـەواوی مێـژووی نـوێ، لە باوەڕیدا بە ئەقڵخوازی و پۆزیتیڤیزم و باوەڕهێنان بە زانست، بریتـی بـووە لـە چـاخی شەو نەك ڕۆژ" . بەڵام ئێمە ئەگەر بمانەوێ ورد بین ئەوا ئەبێ بڵـێین کـە فەیلەسـووفی بوونگەرا ڕەخنە لە "زانستخوازیی توندڕەو Scientism" دەگرێت، نەك لە زانست خـۆی. ئەو دان بـە ڕەوایـەتیی تێڕوانینـی زانـستیانەدا دەنێـت بـۆ جیهـان، بـەڵام نکـووڵی لـەوە دەکات کە ئەوە تاقە تێڕوانین یان تێڕوانینی بنەڕەتی بێت بۆ گەیشتن بە حەقیقەت.

لەگـەڵ ئەوەشـدا و سـەرباری بایـەخ نـەدان بـە سروشـت لـە بوونگەراییـدا، توانـای خـستنەڕووی لێکدانەوەیـەکی بـۆ سروشـت تێدایـە و، لـە ڕاستیـشدا قووڵییـەك لـەو تێڕوانینەشدا هەیە، گەرچی من گومانم لەوە هەیـە کـە ئەنجامـەکانی ئـەم تێڕوانینـە لای فەیلەسووفێکی بوونگەرا بـە تـەواوەتی هاتبێتـە دی. ئـەم تێڕوانینـەی بوونگـەراییش بـۆ سروشت لەسەر حیسابی بـوونی مرۆیـی خۆیـەتی، مـرۆڤ بوونـەوەرێکی مرۆییـە، کەسـە، بەڵام لە هەمان کاتـدا بوونـەوەرێکی ئۆرگـانیی زیندووشـە. دواجـار ئـەو لـە ڕوانگەیـەکی دیاریکراوەوە بابەتێکی ماددییە کە لە کاربۆن و ئۆکسجین و کالـسیۆم و ئـەو توخمانـەی تر پێکدێ کە جەستەیان لێ پێکهاتووە.

هایدیگـەر دەڵێـت: ژیـان خـۆی جۆرێکـە لـە بـوون، بـەڵام بـە تـەنها لەبەردەسـتی "دازایـن"دایـە. ئێمـە لـە ڕێـی لێکدانەوەیـەکی کەمکەرانـەوە Privative دەگەینـە ئۆنتۆلۆجییەك بۆ ژیان کە بتوانێ ئەوەمان بۆ دیاری بکات کە ئەبێ دۆخەکە چۆن بێـت ئەگەر شتێك هەبێت بە ناوی ژیانی پەتی Mere Aliveness یەوە. هەر هایدیگـەر خـۆی

---

* ئاقارێکە هەموو شتێك بۆ زانست دەگەڕێنێتەوە و بـە بەهایـەکی ڕاسـتەقینەی ڕەهـای لـە قەڵـەم ئـەدات، تـەنها میتـۆدی زانـستی و حەقیقەتـە زانـستیەکان بـە ڕاسـت ئـەزانێت و بـە شـێوەیەکی تایبەتیش لای لایەنگرانی زانستە کیمیایی و سروشتیەکان باوە.

زۆر زیاتر لەسەر ئەم خاڵە ناڕوات، بەڵام ئاماژە بۆئەوە دەکات کە ئەم پرۆسەیە شتێکی زیاترە لە کاری نیشانەکانی کۆکردنەوە و لێدەرکردن. ئێمە ناتوانین بە لێدەرکردنی خەسڵەتە مرۆییەکان بگەینە بیرۆکەی ژیان، وەك چۆن ناتوانین لە ڕێی کۆکردنەوەی هەندێ خەسڵەتەوە یان ئیزافەکردنی هەندێ خەسڵەت بۆ بوونەوەری زیندوو، وێنەیەکی مرۆڤ بکێشین.

فەیلەسووفی ئینگلیز جۆن ماکموری John Macmurry لە زۆر ڕووەوە لەگەڵ فەیلەسووفە بوونگەراکاندا یەکدەگرێتەوە. ئەو ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە خود یان بوونی شەخسیی مرۆڤ لە مێژووی فەلسەفەی نوێدا، سەرەتا وەکو شتێك یان گەوهەرێکی مادی سەیردەکرا. کاتێکیش بایۆلۆجی هاتە ئاراوە، وەکو نموونەی بوونەوەرێکی ئۆرگانیی زیندوو سەیردەکرا. بەڵام "ماکموری"یش وەکو هایدیگەر بڕوای وایە کە هەردوو ئەم بۆچوونە بۆ تێگەیشتنی "کەس– شەخس" کەموکورتن و، دەبێ ئێمە بە ئاقاری پێچەوانەدا بڕۆین و بە پێی ئەزموونی تایبەتیی خۆمان لە بوونەوەری زیندوو و هەروەها گەوهەری مادی بگەین، ئەو ئەزموونەی کە هەم بوونی ئۆرگانی و هەم بوونی ماددیش لەخۆ دەگرێت .

ئەبێ چ کاردانەوەیەك لە لایەن زاناکانەوە بەرامبەر بەم بەڵگە و ئەنجامگیرییانە، چاوەڕێ بکەین؟ بێگومان هەر زانایە و کاردانەوەیەکی جیاوازی دەبێت، بەڵام لێرەدا ئەمانەوێ بە تایبەتی ئاماژە بۆ سەرنجێکی زانایەکی بایۆلۆجی بکەین کە ناوی "جۆن هابگود"ە و دەڵێت: "ئێمە ئەتوانین سەبارەت بە بوونەوەری زیندووی کامڵ، پرسیاری فیزیکی و کیمیایی بکەین، بەڵام داخۆ ئەوە مانای چییە کە ئێمە وەکو بوونەوەرێکی زیندوو سەیری گیانەوەریش بکەین؟! بە بڕوای من ئەمە مانای وایە کە دان بەوەدا بنێین کە پەیوەندیی نزیك لە نێوان ئەو و ئێمەدا هەیە و، هەردووکمان سەر بە یەك خێزانین" .

ئەم سەرنجە پێمان دەڵێت کە تێگەیشتنی ژیان جگە لە تێڕوانینی "لە خوارەوە بۆ سەرەوە"ی فیزیا و کیمیا، پێویستی بە تێڕوانینێکی تریش هەیە "لە سەرەوە بۆ خوارەوە" کە لە هۆشیاریی ڕاستەوخۆمانەوە دەستپێدەکات و بەو مانایە دێت کە مرۆڤ زیندووە. بەڵام لە کاتێکا فەیلەسووفە بوونگەراکان ڕەخنە لە هەندێ زانا و فەیلەسووف دەگرن کە زۆر توند خۆیان بە تێڕوانینی یەکەمەوە بەستۆتەوە لەم دوو تێڕوانینە تایبەتە بە بوونی دیاردە سروشتییەکان، ئەوا ئێمەش ئەتوانین بڵێین کە ئەوان خۆشیان زیاد لە پێویست بایەخیان بە تێڕوانینی دووەم داوە.

# بەشی پێنجەم

## بوونی مرۆیی و ئەوانی تر

١–بوون لەگەڵ ئەوانی تردا بەوپێیەی خەسڵەتێکی بنەڕەتیی بوونی مرۆییە.

٢–پەیوەندی لە نێوان کەسەکاندا.

٣–جەستە و ئەوی تر، لەگەڵ ئاماژەیەکی تایبەتیدا بۆ مەیلی سێکسی.

٤–بوون لەگەڵ ئەوانی تردا: لە شێوە ڕەسەنەکەی و ساختەکەیدا.

## ١-بوون لەگەڵ ئەوانی تردا
## بەوپێیەی خەسڵەتێکی بنەڕەتیی بوونی مرۆییە

لە بەشی پێشوودا لە بیرۆکەی جیهان دواین و، بینیمان کە بوونی مرۆیی بەبێ جیهان ئەستەمە، چونکە بوونی مرۆیی لە ڕاستیدا "بوون -لە- جیهاندا"یە. بەڵام ژینگەی مرۆیی بە تەنها جیهان نییە، گەر وا لە وشەی جیهان گەیشتبێتین کە بریتییە لە جیهانی شتەکان، لەبەرئەوەی ژینگەی تایبەتیی ئەو کەسەش هەیە، چونکە بوونەوەری مرۆیی لە کارلێکێکی بەردەوامدایە لەگەڵ بوونەوەرە مرۆییەکانی تردا، یان گەر بمانەوێ بە شێوەیەکی تر دەریببڕین، ئەوا دەڵێین کە بوونی مرۆیی "بوون -لەگەڵ- ئەوانی تردا"یە، یان "بوونی تاکەکەسە لەگەڵ تاکەکەسانی تردا". لەم بەشەدا بایەخ بە شیکردنەوەی ئەم لایەنە تایبەتییەی بوونی مرۆیی ئەدەین، لێدوانەکەشمان بە شێوەیەکی گشتی هاوتەریب لەگەڵ لێدوانەکەی بەشی پێشوومانددا ئەڕوات. وەك چۆن لە بەشی پێشوودا ڕوونمانکردەوە کە بوونێکی مرۆیی نییە بەبێ جیهان، لێرەشدا لەوەوە

دەستپێدەکەین ئەوە ڕوونبکەینەوە کە خەڵکانی تر لە بنەڕەتدا توخمی سەرەکیی پێویستن بۆ بوونی مرۆیی وەك چۆن جیهانیش پێویستە، چونکە بوونی مرۆیی لە بنەڕەتدا مۆرکێکی دەستەجەمعیی بەخۆیەوە گرتووە، بەبێ ئەوانی تر من ناتوانم هەبم.

سەرەتا وا دێتە بەرچاو کە ئەم ڕایە لەگەڵ هەندێ لەو شتانەدا یەك نەگرێتەوە کە پێشتر باسمان لێکردن. چونکە ئێمە زۆرمان لەسەر ئەوە وت کە هەر بوونەوەرێك بۆ خۆی دانسقەیە، کاتێ شیکردنەوەیەکی سەرەتاییمان بۆ بوونەوەری مرۆیی ئەنجام دا. وتمان کە بوونی مرۆیی خاوەن "تایبەتمەندی Mineness"ە، وەك چۆن پێدەچێ شیکردنەوەکانیش جەختیان لەسەر مۆرکی ئەم دانسقەییە کردبێتەوە. پێشتر ئەوەمان بینی کە جێگیربوونی مرۆڤ لە جیهاندا لە ڕێی جەستەیەوە واتە تێڕوانین بۆ ئەم جیهانە لە گۆشەنیگایەکی دانسقەوە، ئەوەش واتە مرۆڤ جیهانێکی بچکۆلەی دانسقە بێت لە ڕێی ڕەنگدانەوەی جیهانەوە لەسەر خودی. هەروەها بینیمان کە کاتێ تۆ جەستەیەکت هەیە واتە تۆ جەستەیت، واتە مرۆڤ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ و توندوتۆڵی بە جەستەیەوە هەیە و لەناو ئەو جەستەیەوە هەستی پێدەکات، لە کاتێکا ئەو لە "دەرەوە"ی هەموو جەستەیەکی تردایە و ناتوانێ پەی بە جەستەکانی تر بەرێت، بە تەنها مەگەر لە ڕێی سەرنجی دەرەکییەوە. کەواتە ئایا تایبەتمەندییەکی حەتمی و ناچار نییە کە هیچ بوونەوەرێکی مرۆیی ناتوانێت خۆی لێ قوتار بکات؟ پاشان ئایا ئەم تایبەتمەندییەی بوون وابەستە نابێت بەو بوونە مرۆییەوەیەی کە پێی دەڵێم "بوونی من".. و لەهەر خەسڵەتێکی دەستەجەمعی زیاتر خەسڵەتەکانی ئەو بوونە دیاری دەکات؟ کاتێکیش بە کەسانی ترەوە دەبەسترێینەوە، ئایا ئەم بەسترانەوەیە شتێك نییە کە دواتر دێت و ئەبێتە خەسڵەتێکی تری بوونەوەری مرۆیی و تاکەکەس؟

وێڕای ئەوەی زۆرجار وا گریمانە دەکرێ کە کۆمەڵگا لە ئەنجامی کۆبوونەوەی کۆمەڵێك تاکەکەسەوە دروست دەبێ، بەڵام زۆربەی زانایانی هاوچەرخی مرۆناسی (ئەنترۆپۆلۆجی) و کۆمەڵناسی ئەڵێن تاکەکەسەکان لە کۆمەڵگایەکەوە هەڵدەقوڵێن کە

پێش ئـەوان بـوونی هەیـە. ئـەوەش ڕاسـتە كـە زۆربـەی فەیلەسـووفە بوونگـەراكان ئـەو سەرنجە لای مرۆڤ دەچەسپێنن كە زۆر تاكگەران، ئەوەتانێ كیركەگۆر تاكەكـەس ئـەكات بە گوتەزایەكی سەرەكی لە فەلسەفەكەیدا، چ ئەو و چ هاوڕێگایانی ئەو جەختیان لەسـەر بەرپرسیارێتیی تاكەكەس كردۆتەوە، ئەو بەرپرسیارێتییەی كـە ناخرێتـە سـەر ئەسـتۆی كەسی تر بەرامبەر بەو بڕیارانەی كە بوون بەسەر تاكەكەسیدا ئەسەپێنێت.

هەڵبـەت ئـەوان سـەرنجی خـەڵكیان بـەلای شـتێكی بنەڕەتیـدا ڕاكێـشاوە لـە بـوونی بوونەوەری مرۆییدا، ئـەویش ئەوەیـە كـە پێویـستە هەركەسـێك خـۆی بڕیـاری خـۆی لـە هەڵوێستە دانسقەكەی خۆیـدا بـدات و بەرپرسـیارێتیی ئـەو بڕیـارەش بگرێتـە ئەسـتۆی خۆی. هەندێ لایەنی تری بوونی مرۆییش هەن كە لە گەوهەردا تاكەكەسانەن، بۆ نموونـە ڕووبەڕووبوونەوەی مەرگ.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا شـیكردنەوەی بوونگەرایانـە كاتـێ دوورتـر ئـەڕوات، بێگومـان جەخت لەسەر گرنگیی مۆركی دەستەجەمعیانە (یان كۆمەڵییانە)ی بوونی مـرۆڤ ئـەكات، لەبەرئەوەی كاتێ قسە لەسـەر بـوونی مرۆیـی ئەكـەین بێگومـان ڕووبـەڕووی جەمـسەرە دژەكان و ناودژێتییەكان ئەبینەوە. ئێمە كاتێ جەخت لەسەر شتێك ئەكەینەوە ئـەبێ لـە چوارچێوەی دیالەكتیكێكدا بێـت كـە ڕێگـە بـە جـەختكردن لەسـەر جەمـسەرە دژەكـەی تـریش بـدات. هـیچ جەمـسەربەندییەكی بـوونی مـرۆڤیش لـە جەمـسەربەندیی نێـوان تایبەتمەندێتیی بوونی مرۆیی و مۆركە كۆمەڵایەتیەكەی قووڵتر نییە.

سەرباری ئەمەش ئەم جەمسەربەندییە لایەنێكی سەرنجڕاكێشی هەیە. ئەگەر ڕێبازی تاكگەرایی **Individualism** لای كیركەگۆر لە ڕێی زێدەڕۆییەكەیەوە ئێمە سەرسام بكـات، ئەوا لە هەمان كاتدا ئەبێ ئێمـە خۆمـان لەهـەر ڕێبـازێكی دەسـتەجەمعی **Collectivism**. بپارێزین كە بەبێ جیاوازیكردن بوونەوەرە مرۆییەكان لە بارستەیەكی چوونیەكدا پێكەوە كۆئەكاتەوە.

دواتر دەرفەتی ئەوەمان بۆ ئەڕەخسێ کە ڕەخنە لە دۆخە ساختە و ناڕەسەنەکانی بوون لەگەڵ ئەوانی تردا بگرین. ئەم دۆخانەش لە ڕووی زیانەوە بۆ بوونی مرۆیی هیچیان لە توندڕەوترین ئاقارە تاکگەراکان کەمتر نییە، بێگومان ڕێبازێکی دەستەجەمعییانە (یان کۆمەڵییانە)ی لەم جۆرە بە خراپ مانای کۆمەڵ (دەستەجەمع) لێکئەداتەوە، لەبەرئەوەی ڕێبازی دەستەجەمعی (یان کۆمەڵگەرا) هەروەکو وشەکەش ئەوە دەسەلمێنێت collectivism مانای کۆمەڵبوونی هەندێ تاکەکەسی جیاواز تا کۆمەڵ Collectionێك پێکبهێنن، واتە لە بنەڕەتدا ڕێبازی تاکگەرا و ڕێبازی کۆمەڵگەرا دوو وێنەی جیاوازی هەڵەیەکن کە ئێمە ناتوانین خۆمانیان لێ بپارێزین تەنها بەوە نەبێت کە لە بوونی مرۆییەوە دستپێبکەین بەوپێیەی "بوونێکە لەگەڵ ئەوانی تردا"، بە جۆرێك کە دەستەواژەی "لەگەڵ ئەوانی تردا" تەنها بریتی نەبێت لە قەوارەیەك کە پێشتر هەیە Pre-Existent و خۆی لە خۆیدا بەسە، بەڵکو ئەم بوونە (کە خودە The Self) و ئەوانی تر The Others خۆیان لە یەك گشتدا دەبیننەوە کە تیایدا پێکەوە بەستراونەتەوە.

گەلێ ڕێگاش هەن بۆ سەلماندنی ئەوەی کە کۆمەڵ (یا دەستەجەمع) تۆخمێکی گەوهەری و ڕەسەنە لە پێکهێنانی بوونەوەری مرۆییدا، بۆ نموونە دەتوانین ئەوە بە ئەنجامێکی ناچارییانەی "بوون- لە- جیهاندا" بزانین کە لە بەشی پێشوودا لێی دواین. لەبەرئەوەی گەرچی هەر کەسێك تێڕوانینی دانسقەی تایبەتیی خۆی هەیە لە جیهاندا، بەڵام بیرۆکەی "جیهان"یش بە پێویست واتە جیهانێکی هاوبەش هەیە، ئەوەش شتێکی ئاشکرایە، بۆ نموونە کاتێ جیهانێك بۆ ئامراز بهێنینە بەرچاومان. پێشتر ئاماژەمان بەوە دا کە ئێمە ناتوانین لە هیچ ئامرازێك بە دابڕان لە ئامرازەکانی تر بگەین، چونکە بەردەوام هەموو جۆرە ئامرازەکانی تر و کەرەسەکانی تر لەخۆ دەگرێت، هەروەها ئەو چوارچێوەی کارەی کە ئەم ئامرازانەی تیا بەکارئەهێنرێ. بەڵام جیهانی ئامرازەکانیش پێویستی بە شتی تر هەیە. ئەو ئامێری چاپەی بەکاری دەهێنم بە تەنها نەبەستراوەتەوە بەو کاغەزەوەی کە لەسەری ئەنووسم، بەڵکو بەو جیهاز و

ئامێرانەشەوە کە ئەم ئامێری چاپەیان بەرهەم هێناوە. هەروەها بـەو خەڵکـەوە کـە ئـەو شـتانە ئەخوێننـەوە کـە مـن لەسـەر کاغەزەکـە ئەینووسـم. کەواتـە جیهـانی ڕۆژانـە بەستراوەتەوە بە ژمارەیەکی زۆری خەڵکەوە کە دەچنە نـاو پەیوەنـدی و کـاری ئـاڵۆز و ئاڵووێرەوە. پێشتر بینیمان کە بوونی ئەم جیهانە مەرجێکی پێشینە A Priori بۆ هەموو بایەخپێدانە کردەییەکانم، هەر بۆیە مـرۆڤ ئـەتوانێ بڵێـت کـە ئـەوانی تـریش "مـەرجێکی پێشینە"ن بۆ بوونی مرۆیی و ئەوان بە تەنها شتێك نین بخرێنە سەر بوون. ئەتوانین ئەم ئەنجامگیرییە سەبارەت بە جیهـانی ئامرازەکـان لەگـەڵ ئـەنجامگیریی پـشتئەستوور بـە شوێنمەندی و کاتمەندیی بوونەوەری مرۆییدا بەراورد بکەین. ئـارەزووی بـە بابـەتیکردنی شـوێن و کـات لـە پێداویـستییەوە بـۆ شـوێنمەندی و کاتمەنـدیی بوونـەوەری مرۆیـی سەرچـاوە ئـەگرێت، لەبەرئـەوەی ئـەو شـوێنەی کـە لـە دەرەوەیـە و جەسـتەی مـن تێئەپـەڕێنێت، شـوێنێکی تایبـەت نییـە بـە مـن، بـەڵام شـوێنێکە کـە تیایـدا لەگـەڵ بوونەوەرەکانی تردا بەشداری دەکەم، ئەو بوونەوەرانەی هەریەکـە و ڕوانگـەی تایبـەتیی خۆی هەیە.

بەڵام ئێمە ئەتوانین بە ڕێگای ڕاستەوخۆتر بیسەلمێنین کە بوون لەگەڵ ئـەوانی تـردا توخمێکی بنچینەیی پێکهاتەی بوونی مرۆییە. لەو ڕووەشەوە کـە بنـەڕەتی و بنـچینەییە لەگەڵ" بوون لە جیهاندا" یەکسانە، بۆیە نابێ وەکو دەرەنجامێکی "بوون لـە جیهانـدا" سەیری بکەین، بەڵکو وەکو خۆی لێی بڕوانین کە بوونێکی سـەربەخۆی هەیـە. هـەروەکو "مارتین بوبەر M. Buber"یش دەڵێت: هیچ "مـن"ێك نییـە هـەر بـە تـەنها خـۆی بێـت، بەڵکو بە تەنها ئەو "من"ە هەیە کە لەگـەڵ وشـەی سـەرەکیی "مـن– تـۆ"دا ئاوێتەیـە، هەروەها "من"ی ئاوێتە لەگەڵ وشەی سەرەکیی "من– ئەو"دا .

---

* پەیوەندیی یەکەم وێنەی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و مرۆڤە واتە پەیوەندیی نێـوان ئادەمیزادەکـان، دووەمیشیان پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و شتەکانە یان بوونەوەرە نائاقڵـەکان. بـەڵام دەبـێ سـەرنجی ئەوە بـدەین کـە مەسـەلەکە بـە تـەنها "پەیوەندییـەك" نییـە و بـەس، بـەڵکو لێرەدا مەبەسـت لـە

دەتوانین ئەو بیرۆکەیەی بوبەر بە شێوازێکی تر و بەو زاراوانەی کە پێشتر خۆمان بەکارمان هێنان، بخەینە ڕوو و بڵێین: "هیچ بوونەوەرێکی مرۆیی خۆی لە خۆیدا بوونی نییە، بەڵکو بە تەنها ئەو بوونەوەرە مرۆییە هەیە کە بوون —لەگەڵ— ئەوانی تردا، یان بوون —لەناو— جیهاندا پێکدێنێت". بوبەر بوون لەگەڵ ئەوانی تردا دەخاتە پێش بوون —لەناو— جیهاندا وە. لە ڕاستیشدا ئەگەر ئێمە کەمێك لە مانای بوونی مرۆیی ڕابمێنین، دەبینین کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بیرۆکەی بوونەوەری تەنیا جگە لە وەهمێك هیچی دی نییە. بیرۆکەکەی بوبەر ئەوەیە کە من و تۆ لە وشەی بنەڕەتیی "من—تۆ"وە داتاشراون. واتە کاتێك من دەڵێم "من" مانای وایە من دانم بە "تۆ"شدا ناوە، ئەو "تۆ"یەی کە ئەم "من"ە خۆی لێ جیادەکاتەوە. بەرلەوەی من و تۆش بە لە یەکتر دابڕاوی هەبن، "من— تۆ" هەبووە، واتە واقیعی دەستەجەمعی یان کۆمەڵایەتی، کەوا لە خودی مرۆیی یان تاکەکەس دەکات هەبێت.

گەلێ شتی تریش هەن کە پشتیوانی لەم بیرۆکەیە دەکەن، واتە بیرۆکەی ئەوەی کە دەستەجەمع (یان کۆمەڵ) مەرجێکی بنەڕەتییە بۆ بوونی مرۆیی و یەکێکە لە توخمە پێکهێنەرەکانی. هەر لەم بارەیەوە با باسی دوو خاسیەتی سەرەکیی خاسیەتەکانی بوونی مرۆیی بکەین کە ئەوانیش "خاسیەتی سێکسی" و "خاسیەتی زمانەوانی"ین و دواتر بە شێوەیەکی فراوانتر قسەیان لەسەر دەکەین. بەڵام ئاشکرایە کە هەم سێکس و هەم زمانیش ئەو بیرۆکەیە دەسەلمێنن کە تاکەکەس ناتوانێت بەبێ ئەوانی تر کامڵ بێت: سێکس ئاماژەیە بۆئەوەی کە سەرباری ئەوەی جەستەی ئادەمیزاد کۆمەڵێك "کۆئەندام"ی تیایە (وەکو کۆئەندامی دەمار، کۆئەندامی هەرس، کۆئەندامی هەناسە.. هتد) بەڵام کۆئەندامی زاووزێی نیو کۆئەندامە و بەبێ کەسێکی تری ڕەگەزەکەی تر کامڵ نابێت. ئەمە جگە لەوەی کە ئەم ڕاستییە بە تەنها ڕاستییەکی تاقیکارانە یان بایۆلۆجی

---

پێکهاتەیەکە کە لە "من—تۆ" یان "من—ئەو" پێکهاتووە، بۆیە بۆ دەربڕین لەمە تەنها "وشە بنەڕەتییەکە" یان دارشتە سەرەتاییەکە بەکارهێنراوە کە گوزارشت لەم پێکهاتەیە دەکات.

نییە، وەكو ئەوەی لای زۆر بوونەوەری تری غەیرە مرۆڤ هەیە. بەڵكو سێكس لای مرۆڤ مۆركێكی مرۆیی بەخۆیەوە دەگرێ Humanized و دەبێتە دیاردەیەكی بوونگەرایانە. بێردیاییڤ دەڵێت: "سروشتی سێكسی لای مرۆڤ ناخرێتە هەمان ئاستی وەزیفە ئۆرگانیەكانی تری جەستەیەوە، وەكو سووڕی خوێن بۆ نموونە، لەبەرئەوەی ئێمە لە چالاكیی سێكسیدا پەی بە ڕەگوڕیشە میتافیزیكیەكانی بوونی مرۆڤ دەبەین". هەروەها دەڵێت: "چالاكیی سێكسی بە تەنها وەزیفەیەكی تایبەتی بوونی مرۆیی نییە، بەڵكو پەلوپۆ بۆ ناو هەموو بوونی مرۆیی دەهاوێژێت و بەناو خانەكانی لەشیدا بڵاودەبێتەوە و هەموو ژیانی دیاریدەكات" بگرە بێردیاییڤ دەگاتە ئەو ڕادەیەی كە دەڵێت گوتەزای چەشنی سێكس و نێرومێ گوتەزای گەردوونین Comic نەك بە تەنها گوتەزای ئەنترۆپۆلۆجی .

بەشێكی زۆری ئەوەی گوتمان بەسەر زمانیشدا دەسەپێت. لە ئەركە سەرەكیەكانی زمان دروستكردنی پەیوەندی و گەیاندنە لەناو خەڵكدا و هەروەها ئاڵوگۆڕی بیروڕایە لە نێوان كەسەكاندا. شتێكیش نییە ناوی زمانی تایبەتی بێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بوونێكی مرۆیی نییە (بە مانا بەرتەسكەكەی ئەم دەربڕینە) بەبێ زمان. چونكە زەحمەتە بیركردنەوە هەبێت بەبێ زمان (مەگەر لە هەندێ بارودۆخی نائاساییدا) چونكە زمانە دەبێتە هۆی ئەوەی هزری تۆ بگاتە بەرامبەرەكەت.

هەندێ لە فەیلەسووفە بوونگەراكان هەمان شتیان سەبارەت بە زمان وتووە كە بێردیاییڤ سەبارەت بە سێكس وتوویەتی، واتە كە زمان بە تەنها دیاردەیەكی مرۆیی نییە، بەڵكو مەغزایەكی ئۆنتۆلۆژیی ڕەهای گشتگیر لەخۆ دەگرێت. ڕاستە كە زمان توانایەكی مرۆیی بنەڕەتیەو بەبێ زمان مرۆڤ ناتوانێت مرۆڤ بێت، بەڵام بۆمان هەیە لەگەڵ هایدیگەردا بپرسین: مرۆڤ چۆن توانیی ئەو توانایە دابهێنێت كە هەموو بوونی تەنیوەتەوە و، وای لێكرد ببێت بە مرۆڤ..؟!

لەم قۆناغەدا پێویستمان بەوە نییە خۆمان بە کێشە ئۆنتۆلۆژییە تایبەتەکان بە زمان و سێکسەوە خەریك بکەین، بەڵکو هێندەمان بەسە سەرنجی ئەوە بدەین کە ئەم خاسیەتانەی بوونی مرۆیی بەڵگەی ئەوەن کە بوونی مرۆیی لە بنەڕەتدا بوونێکی کۆمەڵایەتییە، چونکە تاکەکەسی تەنیا یەکەیەك نییە کۆمەڵ و کۆمەڵگاکانی لەسەر بنیات بنرێ، بەڵکو ئێمە کاتێ دەمانەوێ تاکەکەس تەنیا بکەین، ئەم کارەمان بۆ ناچێتە سەر.

بوونەوەری مرۆیی تەنانەت لە قووڵترین ڕەهەندەکانی بوونیدا بە چواردەوری خۆیدا دەڕژێ (گەر ئەم دەربڕینە لە جێی خۆیدا بێت) و سنوورەکانی بوونی تاکەکەسییانە تێدەپەڕێنێت و بە تەنها لە چوارچێوەی گشتێکی کۆمەڵایەتیی فراوانتردا مانا لەخۆ دەگرێت کە ناومان لێنا: "بوون– لەگەڵ– ئەوانیتردا".

## ٢–پەیوەندی لە نێوان کەسەکاندا

هەروەکو پێشتر بینیمان، بوونی مرۆیی هەر بە تەنها پێویستی بە ژینگەیەکی ماددی نییە، بەڵکو پێویستی بە ژینگەیەکی کەسییش هەیە (واتە لە کەسانێك پێکهاتبێت).

من لەناو جیهاندا لەگەڵ کەسانێکدا هەڵسوکەوت دەکەم کە بریتی نین لە کۆمەڵێك شتی سەر بەم جیهانە، من دەیانناسم و دەزانم کە کۆمەڵێك بوونەوەرن کە لەگەڵ مندا دەژین و، وەك چۆن من لەم جیهانەدا هەم، ئەوانیش هەن، واتە ئەوانیش کۆمەڵێك تەوەری بایەخپێدانن کە جیهانیان لەسەر دائەمەزرێ. نابێ ئەمانە وەکو ئامرازیش بەکارببرێن، بەڵکو ئەوانیش وەکو من بکەرن و جیهان پێکدەهێنن.

وەك چۆن فەیلەسووفە بوونگەراکان هەوڵ نادەن "بەڵگە" لەسەر بوونی جیهان "ی دەرەوە" بهێننەوە، هەر بەو چەشنەش هەوڵنادەن بیسەلمێنن کە بوونەوەری مرۆیی تر هەن، ڕێبازی هەر منی Solipsism نابێتە کێشە لەبەردەم فەلسەفەیەکدا کە نە بە خودی بیرکەرەوەی پەتی دەستپێدەکات و نە بە تاکەکەسی تەنیا و دابڕاو، بەڵکو بەردەوام لە

بوونێکی بەرچاوەوە دەستپێدەکات کە بریتییە لە بوون –لەناو– جیهاندا و بوون –لەگەڵ– ئەوانی تردا.

پێشتر لە گۆشەنیگای "بایەخپێدان Concern"ەوە وەسفی پەیوەندیی نێوان خودی مرۆیی و جیهانی ژیانی ڕۆژانەمان کرد، بەڵام پەیوەندیی نێوان خودێك و کۆمەڵێك خودی تر ناودەنێین "خەریکبوون بەوی ترەوە Solicitude". ئەم دوو زاراوە تایبەتەش لە وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی کتێبەکەی هایدیگەرەوە وەرگیراوە، واتە کتێبی "بوون و زەمەن" کە بەرامبەر ئەم دوو زاراوە ئەڵمانییەن: Besorgen و Fursorge. گەرچی زاراوەکان خۆیان لە خۆیاندا گرنگییەکی وایان نییە، بەڵام زۆر گرنگە هەندێ وشەمان هەبێت تا لە ڕێیانەوە تەعبیر لە جیاوازیی نێوان دوو جۆر پەیوەندی بکەین. زاراوەی "بایەخپێدان" و "خەریکبوون بەوی ترەوە" ئەو دوو وشەیەن کە ئەم مەبەستە دەپێکن. کاتێکیش ئەم دوو وشەیە بەکاردەهێنین وەك ئەوەی دوو زاراوەی تەکنیکی (پسپۆڕانە) بن، ئەبێ ئەوەمان لەیاد نەچێت کە بەردەوام هەڵگری مانای شاراوەی خۆیان نین. پێشتر سەرنجی ئەوەمان دا کە ئەکرێ بە شێوەیەکی نەگەتیڤانە گوزارشت لە "بایەخپێدان" بکەین بەوەی کە شتەکان لەسەر ڕێی خۆمان لابەرین لە بری ئەوەی بەکاریان بهێنین، هەروەها خەریکبوون بەوی تریشەوە بەردەوام شێوەی چاودێرییەکی پۆزەتیڤ بە خۆیەوە ناگرێت، بەڵکو بە داخەوە هەندێ جار لە شێوەی خۆگێلکردن و ڕقدا دەردەکەوێ. بەڵام ئێمە ئەم هەڵوێستانە دەخەینە خانەی "خەریکبوون بەوی ترەوە" کە لێرەدا وەکو چەمکێکی وێنەیی بەکاردەبرێ.

گەرچی ئێمە ئەو جیاکارییە سەرەتاییەی پێشوومان لە نێوان ئەو دوو پەیوەندییەدا بە زمانێك کرد کە لە هایدیگەرەوە وەرمانگرتووە، بەڵام شیکردنەوەکەی ئێستامان لەسەر بنچینەی فەلسەفەکەی "بوبەر" دەبێت نەك "هایدیگەر". "بوبەر" یەکێك بوو لە بیرمەندە هاوچەرخە دیارەکان لەم بوارەدا. هەروەکو "بوبەر"یش دەڵێت دوو دارشتەی بنچینەییمان هەیە کە بریتین لە "من– تۆ" و "من– ئەو" کە ڕەنگدەرەوەی دوو

شـێوازی سـەرەتایین بـۆ پەیوەندییـەکانمان. جیاوازییەکـەش ئەوەیـە کـە داڕشـتەی سـەرەکیی "مـن– تـۆ" بـە تـەنها لەگـەڵ بـوون وەك گـشتدا دەوتـرێ. بـەڵام داڕشـتەی سەرەکیی دووەم "من– ئەو" لەگەڵ بووندا وەکـو گـشتێك نـاوترێ. کەواتـە ئـەم جـۆرە داڕشتە سەرەکییانە بە تەنها بریتی نین لە مۆرکێك یان هۆکاری مەنتیقی. خاوەنی هێـزی بوونگەرایانەن: "کاتێك دەوترێ داڕشتەی سەرەکی، قسەکەر دەچێتە ناو داڕشتەکەوە و لەناویەوە هەڵوێست وەردەگرێت" .

"بوبەر" مەبەستی لەوە چییە کە دەڵێت داڕشتەی "من– تۆ" زمانێکە لەگەڵ بووندا وەکو گشتێك دەوترێ، بەڵام داڕشتەی "من–ئەو" لەگەڵ بووندا وەکـو گـشتێك نـاوترێ؟ کاتـێ سـەرلەنوێ لـە سروشـتی "بایەخپێـدان Concern" رامـاین دەگەینـە کلیلـی ئـەم بیرۆکەیـە، ئەمـەش ئـەو هەڵوێـستەیە کـە بـە داڕشـتەی "مـن– ئـەو" دەریـدەبڕین. بایەخپێدان پەیوەسـتە بـە تێرکردنـی پێداویستیەکی بەشـەکی "جزئـی"ی تایبەتـەوە، ئەوەی کە بایەخی پێئەدەین بە وەسیلە دەژمێردرێ، بایەخپێدانیش بەشەکییە **Partial**، واتە ئەوەی کە بایەخی پێئـەدەین لـە دەرەوەمانـدا دەمێنێتـەوە. بـەڵام لـە پەیوەنـدیی "مـن– تـۆ"دا ئێمـە بـە تـەواوەتی بـەوی تـرەوە دەبەسـترێینەوە، ئەمـەش لـە ڕێـی کرانەوەمانەوە بە روویدا، چونکە ئەو "لەوێ" نییە وەکو شتێك لە دەرەوەی ئێمە بێـت، هەروەها وەسیلەیەکیش نییە بۆ تێرکردنی ئەوەی خودی خۆی تێدەپەڕێنێت.

پێویـستە لێـرەدا هەڵوەسـتەیەکیش بکـەین و سـەرنجی ئـەوە بـدەین کـە ئـەو دوو پەیوەندییـەی ناومـان لێنـان "مـن– تـۆ" و "مـن– ئـەو" و بایەخپێـدان و خـەریکبوون (گەرچـی ئـەم زاراوانـە زۆر بـە وردی هاوواتـانین) بـە شـێوەیەکی رەهـا جیـانین، هـەر داڕشتەیەك لەم داڕشتانە دەشێ لەگەڵ ئەوی تردا تێکـەڵ بێـت، گـەر ئـەم دەربڕینـەمان ڕاست بێت.

لایـەنی تراژیکـی ئـەم مەسـەلەیەش ئەوەیـە کـە: زۆرجـار پەیوەنـدیی "مـن– تـۆ" دائەبەزێتە ئاستی "من– ئەو" ەوە و لەم حاڵەتەشدا بە کەسێکی ترەوە گرێدراو ئـەبین،

نەك بە تەواوی بوونی و كرانەوەیەوە، بەڵكو دەیكەین بە شت و بە وەسیلە. لە حاڵەتە توندڕەوەكانی ئەمەش كۆیلایەتی و سوزانێتییە. بەڵام لەهەر كوێیەك چەوساندنەوە و جیاوازیكردن هەبێت بەو ڕادەیەی كە مامەڵەی مرۆیی لەگەڵ كەسەكاندا دەكرێ، بەردەوام و بێشومار ئەم شتە ڕوودەدات.

بەڵام ئەگەرێكی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە كە پەیوەندیی "من– ئەو" گەشەبكات و ببێت بە پەیوەندیی "من–تۆ". بوبەر دەڵێت ئەم جۆرە پەیوەندییە بە تەنها لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤدا ڕوونادات، بەڵكو دەشێ لە نێوان مرۆڤ و سروشتیشدا ڕووبدات، هەروەها لە نێوان مرۆڤ و ئەوەی كە وەسفی دەكات بە "بوونەوەری ڕۆحی" . دەشێ مرۆڤ لە ڕێی هەموو جۆرەكانی بایەخپێدانی كردەییەوە بە درەختێكەوە وابەستەبێت و درەختەكە ببێتە ئامانجێك بۆی یان تەنانەت وەسیلەیەك. بەڵام دەشێ پەیوەندییەكی گشتیش لەگەڵ درەختەكەدا دابمەزرێنێت، بە جۆرێك كە: "درەختەكە بەرامبەر بە من بەرجەستە دەبێت و وەك چۆن من بەوەوە دەبەسترێمەوە، ئەویش ئاوەها بە منەوە دەبەسترێتەوە: واتە پەیوەندیی نێوانمان پەیوەندییەكی ئاڵوگۆڕە". ئایا ئەوە جۆرێكە لە فەلسەفەی هەمەڕۆحی Panpsychism ؟ بوبەر تا ئەو ڕادەیە ناڕوات و دەڵێت "من بەرامبەر ڕۆحی درەختێك نیم، یان بەرامبەر پەرییەك لە پەرییەكانی دارستان، بەڵكو بەرامبەر خودی درەختەكەم" .

هەرچۆن ئەگەری ئەوە هەیە كە یەكێك لەو دوو شێوەی پەیوەندییە بگۆڕێت بەوی تریان، ئەبێ دان بەوەشدا بنێین كە حاڵەتی مامناوەندییش هەیە. هارڤی كۆكس دەڵێت كە لە زۆر حاڵەتدا پەیوەندیی "من– ئێوە" گونجاوترە لە پەیوەندیی "من– تۆ". لە پەیوەندیی "من– ئێوە"دا ڕێزی كەسێتی و ئینسانیەتی بەرجەستە بوو لەوی تردا دەبینین، بەڵام پەیوەندییەكە هەوڵنادات جۆرێك لە ئولفەت و خۆشەویستیی قووڵی

---

* تیۆرەیەكە دەڵێت كە هەموو ماددەیەكی سروشت وەكو سروشتی دەروونی مرۆیی خاوەن تایبەتمەندیی ڕۆحییە و نموونەی ئەم تیۆرەیەش تیۆرەی مۆنادەكانە لای لایبنیتز.

وابەستە بە بیرۆکەی "من– تۆ" دابمەزرێنێت. بێگومان مەبەستی "بوبەر" ئەوە نییە کە بڵێیت پێویستە مرۆڤ پەیوەندیی شەخسیی توندوتۆڵ دابمەزرێنێت، بەڵام ئەو جیاوازییەی کە زاراوەکانی کۆکس دیاریی دەکەن، سوودبەخشە.

هەروەها مرۆڤ دەتوانێ لە پەیوەندیی "خوا بە مرۆڤەوە" ڕابمێنێت و لە ڕیزی پەیوەندییەکاندا پۆلبەندیی بکات. بوبەر وەکو "تۆی نەمر" باسی لە خودا کردووە، بەڵام بێگومان پەیوەندی لەگەڵ خوادا وەکو پەیوەندی لەگەڵ "تۆی کۆتادار"دا نییە.

بەڵام با بگەڕێینەوە بۆ ڕوونکردنەوەیەکی فراوانتری سروشتی پەیوەندیی نێوان کەسەکان بەو شێوەیەی کە بوبەر شیی کردۆتەوە. لەوانەیە باشترین ڕێگاش بۆ ئەم ڕوونکردنەوەیە ئەوە بێت کە هەندێ لەو زاراوە بنەڕەتییانە بخەینەڕوو کە لەم ڕووەوە پێشنیازی کردوون، ئەم زاراوانەش بە تەنها لە کتێبی "من و تۆ"وە وەرناگرین، بەڵکو لەو نووسینانەشیەوە کە تیایاندا پەرەی بە تێڕوانینەکانی خۆی داوە و بە شێوەیەکی مەنهەجیانەتریش، بە تایبەتی کۆمەڵە وتارەکەی کە ناوی لێناوە "لە نێوان مرۆڤێك و مرۆڤێکدا **Between Man and Man**" و هەروەها دوا کتێبی لە ئەنترۆپۆلۆژیای فەلسەفیدا کە ناوی "زانینی مرۆڤ **The Knowledge of Man**"ە.

لە ڕاستیدا بەکارهێنانی تایبەتیانەی بوبەر بۆ وشەی "دیالۆگ" یەکێکە لە سیفەتە جیاکەرەوەکانی. ئێمە کاتێك دەڵێین پەیوەندیی نێوان کەسەکان جۆرێکە لە دیالۆگ، ئەوە پێداگرتنە لەسەر ئەو مۆرکی "ئاڵوگۆڕ"ەی کە پێشتر لە یەکێك لەو بڕگانەدا باسمان کرد کە لە بوبەرەوە وەرمانگرتبوو. پەیوەندیی ڕەسەن لەگەڵ کەسێکی تردا ناکرێ پەیوەندییەکی یەکلایەنە **One- Sided** بێت و مەیلی بۆ کۆنترۆڵکردن و خاوەندارێتی تیابێت، بەڵکو دەبێت پەیوەندییەك بێت کرانەوە و ئارەزووی بۆ گوێگرتن و وەرگرتن تیابێت، هەروەها ئارەزوو بۆ لێدوان و بەخشش. ئەوەتانێ وا دیسانەوە لێرەدا سەرنجی جیاوازییەکی بنەڕەتی ئەدەین لە نێوان پەیوەندی لەگەڵ کەسێك و پەیوەندی لەگەڵ شتدا. بوبەر بۆئەوەی لەم مەسەلانەشدا گوزارشت لە بیروبۆچوونەکانی بکات دوو

وشـەی تـر بـەكاردەهێنێت كـە بـریتین لـە "پـەیوەنـدی relation" و مـەودا Distance". وشـەی "پـەیوەنـدی" بەسـەر پەیوەنـدیی نێـوان كەسـەكاندا پـاوان دەكـات، هـەروەكو پێشتریش بینیمان ئەم پەیوەندییە بنەڕەتیە و توخمێكی ڕەسەنی بوونی مرۆییـە. بـەڵام لێـرەدا جۆرێـك لـە دیالـەكتیك هەیـە. ڕاسـتیی پەیوەنـدی پێویـستی بـە ڕاسـتییەكی بەڵگەنەویستی یەكسان هەیە، كە ئەویش ماوەیە. درامای پەیوەندیی نێوان كەسەكانیش لەو گرژییەدا بەرجەستە دەبێت كـە لـە نێـوان پەیوەنـدی و مـەودادا هەیـە. هەنـدێ جـار ئەوی تر لە مەودادا هەڵدەخلیسكێت و پەیوەندییە ڕەسەنەكە ون دەبێت، یـان ناتوانێـت پەیوەندیی "من– ئەو" بهێنێتە دی و بیخاتەڕوو. بەڵام تەنانەت كاتێ ئەم پەیوەندییەش دێتەدی، بڕێك مەودا لە نێوان ئەم دووانـەدا هـەردەمێنێت. لـە ڕاسـتیدا خـەڵكی لـە ڕووی پەلەكردنەوە ئەم پەیوەندییـە بـە یـەكبوون Union وەسـف دەكـەن. بـەڵام پەیوەنـدیی ڕاستەقینە دەبێ خودێتیی ئەوی تر و تاكێتیی بپارێزێت، بەوە بواری ئـەداتێ تـا خـودی خۆی بێت. بە پێچەوانەی عیشقی زاڵ و خۆشەویستیی سۆفییانەوە، پەیوەندیی دیـالۆگ ڕێگەنادات ئەو دوو تەرەفە بە تەواوەتی لەناو یەكتردا بتوێنەوە. بوبەر پـێ لەسـەر ئـەوە دائەگرێت كە ئێمە پێویستە ڕێز لەوی تر بگرین و نابـێ بـە گـوێرەی وێنـاكردنی خۆمـان هــەوڵ بــدەین بیگــۆڕین. چــەمكێكی تــریش هەیــە كــە ئــەویش "جــەختكردن Confirmation"ە، من لە ڕێی ئەوی ترەوە جەخت لەسەر خۆم دەكەمەوە، واتە مـن لـە ڕێی پەیوەندیمەوە لەگەڵ ئەوی تردا بە تەواوەتی ئەبم بە خۆم، لێرەشدا جەختكردنـەوە لەسەر ئەوە دەبینینەوە كە هیچ "من"ێك بێ "تۆ" نابێت.

ئەمە كورتەیەكی خێرای "میانەی نێوان خەڵكە" واتـە پەیوەنـدیی نێـوان كەسـەكان وەكو "بوبەر" وەسفی دەكات. سەرباری ئـەوەی هەنـدێ جـار ڕەخنـە لـە هایدیگـەریش دەگرێت، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا لێكـچوونێكی بەرچـاو هەیـە لـە نێـوان ئـەو وەسـفانەی "بوبەر" و ئەو شتانەدا كە هایدیگەر لە كتێبی "بـوون و زەمـان"دا دەربـارەی ئـەوی تـر دەیانڵێت. پێشتر ئاماژەمان بەوە دا كە ئەو جیاوازییەی هایدیگەر كردوویـەتی لـە نێـوان

"بایەخپێدان" و "خەریکبوون بەوی ترەوە" گەچی بە شێوەیەکی زۆر وردیش نەبێت دەشوبهێتە سەر ئەو جیاوازییەی بوبەر لە نێوان "من– تۆ" و "من– ئەو"دا کردوویەتی. بەڵام سەرنجەکانی دواتری هایدیگەر لەسەر ئەم بابەتە لە کتێبی "بوون و زەمان"دا بە ئاراستەیەکی نزیك بە ئاراستەی بیروبۆچوونەکانی بوبەردا دەڕوات. ئەو دان بە بوونی "دوو حاڵەتی توندڕەو"دا دەنێت کە تیایاندا "خەریکبوون بەوی ترەوە" دەردەکەوێ. لە یەکێك لەم حاڵەتانەدا "بازێك" لە پێناوی ئەوی تردا ئەدەین: "ئەم جۆرە خەریکبوونە بەوی ترەوە ئەوە جێی دەگرێتەوە کە پێویستە جێی بایەخپێدانی تایبەتیی بێت. بەم شێوەیە ئەوی تر لە دۆخی تایبەتیی خۆی دووردەخرێتەوە، بۆیە هەنگاو بۆ دواوە دەنێت، بە جۆرێك کە دواتر و کاتێك بابەتەکە سازدەکرێ، بتوانێت وەکو شتێکی بڕاوە و بەردەست بەکاری بهێنێت، یان بە تەواوەتی لە کۆڵی خۆی بکاتەوە". لەم دەقەدا لەگەڵ تایپی زاڵی تایپەکانی خەریکبوون بەوی ترەوە ئاشنا دەبین، هایدیگەریش بڕوای وایە کە ئەوە تایپی زاڵە لەناو تایپەکانی تری خەریکبوون بەوی ترەوەدا، هەروەها بڕوای وایە کە ئەوە تایپێکی بڵاوە بە تایبەتی لە بوونی ڕۆژانەماندا. بەڵام تایپی بەرامبەر لەناو تایپەکانی خەریکبوون بەوی ترەوەدا، ئەو تایپەیە کە تیایدا مرۆڤ "بازێك بۆ پێشەوە" ئەدات، واتە لە بەردەم ئەوی تردا: "نەك لەبەرئەوەی "بایەخپێدان یان خەریکبوون"ی تایبەت بەو نەهێڵێت، بەڵکو بۆئەوەی بە شێوەیەکی ڕەسەن و بۆ یەکەمجار بۆی بگەڕێنێتەوە. "لەم تایپەی خەریکبوون بەوی ترەوەدا دەبینین کە مرۆڤ یاریدەی ئەوی تر ئەدات و تواناکانی بوونی لەبەردەمدا والائەکات". یارمەتیی ئەوی تر ئەدات تا لە ئاست خۆیدا شەفاف بێت لە چاودێریکردنی خودی خۆیدا و بە ئازادییەوە کاتی خۆی بۆ تەرخان بکات .

بەڵام گەرچی لە سەرنجەکانی هایدیگەردا کۆمەڵێك بیروڕای وروژێن هەن، ئەو خۆی پەرەی بە شیکردنەوەی پەیوەندیی نێوان کەسەکان نەداوە بە شێوەیەك کەم تا زۆر لە شیکردنەوەکەی "بوبەر" نزیك بێتەوە. هەر بۆیە ئەگەر بمانەوێ لە لێکۆڵینەوەیەکی

وردی بەهاداری پەیوەندیی نێوان کەسەکان بە ئاگا بین، پێویستە بچینە لای گابریل مارسیل G. Marcel.

دوو دەستەواژە کە خەسڵەتی تێگەیشتنی مارسیل بۆ پەیوەندی بەوی ترەوە جیائەکەنەوە بریتین لە: نەرمی (مرونەت) و دڵسۆزی یان ئەمینی. نەرمی (Availability تەرجەمەی وشەیەکی فەرەنسییە کە (Disponibilite)ە، دەبێ من بە ڕادەیەك ئامادەگیم تیابێت کە بچمە ژێر ویستی ئەوی ترەوە. بەڵام حەقیقەتی تاڵ ئەوەیە کە خەڵك تا ڕادەیەکی زۆر لەگەڵ یەکدا نەرم نین، کەسێکیش کە نەرمیی تیا نییە کەسێکە بە خودی خۆیەوە خەریکە و لە ئاست ئەوی تردا داخراوە.ئەو خاوەنی ئەو شتەیە کە پێیدەڵێن بوونی خۆی"، لەبەرئەمە ئەو ڕەقێتییە (نەبوونی نەرمی لەلای) لە خەمخواردنییەوە بۆ پاراستنی بوونی خۆی سەرچاوە ئەگرێت، بەڵام ڕێگا بۆ بوونی مرۆیی ڕەسەن وا لە بوونی کراوەدا و بەو بوونەدا تێدەپەڕێت کە توانای بەخششی هەیە و بەدەست و دڵکراوەیی و بە برێکی زۆریشەوە دەیبەخشێت. وەك ئاشکرایە ڕەنگدانەوەی دەستوورەکانی چاخی نوێ (واتە ئینجیل) لەم بیروبۆچوونانەدا دەبینینەوە.

لە سای ئەم شێوەیەی نەرمیدا ئەو کەسە لە بەردەم ئەوی تردا ئامادە دەبێت،مارسیل دەڵێ ئامادەبوون"Presence" دەلالەت لە شتێکی جیاواز و گشتگیرتر لە حەقیقەتی بوون لێرە یان لەوێ دەکات. ئەگەر بمانەوێ وردبین نابێ بە هیچ شتێك بڵێین: ئامادەیە" ، لەبەرئەوەی ئامادەبوون بەندە بە دەرچوونی مرۆڤ لە خودی خۆی یان تێپەڕاندنی خودی خۆی بە ئاراستەی ئەوی تر.

لە ڕێگا زۆر باوەکان کە خەڵك تیایاندا خۆیان تێدەپەڕێنن پەیمان و بەڵێندانە. ئەوە کردەوەیەکی مرۆییە کە دەلالەت لە ڕەسەنایەتی دەکات. ئێمە بەردەوام پەیمان ئەدەین و بۆ نموونە دەڵێین: "پاش کۆبوونەوەکە ئەتبینم" یان "سبەینێ نامەیەك ئەنووسم".. هتد. کۆمەڵیش لە دامەزراندنی خۆیدا پشت بە دڵسۆزی و بردنەسەری ئەو بەڵێنانە دەبەستێت کە داومانن، ئەم بیرۆکەی دڵسۆزییەش زۆر دوور نییە لە بیرۆکەی "ئەمەك

"Loyalty"ەوە "مارسـيل" خۆيـشی دەرکـی بـەو لێکـچوونە کـردووە کـە لـە نێـوان بیروبۆچوونەکانی خۆی و بیروبۆچوونەکانی فەیلەسووفێکی ئەمریکیدا هەیە کە نەوەیـەك پێش خۆیەتی و ناوی "جۆشیا رۆیس" ە و بـڕوای وایـە کـە "ئەمەکداری بـۆ ئەمـەك" بنچینەی ئاکار و بنچینەی کۆمەڵگای مرۆییە. مارسـیل بـڕوای وابـوو کـە کۆمـەڵێك ئەڵقە هەن وەکو زنجیرە پێکەوە بەستراونەتەوە: کەس، بەڵێندان، کۆمەڵ، حەقیقەت. هەڵبەت دانانی حەقیقەتیش لەناو ئەم زنجیرەیەدا ئاماژەیە بۆئەوەی کە ڕێگەی بەڵێن و دڵسۆزی دواجار بەرەو خودامان دەبات.

ئێمە تـا ئێستا بایـەخمان بـەو بیرمەنـدە بوونگەرایانـە داوە کـە بیروبۆچـوونەکانیان سەبارەت بە پەیوەندی بەوی ترەوە مۆرکێکی پۆزەتیڤی ئاشکرای بە خۆیـەوە گرتـووە، بەڵام بەسەرهاتەکە لایەنێکی تریشی هەیە.

لای کیرکەگۆر ئەشێ ئەوی تر ببێتە کۆسپێك لە پەیوەندیمدا لەگەڵ خـوادا، ئەمـەش کرۆکی ڕەخنەکەی "بوبەر"ە لە کیرکەگۆر، ئەو دەستەواژەیەی فەیلەسووفی دانیمارکی بـە نموونـە دەهێنێتـەوە کـە دەڵێـت: "پێویـستە هـەموو کەسـێك لـە هەڵـسوکەوت و پەیوەندیدا بەوانی ترەوە ڕژد بێت و، بە تەنها لەگەڵ خـۆی و خـوادا بـدوێت"، "بوبـەر" ئـەم بیرۆکەیـە وا لێکدەداتـەوە کـە: لای کیرکـەگۆر پێویـستە ئـادەمیزاد تاقەکـەس Singleone بێـت تـا بتوانـێ پەیوەنـدی لەگـەڵ خـوادادا ببەسـتێت. لـە پـشت ئـەم لێکدانەوەیەشەوە ژیان و بەسەرهاتی خودی کیرکەگۆر پەنهانە، ئەوە بـوو مارەبییەکـەی خۆی لەگەڵ "ڕێژین ئۆڵسن"دا هەڵوەشاندەوە لەبەرئەوەی بە بڕوای ئەو، ئەو مارەکردنە دژ بەو ئاخاوتنەی خودا بوو لەگەڵیدا بەوپێیەی تاکەکەسێکی نائاساییە.

---

* جۆشیا ڕۆیس (١٨٥٥–١٩١٦) لە لایەنگرانی هیگڵیزمی نـوێ بـوو لـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانـدا و هـەوڵی دا گونجانێـك لـە نێـوان دڵـسۆزی بـۆ کۆمـەڵ (دەسـتەجەمع) و پاراسـتنی سـەربەخۆیی تاکەکەسدا دروست بکات. لە کتێبـە گرنگـەکانی "ئاقـاری ئایینیانـەی فەلـسەفە" ١٨٨٥ و "ڕۆحـی فەلسەفەی نوێ" ١٨٩٦ و "جیهان و تاکەکەس" ١٩٠٠.

بەڵام ئەمە ئەو خاڵەیە كە "بوبەر" لەگەڵیدا نییە و پێچەوانەی كیركەگۆرە. دەشێ كۆمەڵێك لە خوداناسە مەسیحیەكانیش لەمەدا هاوڕای بن. ئایا ئێمە كاتێ لە كەسەكانی تر خۆمان بە دوور دەگرین پتر لە خودا نزیك ئەبینەوە، یان كاتێ بە ڕووی ئەوانی تردا ئەكرێینەوە لە ڕێی "تۆ"ی كۆتادارەوە بە "تۆ"ی ئەبەدی ئەگەین؟ من خۆم بڕوام وا نییە كە ئەم جیاكردنەوەیە جیاكردنەوەیەكی ڕەهابێت. یان خوا بە تەنها لە ڕێی پەیوەندیبەستن بە كەسانی ترەوە دەناسرێ، بەڵام بێگومان ڕێگایەكی بە پیت هەیە كە لە ڕێی پەیوەندیكردن بە كەسان و ئەوانی ترەوە بەرەو خودامان دەبات، ئەمەش ڕێگایەكە بە خۆبەستنەوە بە ژیانی كۆمەڵی مرۆییەوە تێدەپەڕێت. پێویستە مرۆڤ لە ئاست هەر ڕوانگەیەكدا بە گومان بێت كە بەرگری لە جیابوونەوە لە كەسانی تر (ی كۆتادار) دەكات لە پێناوی دروستكردنی پەیوەندی لەگەڵ خوادا. بەڵام، بۆئەوەی بە ویژدانەوە قسە لەسەر كیركەگۆر بكەین، ئەبێ ئەوەمان لەبیرنەچێت كە لە بیروبۆچوونەكانی ئەودا گەلێ شتی تر هەن و لای ئەو پەیوەندی لەگەڵ ئەوی تردا جێی ڕێز و بایەخێكی ئیجابی بووە و بۆ نموونە لە كتێبی "كارەكانی خۆشەویستی"دا بە وردی وەسفی كردووە.

لای سارتەریش ڕووبەڕووی فەیلەسووفێكی تر دەبینەوە كە بوونی تاكەكەس قورساییەكی زیاتری هەیە لەلای وەك لە بوونی دەستەجەمعی. هەمووشمان ئەو دێڕە بەناوبانگە (یان بەدناوە)ی شانۆنامەی "دەروویەك نییە"مان بیستووە كە دەڵێت "دۆزەخ ئەوانی ترە" "بە مانایەك لە ماناكان دەتوانین بڵێین كە: ئەو مەبەستەی لە پشت ئەم دێڕەوەیە زۆر دەشوبهێتە سەر مەبەستەكەی كیركەگۆر كە لە پێناوی دامەزراندنی پەیوەندییەكەدا لەگەڵ خوادا ئەوی تری بە كۆسپی سەرڕێ دەزانی، هەڵبەت سارتەر بە شێوەیەكی زۆر جیاواز لە كیركەگۆر لەم مەسەلەیە گەیشتبوو. لای سارتەر خودا ڕاستییەكی سەربەخۆ نییە. بەڵكو ناوێكە بۆ ئەو "بەركەماڵی"یەی كە ئامانجی هەموو بوونەوەرێكە، واتە بوونەوەری كۆتادار خۆی ئارەزوویەكە بۆ

بەخودابوون، بەڵام زۆریی ژمارەی بوونەوەرەکان لە جیهاندا دەبێتە کۆسپ لە ڕێی وەدیهاتنی ئەم ئارەزووەدا. ئێمە ناتوانین هەموومان ببین بە خوا.

هەر لێرەوە ئەوی تر بە کۆسپێك ئەزانین لە ڕێی وەدیهێنانی بوونی مرۆییماندا.

دواتر کاتێ دەربارەی ڕۆڵی جەستە لەم پەیوەندییانەدا و بە تایبەتیش دیاردەی میلی سێکسی دەپرسین، دەرفەتی ئەوەمان بۆ دەڕەخسێ کە زیاتر لەسەر شیکردنەوە قووڵەکەی سارتەر سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان کەسەکان بدوێین. بەڵام ئێستا پێویستە هەوڵبدەین لەگەڵیدا بە ویژدان بین، وەك چۆن لەگەڵ کیرکەگۆریشدا بە ویژدان بووین، ئەشێ ئەوی تر لە بنەڕەتدا ببێتە کۆسپ لە بەردەم وەدیهاتنی خودی مرۆڤدا، بەڵام ئارەزووی ئەوەی مرۆڤ ببێت بە خوا ئارەزوویەکی بێمانا و مەحاڵە. لە ڕاستیشدا سارتەر —لە ڕووی کردەییەوە— لەگەڵ ئەوەدایە کە پێویستە مرۆڤ پابەندبێت بەوی ترەوەو گرنگی بە بەرژەوەندییەکان و بەختەوەریی ئەوی تر بدات.

لەم بەشەدا ئەو گرژییە قووڵەمان بۆ دەرکەوت کە لەنێو فەیلەسووفە بوونگەراکاندا هەیە و بگرە هەندێ جار لای یەك فەیلەسووفیش هەیە، ئەویش کەرتبوون و دابەشبوونیانە لە نێوان هەردوو جەمسەرەکەی بووندا: بوونی تاکەکەسی و بوونی دەستەجەمعی. ئێمە وتمان کە تێڕوانینی قووڵتر لای ئەو فەیلەسووفانەیە کە دەڵێن "بوون– لەگەڵ ئەوانی تردا" توخمێکی ڕەسەنترە لە تانوپۆی بوونی مرۆییدا وەك لە بوونی مرۆڤ لە پێناوی خودی خۆیدا. بەڵام لە قۆناغی دواتری شیکردنەوەکەماندا پاساو بۆ هەندێ لەو ئاقارە بوونگەرایانە دەبینینەوە کە بەلای ڕێبازی تاکگەرا Individualismدا دەیشکێننەوە بەو پێیەی جۆرێکە لە ناڕەزایی بەرامبەر ئاقاری دەستەجەمعییانەی دەسەڵاتخوازانە و هەروەها بەسەر بوونی ساختەدا لەگەڵ ئەوانی تردا.

## ٣–جەستە و ئەوی تر، لەگەڵ ئاماژەیەکی تایبەتیدا بۆ مەیلی سێکسی

پێشتر بینیمان کە بوونی مرۆیی لە ڕێی جەستەوە لە جیهاندا هەیە. ئەمە سەبارەت بە بوونی لەگەڵ ئەوانی تریشدا ڕاستە، چونکە ناتوانێ بەرامبەر ئەوانی تر هەبێت تەنها لە ڕێی ئەوەوە نەبێت کە ئەو جەستەیە و، خاوەنی جەستەیە. من هوشیاریم بەوی تر هەیە و دەرکی پێدەکەم لەبەرئەوەی: دەستی لێ ئەدەم و دەیبینم و لە ڕێی ئەندامە هەستیەکانمەوە هەستی پێدەکەم. هەروەها لە ڕێی زمانەوە پەیوەندیی لەگەڵ دەبەستم، زمانیش ڕوونادات تەنها لە ڕێی ئەو ئەندامانەوە نەبێت کە لە توانایاندایە دەنگی قسەکان دەربهێنن، یان ئەو قسانە وەربگرن. ئێمە هەندێ جار سەبارەت بە دیاردەی ختووره‌کردن Telepathy و گواستنەوەی Thought- Transference شت دەبیستین، بە ڕواڵەت وا دەردەکەون پەیوەندیکردن لە ڕێیانەوە، بە هۆی قسە و نووسینی ئاساییەوە نەبێت. بەڵام تەنانەت گەر واش بێت، ئەوەی ئاشکرا و ڕوونە ئەوەیە کە بە جۆرێك لە جۆرەکان هەر پشت بە جەستە دەبەستنەوە. پاشان ئەم جۆرە دیاردانە تا ڕادەیەکی زۆر ئاوارتەن، لەبەر ئەوەی چی پەیوەندیکردنی ئاسایی هەیە لە نێوان کەسەکاندا، ئیدی پەیوەندیکردن بێت لە ڕێی قسەوە یان نیگا و ئاماژەوە، یان بەریەککەوتنی جەستەیی بێت و بەهەر ڕێگایەك بێت، کاتێ کەسەکان ئامادە دەبن — یان پەیوەندی بێت لە ڕێی نووسین یا تەلەفۆن یا ڕادیۆ و هەر ئامرازێکی تری پەیوەندیکردنی دوور– هەموو ئەم پەیوەندیکردنانە بە جەستەوە وابەستەن، هەر بۆیە بوون –لەگەڵ– ئەوانی تردا پێویستی بە جەستەیەکی مرۆییە.

---

* تیلیپاتی: واتە وەرگرتنی ختووره و بیروڕازی یەکتر لە نێوان دوو کەسدا کە مەودایەکی زۆر لە نێوانیاندایە و لە ڕێی هەندێ توانای تایبەتیەوە کە سەر بە پێنج هەستەکە نین.

لە ڕاستیدا، لەناو فەیلەسووفە بوونگەراکاندا کەسێك کە تا ڕادەیەکی زۆر بە وردی ڕۆڵی جەستەی لە پەیوەندییەکانی نێو کەسەکاندا شیکردبێتەوە، سارتەرە . هەندێ لە فەیلەسووفە بوونگەراکانی دی، لەنێویشیاندا هایدیگەر، بە دەگمەن قسەیان لەسەر جەستە کردووە، کە ئەمە بە جۆرێك لە پشتگوێخستن دەژمێردرێ و مایەی ئەفسوسە، یان تەنانەت ئەمە جۆرێك لە نکوولێکردن لە جەستە Docetism . هەر بۆیە لە سارتەرەوە دەستپێدەکەین و ئەو دەکەینە ڕێنومایيکەرمان. بەڵام مادامەکی سارتەر وایدەبینێت کە پەیوەندییە جەستەییەکان لەنێو کەسەکاندا خۆیان لە خۆیاندا جۆرە تێکشکانێکن بۆ خود –ئەمەش دەرەنجامێکی ناچارییانەی ئەو تێڕوانینەیەتی کە دەڵێت هەموو بوونەوەرێکی مرۆیی دەیەوێ ببێتە خودا، هەر لەبەرئەمە ئەوی تر هەر لە سەرەتاوە دەبێتە کۆسپ لە بەردەم وەدیهاتنی ئەم ئارەزووەدا– بۆیە ئێمە هەوڵدەدەین لێکدانەوەیەکی ئیجابیتر بۆ ئەم بابەتە بخەینەڕوو، بە تایبەتیش وەختێ باس لە چالاکیی سێکسی ئەکەین کە لەناو هەموو پەیوەندییەکانی جەستەدا بەوانی ترەوە، قووڵترین و بەهێزترینیانە.

پێشتر شتێکمان سەبارەت بەو شێوازانە وت کە بوونەوەری مرۆیی لە پەیوەندیکردندا بە جەستەی خۆیەوە پەیڕەویی لێدەکات: یان ئەو بۆ من جەستەیەکە و ئەبێتە بابەتێك بۆ بینین و دەسلێوەدان.. هتد یان من ئەبمە جەستەیەك بۆ ئەو و هەست دەکەم ئەبمە بابەتێك بۆ ئەو.

سارتەر دوو سەرنجی وردی سەبارەت بەو شێوازە خستۆتەڕوو کە من لەڕێیەوە دەرك بە جەستەی ئەوی تر دەکەم: سەرنجی یەکەم ئەوەیە کە جەستەی ئەوی تر لە میانی هەڵوێستێکی گشتی Totalیەوە دەرك ئەکرێ، بۆ نموونە ئەو ژوورەی کە کورسی

---

* باوەڕێکی گنۆستیانەی کۆنە کە دەڵێت جەستەی مەسیح جەستەیەکی مرۆیی نییە، یان خەیاڵە و یان تارمایی و یان فێڵێکە لە فێڵەکانی بینین و گەر حەقیقەت بێت ئەوا دەبێ سەر بە توخمێکی ئاسمانی بێت.

و گلۆپ و شتی تری تیایە، لە گۆشەنیگای بوونی جەستەییەوە ڕێکخراوە، بەم جۆرە وا سەیری جەستە ئەکرێ کە پەیوەستە بە جیهانەوە، نەك وەك ئەوەی بڕگەیەکە لە بڕگەکانی ئەم جیهانە، بەڵکو وەك ئەوەی بەکارهێنەری جیهانە. بەڵام سەرنجی دووەم ئەوەیە کە ئێمە وەکو گشتێك دەرك بە جەستەی ئەوی تر دەکەین، بۆ نموونە ئێمە ناڵێین "دەستی بەرزبۆوە"، بەڵکو دەڵێین "دەستی بەرزکردەوە"، لەبەرئەوەی ئێمە جووڵەی دەستی لە خۆی جیاناکەینەوە. ئێمە دەڵێین "فلان دەستی بەرزکردەوە"، لەبەر هەموو ئەمانە سارتەر وای بۆ دەچێت کە: "دەرك کردنم بۆ جەستەی ئەوی تر جیاوازییەکی بنەڕەتیی هەیە لەگەڵ دەرك کردنمدا بۆ شتەکان" .

جەستەی ئەوی تر شت نییە، بەڵکو جەستە ئەو کەسە خۆیەتی، "لای من جەستەی فلان هەرگیز لە فلان خۆی جیاناکرێتەوە". تێگەیشتن لەمە بە مانای تێگەیشتنە لەو خاڵەی کە جەستەی من بۆ ئەوی تر بابەتێکە، وەك چۆن جەستەی ئەویش بۆ من بابەتێکە. کاتێکیش ئەو سەیری من دەکات من وەك بابەتێك بۆ سەیرکردنی ئەو دەرك بە خۆم دەکەم: "جەستەی من بە تەنها ئەو گۆشەنیگایە نییە کە بریتییە لە خۆم، بەڵکو بریتییە لەو گۆشەنیگایەش کە دەبێتە مایەی کۆمەڵێك گۆشەنیگای تر کە من ناتوانم پێکیانبهێنم. جەستەم لە هەموو لایەکەوە لە من هەڵدێ" . هەر لێرەوە من وام لێدێت بە مانایەك لە ماناکان بە جەستەی خۆم بێگانە بم. ئەمەش لە زۆر حاڵەتی ویژدانیدا دەردەبڕین، وەکو حاڵەتی شەرم و شڵەژان. لەبەرئەوەی من بەو شێوەیە هۆشیاریم بە جەستەم دەبێت کە بۆ ئەوی تر دەردەکەوێ، نەك بەو شێوەیەی کە بۆ خەوم دەردەکەوێ.

ئەم پەیوەندییە لەگەڵ ئەوی تردا چۆن چارەسەر دەکرێ بە جۆرێك کە مرۆڤ نەبێتە بابەتێك بۆ ئەوی تر؟! جێی سەرسوڕمان نییە کە دەبینین سارتەر بۆ توێژینەوە لە ئەگەرە جیاوازەکان، پەنا بۆ بەکارهێنانی زمانی چالاکیی سێکسی دەبات، لەبەرئەوەی لێرەدا ئەم زمانە بە شێوەیەکی تایبەتی گونجاوە. بەڵام دەبێ وریابین لەوەی کە

"چالاکیی سێکسی Sexuality" لای سارتەر مانایەکی فراوانی هەیە و هەندێ شێوەی سێکسوالیتی ئەگرێتە خۆی وەك مازۆشیزم و سادیزم ، کە ئەمانەش جۆرێکن لە پەیوەندی کە ناچنە چوارچێوەی پەیوەندیی سێکسییەوە بە مانا تەسکەکەی ئەم وشەیە.

سارتەر لە توێژینەوەیدا لەم پەیوەندییانە وەکو خۆی دەڵێت مۆرکێکی ناودژئاسا و بێبەر دەبینێتەوە کە لە پەیوەندیی سێکسیدا و لە پەیوەندیی نێوان کەسەکاندا ناچارییە. من لە پەیوەندیی خۆشەویستیدا هەوڵ ئەدەم لەوە ڕابکەم کە ببمە بابەتێك بۆ ئەوی تر. لەم چوارچێوەیەشدا خۆشەویستی وەکو خۆشەویستییەکی موڵکدارانە Possessive Love سەیردەکرێ و بریتییە لە ئارەزووی ڕاکێشانی ئەوی تر بۆ ناو خۆم، بۆئەوەی ئەمەش سەربگرێت ئەبێ ئەوی تر منی خۆشبوێت، بۆئەوەی وا لە وی تریش بکەم منی خۆشبوێت پێویستە ببمە بابەتێك بۆ وروژاندنی ئەو خۆشەویستییە. بەم جۆرە ئەم پەیوەندییە بێڕادە ئاڵۆز و نائومێدکەر دەبێت و لە نێوان خۆشەویستی و ڕقدا، لە نێوان ئارەزووی ئەوەی ببمە موڵکی ئەوی تر یان ئەوی تر ببێتە موڵکی من، دێت و دەچێت. بگرە دەشێ مەسەلەکە بگاتە ڕادەیەك کە ئارەزووی ئەوە بکەم ببمە جەستەیەك، بە تەنها جەستەیەك کە هەڵگری خەسڵەتی بوون لەناو خۆیدا en-soi بێت. بەهەرحاڵ ئەو تۆزە ڕەزامەندییەش کە لە ئەنجامی کاری سێکسییەوە دێتە دی، بە کۆتاییهاتنی کارەکە ئەویش لەناودەچێت.

گەرچی ئێمە هەرگیز نکووڵی لەوە ناکەین کە گەلێ ڕوانینی ورد لە توێژینەوەکەی سارتەردا بۆ مەیلی سێکسی هەیە، بەڵام من لەو بڕوایەدام کە دەکرێ مرۆڤ لێکدانەوەیەکی ئیجابی تر بۆ مەیلی سێکسی بکات، لەبەرئەوەی وەجد Ecstasis کە بریتییە لە مەیلی ڕاکێشان بەلای ئەوی تردا هەر بوونی مرۆیی Exostenceیە کە مانای چوونەدەرەوەیە لە

---

* مازۆشیزم Masochism جۆرێکە لە لادانی سێکسی کە تیایدا مرۆڤ چێژ لەوە دەبینێت ئازاری بدەن، ئیدی ئەو ئازارە سێکسی بێت یان ناسێکسی.

سادیزم Sadismیش کە ناوەکەی لە ناوی "مارکیز دۆ ساد"ەوە وەرگیراوە، لادانێکە کە تیایدا مرۆڤ چێژ لەوە دەبینێت ئازاری سێکسی یان ناسێکسیی بەرامبەرەکەی بدات.

خود و تێپەڕاندنی بەرەو ئەوی تر، چونكە تاكەكەس لە پەیوەندیی سێكسیدا لە خودی خۆی دەردەچێت بەرەو ئەوی تر تا یەكەیەكی بوون –لەگەڵ– ئەوی تردا پێكبێنێت. كرداری سێكسیش بە تەنها بریتی نییە لە وەجد و نەشئە، بەڵكو كردارێكی گشتگیر Total یشە. ئارتۆر گیبسۆن كاتێ لەسەر "هینری میللەر" ئەدوێت ئەگاتە ئەوەی بڵێت: "ئەو نهێنییە نارِوونەی لە سێكسدا هەیە هەمان ئەو نهێنییە نارِوونەیە كە لە پەیوەندیكردنێكی گشتیی نێوان دوو بوونەوەردایە" بەم شێوەیە سێكس هەوڵێكە بۆ بەشدارییبوونێكی گشتییانە لە بووندا. ئەگەر ئەو پێداگرتنەی بێردیاییڤیش ڕاست بێت (كە من بڕوام وایە ڕاستە لەسەر ئەوەی كە چالاكیی سێكسیی لای مرۆڤ بە تەنها ئەركێكی بایۆلۆجی نییە، بەڵكو ڕەهەندێكی ئۆنتۆلۆژیشی هەیە)، كەواتە نابێ وا سەیری كرداری سێكسی بكەین – تەنانەت ئەو كردارە سێكسییانەی بە تێپەڕیش دەژمێردرێن– كە بە تەنها مەسەلەیەكی پەراوێزییە بۆ بوونی مرۆیی، بەڵكو ئەو كردارە دەبێ بە قووڵی كار لەسەر كەسە هاوبەشەكان بكات، لەبەرئەوەی ئەم كردارانە گوزارشتن لە شتێك لە گشتێتیی بوون – لەگەڵ– ئەوانی تردا، تەنانەت گەر ئەو گوزارشتە بە شێوازێكی خراپیش ئەنجام بدرێ.

لێرەدا هەقە باسی ئەو جیاوازییە بكەین كە بوبەر لە نێوان "من–تۆ" و "من–ئەو"دا كردوویەتی، كە هەمان جیاوازیی نێوان شتێكە كە لە خودی مرۆییەوە وەكو گشتێك سەرچاوە بگرێت و شتێك كە لەم خودەوە وەكو گشتێك سەرچاوە نەگرێت. هەڵبەت جۆرێك لە زەوتكردنی سێكسی هەیە كە تیایدا زەوتكار بە تەنها وەكو "شتێك" سەیری ئەوی تر دەكات، گەرچی من وام داناوە كە ئێمە بە گوێرەی پێكهاتەمان پێویستە كرداری سێكسی زۆر كارمان لەسەر بكات، تەنانەت گەر خۆشمان لەوە بە ئاگا نەبین. بەڵام ئەگەر یەكێك لە خاسیەتەكانی پەیوەندیی "من–تۆ" ئەوە بێت كە ئەو كەسە وەكو گشتێك بگرێتەوە، ئەوا كرداری سێكسی بە مانایەك لە ماناكان نموونەیەكی ئەم پەیوەندییەیە: هەم وەجدێكی گشتییە و، هەم تەماسێكی گشتی و، هەم ئاڵوگۆڕێكی گشتی.

کاتێکیش کرداری سێکسی دەخەینە چوارچێوەی پەیوەندیی "من–تۆ"وە، دەتوانین وەڵامی ئەو سکاڵایەی سارتەر بدەینەوە کە دەڵێت کامڵبوونی کرداری سێکسی نابێتە هۆی یەکبوون لەگەڵ ئەوی تردا. لێرەدا هەڵەکەی سارتەر روون و ئاشکرایە، لەبەرئەوەی ئەو وەکو شتێکی کامڵی سەربەخۆ و دابراو سەیری کرداری سێکسی دەکات. لە کاتێکدا ئەم کردارە (باشتریش وایە بڵێین ئەم زنجیرە کردارە) لە چوارچێوەی پەیوەندیی نێوان دوو کەسدا روودەدات و ئەم پەیوەندییەش لە کرداری سێکسی خۆی گەلێ فراوانتر و دەوڵەمەندترە، گەرچی ئەم کردارە ناوبەناو ئەم پەیوەندییە چڕتر ئەکات و دەوڵەمەندتری ئەکات. ئەو نەشئە سێکسییەش کە هەروەکو کتێبی پیرۆز دەڵێت تیایدا ئەو دوو کەسە دەبن بە "جەستەیەك" بەشێکە لە نەشئەیەکی بەردەوامی فراوانتر کە بە شێوازی بێشومار و لە "تەماسێکی گشتی"دا بوونی ئەو دوو کەسە دەتەنێتەوە.

لە ئەنجامی پەرەسەندنی ئامرازەکانی رێگرتن لە سکپڕییەوە، ئەمڕۆ لە توانادایە کرداری سێکسی لە زاووزێ جیابکەینەوە. ئەوەندەی ئەمەش دەبێتە مایەی ئازادکردنی تاکەکەسەکان لە رووی پەیوەندیی سێکسییەوە، کە خۆی لە خۆیدا شتێکی باشە، لە چوارچێوەیەکی فراوانتر لە پەیوەندیی "من–تۆ" (هاوسەرێتی)دا، پێویستە پێشوازی لە رێگرتن لە سکپڕی بکەین تا ئەو رادەیەی کە دەبێتە مایەی دەوڵەمەندکردنی پەیوەندییە ئینسانییەکان. بەڵام سەرباری ئەو رۆڵە بنەڕەتیەی سێکس هەیەتی بەوپێیەی شێوازێکە بوونەوەر لە رێی جەستەیەوە خۆی پێتێدەپەڕێنێت تا لەگەڵ ئەوی تردا بێت، لێرەدا مەترسیی سەرهەڵدانی خۆپەرستییەکی دوولایەنە **egoisme a deux** دێتەگۆڕێ. چونکە رێگرتن لە سکپڕی وەکو زۆر دەسکەوتی دی، لە رووی ئەخلاقییەوە دوو مانا لە خۆی دەگرێت. لە چوارچێوەی بەرپرسیارێتیدا دەشێ پەیوەندیی نێوان کەسەکان دەوڵەمەند بکات، بەڵام لەوانەیە کۆمەڵگاش لە قۆناغی بوون –لەگەڵ– ئەوی تردا رابگرێت و بوەستێنێت، بەرلەوەی مرۆڤ بگات بە قۆناغی بوون –لەگەڵ– ئەوانی تردا، پەیوەندی لە نێوان چالاکیی سێکسی و چالاکیی داهێنەرانەدا لێکناترازرێن. گەر چالاکیی جەستەیی

بناغەی جەستەیی سادەترین جۆری کۆمەڵ بێت (یەکگرتنی سێکسی یان هاوسەرێتی) ئەوا ئەو کردارەشە کە توانای دامەزراندنی سیستمی دواتری کۆمەڵی لەخۆگرتووە، کە ئەویش خێزانە.

لەم بەشەدا هەوڵمان دا باسی ئەو رۆڵە بنەڕەتییە بکەین کە جەستە لە پەیوەندیی نێوان کەسەکاندا دەیبینێت، گەرچی ئێمە لەم ڕووەوە گرنگیمان بە سێکس دا بەوپێیەی پایەیەکی تایبەتیی لە پەیوەندییە جەستەییەکاندا هەیە، بەڵام بێگومان شێوازی تری پەیوەندیکردنی جەستەییش هەن، ئەم شێوازانەش زۆرجار لەسەر نموونەی سێکسی لێکدەدرێنەوە. ئەو شتەی کە لە میانی باسکردنی کورتی ئەم بابەتانەشەوە ئاشکرا دەبێت، جۆراوجۆریی شێوازەکانی پەیوەندی و ئاڵۆزبوونێتی. تەنانەت سێکس خۆیشی، بە جۆرەکانی و بە لادانە بێشومارەکانیەوە، ئاماژەیە بۆ ڕادەی فراوانیی ئەم پەیوەندییە. جاری وایە ئەم پەیوەندییە لە حاڵەتی توندڕەوانەیدا، دەگاتە ئەوەی کە مرۆڤێك هێرش بەرێتە سەر ئەوی تر و هەوڵبدات جەستەی وێران بکات و خۆی لێ ڕزگار بکات. بەڵام تەنانەت گەر ئەم هەڵوێستە نەرێیانەشمان بەرامبەر بەوی تر هەبێت، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە ئێمە بە ناچاری لە ڕێی بوونی جەستەییمانەوە، بە شێوازێك لە شێوازەکان، بەوانی ترەوە بەستراوینەتەوە.

## ٤–بوون لەگەڵ ئەوانی تردا

## لە شێوە ڕەسەنەکەی و ساختەکەیدا

زۆربەی ئەم بەشەمان بۆ جەختکردنەوە لەسەر حەتمیەتی بوون لەگەڵ ئەوانی تردا تەرخان کرد. هیچ مرۆڤێك دوورگەیەکی تەریك و دابڕاو نییە، ئەمەشمان لە ڕێی شیکردنەوەی بوونگەرایانەوە بۆ ڕوون دەبێتەوە. بەڵام ئێمە لە تێڕوانینەکەی تریش ئاگادار بووین، وەك چۆن لە ڕێبازی تاکگەرادا لای کۆمەڵێکی زۆر لە فەیلەسووفە بوونگەراکان دەیبینینەوە.

کەواتــە ئێمــە چــۆن دەتــوانین ئــەو ڕاســتییەی کــە شــیکردنەوەی بوونگەرایانــە پێماندەڵێت کە بوونی مرۆیی مۆرکێکی دەستەجەمعییانەی هەیە، لەگەڵ ئـەو ڕاسـتییەدا بگونجێنین کە دەڵێت فەیلەسووفە بوونگەراکان لە زۆربەی کاتدا تاکگەران؟!

لە ڕاستیدا شتێکی زۆر قورس نییـە ئـەوە ڕوون بکەینـەوە کـە چۆن ئـەم دژایەتییـە ڕووکەشــە ســەرهەڵئەدات. زۆربــەی بوونگــەراکان، تەنانــەت ئەوانــەش کــە زۆر بایــەخ بــە بیرۆکە و ماناکانی "من–تۆ" و "بوون لەگەڵ ئەوانی تردا" ئـەدەن، لەسـەر ئـەوە کـۆکن کــە عادەتــەن پەیوەندییــە کۆمەڵایەتییــە مرۆییــەکان وەکــو دەیبیــنین بــە ڕادەیــەك تێکشێواون کـە مایـەی ئەفـسوسن. بـوونی ژیـانی ڕۆژانـە لەگـەڵ ئـەوانی تـردا بـوونێکی ساختەیە، مەبەستم لەوەیە کە ئەمجۆرە بوونـە حەقیقـەتی ئـەو خودانـە ناخاتـەڕوو کـە تیایدا بەشدارن و بەرەنجامی ئەم خودانە نییە وەکو گشتێك. ئەو شێوازەی کە خەڵکیش پێی کۆدەبنەوە شایستەی ئەوە نییە ناوی "کۆمەڵ"ی لێبنێن، بەڵکو ئـەوەی دەیبیـنین تێکـشێواندنە و پەیوەندییـەکی تێکـشێواوە، لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم ئەزموونەشـدا کـە بوونگەراکان تاقیانکردۆتەوە دەبێ لە ڕەخنەگرتنی ئەوان لـە کۆمـەڵگا بگـەین، هـەروەها لە بانگەشەکردنیان بۆ دەرچوونی تاکەکەس لە ناو حەشـامات، تـا ئـەرکی بـوونی خـۆی بگرێتە ئەستۆی.

کیرکەگۆر کە باوکی بوونگەرایی نوێیە نموونەیەکی دانا کە دواتـر زۆر دووبـارە بـۆوە، ئەو بایەخی بە "حەشامات" و "جەماوەر" نەدا، لە ڕاستیشدا بە درێژایی ژیانی هەسـتی بە هاوسۆزی نەکرد لە لایەن ئەو جەماوەرەوە، بەم جۆرە دەڵێـت "حەشـامات خـۆی لـە خۆیـدا ناڕاسـتییە **Untruth**، ئەمـەش لەبەرئـەوەی کـە تاکەکـەس دەکـات بـە کەسـێکی نابەرپرسیار کە نە تۆبە ئەکات و نە پەشیمان دەبێتەوە، یان لانـی کـەم هەسـتکردن بـە بەرپرسیاری لای لاواز دەکات بەوەی کە دەیکات بە پارچەیەك (یان بەشێکی بـچکۆلە لـە گشتێك).. . گەرچی تۆبەکردن یان بەرپرسیارێتی بـە چـەندێتی نـاپێورێ یـان دابـەش نـاکرێ، کەچـی حەشــامات بــەم جــۆرە هەڵیدســەنگێنن، ئەمــەش لــە ڕاســتیدا واتــە

ئەفەرۆزكردنی. كۆمەڵ بە شێوازێكی سامناكانە تاكەكەس كۆنترۆڵ دەكات. "خەڵكی ئەگەر رێگە بە خۆیان بدەن ئاوێتە بن لەگەڵ ئەوەدا كە ئەرستۆ پێی دەڵێت" گەلە" كە ئەوەش وەسفێكە گیانەوەرانی پێ جیائەكرێتەوە، ئەوا ئەم تەجریدبوونە (لە جیاتی ئەوەی وا سەیربكرێ كە لە هیچیش كەمترە، كەواشە، و لە تاكەكەسێكی زۆر نزم نزمترە) وا سەیر ئەكرێ كە شتێكە و زۆری پێ ناچێت ئەم تەجریدبوونە ئەبێت بە خودا" . لەوانەیە لێرەدا كیركەگۆر مەبەستی لە هەندێ فەیلەسووفی توندڕەوی سەدەی نۆزدەیەم بێت كە وای بۆ دەچوون وشەی "خودا" چ نییە جگە لە ناوێكی ئەفسانەیی بۆ كۆمەڵگا. بەڵام بە چاوپۆشین لەوە، ئەو دژ بەو دەسەڵاتە رەهایانە بوو كە كۆمەڵگا بەسەر تاكەكەسدا پیادەی ئەكرد. هەروەها ئاگاداركردنەوەكانی لەوەی كە دەشێ "حەشامات" بگۆڕێت بۆ خودایەك، پاش سەدەیەك ئەنجامەكەی دەركەوت، كاتێك نازیزم دەوڵەتی كرد بە خودا. بەڵام پێویستە لێرەدا سەرنجی ئەوە بدەین كە كاریگەرییە قووڵەكانی ئاقاری دەستەجەمعی و دەزگا تاسێنەرەكان لە سەردەمی كیركەگۆردا لە كڵێسای مەسیحی و بارودۆخی مەسیحیەتی ئەو رۆژگارەدا بەرجەستە بووبوو، كە بە تەواوی لە ئایینی "چاخی نوێ" دابڕابوو:

"پێویستە ئەوە بڵێین و تا ئەو رادەیەی كە دەتوانین بە دەنگی بەرزیش بیڵێین كە ئەوەی پێی دەڵێن جیهانی مەسیحی (كە تیایدا هەموو خەڵك بە جۆرێكی تایبەت مەسیحین و بەو رادەیەی كە چەند ئادەمیزاد هەیە ئەوەندە مەسیحیش هەیە) نەك هەر چاپێكی خراپی مەسیحیەتە، بگرە پڕە لە هەڵەی چاپی وەها كە ماناكان دەشێوێنن و پڕە لە لابردن و ئیزافەی بێمانا، بەڵكو زۆر بێشەرمانە ناوی لە خۆی ناوە مەسیحیەت" .

خۆ ئەگەر كیركەگۆر وشەیەكی بەكارهێناوە كە كەمتر سووكایەتیی تیا بەدی دەكرێ، ئەویش وشەی "حەشامات Crowd"ە، ئەوا نیچە ناوێكی تری زەقتری لێنا كە ئەویش "گەلە Herd"یە. گەلە "سیستمێك لە بەهای داهێنا كە لە رێیەوە بەسەر ژیانی

ڕەگەزی مرۆییدا زاڵ بووە" نیچەش بڕوای وابوو کە گەلە هەڵگری خەسڵەتەکانی خوایە: "ئێستا و، دوای ئەوەی بۆمان دەرکەوت کە خودا مردووە، ئەو پرسیارەی دێتە پێشێ ئەوەیە کە: کێیە قسە دەکات؟ وەڵامی من بۆ ئەم پرسیارە، کە وەڵامێکە لە بایۆلۆژیاوە وەرمگرتووە نەك لە میتافیزیکاوە، ئەوەیە کە غەریزەی گەلە قسە دەکات. واتە ئەو دەیەوێ باڵادەست بێت و دەبینیت دەڵێت "پێویست لەسەرت!"، ڕێگەش نادات تاکەکەس هەبێت تەنها وەکو بەشێك نەبێت لە گشت و بۆ بەرژەوەندیی گشت" لە دیارترین ئەو خەسڵەتانەی کە گەلەش جیادەکاتەوە لای نیچە بریتییە لە "مامناوەندێتی". چونکە ئەو بەرگەی مشتێکی گەورە یان ئاوارتە ناگرێت و هەموو شتێك سادە دەکاتەوە و یەکسانی دەکات تا ببێتە شتێکی باو و ئاشنا و بێ زیان.

گومان لەوەدا نییە کە لە وەسفەکانی هایدیگەردا بۆ "ئەوان They" (کە مەبەستی پێێ خەڵکە بە شێوەیەکی گشتی و بێ دیاریکردن) دەنگدانەوەی نیچە دەبینین. "ئەوان" ئەو هێزە نەناسراو و بێسیمایەیە کە بەسەر هەمووماندا زاڵە. هایدیگەر بە وردی زاراوەی "ئەوان" ی بەکارهێناوە، لەبەرئەوەی ئەم وشەیە بەردەوام لەسەر زمانمانە: "ئەمساڵ ئەوان ئادەمیزادێك بۆ سەر مانگ دەنێرن"، "ئەوان هەرگیز بایەخ بە مەسەلە ڕاستەقینەکان نادەن". وشەی "ئەوان" دەشێ مەبەست لێێ هەموو کەسێك بێت یان هەرکەسێك و یان کەسیش نا! وشەی "ئەوان" واتە ئەوانی تر، بەڵام ئەوانی تر بەبێ دیاریکردن، گەرچی لەگەڵ ئەمەشدا بەسەر ژیانماندا زاڵن.

لەوانەیە ببێتە دووبارەکردنەوە گەر هەندێ دەق لە "هایدیگەر" وەربگرین کە زاراوەی "ئەوان They" بە وردی شیدەکاتەوە. چونکە بیروبۆچوونەکانی لەم بارەیەوە زۆر لە بیروبۆچوونەکانی کیرکەگۆر و نیچەوە نزیکن. "ئەوان" دژ بە ئازادیی هەڵبژاردنە و نایەوێت تاکەکەس ئەرکی بەرپرسیارێتی بگرێتە ئەستۆ و، هەموو شتێك سادە ئەکاتەوە و دەچێتە ئاستی ناوەڕاستەوە و پێوەرەکانی زەوق و ئاکار دیاریدەکات. بەڵام هایدیگەر بیرۆکەیەکی نوێمان سەبارەت بە پەیوەندیی تاکەکەس بە "ئەوان"ەوە لە ژیانی

ڕۆژانەیدا بۆ دەخاتەڕوو: هەموو كەسێك ئەوی ترە، كەسیش خۆی نییە. پاشان بە وردی ئەم بیرۆكەیە فراوان دەكاتەوە بەوەی كە دەڵێت: خودی تایبەت بە بوونی ڕۆژانەی دیاریكراو Dasein "خود-ی ئەوان They-Self"ە كە لە خودی ڕەسەن جیای دەكاتەوە- واتە لەو خودەی كە بە شێوەی تایبەتی خۆی هەڵبژاردووە. كاتێكیش دازاین دەبێتە خودێكی وابەستە بە "ئەوان"ەوە، لەناو "ئەوان"دا ون دەبێت، پێویستیشە یەكەمجار خودی خۆی بدۆزێتەوە . ئەمەش پێویستی بە بەناویەكداچوونی حەتمیی نێوان تاكەكەس و ئەوانی ترە، بەڵام ئەمە پەیوەندییەكە تاكەكەس لە خودی ڕاستەقینەی خۆی بێبەش دەكات و بە تەواوەتی ئەیخاتە ژێر كۆنترۆڵی ئەوانی ترەوە، لەگەڵ ئەمەشدا خۆیشی بە شێوازێكی ناودژ ئاسا لە مسۆگەركردنی ئەو كۆنترۆڵە ناشەخسییەی "ئەوان"دا بۆ خۆی بەشداری دەكات.

كارل یاسپەرزیش دەستەواژەی "ئاپۆرە mass" بەكاردێنێت بە مەبەستی زاڵبوونی خەڵكی ڕەمەكیی بێ هزر بەسەر ژیان و بەسەر پێوەرەكاندا. دەشڵێت كە ئەم مەترسییە بە ڕادەیەكی زۆر لە هەلومەرجی گوزەرانی كۆمەڵگای پیشەسازی و شارستانیدا بڵاوبۆتەوە و بە تایبەتیش لە كتێبەكەیدا "مرۆڤ لە چاخی نوێدا" ئەمە دەخاتە ڕوو.

تەنانەت مارتین بوبەریش سەرباری ئەوەی جەختی لەسەر گرنگیی لایەنی پۆزەتیڤی پەیوەندیی نێوان كەسەكان دەكرد، تەواو ئاگای لە دیوی ئەودیوی دراوەكە بوو. ئەو گەرچی تەواو لە ئاقاری تاكگەراییش دوور بوو، بەڵام دەیگوت كە شێوەی پەیوەندیی "من- تۆ" بەردەوام هەڕەشەی لەسەرە كە بۆ شێوەی پەیوەندیی "من- ئەو" بگۆڕێت، پەیوەندیی ڕاستەقینەی نێوان كەسەكان گوڵێكی دانسقەیە، هێندەی پێناچێت سیس دەبێت.

بەڵام ئەو پێوەرە چییە كە ئادەمیزاد لە حاڵەتی بوونی لەگەڵ ئەوانی تردا، بوونی ڕەسەنی پێ لە بوونی ساختە جیادەكاتەوە؟ بوونی ڕەسەن لەگەڵ ئەوانی تردا ڕێك ئەو جۆرەی پەیوەندییە بەوی ترەوە كە كاری جەختكردنەوەیە لەسەر بوونی مرۆیی بە

هـەموو ماناکـانی ئـەم وشـەیە. واتـە ڕێخۆشـدەکات تـا مـرۆڤ لـە ڕێـی هەڵبـژاردن و بەرپرسیارێتییەوە وەکو مرۆڤێك دەربکەوێت. بـەڵام بـوونی سـاختە لەگـەڵ ئـەوانی تـردا ناهێڵێت لایەنە مرۆیی و شەخسیە ڕەسەنەکان دەربکـەوێت. هـەر پەیوەندییـەك لەگـەڵ ئەوانی تردا چەند مرۆڤ لە لایەنە شەخسی و مرۆییەکـەی داماڵێـت، ئەوەنـدە ئـەو بوونـە بـوونێکی سـاختەیە. بـەم پێیـە ئێمـە لێرەدا موفارەقـە Paradoxێـك دەبیـنین، بـوونی تاکەکەسییانەی پـەتی شـتێکی مەحاڵـە و نـاکرێ نـاوی بـوونی مرۆیـی لێبنـێین، لەگـەڵ ئەوەشدا دەڵـێین کـە بـوون لەگـەڵ ئـەونی تـردا کاتێك ڕەسـەن دەبێـت کـە "ڕێ بـدات تاکەکەسەکان ئـازاد بـن تـا گوزارشـت لـە تـاکێتیی کەسـێتیی خۆیـان بکـەن". کۆمـەڵی ڕاستەقینە ئەو کۆمەڵەیە کە ڕێگا بە فرەچەشنی بدات.

بوونی ساختە لەگەڵ ئـەوانی تـردا ئـەو بوونەیـە کـە یەکتـەرزی Uniformity بەسـەر خەڵکدا ئەسەپێنێت و دەشێ ئەمە لە تێگەیشتنێکی هەڵەوە بێت لە پرنسیپی یەکسانی کە ناهێڵێـت کـەس تایبەتمەنـدێتیی خـۆی هـەبێت. هەنـدێ جـار ڕەخنـەی فەیلەسـووفە بوونگـەراکان لـە بـوونی دەسـتەجەمعی mass- existence بـە جۆرێـك لـە "دەمـارگیریی ئۆرستۆکراسیانە" وەسـف کراوە، هەڵبـەت مـەیلی لـەم چەشـنە لای هەنـدێ نووسـەری بوونگەرا هەیە، بەڵام من لەو بڕوایەدام کە خەڵك نە بەرگەی لاوازی دەگرێت و نە بەرگەی هێز، نە بەرگەی ژێردەستی دەگرێت و نـە بەرگـەی باڵادەسـتی، ئەمـەش زۆر بـە ڕوونـی نیچە پەی پێ بردووە: "بە ڕای من گەلە خوازیارە ئادەمیزادەکان یەك جۆر بن و کـاریش بۆ ئەوە دەکات، بەمەش لە دوو سەرەوە بەرگری لـە خـۆی دەکـات: دژ بەوانـەی کـە لـە ئاستی خۆی دابەزیون (وەکـو تاوانبارەکـان.. هتـد) و دژ بەوانـەی کـە چـوونەتە سـەروو ئاستە وەستاوەکەی ئەوەوە" .

---

* Egalitarianism تێگەیـشتنی هەڵـە لـە یەکسانی کـە لـە سـەردەمی شۆڕشـی فەرەنـسیدا هاتـە ئـاراوە، بـڕوای وابـوو کـە یەکسانی بریتییـە لـە یەکسانکردنی (یـان چـوونیەك کردنـی) خـەڵك و نەهێشتنی هیچ جیاوازییەکی تاکەکەسی لە نێوانیاندا نەك یەکسانکردنیان لە بەردەم یاسادا.

كەواتە ئەو شتەی كە بـوونی دەسـتەجەمعییانەی سـاختە ناتوانێـت بەرگـەی بگرێـت "جیاوازی"یە، واتە هەر شتێك كە لە پێوەری باو نەچێت. لێرەوە هەڵەیـە گـەر وابـزانین ئەم جۆرەی بوون بە تەنها دەیـەوێ ئاسـتە بـەرزەكان وەكـو ئـەوانی تـر نـزم بكاتـەوە. ئەمەش هەمان هەڵوێستی بوونگەرایانەی دەمارگیرانەیە دژ بە كەسی جیاواز لـە ڕەنـگ و ڕەگەزدا، خۆ ئەگەر كەسێك جیاواز بوو: "ئەوا ئەو جیـاوازە و لـە ئێمـە نییـە"، هـەروەكو چۆن لە دەربڕینە میللیەكانماندا وا دەڵێین. تەنانەت كەسە كەمئەندامـەكانیش سـەرباری ئـەو قـسە بەزەییئامێزانـەی لـە بارەیانـەوە دەیكـەین، زۆرجـار دەبنـە قوربـانیی جیاوازیكردن، لەبەرئـەوەی لەگـەڵ پێـوەری بـاودا نـاگونجێن و لـە "ئـەوانی تـر" ناچـن. لەبەرئەوەی وا سەیری ڕەخنەی بوونگەرایانە لە "جـەماوەر"یـش دەكـرێ كـە جـەماوەر دەیـەوێ لـە ئاسـتی ئـەو كەسـە "ئاوارتـە"انـە كـەم بكاتـەوە كـە لـە سـەروو كەسـە مامناوەندییەكانـەوەن، پێویـستە ئـەوەش بڵـێین كـە ئـەنگێزەی دەسـتەجەمعی بـۆ یەكتـەرزكردن جێـی ئـەو كڵۆڵانەشـی تیـا نابێتـەوە كـە لـە خـوار ئاسـتی ئاسـایی یـان مامناوەندییەوەن.

گومان لەوەدا نییە كە بەشێكی زۆری ئـەوەی پێـی دەگـوترێ ڕۆحـی دەسـتەجەمعی لەسەر ئاستی پەیوەندییە ڕۆژانەكانی نێوان كەسەكان، سەر بە جۆرە ساختەكەیە. واتـە ئەوەی پێی دەوترێ: جەماوەر، یان گەلە، یان حەشامات، یـان "ئـەوان" و هەرچـییەكی ناو دەنێیت. ئەمانە هەموو بریتین لە گوشار لـە پێنـاوی یەكتـەرزی (یـان چـوونیەكی)دا، ئەمەش شتێكە كە لە سەردەمی نوێدا و لەسای ڕاگەیاندن و بەرهەمهێنانی بە كۆمەڵـەوە زۆر پەرەی سەندووە كە كۆمەڵگا بەرخۆرەكانیان تەنیوەتەوە. ئەبێ لەبەر ڕۆشنایی ئەم باكگراوەندەدا لە تاكێتیخوازیی بوونگەراكان تێبگەین. كۆمـەڵێكی دروسـت پێكنایـەت تـا ئەو تەوقەی بوونی تێكشێواو لەگەڵ ئەوانی تردا نەشكێنرێ. دەكرێ ئەمەش بە قۆنـاغی "هێزی ڕەش" بشوبهێنین، ململانێی قولەڕەشەكانی ئەمریكا لە پێنـاوی بەدەسـتهێنانی مافی تەواوی هاووڵاتێتیدا. بەڵام بەرلەوەی پەیوەندییەكی ڕەسەن و پـۆزەتیڤ فۆرمەلـە

ببێـت، دەبـێ پەیوەنـدیی سـتەمکارانە تێکبـشکێت و هەسـتکردن بـە سـەربەخۆیی و کەرامەت دروستبێت.

بەڵام تەنانـەت لـەم حاڵەتەشـدا وەك دەردەکـەوێ لـە نێـوان دوو جـۆر بوونگەرایيـدا سەبارەت بە کێشەی بوون لەگەڵ ئەوانی تردا ڕای جیاواز هەیە. یەکێکیان دەڵێت کاتێـك تاکەکـەس پەیوەنـدیی خـۆی لەگـەڵ کۆمـەڵگای سـاختەدا دەپـسێنێت، ئەمـە دەبێتـە هـەنگاوی یەکـەم لـە ڕێـی ئازادبوونـدا کـە ڕێ بـۆ دامەزرانـدنی پەیوەنـدیی ڕاسـتەقینەی ڕەسەن لەگەڵ ئەوانی تردا خۆشدەکات. بەڵام جۆری دووەم بڕوای وایە کە هەرچی هەوڵ هەیە لە پێناوی گەیـشتن بـە بـوونێکی ڕەسـەن لەگـەڵ ئـەوانی تـردا، هـەوڵی بێـسوود و بێهوودەن، پێدەچێ ئەم تێڕوانینەی دووەمیان زیـاتر سـارتەر پـەیڕەویی لێکردبێـت، بـە تایبەتیش ئەو ماوەیەی کە "بوون و نەبوون"ی تیا نووسیی. بەڵام ئـاڵۆزیی پەیوەندییـە مرۆییـەکان و ناڕوونییـان و ئـاڵوگۆڕی دەورەکـان، نابـێ وامـان لـێ بکـەن ئـەنجامگیریی بەدبینانە بکەین. لێکۆڵینەوەکـەی "سـارتەر" بـۆ پەیوەنـدیی سێکسی زۆر دەشـوبهێتە سەر لێکۆڵینەوە قووڵ و وردەکەی هیگڵ بۆ سـەروەر و کۆیلـە . بـەڵام ئـەبێ ئـەوەمان لەیاد نەچێت کە ئەم پەیوەندییە تایبەتییە دوا قسە نـەبووە سـەبارەت بـە دیالـەکتیکی ڕۆح.

گەر واپێدەچێت کە فەیلەسووفانی بوونگەرا پەیوەندیی نێـوان کەسـەکان وا دەبیـنن کە عادەتەن لە ئاستی ساختە و ناڕەسەندا دەمێننەوە و، هەروەها گەر واپێدەچـێت کـە ڕێبازی تاکگەرا پەسەند ئەکەن بەوپێیەی یاخیبوونێکە دژ بەو سـاختەییە، بـەڵام هێـشتا ئەمە دوا قسە نییە لەم شیکردنەوەیەدا. وێڕای هەموو ئەمانەش ئەبێ دان بـەوەدا بنـێین کە زۆربەی ئنم فەیلەسووفانە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشـکرا شـێوەی بـوونی ڕەسـەنیان لەگەڵ ئەوانی تردا دیاری نەکردووە.

# بەشی شەشەم

## زانین و تێگەیشتن

١-بوونگەرایی و تیۆرەی زانین.
٢-تێگەیشتن و لێکدانەوە.
٣-شێوەکانی زانین.
٤-کێشەی حەقیقەت.

## ١–بوونگەرایی و تیۆرەی زانین (یان تیۆرەی مەعریفە)

کێشەی زانین (ئەپستمۆلۆجی Epistemology) بە شێوەیەکی توندوتۆڵ بە کێشەی بوون (ئۆنتۆلۆجی Ontology)ەوە بەستراوەتەوە، هەموو لافلێدانێکی زانین دەبێ گوزارشتێکمان بداتێ سەبارەت بەوەی کە هەیە و نییە، لە کاتێکا هەموو گوزارشتدانێك لە واقیع لافلێدانی زانینە، لەبەر ئەم پەیوەندییە ئاڵوگۆڕەش زەحمەتە بزانین ئاخۆ ئەو قسەیەمان هیچ مانایەکی هەیە کە بڵێین تیۆرەی زانین (ئەپستمۆلۆجی) پێش تیۆرەی بوون (ئۆنتۆلۆجی) کەوتووە، یان تیۆرەی بوون پێش تیۆرەی زانین کەوتووە.

لەگەڵ ئەمەشدا عادەتەن لە مێژووی فەلسەفەدا یەکێك لەم دوو کێشەیە پێش ئەوی تریان خراوە. لە سەردەمی تازەدا کێشەی زانین پێش خراوە، ئەوەبوو دیکارت لە رووی ئەقڵگەرایی و لۆکیش لە رووی ئەزموونگەراییەوە جووڵەیەکی بەهێزیان بە لێکۆڵینەوەی فەلسەفی لە بنچینەکانی زانین و تێگەیشتنی مرۆیی بەخشی. هەرچۆن "کانت"یش بەر

لە هەر شتێك لە مەرجەکان و سنوورەکان و ڕادەی ڕاستیی زانینی بە شێوازێك کۆڵییەوە کە کاریگەریی لە هەموو فەلسەفەکانی دواتری خۆی کرد. ئێمە ئەتوانین چی بە یەقین بزانین؟ ئەمە پرسیارێکی بنەڕەتی بوو، کەسیش مافی نەبوو (باوەڕی باو لای زۆربە وابوو) بەرلەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، پرسیاری تر لە واقیع بکات.

بەڵام بە سەرهەڵدانی بوونگەرایی ئەم نەزمە باوە ئاوەژوو بۆوە و گومان لە ڕەوایەتیی سەروەرێتیی تیۆرەی زانین کرا کە بۆ ماوەیەکی زۆر درێژخایەن باڵادەست بوو. لە فەلسەفەی بوونگەراییدا بوونی مرۆیی خاڵی دەستپێکردنی دانپیانراوە.

گەرچی ئەبێ سەرنجی ئەوەش بدەین کە ئەمەش مانای "بیرۆکە"ی بوونی مرۆیی نییە، بەڵکو بوونی زیندوو کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و بەوپێیەی بوونەوەری مرۆیین پەیوەندیی پێوە دەکەین. لەبەرئەوەی ئەم فەلسەفەیەش لە واقیعەوە (کە بوونی مرۆییە) دەستپێدەکات، بۆیە کێشەی زانین دوای ئەو سەرهەڵئەدات و بە دوای کێشەی بووندا دێت و، هەروەکو هایدیگەر دەڵێت "زانین جۆرێکە لە بوون کە سەر بە بوون– لە– جیهاندایە" .

پاشان لە سەری دەڕوات و دەپرسێت کە ئاخۆ ئەم دەستەواژەیە کێشەی زانین ڕەت ناکاتەوە، واش پێدەچێت کە بە مانایەك لە ماناکان ڕەتیکردبێتەوە. لە ڕاستیدا فەیلەسووفە بوونگەراکان کاتێکی زۆر بە لێدوان لەسەر کێشەی زانینەوە لە شێوە سوننەتیەکەیدا ناکوژن، ئەمەش وەکو هەندێ کەس بۆی دەچن بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە فەیلەسووفە بوونگەراکان هەموویان ئاقاری ئەقڵگەرایی پەتی ڕەتدەکەنە و کۆمەڵێك بوونەوەری عاتیفین کە بایەخ بە ویژدان و جۆش و خرۆش ئەدەن و بەم جۆرە گرنگی بە زانین و تێگەیشتنی ورد یان حەقیقەت نادەن. بەڵام فەیلەسووفە بوونگەراکان هەرگیز ئەوەندە بێدەربەست نەبوون و بێ ئۆقرەییان سەبارەت بە کێشەی ئەپستمۆلۆژی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان بڕوایان وایە کە ئەو شێوازە باوەی سەبارەت بە کێشەی زانین لە ئارادایە شێوازێکی هەڵەیە و کێشەیەکی ساختە دەخوڵقێنێت.

هەڵەکەش لەوەدایە کە مرۆڤ لە دوو قەوارەوە دەستپێبکات کە گریمانە ئەکرێ تەواو لێك جودا بن، پاشان هەوڵبدات بەیەکەوە کۆیانبکاتەوە. خۆ ئەگەر مرۆڤ لە خودی بیرکەرەوە Res Cogitans و گەردوونی ماددی Res Extensaوە دەستپێبکات، ئیدی چۆن خودی مرۆیی دەتوانێ لە خودێتیی خۆی دەربچێت تا جیهان بناسێت؟

بێگومان یەکەم هەنگاویش کە دیکارت لە ئەنجامگیرییەکەیدا نای، عادەتەن وا سەیرکراوە کە بەهێزترین پاساوهێنانەوەیە لە فەلسەفەدا، کە دەڵێت "من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم Cogito, Ergo, Sum" گومانی قووڵیشم جۆرێکە لە بیرکردنەوە کە بەڵگەیە لەسەر بوونم. بەڵام فەیلەسووفی بوونگەرا ڕەخنە لەم پاساوە کلاسیکییە دەگرێت و بە ئەبستراکت وەسفی دەکات، من لە بنەڕەتدا خودێکی بیرکەرەوە نیم، بەڵام من بەر لە هەموو شتێك بوونەوەرم، بوونیش شتێکی زۆر فراوانترە لە بیرکردنەوە و پێش ئەویش دەکەوێت.

فەیلەسووفی بوونگەرا دەیەوێت ئەم پاساوە هەڵاوگێڕیکاتەوە و بڵێت: "من هەم، کەواتە من بیردەکەمەوە". بەڵام مەبەستی چییە کە دەڵێت: "من هەم؟" مەبەستی لەوەیە کە من بە شێوەیەك هەم کە دەتوانم خودی خۆم تێپەڕێنم.. Exist.

بەڵام ئەم جۆرەی بوونیش هاوواتای گوتەی "بوونەوەر –لە– جیهاندا"یە، یان بە دەستەواژەیەکی دی: "من لەگەڵ– ئەوانی تردا هەم". بەم جۆرە ئەنجامگیریی لۆژیکییانەی پاساوەکە هێندەی وشەی "من بیردەکەمەوە" یان تەنانەت "من هەم" ئەبستراکت نانوێنێت. لەبەرئەوەی لێرەدا دەربڕینەکە واقیعەکەیە بە هەموو دەوڵەمەندی و ئاڵۆزییەکەیەوە: من –لەگەڵ– ئەوانی تردا –لە– جیهاندا. ئەم واقیعەش شتێك نییە لە ڕێی پاساوێکەوە یان تیۆرەیەکی ئەپستمۆلۆژییەوە دابمەزرێنرێ: بەڵکو یەکەم پێدراوە کە دەبێ دواتر بیری لێبکەینەوە و پەردە لە ڕووی هەڵبماڵین.

جۆن ماکمۆری بە وردی لە هەوڵی گواستنەوەی سەرەتای فەلسەفەی لە خودی بیرکەرەوەی ئەبستراکتەوە بۆ بناغەیەکی زیندووتر لە ئەزموونی مرۆیی گشتگیری فرە

ڕەهەند کۆڵییەوە، ئەزموونی چوونە ناو شتە دونیاییەکانەوە، کاتێك زاراوەی "من دەکارم" (لێرەدا وشەی دەکارم بە مانای" کاردەکەم یان کردەوە ئەنجام ئەدەم" هاتووە —و. کوردی) — یان خود بەوپێیەی بکەرە— جێی "من بیردەکەمەوە" دەگرێتەوە، ئەو وتی کە پێویستە شێوە دارِشتنی یەکەم ببێتە سەرەتا بۆ دەستپێکردنی فەلسەفە. بەڵام "من دەکارم" بە تەنها "دژ" بە "من بیردەکەمەوە" نییە، بەڵکو چەمکی "کار —یان کردار— وەکو ئەو دەڵێت، چەمکێکی گشتگیرە.." . چونکە کردار (بەرامبەر بە چالاکیی هەرەمەکییانە) بیرکردنەوەش ئەگرێتەوە. بەڵام خودی بیرکەرەوە دامالینی خودە بەو پێیەی بکەرێکی گشتگیرە. "ماکمۆری" پەیوەندییەکانی نێوان خود بەوپێیەی بکەرە و خود بەوپێیەی بیرکەرەوەیە لەم چوار مەسەلەیەدا پوخت دەکاتەوە:

١—خود بکەرە و بە تەنها وەکو بکەر بوونی هەیە.

٢—خود بیرکەرەوەیە، بەڵام بۆیە بیرکەرەوەیە چونکە بکەرە.

٣—خود بیرکەرەوەیە لە خۆی و لە پێناوی خۆیدا بەوپێیەی بکەرە.

٤—خود بکەرە لەبەرئەوەی بیرکەرەوەشە .

"ماکمۆری" دەڵێت هەڵبژاردنی شێوە دارِشتنی "منی بکەر" لەبری "منی بیرکەرەوە" وەکو سەرەتایەك بۆ فەلسەفە گەلێ کێشە لە کۆڵ دەکاتەوە کە کێشەی دژوارن لە فەلسەفەدا، بە تایبەتیش وەکو کێشەی دوالیزمی هۆش و مادە، جەستە و دەروون، خود و جیهان، کە لە کێشەکانی فەلسەفەی نوێن.

بۆچوونەکەی ماکمۆریش لەم بارەیەوە لە هەڵوێستی گەلێ فەیلەسووفی بوونگەراوە نزیکە. بۆیە لێرەشدا ئەومان بە نموونە هێنایەوە، لەبەرئەوەی بە وردی لە نووسینەکانیدا لەسەر ئەم کێشەیە دواوە، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە بخرێتە ڕیزی بوونگەراکانەوە. بەهەرحاڵ، کێ بە ویستی خۆیشی ئەم نازناوەی بەسەردا دابڕاوە؟!

بەڵام پێویستە ڕووبەڕووی ئەو کێشەیە ببینەوە کە ئاخۆ فەیلەسووفی بوونگەرا (یان ئەوانەی وەکو ئەوان بیردەکەنەوە) خۆی لە کێشەی زانین دوور ڕاگرتووە و بابەتێکی لە کۆڵ خۆی کردۆتەوە کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بە یەکێك لە ئاڵۆزترین و دژوارترین کێشەی بنەڕەتیی فەلسەفە لە قەڵەم دراوە؟! ئایا لێرەدا هەوڵێك دەبینینەوە کە دەیەوێت ڕێگایەکی کورت بگرێتەبەر و تەسلیمی شتێك ئەبێت کە پێویستە بسەلمێنرێ؟! بە بروای من نەخێر. بەڵام ئێمە کە ئەوەمان سەلماندبێت کە کێشەی زانین کێشەیەکی سەخت و دژوارە و، بگرە بە ڕواڵەت بێ چارەسەریشە، ئایا هۆکەی بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە بە شێوازێکی هەڵە داڕێژراوە؟ لەبەرئەوەی ئەگەر مرۆڤ کەسی زانا و شتی زانراوی بە دوو شتی لە یەك جودای لە قەڵەم دان، لەوانەیە دواتر مەحاڵ بێت بتوانێت پێکەوە کۆیان بکاتەوە، یان بە شێوازێکی قەناعەتپێکەر خۆی لە تەڵەزگەی "ڕێبازی هەرمنی Solipsism" دەربازبکات. بەڵام (هەروەکو پێشتریش وتمان) فەیلەسووفی بوونگەرا لە دوو شتی جوداوە دەستپێناکات تا دواتر پێکەوە کۆیانبکاتەوە، بەڵکو لە یەکەی: (بوون –لەگەڵ– ئەوانی تردا –لە– جیهاندا) وە دەستپێدەکات. لەو بنچینەیەوە دەستپێدەکات کە بە لایەوە گرنگە: ئەویش ئەوەیە کە خودێکی دابڕاو نییە لە سەرێکەوە کە پاشان بە جیهانەوە ببەسترێتەوە یان بە کۆمەڵێك خودی ترەوە کە ڕووبەڕووین. بەڵام ئەوە کێشەی ئەپستمۆلۆژیا (کێشەی زانین) ناسڕێتەوە، کێشەی مەرجەکانی زانینمان و سنووری زانینمان و حەقیقەتی، بەڵکو شێوەیەکی تر بە کێشەکە دەبەخشێت و وا سەیری بوون دەکات کە زانین لەخۆدەگرێت (یان کرداری بیرکردنەوە یان خود بەوپێیەی بیرکەرەوەیە) چونکە زانین جۆرێکە لە بوون –لەگەڵ– ئەوانی تردا، واتە وا سەیری ئەکات کە وەکو ئەو پەتە وایە بە گرێ هۆنرابێتەوە، لەم حاڵەتەشدا گرێکانیش هەر بریتین لە پەتەکە خۆی و دەچێتە ناو پەیوەندییەکی فرەچەشنەوە، بەم جۆرە کێشەی ئەپستمۆلۆژی دەمێنێتەوە، بەڵام دەبێتە کێشەی جیاکاری و پۆلێنکردنی ئەم پەتە تایبەتییە و خستنەڕووی

شـیکردنەوەیەکی فینۆمینۆلـۆجی بـۆ پەیوەنـدیی خـود —بـە جیهانـەوە لـە مۆرکـە ئەپستمۆلۆژییە تایبەتیەکەیدا. بێگومان دەبێ ئەم جـۆرە شـیکردنەوەیەش چارەسـەری بابەتگەلی وەکو: سروشتی تێگەیشتن، جۆرەکانی زانین و کێشەی حەقیقەت بکات.

ئەوەبوو لە بەشەکانی پێشوودا بنەماکانی ئەم باسەی ئێستامان دامەزرانـد، چـەمکی بوون Existence خۆی بەوپێیەی دەرچوونی مرۆڤە لە خـودی خـۆی کۆمـەڵێك نـاوەرۆکی گرنگی پەیوەستدار بە تیۆرەی زانینەوەی گرتە خۆی. کاتێکیش ئەو بوونەمان هەڵبـژارد کە خۆی تێدەپەڕێنێت Ex- sistence بەوەی کە وەسـفی گونجـاوە بـۆ دۆخـی مـرۆڤ، کـە ئەویش خەسڵەتی کرانەوەیە Openness، یان لانی کەم ئەو توانایەی هەیە. بـوونی مـرۆڤ واتە بوونی لە دەرەوەی خودی خۆی و، واتـە لـە پـاڵ ئـەوانی تـردا بێـت. چـونکە مـرۆڤ هەرگیز خەڵوەتچی نەبووە و هەرگیزیش خودێکی داخراو نەبووە بەسەر خۆیدا، کە تەنها بە خودی خۆی ئیکتیفا بکات و دواتر لەو خودە دەربچێت تا پەرە بـە پەیوەنـدیی خـۆی لەگەڵ جیهان و خودەکانی تردا بدات. بەڵکو ئەو لە بنەڕەتدا لە خودی خۆی دەردەچێت تا لەناو شتەکان و لەناو کەسـەکانی تـردا بێـت. ناشـتوانین پێـی بڵـێین (هەیـە) ئەوکاتـە نەبێت کە دەچێتە ناو ئەم جۆرە پەیوەندییانەوە.

بـەڵام ئـەوەی کـە لـە چـەمکی بوونـدا شـاراوە بـوو، لـە باسـکردندا بـۆ جیهـان و بوونەوەرانی تر ڕوونتر بۆوە. پێشتر ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە هیچ بوونێکی مرۆیـی نییـە بەبێ جیهان و بەبێ بوونەوەرانی تر. بەم جۆرە دەبیـنین کـە ناسـینی جیهـان و ناسـینی ئەوانی تر بەبێ بوون مومکین نییە. لێدوانیشمان لەسەر جەستە لەو بابەتە کەم بایـەختر نییە. بوونی تۆ بە تەنها مانای ئـەوە نییـە کـە تـۆ جەسـتەیەکت هەیـە، بـەڵکو واتـە تـۆ جەسـتەیت و لـە ڕێـی بوونتـەوە وەك دەسـتەیەك ئیـدراکی هەسـتی و هەسـت و سـۆز و توخمە پێکهێنەرەکانی تری مەعریفەت دەبێت. کاتێ بە بوونەوەرێك دەڵـێین جەسـتەیە، واتە یەکەیەکی دەروونی —جەستەییە Psychosomatic.

دیسانەوە لێرەشەوە فەیلەسووفی بوونگەرا ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە لە دوالیزمی دەروون و جەستەوە دەستپێبکات. بەڵام ئەمەش ئەو ئەرکەی لە کۆڵ ناکاتەوە کە پێویستە باشترین لێکدانەوەمان سەبارەت بە ڕوودانی ئیدراکی هەستی و تێگەیشتن و زانین، لەناو یەکەی بوون –لە– جیهاندا بۆ بخاتە ڕوو.

## ٢–تێگەیشتن و خستنە سەر و لێکدانەوە

دەبێ دان بەوەدا بنێین کە باو نییە لە نووسینەکانی فەیلەسووفە بوونگەراکاندا لێدوانێکی ڕاشکاو و بەرنامەدار بۆ سروشتی زانین و تێگەیشتن بینینەوە. ڕەنگە پێویست بێت وا چاوەڕێ بکەین ئەم نووسەرانە، لە یاخیبوونیاندا بەسەر ئەو شتانەدا کە بە بابەتی ئەبستراکتی لە قەڵەم ئەدەن لە فەلسەفەی سوننەتی (تەقلیدی)دا، بایەخێکی زۆر بە عاتیفە و ویژدان و ئیرادە و کردار بدەن، زیاتر لەوەی بایەخ بە لایەنی ئەقڵانی بدەن لە بوونی مرۆڤدا. بە تایبەتیش ئەوان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە زانینمان مۆرکێکی سۆزدارییانە Passional بەخۆوە دەگرێت، هەرچۆن تێگەیشتنیشمان ڕەنگی حاڵەتی سۆزداریمان دەگرێت. بەڵام لە ڕاستیدا مایەی ئەفسووسە کە بە شێوەیەکی گشتی فەیلەسووفە بوونگەراکان زۆر بایەخیان بە کێشەی زانین نەداوە.

فەیلەسووفە بوونگەراکانیش وەکو کانت Kant باوەڕیان وایە کە مەعریفەی مرۆیی لە دوو ڕیشەوە سەرچاوە ئەگرێت: لە سەرێکەوە پێدراوەکان، واتە پێدراوە هەستییەکان هەیە، لە سەرێکی تریشەوە هۆشمان هەیە کە بە هۆیەوە و بە گوێرەی هەندێ وێنەی پێشینە a priori ئەم پێدراوانە ڕێکدەخرێن. بێردیاییف دەڵێت: "ئیدراکی هەستی بە پێی سروشتی قووڵی، بە تەنها ڕەنگدانەوەیەکی ملکەچانەی واقیع یان گونجانێکی ڕاستەوخۆی پێدراوەکان نییە، بەڵکو گۆڕینێکی ئیجابیی شێوەی بوون و مانا بەخشینیشە پێی" .

لەم باسەدا بایەخێکی بنەڕەتی بەم توخمە ئیجابییە ئەدەین کە لە پرۆسەی تێگەیشتندا مانا بە بوون دەبەخشێت. ئەو چالاکییە ئیجابییەی کە لێرەشدا ڕووبەڕووی ئەبینەوە ئەوەیە کە لە نووسینەکانی "هایدیگەر" و "سارتەر"دا ناونراوە "خستنەسەر" (یان فڕێدانە سەر Projecting) ئەمەش ناولێنانێکی گونجاوە، بوونەوەری مرۆیی بە شێوەیەکی بەردەوام پرۆسەی خستنەسەر ئەنجام ئەدات، لەبەرئەوەی ئەمە بەشێکە لە بوونی، واتە دەرچوونی بەردەوامی لە خودی خۆی، چونکە ئەو بەردەوام خودی خۆی فڕێ ئەداتە سەر چواردەوری.

لە کتێبەکەی "هایدیگەر"یشدا، واتە کتێبی "بوون و زەمەن"، خوێنەر ڕووبەڕووی چەشنەها بەکارهێنانی سەیری وشەی "خستنەسەر" ئەبێتەوە، لەوانە خستنەسەری خود، خستنەسەری بوون و، تێگەیشتن و ئیمکانەکان و مانا و جیهان دەبینینەوە و ئەمانەش نموونەی کەمن لەو نموونە زۆرانەی بە درێژایی کتێبەکە هاتوون .

جێی گومانیشە کە هایدیگەر توانیبێتی بە درێژایی نووسینەکەی یەك مانای ئەم وشەیەی پاراستبێت. گەرچی مانا گشتییەکەی ئەم وشەیە زۆر ڕوونە: حستنە سەر (یان فڕێدانە سەر) Project واتە فڕێدانە بەردەم یا خستنە بەردەم، لەبەرئەوەی بوونەوەری مرۆیی لە پرۆسەی تێپەڕاندنی خوددا، لە ئیمکانەکانیدا خۆی بۆ پێشەوە فڕێ ئەدات،

---

* خستنەسەر (یان فڕێدانەسەر) Projecting: ئەم زاراوەیە کە بە عەرەبی پێی دەڵێن: "**الأسقاط**" و بە فارسیش پێی دەڵێن "فرافکنی" بە مانای ئەوە دێت کە خود شتی خۆی دەخاتە سەر (یان فڕێ ئەداتە سەر) دەرەوەی خۆی. ئەم زاراوەیە لە ڕێبازی دروونشیکاریشدا بەکارهاتووە بەو مانایەی کە زۆرجار. خود کردەوەکانی خۆی ئەخاتە سەر کەسێکی دی —و. کوردی—.

* وشەی Project لە ئەسڵدا لە دوو بڕگە پێکهاتووە: Pro واتە پێشەوە یان "بۆ پێشەوە"، ject واتە فڕێی ئەدات یان ئەیخاتەڕوو، بۆیە مانای حەرفییەکەی "خستنەسەر یان فڕێدانە سەر" واتە فڕێدانە بۆ پێشەوە، وشەی پرۆژە Projectیش کە مرۆڤ دەیەوێ لە داهاتوودا ئەنجامی بدات“ هەر لەمەوە هاتووە،واتە کارێکە لە پێشیدایە.

هەروەها لە ژینگە و دەوروبەریشیدا ئەم ئیمکانە فرێ ئەداتە پێش خۆی، هەر لە چوارچێوەی ئەم ئیمکانانەشدا کە فرێیان ئەدات یان خودی خۆی دەخاتە سەریان، لە ژینگەکەی دەگات. بەم جۆرەیە کە مانا دەخاتە سەر و جیهانێکی قابیلی تێگەیشتن دروست دەکات. لێرەشدا لێدوانەکەی ئێستامان بە لێدوانەکەی پێشوومانەوە دەبەسترێتەوە سەبارەت بە دروستکردنی (یان پێکهاتەی) جیهانی. چونکە جیهانیش پرۆژەیەکە Project یان سیستمێکە لە پرۆژە کە تیایدا پێدراو بریتیە لە ناوەرۆك یان کەرەسەی خاوی جیهان، بەڵام سیفەتی جیهانێتی Worldhood بە مانا وردەکەی، لە چوارچێوەی ئەو پرۆژانەدا بینادەکرێ کە پێشتر لە بایەخدانەکانی بوونەوەری مرۆییدا هەبوون.

پێشتر باسمان لە سروشتی تێگەیشتنی ڕۆژانە کرد وەختێ لە جیهانی ڕۆژانە دواین، ئێمە وەختێ بایەخ ئەخەینە سەر ئەم جیهانە شتێك تێدەگەین، هەرچۆن پەی بە سوودی ئەبەین، وەك چۆن منداڵ کاتێك فێری "مەبەست لە شتەکان چییە" دەبێت، تواناکانی خۆی دەخاتەسەریان و بەم جۆرە ئەو شتانە مانا و مەغزا ئەگرنە خۆیان.

بێگومان تێگەیشتن لە بنەڕەتدا مۆرکێکی کردەییانەی هەیە کە مۆرکی ژیانی ڕۆژانەیە، زۆرجاریش دەوترێ کە بەهرەی ئەقڵانی لای مرۆڤ لەسەر بناغەی کاردانەوەی بۆ پێداویستییە بایۆلۆژییەکان پەرەی سەندووە. چونکە تێگەیشتنی جیهان واتە تۆ توانای زاڵبوونت بەسەر ئەو کێشە و دژوارییانەدا هەبێت کە تیایدان و، بزانیت چۆن ڕێگای خۆت ئەکەیتەوە تیایداو، پەیوەندی لە نێوان شتەکان و بایەخە مرۆییەکاندا دروست ئەکەیت و ئەیانخەیتە خزمەتی خۆتەوە، هەروەها بزانیت چۆن خۆت لە مەترسییەکان دەپارێزیت. ئەم تێگەیشتنەش بۆ جیهان چوارچێوەیەکی مرۆیی بە دیاردەکان ئەدات و بە گوێرەی ئەم چوارچێوەیەش دیاردەکان لە کۆمەڵێك گوتەزادا پۆلێن دەکات. ئێمە دەتوانین ئەمە ناوبنێین تێگەیشتنی کردەیی، تا لە تێگەیشتنی تیۆرەیی جیابکەینەوە. دەشێ تێگەیشتنی کردەیی زۆر بە ئاسانی خۆی لە شێوەکانی

کاردا بخاتەڕوو. بۆ نموونە: لە شێوەی هەڵسوکەوتمان لەگەڵ شتەکاندا، گەرچی ئێمە لەوانەیە هەرگیز ئەم شێوەیە لە قاڵبێکی زمانەوانیدا دانەڕێژین. لەوانەیە سەخت بێت بەلامانەوە ئەوە بکەین. هەر بۆیە لەوانەیە دەرککردنی کردەییانەی شتێك زۆر قورستر بێت لە تێگەیشتنی تیۆرییانەی ئەو شتە. بۆ نموونە: تێگەیشتنی تیۆرییانەی دەستوور و ڕێساکانی کتێبێك کە سەبارەت بە پرنسیپەکانی فەرمانڕەواییە و زانایەکی سیاسەت نووسیویەتی، زۆر ئاسانترە لە تێگەیشتنی هونەری فەرمانڕەواییکردن لەسەر دەستی سیاسەتمەدارێکی گەورە. کاتێکیش ئێمە دەربارەی "هونەر" یان "کارامەیی" ئەدوێین جۆرێك لە حیکمەتی کردەییمان بە خەیاڵدا دێت کە دەکرێ لە کۆمەڵێك مەسەلەدا بە وردی دابڕێژین. بەڵام بێگومان ئەمە جۆرێکی ڕەسەنی تێگەیشتنە و لە ڕاستیدا جۆرێکی زۆر گرنگیشێتی، لەبەرئەوەی بەوەوە بەندە کە مرۆڤ خودی خۆی "فرێبداتە سەر" هەڵوێستێك بە شێوازێك وای لێبکات سوود لەو ئیمکانانە وەربگرێت کە ئەم هەڵوێستە ئەیانخاتەڕوو، هەر بۆیەشە بە سیاسەت گوتراوە "هونەری مومکین".

تێگەیشتنی تیۆرەیی لە تێگەیشتنی کردەییەوە پەرەی سەندووە، گەرچی نابێ تیۆرە و پراکتیك بە دوو جەمسەری تەواو دژ بە یەك بزانین، بەڵام ئاشکرایە کە پراکتیکێك نییە شایانی ئەوە بێت ناوی لێبنێین "هونەر" یان "کارامەیی" (چ لە بواری ڕاودا بێت یان کشتوکاڵ، یا ئەندازە، یان یارییە وەرزشییەکان و یان فەرمانڕەوایی دەوڵەت) و تیۆرەیەکی ناوەکی یان ڕێنوێنییەکی بۆ ئەو شتانە تیا نەبێت کە بە بواری ئەو چالاکییە دیاریکراوەوە پەیوەستن. بە هەمان شێوە تیۆرەیەك نییە پێی بوترێ تیۆرەیەکی پەتیی خاڵی لە هەموو بایەخدانێکی کردەیی. جیاکاری لە نێوان تیۆرە و پراکتیکدا مەسەلەیەکی ڕێژەیی (نیسبی)یە بەڵام سوودبەخش و گرنگیشە. کاتێك مرۆڤ لە پراکتیکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ تیۆرە، لەم حاڵەتەدا واتە لە بەشەکیی تایبەتی (الجزئی الخاص)ەوە بۆ گشت و لە حاڵەتی بەرجەستەبووەوە بۆ حاڵەتی ئەبستراکت و لە واقیعییەوە بۆ گریمانەکراو و لەو حاڵەتەوە کە تیایدا بایەخ بە بوونەوەر لەوپەڕیدایە بۆ

ئـەو حاڵەتـەی ئـەم بایەخـەی تیـا كەمدەبێتـەوە و بگـرە لەوانەشـە هـەر نـەمێنێت، دەگوێزرێتـەوە. كـاتێكیش ئەمـە ڕوودەدات مـرۆڤ لـە پرۆسـەی فرێدانـە سـەری ئـەو گوتەزایانـەی كـە بـە بایەخدانـەوە پەیوەسـتن دەگوزێرێتـەوە بـۆ كۆمـەڵێك گوتـەزاری تیـۆرەییتر: وەكـو ئـەو گوتەزایانـەی تێگەیـشتن كـە "كانـت" وەسـفی كـردوون، یـان چەمكەكانی زانستی سروشتی.

جیـاوازیی نێـوان تێگەیـشتنی كردەیـی تیۆرەییمـان لـە ڕێـی بەراوردكردنیـەوە بـە جیاوازییەكی تر كە لە نێوان تێڕوانینی بوونگەرایانە و تێڕوانینی تایبـەت بـە كەلـەپووری فەلـسەفەیدایە، زیـاتر بـۆ ڕووندەبێتـەوە. ئـەم كەلـەپوورە تێگەیـشتنی زانـستییانەی كردووە بە پێوەر و وایدەبینێت كە گوتەزا تیۆرییـەكان دەلالـەت لـە بونیـادی بنـەڕەتیی تێگەیـشتن دەكـەن. لـە كاتێكـا بوونگـەراكان تێگەیـشتنی كردەییـان كـرد بـە پێـوەر، بەوپێیەی كە تایپێكی بنەڕەتیترە لـەوانی تـر و، وایـان دانـا كـە تێگەیـشتنی زانـستییش لەمەوە وەرگیراوە. لەوانەشە خەیاڵ پەیوەندیی لە نێوان ئەم دوو شێوەیەی تێگەیشتندا دروستكردبێت و هـەر ئـەویش لەهـەر یەكێكیانـدا ڕۆڵێكـی جیـاواز ببینێـت. لەبەرئـەوەی ئاشكراشە كە هەر جۆرێك لە فرێدانە سەری ئیمكانەكان (لە ئایندەدا) چەشنێك خەیاڵ لە خـۆی دەگرێـت. هـەروەها دەبیـنین كـە پێداویـستییە كردەییـەكانن كـە لـە پرۆسـەی تێگەیشتنی ڕۆژانەدا خەیاڵ دەبزوێنن .هەرچۆن خەیاڵ ڕۆڵێكی سەرەكیی لە تێگەیشتنی زانـستی و لـە گریمانەسـازیدا دەبینێـت، بـەڵام ئـەوەی لێـرەدا خـەیاڵ دەبزوێنێـت پێداویستییە كردەییەكان نین، بەڵكو حەز و ئارەزووە بۆ زانین.

هەر بەم بۆنەیەوە "هایدیگەر" لـە كتێبەكەیـدا كـە سـەبارەت بـە "كانـت"ە و نـاوی "كانت و كێشەی میتافیزیكـا"یـە بـاس لـە ڕۆڵـی خـەیاڵ دەكـات لـە پرۆسـەی زانینـدا و هەروەها پەیوەندیی فەیلەسووفی بوونگـەرا بـە تێڕوانینـی سـوونەتییانەوە بـۆ تیـۆرەی زانین. هایدیگەر دەڵێت ئەو یانزدە لاپەڕەیەی كانت لـە كتێبەكەیـدا "ڕەخنـە لـە ئـەقڵی پـەتی" بۆ خشتەی گوتەزاكان تەرخانی كردووە، كرۆكـی هـەموو كتێبەكـە پێكـدێنێت .

ئەو وایدەبینێت کە خەیاڵ و سروشتی زەمانمەندییانەی مرۆڤ ئەو دوو مەرجە سەرەکیەن کە وا لە تێگەیشتن ئەکەن مومکین بێت .ژیان وزەمانمەندیش ڕێك ئەو دوو شتەن کـە لـە پرۆسەی "خستنەسەر"ی مومکینەکان و ماناکان و بگرە جیهان خۆیشیدا دەیبینین.

لێدوان سەبارەت بە خستنەسەری ماناکانیش دەلالەت لەوە دەکات کـە هـەر جۆرێـك لە جۆرەکانی تێگەیشتن کردارێك لە کردارەکانی لێکدانەوە لەخۆدەگرێت. هەر شتێك کـە لە بەردەم ئێمەدا خـۆی دەنوێنێـت، "وەکـو شـتێك" دەیبیـنین یـان دەیبیـستین. ئێمـە پەڵەیەك ڕەنگ دەبینین دەزانین کە ساختومانێکی بەرزە، یان دەنگێك دەبیستین

دەزانـین کـە فڕۆکەیەکـە. دیـاریکردنی ماناکـانیش واتـە ئێمـە چوارچـێوەیەکی سەرچاوەیی (مەرجەعی) (یان کۆمـەڵێك چوارچێوەی سەرچـاوەیی)مـان هەیـە کـە ئـەو بابەتە جیاوازانەی تیا "دادەنـێین" کـە لـە ئەزموونمانـدا ڕووبـەڕوویان دەبینـەوە. کاتـێ دەربارەی جیهـان دوایـن بـە شـێوازێکی کـەمێك جیـاوازتر لـەم دیاردەیـەمان کۆڵییـەوە، وەختـێ سـەرنجی ئـەوەمان دا کـە بوونـەوەری مرۆیـی دەیـەوێ هـەموو شـتێك بگرێتـە جیهانەکەی خۆی، بەڵام ئێمە لە هەمان چوارچێوەدا سەرنجی ئـەوەمان دا کـە کۆمـەڵێك "جیهان" هەن، بۆیە ئێمەش لێرەدا دەڵێین کە کۆمەڵێك شێواز هەن بۆ تێگەیشتن —نەك هەر شێوازی تیۆریی و شێوازی کردەیی— بەڵکو دەتوانین بڵێین کە تێگەیشتن هەیە هـی هونەرمەنـدە و، هەیـە هـی مێژوونووسـە و، هەیـە هـی خودناسـە و.. هتـد..، هـەر تێگەیـشتنێکیش بەقـەدەر ئـەوەی کردارێـك لـە کردارەکـانی لێکدانـەوەی تیایـە، تێگەیشتنێکی پێشینە یان شێوازێك بۆ ڕوانین لە شـتەکان یـان شـێوازێك بـۆ وێنـاکردنی شـتەکان لـەخۆدەگرێت کـە ئـەوە دیاریـدەکات چـۆن پـەی بـەو شـتانە بـەرین. دەشـێ تێگەیشتنی پێشینە خۆیشی ببێتە بابەتێك بۆ لێکۆڵینەوە، وەکو ئەوەی لەوە بکۆڵێنەوە کە گوتەزا پێشینەکانی **apriori** تا چ ڕادەیەك بۆ پـەیبردن بـە ئـەزموونێك و لێکدانـەوەی گونجاون. لە تێگەیشتنی ڕەخنەییشدا پێویستە ڕۆڵێکی کاریگەری ئاڵوگۆڕکەر لـە نێـوان ئەو گوتەزایانەدا کە لێکدەدرێنەوە و پێدراوە کردەییـەکانی ئەزموونەکـەدا هـەبێت. ئـەو

دەزگا چەمکییەی کە لەم پرۆسەیەدا بەشداری ئەکەین پێویستە، ئەگەر بمانەوێ بابەتی ئەزموونەکە بخەینە ناو کردەی تێگەیشتنەوە. بەڵام پێویستە ئەم گوتەزایانە خۆشیان نەرمی (مرونەت)یان هەبێت و قابیلی پیاچوونەوە و ڕاستکردنەوە بن، گەر بمانەوێ بۆ ئەزموونێکی فراوان گونجاوبن. لە ڕێی کارلێکێکی وەهاوە تێگەیشتن پێش دەکەوێت و، مێژووی زانستە سروشتیەکانیش نموونەی زۆرمان لەم بارەیەوە دەداتێ.

## ٣–شێوەکانی زانین (یان ناسین)

کاتێك دەربارەی "زانین– مەعریفە" ئەدوێین، ئەمە واتە تێگەیشتن گەیشتووەتە ڕادەیەك کە برێکی مەعقولمان لە یەقین ئەداتێ بەو ئەنجامانەی کە پێیاندەگات. کە دەشڵێم "برێکی مەعقول لە یەقین" لەبەرئەوەیە کە لەوانەیە لە توانای مرۆڤدا نەبێت هەرگیز بە یەقینی ڕەها بگات. لەوانەشە فرمانی "ئەزانێت To Know" بە ئازادییەکی زیاترەوە بەکاربهێنین، چونکە ئێمە چۆن دەزانین کە دەزانین؟ بەڵام بەکارهێنانی ئاسایی باوی ئەم وشەیە ڕێگەمان ئەدات کە وەختێ یەقینی ڕەها شك نابەین، دەربارەی "زانین" بدوێین.

لەم بەشەدا بە مانا فراوانەکەی، نەك مانا تەسکەکەی قسە لەسەر "زانین" دەکەین.

گەلێ جۆری زانین هەیە و، هەم لە فەلسەفەدا و هەم لە هەڵوێستی ئاساییدا جیاوازی لە نێوان ئەم جۆرانەدا کراوە.ئێمە پێشتر ئاماژەمان بە جیاوازیی نێوان زانینی تیۆرەیی و زانینی کردەییدا. بەڵام جیاوازییەکی گرنگتر لە نێوان زانینی ڕاستییەکی دیاریکراو afact و زانینی کەسێك apersonدا هەیە ئەمەش جیاوازییەکە بە ڕادەیەك قووڵە کە هەندێ زمان فرمانی تایبەتیان بۆ گوزارشتکردن لەم دوو جۆرەی زانین تەرخان کردووە، ناسینی مرۆڤیش بۆ خودی خۆی جۆرێکی تری گرنگی زانینە.

لەهەر تیۆرەیەکی زانیندا وا باو بووە کە شێوازێکی دیاریکراو لە شێوازەکانی زانین بکرێتە نموونەیەکی شوێنپێهەڵگیراو. لە ڕابردوودا ئەولەویەت دراوە بە زانینی ماتماتیکی،

لەبەر ئەو وردەکاریی و ڕوونی و یەقینییەی لە هیچ بوارێکی تری لێکۆڵینەوەدا زانین ناتوانێت بە دەستی بهێنێت. بەڵام گەلێ لە فەیلەسووفان وای بۆ دەچن کە ئەم خاسیەتانەی زانینی ماتماتیکی بەرەنجامێکی خودیی خۆین. لە ئێستاشدا زانستە سروشتیەکان زیاتر شایانی ئەوەن ئەو پێوەرەمان بدەنێ بۆ پێوانەی ئەو شتەی بە "زانین"ی دەزانین. ئەو توخمە ئەزموونییەمان ئەداتێ کە ماتماتیك لێی بێبەشە. بەڵام کاتێ چەمکە ماتماتیکیەکان بەسەر بابەتەکانی زانستە ئەزموونگەرەکاندا پراکتیك دەکرێ، لەم حاڵەتەدا ئەم زانستانە دەتوانن بگەنە برێك لە "وردبینی" کە پێدەچێ لە لێدوانماندا سەبارەت بە "زانین" هەبێت.

بەڵام دیسانەوە دەبینین کە بوونگەراکان بە پێچەوانەی تەوژمەکەوە مەلە دەکەن، لەبەرئەوەی نموونەی بوونگەرایانەی زانین زانینی بابەتیانە نییە بە ڕووداوە ئەزموونییەکان کە زانستەکان هەوڵی بۆ ئەدەن، بەڵکو ناسینی کەسەکانە. ئەم ناسینە (زانینە)ش یان زانینێکی خودییە واتە دەروونبینانەی خودە، یاخود ناسینی کەسەکانی ترە کە لە ڕێی دیداریانەوە بە دەستی دەهێنین.

دەشێ ناسینی مرۆڤیش بۆ خودی خۆی، بە مانایەك لە ماناکان لە توانایدا بێت لافی برێك لە یەقین لێبدات کە بە شێوازی دی بەدەست نایەت، لەبەرئەوەی ئێمە لەو حاڵەتەدا دەرك کردنێکی ڕاستەوخۆ و هوشیارییەکی ناوەکیمان دەبێت. بەڵام شتێکی بەڵگەنەویستیشە کە خودناسی یان ناسینی مرۆڤەکان بە شێوەیەکی گشتی لە قورسترین جۆرەکانی زانینە. تەنانەت گەر مرۆڤ بەم ناسینەش بگات: بەڵام ئایا ئەم ناسینە برێك ئاڵۆزیی دیارینەکراو لەخۆناگرێت گەر بەراوردی بکەین بەو ناسینە (زانینە) وردەی کە لە ڕێی میتۆدەکانی زانستە سروشتیەکانەوە فێری بووین؟

ئاشکرایە کە بە تەنها جۆری جیاوازی زانین نییە، بەڵکو پلەی جیاوازی زانینیش هەیە، بۆ نموونە ناسینی مرۆڤ بۆ کەسێکی دی (یان ناسینی بۆ خودی خۆی)دەشێ ئاڵۆز بێت و دەشێ وردیش بێت،دەشێ ڕووکەش بێت و دەشێ قووڵیش بێت.بەهەمان

شێوە سەبارەت بە ناسینی دیاردە سروشتییەکانیش.ئێمە دەمانەوێ بەگوێرەی ئەو پلەیەی ئەم دوو جۆرەی زانین پێی دەگەن و پێشبینیکردنی ڕەوتی ڕەفتار یان کرداردا یارمەتیمان ئەدەن،حوکمیان بەسەردا بدەین.(بۆ نموونە)لەوانەیە ناسینی مرۆڤێك بۆ کەسێك هێندەی ناسینی مرۆڤێك بۆ کەشوهەوا وردبێت، بەلاّم ئەم دوو جۆرەی زانین دوو جۆرن کە بە شێوازی جیاواز پێیان دەگەین.

کەواتە تایبەتمەندیی ئەو زانینە چییە کە بوونگەراکان دەیکەن بە نموونەی خۆیان؟ بێگومان دەبێ وەلاّمەکە ئەوە بێت کە: تایبەتمەندیی ئەم زانینە بەشداریکردنە **Participation**، چونکە ئێمە لە ڕێی سەرنجدانی شتێکی دەرەوەی خۆمانەوە ناگەین بەم زانینە، بەلّکو بە بەشداریکردن (و چوونە ناو)ی ئەو شتەی کە دەمانەوێ بیزانین (یا بیناسین). ئاشکراشە کە لە حالّەتی ناسینی مرۆڤدا بۆ خودی خۆی ئەم بەشداریکردنە هەیە، بەلاّم لە حالّەتی ناسینی کەسێکی تریشدا شتێکی شوبهاو بەمە هەیە. لە پرۆسەیەکی لەم جۆرەدا جۆرێك لە ئالّوگۆڕکردن و، لە دانوستان دەبینین. چونکە ئێمە تەنها لە ڕێی سەرنجدانی کەسێکی ترەوە ناتوانین بیناسین، گەرچی لە هەموو حالّەتێکدا سەرنجدان هەر پێویستە، بەلاّم ئەو چەند خودی خۆی بخاتە بەردەستمان و ئێمەش خودی خۆمان بخەینە بەردەستی، ناسینمان بۆ یەك لە زیادبووندا دەبێت و ئەودەم وەکو دەلّێین باش یەکتر دەناسین (وەکو دەلّێین). بە تایبەتیش کاتێك ئەو دانوستانە یان ئەو بەشداریکردنەی نێوانمان ماوەیەکی زۆری خایاندبێت و تێگەیشتنێکی قوولّمان بۆ یەکتر لا دروست بووبێت.

کتێبی پیرۆزیش کە وشەی "زانین" بەکاردێنێت مەغزایەکی گرنگی ئەداتێ. لێرەشدا زانین لە ڕێی بەشداریکردن و ناسینی کەسانی ترەوە لە ناسینی ڕووداوەکانی واقیع لەپێشترە. بۆ نموونە ناسینی خودا لە بنەڕەتدا ئەوە نییە کە بزانیت خودا هەیە (گەرچی ئەمەش لەخۆدەگرێت)، بەلّکو مانای پەیوەندی دروستکردنە لەگەلّ خودادا و، هەر ئەمەشە مانای ئیمان. لە هەندێ ئایەتی "چاخی کۆن"دا بەکارهێنانی وشەی

"دەناسێت" مەغزایەکی تایبەتیی هەیە، فرمانی "ناسین" بە مانای ئاوێتەبوونی سێکسی دێت: "ئادەمیش حەوای ژنی خۆی ناسی.." (کتێبی دروستبوون، بەشی ٤، ئایەتی ١) لێرەدا وەکو دەبینین ناسین (یان زانین) ئاماژەیە بۆ یەکبوونی ناسەر و ناسراو. هەرچۆن دەبێ سەرنجی ئەوەش بدەین کە ئەم رستەیە ئاماژە بۆ فاکتەری جەستەییش دەکات لە ناسین (زانین)دا، ناسین پەیوەستە بە بوون —لە— جیهاندا وەو بوون —لەگەڵ— ئەوانی تردا، واتە فرمانێکی دابڕاو نییە کە خودێکی پەتیی بیرکەرەوە ئەنجامی بدات.

فەیلەسووفی بوونگەرا لە فرمانی ناسیندا جەخت لەسەر گرنگیی بەشداریکردن دەکاتەوە و، رەخنە لەو جۆرەی ناسین دەگرێت کە تیایدا ناسەر هەوڵدەدات لە ناسراو جیابێتەوە، تا بە شێوەیەکی دەرەکی لێی خوردبێتەوە. لەم جۆرەی دووەمی ناسیندا دەشێ مرۆڤ بە بابەتێتی بگات، بابەت ئەو شتەیە کە رووبەرووم دەبێتەوە بە جۆرێك کە خود و بابەت لە دەرەوەی یەکتردا رووبەرووی یەك دەبنەوە.

کاتێکیش دەڵێم فەیلەسووفی بوونگەرا رەخنە لەم جۆرەی ناسین دەگرێت کە مەبەستی دابڕانە، مەبەستم لەوە نییە کە ئەو دان بەوەدا نانێت کە ئەم جۆرەی ناسین بەهای تایبەتیی خۆی هەیە. راستە لە هەندێ حاڵەتی زێدەڕەوانەدا بوونگەراکان وا دێنە پێشچاو کە دژ بە زانست بن، بەڵام ئەم نەیارییەیان لەو حاڵەتانەدا رەوایە کە ئەو تێڕوانینە ئەبستراکتەی بۆ هەندێ زانست دەگونجێت بەبێ هیچ جیاوازییەك بەسەر بواری تردا پراکتیك بکرێ و لافی ئەوە لێبدرێ کە ئەو زانینە "بابەتیە"ی بەم رێگایە بەدەست دێت تاقە زانینی راستەقینەیە، ئەم نەیارییەی بوونگەراکانیش بە تایبەتی کاتێك دێتەئاراوە کە بابەتی لێکۆڵینەوەکە خودی مرۆڤ بێت. بێگومان کۆمەڵناسی و مرۆناسی (ئەنترۆپۆلۆجی) و ئەو لێکۆڵینەوانەی مرۆڤ ئەکەنە بابەتی خۆیان، کۆمەڵێك میتۆد بەکاردەهێنن. کە لە بنەڕەتدا دەشوبهێنە سەر ئەو میتۆدانەی کە لە لێکۆڵینەوەی هەر دیاردەیەکی ئەزموونگەرایانەدا بەکاردەبرێن و، ئەمانەش زانستگەلێکن کە بەهایان

دیاریکراوە. بەڵام فەیلەسووفی بوونگەرا لەوەدا ڕاست دەکات کە دەڵێت تێڕوانینی ئەبستراکتانە ناتوانێت لە لایەنی مرۆیی تایبەت لە ئادەمیزاددا تێبگات، ئەمەش لایەنێکە ناناسرێ تەنها لە ڕێی بەشداریکردنمانەوە نەبێت لە بوونی مرۆییدا. لە ڕاستیدا "ڤیلهلم دیلتای" لە سەدەی نۆزدەیەمدا زۆر بە ڕوونی ئەمەی خستۆتەڕوو، بەڵام ئێمە درەنگ فێری ئەم وانانە بووین، ئەگینا کۆمەڵناسی و لێکۆڵینەوە ئەزموونگەراکانی تری مرۆڤ، بە تایبەتی لە ولایەتە یەکگرتووەکاندا قەوارەیەکی زیاد لە پێویستیان دراوەتێ و ئیدی وای لێهاتووە ئەم "لێکۆڵینەوە" لاسایی ئەو "لێکۆڵینەوە" دەکات و لەبەرئەوە جێی سەرسوڕمان نییە کە دەبینین مرۆڤ بە شتێکی کەمتر لە مرۆڤ سەیردەکرێ.

فەیلەسووفە بوونگەراکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ناتوانین ناسینی مرۆڤ بە زانستێکی گشتگیر سەبارەت بە ڕووداوە ئەزموونییەکانی واقیع بسپێرین. بەڵام زیاتر لەسەر ئەولەویەتی ناسینی مرۆیی کۆکن، واتە ناسینی بوونگەرایانە، بەڵام لە شێوازی دەربڕین لەوەدا جیاوازن. بۆ نموونە "کارل یاسپەرز" پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە هەرچی زانینمانە شێوەی "خود– بابەت" بەخۆیەوە دەگرێت، بەڵام لە هەمان کاتدا دان بە گرنگیی ئەوەشدا دەنێت کە پێی دەڵێت "گشتگیر یان هەمەگیر Comprehensive, Encompassing"، ئەم گشتگیرە خۆی نابێت بە بابەت، بەڵام ئێمە هوشیاریمان پێی هەیە بەو سیفەتەی بوارێکی فراوانترە کە خود و بابەتیش لەخۆدەگرێت. هەروەها بوونیش "بوون لە خۆیدا کە وا لە دەوروبەرماندا" و "ئەو بوونەی کە هەین". بۆئەوەی پەی بە گشتگیر یا هەمەگیریش بەرین دەبێ خۆمان لەو پەیوەندییە بابەتییە تەسکەمان ڕزگاربکەین کە بە ژینگەکەمانەوە دەمانبەستێتەوە و لە ڕێگەی بەشداریکردنەوە ئەو نشێوە تێپەڕێنین کە لە نێوان خود و بابەتدایە .

پێدەچێ "نیکۆلای بێردیاییڤ"یش بڕوای وابێت کە "بە بابەت بوون Objectification" شتێکی دابڕاو نەبێت لە کەوتنەخوارەوەی مرۆڤ. هەروەها ئەو بە پەیڕەویکردن لە لێڤی بریڵ Levy- Brull وای بۆ دەچێت کە بیرکردنەوەی مرۆڤ لە

قۆناغە سەرەتاییەکانیدا بە بابەت نەبووە، بەڵکو بە گوێرەی "یاسای بەشداریکردن" لەگەڵ ئەو شتەدا کە دەیزانی ببوو بە یەك. بەڵام ئەم بەشداریکردنە شکستی هێنا، لەبەرئەوەی: "بێداربوونەوەی ئەقڵی هوشیار و پەرەسەندنی هاوکات بوو لەگەڵ دابەشکردن و نامۆبووندا، دەبووایە مرۆڤ بە قۆناغێکدا تێپەڕیبایە کە تیایدا هزر و ئەقڵی خۆی بخستبایەتە ژێر ڕەخنەوە و پاشانیش تێپەڕین بە بابەتبووندا چارەنووسی ڕۆحە "لەم جیهانەدا". بەڵام ئەو باوەڕی وایە کە پێویستە لەسەرمان بۆ جۆرێکی نوێی بەشداریکردن بگەڕێینەوە. فەلسەفەی بوونگەرایی گواستنەوەیەکی نوێمان ئەداتێ:

"لە لێکدانەوەی زانین (مەعریفە)ەوە بەوپێیەی بە بابەتبوونە بۆ تێگەیشتنی بەوپێیەی بەشداریکردن و یەکبوونە لەگەڵ بابەتدا و دەستکردنە بە پەیوەندییەکی هاوکارانە ". لە نووسینەکانی "مارشاڵ ماکلۆهان"یشدا ڕەنگدانەوەی ئەم بیروڕایانە دەبینینەوە. ئەویش وایدەبینێت کە ئێمە لە چاخی تازەی ئەلەکتریکدا دەگەینە کۆتایی پارچەپارچەبوون و پێدەخەینە ناو چاخێکەوە کە تیایدا بۆ جارێکی دی هوشیاریی ئەفسانەیی گرنگی بەدەست دەهێنێتەوە: ئەوەی ئەویش ناوی دەنێت "میدیای سارد" بۆ نموونە وەك تەلەفزیۆن، ڕێك ئەو میدیایەن کە بەشداریکردنی ئەو کەسانە دەگرنە خۆیان کە گوتاریان ئاراستە دەکەین .

پێویستە دیسانەوە سەرنجی ئەوە بدەینەوە کە بوونگەراکان جیاوازییەکی بنجبڕانە لە نێوان زانین و ویژدان و ئیرادەدا ناکەن. لە کیرکەگۆرەوە تا دەگاتە بێردیاییڤ ڕایان وایە کە زانین سیمای عاتیفی و ململانێ بەخۆوە دەگرێت. کاتێکیش لە هەست و سۆز دەکۆڵینەوە (لە بەشی ٩دا) پتر ئەمەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە و دەبینین کە چۆن چەمکی بوون چەمکی تیۆرەی کۆنی دەروونناسی سەبارەت بە توانستەکان ڕەتدەکاتەوە. هەروەها پێویستە سەرنجی ئەوەش بدەین کە لە کاتێکا زانینی تاکەکەسی بە زانینی نموونەیی دەژمێردرێ، جیاوازییەکی تەواوی لەگەڵ زانینی ڕووداوە ئەزموونییەکانی واقیعدا نییە، خۆ ئەگەر تەواو جیاواز بووایە، ئەوا شایانی ئەوە نەدەبوو ببێتە نموونەیەك

بۆ هەموو جۆرەکانی زانین. گەرچی لەسەر ئەم خاڵەش جیاوازی لە ڕاوبۆچووندا هەیە، بەڵام زۆربەی بوونگەراکان لەگەڵ "میشیل پۆلانی Michael Polanyi"دا یەکدەگرنەوە کە لە کتێبەکەیدا "زانینی تاکەکەسی"دا دەڵێت کە تەنانەت هەنگاوەکانی زانستە سروشتیەکانیش کە بە ڕواڵەت ئەبستراکت و ناشەخسین، لە فاکتەری شەخسی خاڵی نین، بەڵام لەم بەشەی دواییدا کە بۆ "حەقیقەت"ی تەرخان دەکەین زیاتر ئەم چەمکەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

## ٤-کێشەی حەقیقەت

حەقیقەت چییە؟ ئایا حەقیقەت لە بابەتدایە؟ یان لە خوددایە؟ یاخود لە پەیوەندیی نێوانیاندایە؟ یان لە شتێکی دیکەدایە؟ تێڕوانینی سوننەتییانە بۆ حەقیقەت وایدەبینێ کە حەقیقەت بریتییە لە گونجانی ناواخنی خودی (ئیدی حوکمێك بێت یان بیرۆکەیەك) لەگەڵ ئەو شتە واقیعییەی کە لە جیهانی دەرەوەدایە و بیرۆکەکە یان حوکمەکە "نوێنەرایەتیی دەکات".

لەبەر ڕۆشنایی باسەکانی پێشووشماندا سەبارەت بە زانین و تێگەیشتن، بەلامانەوە شتێکی سەیر نییە کە دەبینین فەیلەسووفی بوونگەرا وێناکردنی سوونتەتییانە بۆ حەقیقەت ڕەتدەکاتەوە و دەڵێت کە کەموکورتە. لە ڕاستیدا دەشێ ئەم وێناکردنە لە توانایدا بێت وەسفی جۆرێك لە زانینمان بۆ بکات، ئەویش ئەو جۆرەیە کە تێگەیشتنی ئەبستراکتی بە بابەتبوو دەیویست پێیبگات. بەڵام جۆرێك لە حەقیقەت هەیە کە لەو حەقیقەتە ڕەسەنترە (هەروەکو بوونگەراکان وادەڵێن) و ئەویش حەقیقەتێکە سەر بە بوونی زیندووی مرۆڤە.

بە تایبەتی کیرکەگۆر سەبارەت بە "حەقیقەتی خودێتی" دوا. لەوانەشە لە هەڵبژاردنی زاراوەکاندا سەرکەوتوو نەبووبێت: ئەی حەقیقەت بە گوێرەی پێناسەکەی شتێکی بابەتی نییە؟ ئەوەی بەلای کەسێکەوە حەقیقییە،بێگومان بەلای هەموو

خەڵکیشەوە هەر حەقیقیەیە. کەواتە چۆن دەتوانین حەقیقەت و خودێتی پێکەوە ببەستینەوە؟

بەڵام دەبێ لە چوارچێوەی ڕەتکردنەوەی کیرکەگۆردا بۆ ئەو شتەی پێی دەوت رووتکردنەوەی حەقیقەتی "بابەتی" لە زمانەکەی بگەین. حەقیقەت واتە ناوەوەییبوون. حەقیقەت شتێك نییە ناشەخسی بێت و لەناو مەسەلەیەکدا بئاخنرێ، بەڵکو شتێکە کە لە ناوەوە دەمانبێت. گومان لەوەدا نییە کە کاریگەریی ئایین لەسەر فەلسەفەکەی کیرکەگۆر لێرەدا بە ئاشکرا دیارە. مەسیح (د.خ) وتوویەتی "من حەقیقەتم" یوحەننا بەشی ١٤ ئایەتی ٦. کەواتە ئەو حەقیقەتە چییە کە لە ناسنامەیەکدا لەگەڵ ژیانی تاکەکەسدا دەبێتە یەك؟ دیارە دەبێ شتێکی زۆر بابەتیتر بێت لەو حەقیقەتەی کە لە هەندێ مەسەلەدا دادەڕێژرێ.

کیرکەگۆر بەم جۆرە گوزارشتی لەمە کردووە:

"کاتێ بە شێوازێکی بابەتیانە کێشەی حەقیقەت دەوروژێنرێ، ڕاستەوخۆ هزر بە شێوەیەکی بابەتیانە روو لە حەقیقەت دەکات بەو پێیەی بابەتێکە کەسی ناسەر (العارف) پێوەی پەیوەستە. کاتێکیش ئەو بابەتەی کە تەنها کەسی ناسەر پێیەوە پەیوەستە ئەبێتە حەقیقەت، خود ئەبێتە خاوەنی ئەو حەقیقەتە. بەڵام کاتێك کێشەی حەقیقەت بە شێوەیەکی خودی دەورووژێنرێ، هزر خۆبەخۆیی روو لە سروشتی ئەو پەیوەندییە دەکات کە تاکەکەس پێکیدەهێنێت. خۆ گەر "جۆر"ی ئەم پەیوەندییە تاقە جۆری ڕاستەقینە بێت، ئەوا تاکەکەس لەم حاڵەتەدا دەبێتە خاوەنی ئەو حەقیقەتە، تەنانەت گەر ئەو شتەی بەم شێوەیەش پێیەوە پەیوەست بوو ناڕاستەقینە بێت" .

ئەمە بەو مانایە نییە کە "بیرکردنەوە وای لێدەکات" یان ئەبێ حەقیقەت لەگەڵ پێشداوەریی تایبەتیی مندا یەك بێتەوە، بەڵکو واتە حەقیقەت لە تەواوترین مانایدا لە قووڵایی ناخی بوونی مرۆییەوە دەردەچێت و ڕەگوڕیشەی وا لە واڵایی بووندا.

دەتوانین ڕەخنە لە لێكدانەوەكەی كیركەگۆر بگرین بەوەی كە زیاد لە پێویست تاكگەرایانەیە، گەرچی هەندێ فەیلەسووفی بوونگەرا دواتر ئەم ئاقارەیان ڕاستكردەوە، لەوانە "بێردیاییڤ" و "مارسیل". بەڵام ئەوانیش لەوەدا وەكو كیركەگۆر ڕاشكاوبوون كە بەردەوام حەقیقەت ڕەهەندێكی شەخسی بەخۆوە دەگرێت، گەرچی ئەمان هوشیارییان بە مۆركی هاوبەشی زانینمان زیاتر بوو، هەروەها بەوەی كە حەقیقەت پشت بە دانپیانانی دەستەجەمعی دەبەستێت. بە تایبەتیش مارسیل پەردەی لەسەر ئەم تایبەتمەندییە هەڵماڵی، چونكە هەر ئەویش بوو كە ئەم بیرۆكەیەی لای فەیلەسووفی ئایدیالیستی ئەمریكی "جۆشیا ڕۆیس Josiah Royce" دۆزییەوە، بە تایبەتیش تیۆرەكەی لە بواری لێكدانەوەی دەستەجەمعیدا.

كاتێ گروپێك زانا سەرقاڵی لێكۆڵینەوەیەك دەبن، تا ڕادەیەكی زۆر ملكەچی كۆت و بەندی ئەمانەتی شەخسی دەبن و ئەمەش كامڵبوونی لێكۆڵینەوەكە مسۆگەر دەكات تا ڕاستییە بابەتییە داواكراوەكان وەكو ئەنجامێكی ئەم لێكۆڵینەوەیە بەدەست بێن و پاشان لە كتێبەكانی خوێندندا تۆماربكرێن. وێناكردنی گشتی Notion ی حەقیقەت (گەر بۆم هەبێت لێرەدا دەستەواژەی وێناكردنی گشتی "یان بیرۆكەی گشتی" تا ڕادەیەك بە مانا هیگڵییەكەی بەكاربهێنم) بە تەنها ئەو مەسەلانە ناگرێتەوە كە لە كۆتایی لێكۆڵینەوەكەدا بەدەست دێن، بەڵكو ئەو تەقەللا شەخسیانەش ئەگرێتەوە كە مۆركی ئازادی و دڵسۆزی و ئەو ململانێیە بەخۆوە دەگرن كە بەرەو حەقیقەتمان دەبات.

بەڵام پەیوەندییەكانی نێوان حەقیقەت و ئازادی و كرانەوەی بوونی مرۆیی، هایدیگەر لە وتارێكیدا بە ناوی "سەبارەت ماهیەتی حەقیقەت" لێیان دواوە. مرۆڤ چەند ئازادبێت ئەوەندە دەبێتە خاوەنی حەقیقەت، چەند كراوەش بێت بە ڕووی شتەكاندا وەك ئەوەی

---

* دەستەواژەی "وێناكردنی (یان بیرۆكەی) گشتیی حەقیقەت زاراوەیەكی هیگڵیانەی تایبەتییە و مەبەست لێی وێناكردنی ئەقڵیانەی بابەتێكە لەگەڵ هاتنەدیی كردەییدا لەیەك كاتدا، هەر بۆیە گوتەزای وێناكردنی گشتی پێكهاتەیەكە كە لە هەمان كاتدا بوون و ماهیەتیش لەخۆ دەگرێت.

هەن، ئەوەندە ئازاد دەبێت، چەند واز لە شتەکانیش بهێنێت خۆیان بن وەك ئەوەی هەن، ئەوەندە بە ڕوویاندا کراوە دەبێت. بە جۆرێك کە دەستکارییان ناکات، بەڵکو بە تەنها بەشداری لە کرانەوەیان (ئاشکراکردنیان)دا دەکات. هایدیگەر چەندین جار بۆ وێناکردنی یۆنانیەکان بۆ حەقیقەت دەگەڕێتەوە بەوپێیەی "پەردە هەڵماڵراوی A-letheia"یە و مانا حەرفیەکەی "حەشارنەدان"ە، چونکە وختێ پەردەکان هەڵدەماڵرێن و شتەکان دەکرێنەوە، حەقیقەت "ڕوودەدات" (گەر ئەم دەربڕینە ڕاست بێت. بەڵام ئەمەش مانای وایە کە ڕەگوریشەی حەقیقەت لە بوونی مرۆیی **Dasein** و لە خودێتی **Subjectivity**دایە. (گەرچی هایدیگەر نەیدەویست ئەم زاراوەیەی کیرکەگۆر بەکاربهێنێت. لەبەرئەوەی بوونی مرۆیی ڕۆشناییە لە تاریکیی بوون **Being**دا و مرۆڤیش ئەو جێیەیە کە کرانەوەکەی تیاڕوودەدات، هەربۆیە ئەو بە هۆی بوونیەوە لە دەرەوەی خودی خۆیدا، بوونی "لە حەقیقەتدا" هەیە (یان لە ناحەقیقەتی حەشاربووندا).

گەر بمانەوێ ئەم بەشە پوخت بکەینەوە دەڵێین کە فەلسەفەی بوونگەرایی بانگەشەمان دەکات بۆئەوەی کە پێویستمان بەوەیە کە لە پرۆسەی تێگەیشتن و زانین و حەقیقەتدا زۆر زیاتر بایەخ بە فاکتەرە شەخسی و بوونگەراییەکان بدەین.

گەر هەندێ فەیلەسووفی بوونگەراش لە ڕەخنەگرتنیاندا بۆ بابەتێتیی زانست و ئەبستراکتیی، زێدەڕۆ بووبن، ئەوا دەشێ لەو کارەیاندا پاساوی خۆیان هەبێت بەوەی هەوڵی دروستکردنەوەی هاوسەنگی ئەدەن و ئەوەمان بیردەخەنەوە کە هەموو تێگەیشتن و زانین و حەقیقەتێك لە چوارچێوەی بوونی شەخسیدا ڕووئەدات.

## ١–بیرکردنەوە

ئێمە لەم بەشەشدا تا ڕادەیەکی زۆر درێژە بە لە لێکۆڵینەوەی ئەو کێشانە ئەدەین کە لە بەشی پێشوودا لێمانتۆژینەوە، واتە لایەنی ئەقڵی و مەعریفی لە بوونی مرۆییدا. ئەوە بوو زانیمان چۆن فەلسەفەی بوونگەرایی جەختێکی زۆر لەسەر گرنگیی ئەو (پرۆسەیە) دەکات کە بە هۆیەوە لە تێگەیشتن لە حەقیقەت و ناسینی، یان گەیشتن پێی نزیك دەبینەوە. ئەم شتانەش حازربەدەست نین تا لێیان وردبینەوە، بەڵکو دەبێ لە ڕێی هەوڵی تاکەکەسیەوە بەدەستیانبهێنین. بیرکردنەوە **Thinking**ش ئەو چالاکیەیە کە لە ڕێیەوە بە مەعریفە دەگەین، زمانیش پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە هزر (یان بیر) **Thought**ەوە هەیە و دەکرێ بڵێین بەرجەستەکردنی هزرە.

فەلسەفەی بوونگەرایی بەم تێڕوانینەی بۆ بیرکردنەوە دیسانەوە لە زۆربەی نەریتی فەلسەفی جیادەبێتەوە. بە تایبەتی ئەو نەریتە کۆنەی کە دەڵێت هزر و ڕاستی (یان

واقیع) Reality شتێکن، ئەم نەریتەش لانی کەم دەچێتەوە سەر پارمەنیدس کە دەڵێت "بیرکردنەوە و بوون شتێکن".

ئەم نەریتە بەردەوام بەسەر فەلسەفەی خۆرئاوادا زاڵبووە و، پێدەچێ ڕێکترین گوزارشتی خۆیشی لە فەلسەفەکەی هیگڵدا بینیبێتەوە کە دەڵێت ئەوەی واقیعیە مەعقولە، هزرێکی ڕەهایە و بیر لە خۆی دەکاتەوە. ئەوە بوو کیرکەگۆر بە تایبەتی دژ بەم فەلسەفەیە وەستایەوە و وتی کە بیرکردنەوە و بوون، یان هزر و واقیع یەك شت نین، بەڵکو ئەوە واقیعە کە بیرکردنەوە ئەتەقێنێتەوە.

ئەوە بوو پێشتر ئاماژەمان بۆ ڕەخنەکانی کیرکەگۆر کرد لە "هزری ئەبستراکت": "لەبەرئەوەی هزری ئەبستراکت بریتییە لە هزر لە ڕوانگەیەکی ئەزەلییەوە" هەر بۆیە دەبینین قەیرانی بوونەوەری تاك فەرامۆش دەکات کە ئاوێتەیەکە لە زەمانمەندی و ئەزەلیەت و لەناوجەرگەی بووندایە" .

ڕەخنەکەی کیرکەگۆر ڕێك لەسەر ئەوە بوو کە هزر لە واقیعمان دادەبڕێت و جیهانی هزر جیهانی بوونی ڕاستەقینە نییە، بەڵام دەبێ ئێمە وریا و بەئاگابین لەوەی کە کیرکەگۆر بە ڕاشکاوی قسە لەسەر هزری ئەبستراکت دەکات. چونکە زۆرجار ناکۆکیی بوونگەرایی لەگەڵ ئەقڵپەرستی intellectualismدا وا لێکدراوەتەوە کە هێرشکردنە سەر هزرە بە شێوەیەکی گشتی. ڕاستە ئێمە هەندێ جار لای کیرکەگۆر و ئۆنامۆنۆ و فەیلەسووفانی دی ڕستەی توندڕەوانەی وا دەبینینەوە کە بانگەشە بۆ وازهێنان لە هزر و پەیڕەویکردن لە ویژدان و ئیرادە دەکات. بەڵام تەوژمی سەرەکیی بوونگەرایی بە ئاراستەی وازهێنان لە هزردا ناڕوات (گەر ئەمە ڕوویبدایە، دەبووە پرۆژەیەکی ئەستەم) بەڵکو بە ئاراستەی بانگەشەکردن بۆ داننان بەوەدا کە هزر شێوەی جیاجیای هەیە. ئەو هزرە ئەبستراکتەی کە کیرکەگۆر ڕەخنەی لێگرتووە لەوەدیهێنانی ئامانجیدا دووچاری شکست دەبێت لەبەرئەوەی هەوڵدەدات تاییێکی وردی وەها بەسەر واقیعدا بسەپێنێت کە بوونی کردەیی بە درۆی دەخاتەوە، لەبەرئەوەی کێشەی هزر لەوەدا نییە کە هزرە،

بەڵكو لەوەدایە كە هزرێكی ئەبستراكتە نەك هزرێكی دیالەكتیك بەو مانایەی كە كیركەگۆر لە وشەی "دیالەكتیك" گەیشتووە. بەم جۆرە هەر خۆی پەرە بە چەمكی پارادۆكس (موفارەقە) ئەدات، پارادۆكس ناودژێتییەكی ئاشكرا نییە بە رەتكردنەوەیەكی هزر بژمێردرێ، بەڵكو "پارادۆكس ناودژێتییەكان یەكدەخات" نەك لە رێی تواندنەوەیانەوە لە بونیادێكی ئەقلانیدا، بەڵكو بەوەی كە واز لە ئەقڵ و پارادۆكس بهێنین تا لە ئیماندا ئاشت ببنەوە. "ئەقڵ و پارادۆكس لەم قۆناغەدا بە شادمانییەوە رووبەرووی یەك دەبنەوە و لێرەدایە كە ئەقڵ لادەچێت و جێ چۆڵدەكات تا پارادۆكس دەركەوێت. قەوارەی سێیەمیش كە ئەم یەكبوونەی تیادێتە دی.. ئەو خرۆشانە زاڵە كامەرانەیە كە ناوێكی بەسەردا دائەبڕین، گەرچی ناولێنانیشی زۆر گرنگ نییە، ئەم خرۆشانە زاڵە ناودەنێین ئیمان **Faith**".

وێڕای ئەمەش كیركەگۆر هەندێ جار وا دەردەكەوێ كە زۆر لە نائەقڵگەرایی **Irrationalism** نزیك بێتەوە. ئەمەش كاردانەوەی لای فەیلەسووفە بوونگەراكانی دی دروست كردووە. دەكرێ بڵێین كارل یاسپەرز ئەو فەیلەسووفە بوونگەرایەیە كە زۆر وریایانە رێزی لە داخوازییەكانی ئەقڵ و بیركردنەوە گرتووە، ئەقڵ بەر لە هەموو شتێك فاكتەرێكی سەرەكیی پێكهاتەی بوونی مرۆییە. لە كاتێكیشدا یاسپەرز هاوڕایە لەگەڵ كیركەگۆردا كە واقیع لە سەروو ئەقڵەوەیە، بەڵام ئەو جیابوونەوە لە نێوانیاندا نابینێت. بگرە بە پێچەوانەوە، جۆرێك لە چوونیەكی لە نێوان وێناكردنەكانمان و واقیعدا هەیە لەبەرئەوەی ئەو وێناكردنانەمان هەموو لەناو "گشتگیر **Encompassing**"دا هەیە، كە پێدەچێ هەمان ئەو ئەركە ئەنجام بدات كە كیركەگۆر بۆ پارادۆكس تەرخانی كردووە. بێگومان یاسپەرز سنوورەكانی هزر دەزانێت، دواتر قسە لەسەر مانای ئەو شتە دەكەین كە ئەو ناوی دەنێت "جفرەكان **Ciphers**" كە بریتین لەو بیرۆكانەی هەوڵدەدەین بە هۆیانەوە ئەو راستیانە وێنابكەین، كە لە رێی هزرەوە دەرك ناكرێن.

بەلاّم یاسپەرز بە راستی گومان لە نائەقلگەرایی و رۆمانتیزم و سۆزگەرایی Emotionalism دەکات. هەموو ئەمانەش ڕێبازگەلێکن کە سەدەی بیستەم لە دیاردەی نازیزمدا ڕواڵەتی ترسناکیانی بینیوە. فەلسەفەی بوون ناچارە حساب بۆ ئەقڵ بکات، لەبەرئەوەی هەم فەلسەفەیە و هەم بوونگەراشە. یەکێك لە تۆژەرەوە قووڵەکانی یاسپەرز ئەمەی بەم جۆرە دەربڕیوە: "ڕەتکردنەوەی شێوەی توندڕەوانەی ئەقڵپەرستی مانای ئەوە نییە کە ئێمە خۆمان فڕێدەینە ناو باوەشی خودپەرستی و نائەقلگەرایی (یان نائەقلانیەت)ەوە. ئەوە شتێکی دەبەنگانەیە کە ئەقڵ وەکو خۆی ڕەتبکەینەوە، بە پێچەوانەوە ئێمە دەبێ پێ لەسەر بەهێزیی ئەقڵ و ئەو کاراییەی دابگرین کە بوون ڕەگاژۆ بووە تیایدا و سەرچاوەکەشیەتی .

مارتین هایدیگەر زۆری لە بارەی هزر و بیرکردنەوەوە گوتووە. ئەوە دەڵێت کە بیرکردنەوە توخمێکی بنەڕەتیی بوونەوەری مرۆییە.

بەلاّم ئەو لە ڕێی جیاکردنەوەی تایپ و ئاستە جۆراوجۆرەکانی بیرکردنەوەوە توانیی بلّێت کە جۆرێك لە بیرکردنەوە هەیە کە لە جۆرەکانی دی بنەڕەتی ترە. بۆ نموونە ئەو لەگەڵ ئەوەدا نییە کە پێی دەوترێ "بیرکردنەوەی حسابگەرانە": چونکە ئەوە بیرکردنەوەی رۆژانەیە کە کێشە کردەییەکانمانی پێ چارەسەر دەکەین، هەروەها لە لایەکی ترەوە بیرکردنەوەی زانستە سروشتیەکانە. ئەم بیرکردنەوەیەش لەم رۆژگارەماندا ئامێرەکان زۆر بە وردی ئەتوانن ئەنجامی بدەن، لەوانەیە هەر ئەمەش بەلّگەیەك بێت بۆ ئەوەی کە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە ئەو بیرکردنەوەیە نییە کە ئادەمیزاد جیادەکاتەوە. چونکە بێگومان ئەبێ بیرکردنەوەی مرۆیی لە بیرکردنەوەی حسابگەرانە و هی کۆمپیوتەر جیاواز بێت. بێشك ئەبێ بیرکردنەوەیەك بێت هەلّقولاّوی بوون بێت، بە گوێرەی ئەو دەستەواژەیەش کە بەکارمان هێنا وەختێ قسەمان لەسەر یاسپەرز کرد. هایدیگەریش کتێبەکەی خۆی "بەچی دەگوترێ بیرکردنەوە؟" بەم قسەیە

دەستپێدەکات "ئێمە کاتێك لە بیرکردنەوە تێدەگەین کە خۆمان هەوڵمان دا بیربکەینەوە ".

بەڵام ئەو بیرکردنەوەیەی کە هایدیگەر زۆر لەسەری ڕادەوەستێت و ناوی دەنێت "بیرکردنەوەی بنەڕەتی" یان بیرکردنەوەی گەوهەری، بە تەنها لە بوونی مرۆییدا ڕەگاژۆ نییە، بەڵکو لە بوونی گشتیشدا. لەبەرئەوەی بیرکردنەوە کاردانەوەی ئێمەیە بۆ بوون و هاوژیانیی ڕامێنانەی ئێمەیە بۆ واقیع.

ئەمەش شێوازێکی جیاوازە بۆ لێکدانەوەی قسەکەی "پارمنیدس" سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان بیرکردنەوە و بوون: هزر واقیع پێکناهێنێت، بەڵکو بوون لەو شتەدا گوزارشت لە خۆی دەکات کە ڕاستترین ناولێنانی: هزرە. ئەم بیرکردنەوە بنەڕەتییەش هیچ پەیوەندییەکی بە مۆرکی ئیجابیی کردەیی بیرکردنەوەی حسابگەرانەوە نییە. بە پێچەوانەوە سەلبی و قبووڵکەرە. هایدیگەر یەکێك لە کتێبەکانی خۆی ناوناوە "گۆشەگیری Gelassenheit"، ئەمەش وشەیەکە لەناو کەلتووری سۆفییانەی ئەڵماندا مێژوویەکی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ ئیکهارت*. ئەم وشەیە بە شێوەیەکی گشتی بە "گۆشەگیری" یان "تەریکی" وەردەگێڕێ. بەڵام ناونیشانی کتێبەکە لە وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەیدا "وتارێك سەبارەت بە بیرکردنەوە" بوو. ئەمەش دوورکەوتنەوەیەکی گەورە نییە لە مەبەستەکە، مادامەکی بە ڕای هایدیگەر ئەم گۆشەگیرییە بەرزترین ئاستی بیرکردنەوەی مرۆییە.

* مایستەر ئیکهارت (Eckhart, Meister ( - ) سۆفییەکی ئەڵمانییە، لە سەرەتای ژیانیدا چووە ڕیزی دۆمینیکانییەکانەوە، ماوەیەك لە کۆلۆنیا و پاریس خوێندی، دواتر بووە قەشەی گشتیی ناوچەی بۆهیمیا، پاشتر لە هەموو ئەڵمانیادا ناسراو تەنانەت بە دامەزرێنەری تەسەووفی ئەڵمانی لە قەڵەم ئەدرێ، لە تەسەووفەکەیدا پشت بە خواناسی یان ڕامانی میتافیزیکی نابەستێت، بەڵکو بە شیکردنەوەی بۆ ئەزموونی سۆفێتیانەی تاکەکەسی.

ئـەم سـەرنجانەی هەنـدێ لـە فەیلەسـووفە بوونگـەراکان سـەبارەت بـە بیرکردنـەوە کتێشەیەك لە لۆجیك (مەنتیق)دا دەورووژێنێت، هـەر بۆیـە بـە شـێوازێکی نـوێ کێـشەی "نائەقڵانیەت" لە بوونگەراییدا دەهێنێتەوە پێشەوە. هەروەها کێـشەی ئـەوە دێنێتـەوە گۆڕێ کە ئاخۆ بوونگەرایی بۆی هەیە ناوی فەلسەفە لە خۆی بنێت. لەبەرئەوەی بـەر لـە هەموو شتێك لۆجیك ڕێساکانی بیرکردنەوەمان ئەداتێ، بەڵام گەر پەیڕەوی لەم ڕێسایانە نەکرێ، چۆن دەتوانین لافـی ئـەوە لێبـدەین کـە خـەڵك هێـشتا هـەر بیردەکەنـەوە، یـان بەرهەمی بیرکردنەوەکەیان پێی دەوترێ فەلسەفە؟ لەوانەیـە هـەقی خۆمـان بێـت بڵـێین پارادۆکسەکانی کیرکەگۆر ناودژێتیی ئاشکرانین، بەڵام بـە دڵنیاییـەوە نالۆجیـك illogical ن و ئاخۆ ئێمە داوای هەرچیەك لە فەیلەسووف بکەین، ئەی نابێت چاوەڕوانی ئـەوە بـین لێی کە مەنتیقی بێت؟ کاتێك دەسبەرداری مەنتیقیش دەبێت، ئـاخۆ بـەوە دەسـبەرداری فەلـسەفەش نابێـت؟ ئایـا نـاتوانین هـەمان ئـەم ڕەخنانـە لـە زۆربـەی فەیلەسـووفە بوونگەراکانی تریش بگرین؟ بۆ نموونە، کاتێك هایدیگـەر هەنـدێ شـێوەی بیرکردنـەوەی ڕامێنانەی نیمچە سۆفییانە دەخاتەڕوو، بە تایبەتیش لە نووسینەکانی دواییدا، کـە ئـەوە مافی ڕەوای خۆیەتی، بەڵام ئاخۆ بەوە بە ئاشکرا ڕاینەگەیاندووە کـە وازی لـە فەلـسەفە هێناوە؟ لە ڕاستیدا ئەو دەڵێت: "چەمکی" مەنتیق لە گێژەڵووکەی باسـێکی ڕەسـەنتردا ون دەبێت . بەڵام ئاخۆ باسـێك هەیـە کـە دەسـبەرداری مـەنتیق بێـت و ڕەسـەنتربێت. هەروەها ئاخۆ ئەم باسە باسێکی فەلـسەفییە؟ بێگومـان وەڵامـی ئـەم جـۆرە پرسـیارانە ئەوەیە کە هەروەکو چۆن تایپی جۆراوجۆر یان ئاستی جۆراوجۆری بیرکردنەوە هەیە، بە هەمان شێوە گـەلێ جـۆری مـەنتیقیش هەیـە. بـە درێـژایی ڕابـردوو بـە تـەنها جۆرێـك لـە مەنتیق بەسەر فەلسەفەی باودا زاڵ بووە، بەڵام لەوە دەچـێت کـاتی ئـەوە هاتبێـت ئـەم ستەمە تێکبشکێنرێ و دان بەوەدا بنێین کە شێوازی جۆراوجۆر هەیە بـۆ فەلـسەفاندن و ئەم فەلسەفانەش مـەنتیقی تایبـەتی خۆیـان هەیـە. ئەشـێ فەیلەسـووفی بوونگـەرا لـەم ڕۆژگـارەدا کۆمـەك لـە خـاوەنی ڕێبـازی شـیکاریی مـەنتیقی وەربگرێـت و بـە تایبـەتیش

نووسینەکانی دوایی "ڤیتگنشتاین" و پەیڕەویکارانی. لەبەرئەوەی خاوەنی ئەم ڕێبازەش دەڵێت کە مەنتیق (لۆجیك) جۆری زۆرە. گەمە زۆرن و هەر گەمەیەش ڕێسای تایبەتیی خۆی هەیە.

بەڵام گەرچی من لەگەڵ ئەو ڕەخنەگرانەدا نیم کە بە بۆچوونی ئەوان کیرکەگۆر و ئۆنامۆنۆ و هایدیگەر و ئەوانی تر دەسبەرداری فەلسەفە و مەنتیق و بگرە بیرکردنەوەش بوون، بەڵام دەبێ دان بەوەشدا بنێم کە لۆجیکی تەقلیدی سەر بە شێوازێکی بیرکردنەوەیە کە ورد و ڕوونە، هەروەها بیرکردنەوەی بوونگەرایانە بەردەوام مەترسیی ئەوەی لێ دەکرێ کە ببێت بە هزرێکی پەرشوبڵاو، کە هەڵچوون و قەناعەتی تاکەکەس تیایدا بەسەر بەڵگە و سەلماندندا زاڵ بێت و، ناڕوونی تیایدا بە قووڵی لە قەڵەم بدرێ. هەر بۆیە جێی خۆیەتی بڵێین کە پێویستە ئەو فەیلەسووفە بوونگەرایانەی کە لافی ئەوە لێدەدەن تاپیە باوەکانی هزر و مەنتیقیان تێپەڕاندووە زۆر بە ڕوونی پێمان بڵێن چی دەکەن و، مەنتیقی تایبەتیی ئەوان چییە.

## ٢–زمان

لە ڕێی زمانەوە گوزارشت لە هزر دەکرێ، زەحمەتیشە هیچ هزرێك بەبێ زمان دابمەزرێ. تەنانەت هزری نەگوتراویشمان بە وشە و ڕستە گوزارشتی لێدەکرێ. دەشێ

---

* لودڤیگ ڤیتگنشتاین (١٨٨٩–١٩٥١) Wittgenstein, Ludwig فەیلەسووف و لۆجیکناسێکی نەمساوییە و لە دامەزرێنەرانی فەلسەفەی شیکارییە، لە کتێبەکەیدا "نامەیەکی مەنتیقی–فەلسەفی" (١٩٢١) بیرۆکەی زمانێکی تەواو کامڵ لە ڕووی مەنتیقییەوە پێشنیاز دەکات و نموونەی ئەو زمانەش لە زمانی مەنتیقی لەخۆ دەگرێت، هەروەها کاریگەری لەسەر پەرەسەندنی مەنتیقی ماتماتیکیدا دەبینێتەوە. ئەم کتێبەی بۆچوونە سەرەکیەکانی پۆزیتیڤیزمی مەنتیقی لەخۆدەگرێت،هەروەها کاریگەریی لەسەر پەرەسەندنی مەنتیقی نوێ هەبووە. بیروڕاکانی دواتری لە کتێبی "هەندێ باسی فەلسەفی"دا کۆکراوەتەوە کە پاش مەرگی لە ساڵی ١٩٥٣دا بڵاوکراوەتەوە.

هەندێ جۆری بیرکردنەوەی ڕامێنانە هەبێت کە پێویستی بە وشە نەبێت. گەلێ لە بوونگەراکانیش بە قەدرزانینەوە باس لە بێدەنگی دەکەن، بەڵام ئەم بێدەنگییەش پاش قسەکردن دێت. بۆ نموونە لای فەیلەسووفێکی وەکو "یاسپەرز" ئێمە لە ڕێی بیرنەکردنەوە و قسەنەکردنەوە ناگەینە بێدەنگی، بەڵکو لەوپەڕی بیرکردنەوە و قسەکردنەوە دەگەینە بێدەنگی و پاش ماوەیەکی کەمیش وامان لێدەکەن سەرلەنوێ قسەبکەینەوە . بەڵام بەدەر لە حاڵەتە ئاوارتەکان، هەموو بیرکردنەوەیەك پێویستی بە زمانە. هەر لە ڕێی زمانیشەوەیە کە بیرکردنەوە دەبێت بە شتێکی گشتی و دەچێتە بەردەستی خەڵك، ئەمەش توخمێکی گەوهەریی بوونمان -لە- جیهاندایە.

لە نووسینەکانی فەیلەسووفە بوونگەراکاندا زۆر قسە لەسەر زمان کراوە، گەرچی کاری سەرەکییان ئەوە نییە، وەکو لای فەیلەسووفانی شیکاریی مەنتیقی دەبینین. لەوانەشە شتێکی سوودبەخش بێت لە سەرەتای باسەکەمانەوە بپرسین ئاخۆ جیاوازیی نێوان تێڕوانینی بوونگەرایانە و تێڕوانینی شیکارەکان بۆ زمان چییە. ئەوەندەی من بزانم فەیلەسووفی شیکار گرنگی بە بونیادی ناوەوەی زمان ئەدات، یان بە پێکهاتەی مەنتیقیانەی. هەروەها بایەخ بە شێوازی پەیوەندیی زمان بە جیهانەوە ئەدات و، وشەکان "دەلالەت" لەچی ئەکەن و "ئاماژە بۆ چی دەکەن"؟ هەروەها مەسەلەکان چۆن مانایان دەبێت و مەرجی ڕاستییان چییە؟ بەڵام بایەخپێدانی فەیلەسووفی بوونگەرا جیاوازە، لەبەرئەوەی ئەم وەکو دیاردەیەکی مرۆیی گرنگی بە زمان ئەدات زیاتر لەوەی گرنگی بە بونیادی ناوەوەی بدات یان بە پەیوەندییەوە بە شتێکەوە. لە ڕاستیدا فەیلەسووفی بوونگەرا لە بنەڕەتدا بایەخ بە وشەی گوتراو ئەدات، بە قسە بەوپێیەی دیاردەیەکی مرۆیی تەواوە. هەر بۆیە بایەخ بە ئاوازی دەنگ و هێما و دەربڕینی دەموچاو ئەدات. ئەمانەش کۆمەڵێك تایبەتمەندین کە مەنتیق (لۆجیك) گرنگییان پێنادات، بەڵکو بە واقیعی زمانەوە وابەستەیە، ئەو واقیعەی کاتێك وشەی چاپکراو یا نووسراو جێی قسەی گرتەوە، نامێنێت.

هەمیشە توخمە بوونگەراکان یان مرۆییەکان لە زماندا ئامادەن، گەرچی هەندێ جار روونتر بەدەردەکەون. فۆرمە ماتماتیکیەکانی کتێبەکانی خوێندن نموونەی حاڵەتێکمان ئەداتێ کە تیایدا وردە وردە مۆرکی شەخسی یان بوونگەرایانەی زمان لاواز دەبێت و خەریکە هەر دیارنامێنێت. لە کاتێکدا قسەکردنی سیاسی دەبێ نموونەیەکی ترمان پێشکەش بکات کە تیایدا لایەنە شەخسیەکانی زمان زەق و روونن. بەڵام ئەو جیاکارییە سوونەتیە لە نێوان زمانێکی هەواڵئامێز و زمانێکی تەعبیری یان هەڵچوونئامێزدا، جیاکارییەکی زۆر ساویلکانەیە، لەبەرئەوەی زۆربەی زمانەکەمان بریتییە لە دیاردەیەك کە تا رادەیەکی زۆر هەردوو جۆرەکەی تیا ئاوێتە دەبێت. لەوانەیە زمانێك نەبێت کە تەواو ناشەخسی بێت.

پێدەچێ دوو رێگا هەبێت کە بە هۆیانەوە زمان بە شێوەیەکی نەپساو بە بوونی شەخسییەوە دەبەسترێتەوە، یەکەمیان ئەوەیە کە هەر زمانێك زمانی کەسێکە. زمانم لە بۆشاییەوە سەرهەڵنادات، بەڵکو لە مرۆڤێکی قسەکەر (Homo Loguens)ەوە سەرچاوە دەگرێت. لە راستیدا شتێك نییە لە زمان مرۆییتر بێت، تەنانەت ئەو کاتانەش کە شێوەی ئەبستراکت بە خۆیەوە دەگرێت. دووەمیشیان ئەوەیە کە: هەموو زمانێك ئاراستەی کەسێك دەکرێ (بە گریمانەی منیش ئەمە شتێکی راستە، تەنانەت لەو حاڵەتانەشدا کە مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا ئەدوێت) چونکە یەکێك لە ئەرکە سەرەکیەکانی زمان وەدیهێنانی پێکگەیشتن و لێکگەیشتنە.

کەواتە ئەتوانین بڵێین کە فەیلەسووفی بوونگەرا زیاتر بایەخ بە شیکردنەوەی بوونگەرایانەی زمان ئەدات وەك لە شیکردنەوەی مەنتیقی، چونکە ئەرکی ئەو چوونە قووڵایی ئەو پەیوەندییە بوونگەرایانەیە کە وا لە زمان ئەکەن مومکین بێت و هەروەها خۆیشیان لە رێی زمانەوە مومکین دەبن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لێکۆڵینەوەی بوونگەرایی بۆ زمان لە چوارچێوەی بوون لەگەڵ ئەوانی تردا ئەنجام دەدرێ. لە لاپەرە سەرەتاییەکانی کتێبی "من و تۆ"ی "بووبەر"دا کۆمەڵێك سەرنجی گرنگ سەبارەت بە

زمـان دەبینینـەوە. ئـەو لـەو لاپەڕانـەدا چـەمکی "مـن– تـۆ" و چـەمکی "مـن– ئـەو" ڕووندەکاتەوە. هـەروەکو پێـشتریش سـەرنجمان دا ئـەم وشـانە وشـەی دابـڕاو نـین وەك "من" و "تـۆ" و "ئـەو"، بـەڵکو کۆمـەڵێك وشـەی ئاوێتـەن کـە لـەناو خۆیانـدا بوونمـان –لەگەڵ– ئەوانی تردا لە جیهاندا هەڵدەگرن. "کە وترا "تۆ" لەگەڵیـدا دەگـوترێ مـن کـە لەوشەی "من– تۆ"دا ئاوێتەی یەکدی دەبن.

لێرەدا جەختکردنەوە لەسەر ڕەهەندی شەخسییانەی زمـان دەبینینـەوە، واتـە بـەو پێیەی کە بـەردەوام ئامرازێکـە بـۆ پەیوەنـدیکردن لـەناو خەڵکدا. وشـە سـەرەتاییەکان دەلالەت لە شتەکان ناکەن، بەڵکو ئاماژە بۆ پەیوەندییەکان دەکـەن. لەبەرئـەوەی وشـە سەرەتاییەکان ناتوانن وەسـفی شـتێك بکـەن کـە بـوونێکی سـەربەخۆی لـەوان هـەبێت، بەڵکو کاتێك دەگوترێ لەگەڵ خۆیاندا بوون دەهێنن . ئـەم دەسـتەواژەیە بایەخنـەدانی بوونگەرایانە یان شەخسییانە بەوە دەخاتەڕوو کە پێی دەوترێ ئەرکی سـەرەکیی زمـان بەوپێیەی قسەکەر بە کەسێکی ترەوە دەبەستێتەوە. پێدەچـێ "بووبـەر"یـش جـەخت لەسەر ئەوە بکات کە پەیوەندییەکی پێشین لەگـەڵ کەسـێکی تـردا قـسە ناخوڵقێنێـت، بەڵکو قسە ئەو پەیوەندییە دەخوڵقێنێت.

منیش بیرۆکەیەکی وەها لە زەینمدا بوو کاتێ لە کۆتایی برگەی پێشوودا دەربـارەی "ئەو پەیوەندییە بوونگەرایانەیەی کە وا لە زمان دەکەن مومکین بێت و خۆشیان لە ڕێـی زمانەوە مومکین بن" قسەم کرد. بەڵام من لەو بڕوایەدام کە بێهوودەیە لەوە بپرسـین کـە ئاخۆ بوون لەگەڵ ئەوانی تردا پێش زمان دەکەوێت یان زمان پێش بـوون لەگـەڵ ئـەوانی تـردا دەکـەوێت، لەبەرئـەوەی بـوون لەگـەڵ ئـەوانی تـردا –ئەگـەر بـە مانـا بوونگەرایانـە شەخسیە تەواوەکەی وەریبگرین –لە مۆرکی بنەڕەتیدا لەگـەڵ زمانـدا یەکسانە. دواجـار بووبەر وای بۆ دەچێت کە زمانی "من– تۆ" لەگەڵ تەواوی بوونـدا ئـەدوێن و بـە تـەواوی گوزارشت لە شەخس دەکات، لە کاتێکا زمـانی "مـن– ئـەو" ئـەم کـارە ئـەنجام نـادات. زمان بە پلەی جیاجیا پەرە بە خۆی ئەدات.

وای دەبینم کە ئەو دێڕە کورتانەی بووبەر تۆوی شیکردنەوەیەکی بوونگەرایانەیان تیایە. گەرچی نووسەرە بوونگەراکانی دی جەختیان لەسەر کۆمەڵێك لایەنی جۆراوجۆری تری ئەم بابەتە کردۆتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا شتێکی تازە بۆ سەرنجەکانی بووبەر ئیزافە ناکەن. بۆ نموونە هایدیگەر لە سەرەتای ژیانیدا (لێکۆڵینەوەی بیروبۆچوونەکانی دواتری سەبارەت بە زمان بۆ دوایی هەڵدەگرین) شیکردنەوەیەکی وردمان لە بارەی گوتار Discourseەوە بۆ ئەنجامدەدات بەوپێیەی مۆرکێکی بوونگەرایانەی بنەڕەتییە و لە چوارچێوەی گوزارشتکردن و پەیوەندیکردندا بەدی دێت. بەڵام ئێمە دەبینین کە ئەو خاڵە سەرەکییانەی لەم شیکردنەوەیەدا هاتوون، بووبەر ئاماژەی بۆ کردوون. لەگەڵ ئەمەشدا هایدیگەر وای بۆ چووە کە جۆرێك لە "بوون لەگەڵ ئەوانی تردا" هەیە پێش زمان دەکەوێت، هەروەها بایەخ بە پەیوەندیی زمان بە واقیعەوە ئەدات (وەك چۆن ئێمەش پاش تۆزێکی تر وا دەکەین) . هەروەها سارتەریش ڕای وایە کە زمان دیاردەیەك نییە لە پێناوی ئەوانی تردا بخرێتە سەر بوون، بەڵکو خۆی لە بنەڕەتدا بوونە لە پێناوی ئەوانی تردا، واتە ئەوە ڕاستە کە خودێك هەیە لە بری ئەوی دی خۆی تاقی دەکاتەوە . لێدوانی "سارتەر" لەسەر زمان دەچێتە چوارچێوەی سەرنجەکانییەوە سەبارەت بە فریودان Seduction، لەبەرئەوەی من بۆئەوەی وا لەویتر بکەم منی خۆشبوێت، ئەبێ وا لە خۆم بکەم ببمە بابەتێکی سەرنجڕاکێش بۆ ئەو، بابەتێك کە ئەفسوونی لێ بکات و دڵڕفێن بێت بۆی. ئەمەش بە تەنها لە ڕێی زمانەوە (بە مانا فراوانەکەی) ئەتوانم بیهێنمە دی. "سارتەر"یش دان بەوەدا دەنێت کە زمانی سەرەتایی بە پێویست زمانی فریودان و دڵڕفێنی نییە و گەلێ شێوەی تری هەیە. بەڵام دەکرێ "زمان لە ڕێی فریودان و دڵڕفێنییەوە بە یەکجاری و بەوپێیەی شێوەی سەرەتایی گوزارشتکردنە، ئاشکرا ببێت" . لە ڕاستیدا مەیلی سارتەر بۆ بایەخدان بە پەیوەندییە ناڕەسەنەکان لەگەڵ ئەوانی تردا بە نەخشەکێشانێك ئەژمێردرێ بۆ ئەو پەیوەندییەی کە تا ڕادەیەك مۆرکێکی ئایدیالیستیانەی بە خۆوە گرتووە، واتە پەیوەندیی "من– تۆ" کە

بووبەر جەختی لەسەر دەکردەوە، سەرباری ئەوەی بووبەر تەواو دەیزانی کە ئەم پەیوەندییە لەرزۆکە و بەرەو نەمان دەڕوات.

هەر شیکردنەوەیەکی واقعیانە بۆ زمان دەبێ جووتلایەنی Ambivalenceی دەلالی لە زماندا لەبەرچاو بگرێت. دەشێ ئامرازێکی گەیاندن بێت، بەڵام هەروەها دەشێ ئامرازێکی فریودانیش بێت. کەواتە ئەو پێوەرانە چین کە دەتوانین بە هۆیانەوە حوکم بەسەر زماندا بدەین؟ لێرەدا دەتوانین لێدوانینەکانی پێشوومان سەبارەت بە حەقیقەت بهێنینەوە یادی خۆمان، بە تایبەتیش تێگەیشتنی هایدیگەر بۆ حەقیقەت بەوەی کە ئاشکرابوونە، ئەو لە چوارچێوەی پرۆسەی کەشف و ئاشکرابوون (یان پەردەهەڵماڵین)دا کە پێشتر لە بارەیەوە دواین، لە پەیوەندیی زمان بە واقیعەوە دەگات. زمان وێنەیەك نییە لە واقیع، تا بەم پێیە داوەریی واقیع بکەین کە ئایا چوونیەکیەکی سەد دەرسەد لە نێوان ئەم وێنەیە و ئەو ڕاستییە واقیعییەدا هەیە کە دەلالەتی بۆ دەکات یان نا؟ حەقیقەت لە مەسەلەدا نییە، بەڵکو لە واقیع خۆیدایەتی. زمان ڕێمان پێئەدات (و وامان لێدەکات) ئەو شتەی کە باسی ئەکەین وا بێتە بەرچاو کە خۆیەتی. هەروەها زمان سەرکەوتووانە پرۆسەی گەیاندن ئەنجامدەدات کاتێ بۆ دوو کەس یان زیاتر بوونیان -لە- جیهاندا ڕۆشن دەکاتەوە و وا لە هەر یەکێکیان دەکات ئەو شتە ببینێت کە ئەوی تریان دەیبینێت. دیارە ئەم لێکدانەوەیەش بۆ زمان بایەخێکی زۆر ئەدات بە ڕاستی و دروستیی بەکارهێنانی شەخسیانەی زمان، هەروەها بە وردیی مەنتیقیانەی زمان خۆیشی.

بەڵام گەلێ شێوەی زمان هەن کە ئەم ڕۆشنکردنەوە و گەیاندنە بەدی ناهێنن. کیرکەگۆر نووسیویەتی و دەڵێت: "چ گاڵەجارپییەکە، مرۆڤ دەتوانێ لە ڕێی قسەوە خۆی بخاتە ئاستێکی نزمتر لە ئاستی گیانەوەرانەوە و ببێتە کەسێکی چەنەباز" . هایدیگەر وشەی "چەنەبازی Gerede" بەکاردەهێنێت بۆ گوزارشتکردن لەو جۆرە قسەکردنەی کە هیچ ناگەیەنێت و پەردە لەسەر بوونەوەرەکانیش هەڵناماڵێت وەکو ئەوەی کە هەن

"ئێمە زۆر جار لەو شتانە ناگەین کە لە بارەیانەوە ئەدوێین. بەڵکو تەنها گوێ لەوە دەگرین کە لە قسەکاندا دەگوترێن . چەنەبازی لە بری ئەوەی پەردە لەسەر شتەکان هەڵبماڵێت و بە ڕووماندا بیانکاتەوە، پەردەپۆشییان دەکات و بە ڕووماندا دایاندەخات. بەم جۆرە وشە بەکاردەبرێ و شیکردنەوەیەکی پەسەند بۆ ئەو شتە دەگرێتە خۆی کە لە بارەیەوە ئەدوێین و تەنانەت ئەبێتە بەڵگەنەویست، بەڵام هەرگیز ڕۆڵی قسەی ڕەسەن نابینێت. هەڵبەت هەر ئەم جۆرەیە لە چەنەبازیش کە سیفەتی جیاکەرەوەی "ئەوان"یان "جەماوەر"ەو یان هەرناوێکی تریان لێدەنێیت و، پشتگیری لە دەسەڵاتیان دەکات و دەبێتە ڕێگر لە بەردەم ڕووبەڕووبوونەوەی ڕەسەن یا داهێنەرانەدا "لەگەڵ خودی شتەکان خۆیاندا". هەروەها دیاردەی قسەی نارەسەن ئەوە ڕووندەکاتەوە کە بۆچی بوونگەرایی دژایەتی دۆگماتیزم Dogmatism و ئەو بیروبۆچوونانە دەکات کە لەبەر دەسەڵات یان مێژووی درێژیان لەناو دابونەریتدا قبووڵکراون. لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا زمان لە ئەرکی ڕاستەقینەی خۆی لائەدات، وشەکان بۆ ماوەیەکی درێژ بەکاردەبرێن، بەڵام تەنها وەك وشە دەیانبینین و هیچی دی. کرانەوە ڕوونادات و، ڕێمان پێنادرێ ئەو واقیعە ببینین کە ئەم وشانە گوزارشتی لێدەکەن.

هەر بۆیە فەیلەسووفی بوونگەرا واپەسەند دەکات بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکان و ڕووبەڕووی شتەکان بێتەوە وەك ئەوەی کە هەن، نەك وەك ئەو شێوازەی کە دەڵێن هەن. ئەمەش مانای ڕەتکردنەوەیەکی لەخۆباییانە نییە بۆ تەواوی نەریتەکان چ لە فەلسەفە و چ لە خوداناسی و هەروەها هونەردا، بەڵکو مانای لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەییانەیە بۆ نەریت، بە جۆرێك کە واقیعمان وەکو خۆی بۆ بگوێزێتەوە.

---

* دۆگماتیزم Dogmatism ڕێبازێکە دەیەوێ بەهای ئەقڵ و توانای بۆ مەعریفە و گەیشتن بە یەقین بسەلمێنێت و بە پێچەوانەی ڕێبازی گومانگەرا و ڕێبازی ڕەخنەگەراوەیە. دۆگماتیزم وا دەبینێت کە زانینی مرۆڤ بێ سنوورە، ئەم ئاقارە لە فەلسەفەی ئەقڵگەراکاندا لە سەدەی حەڤدە و هەژدەدا باو بوو.

گەرچی شیکردنەوە و ڕەخنەی بوونگەرایانە بۆ زمان تەواو جیاوازن لە شیکردنەوەی مەنتیقیانەی زمان، بەڵام دەبێ ئەم دوو ڕوانگەیە بە تەواوکەری یەك بزانین، نەك دژ بە یەك، چونکە هەردووکیان دان بە گرنگیی زۆری زماندا دەنێن لە کاروبارەکانی مرۆڤدا و، بەوەدا کە دەشێ بە ئاسانی گومڕاکەر و فریودەر بێت و، بەو جۆرە پێچەوانەی مەبەست بپێکێت. هەردووکیشیان بە شێوازی جیاواز ڕێنومایی گشتی بۆ بەکارهێنانی دروستی زمان دەخەنەڕوو.

## ٣–سنوورەکانی هزر و زمان

لەم بەشەدا پتر لە جارێك ئاماژەمان بە شیکردنەوەی مەنتیقی دا، بەوپێیەی جۆرێکە لە فەلسەفە کە بایەخێکی تایبەتی بە زمان ئەدات. ئاشکرایە کە زۆربەی شیکارەکانیش پۆزیتڤیستن Positivists* و بڕوایان وایە کە سنوورێکی دیاریکراو هەیە بۆ ئەو شتانەی لێیان دەدوێین یان بیریان لێدەکەینەوە، لانی کەم لێدوانێك یان بیرکردنەوەیەکی مانادار. لەم دوابەشەدا دەمەوێ بپرسم ئاخۆ شیکردنەوەی بوونگەرایانەش بۆ زمان دەتوانێ سنوورێکمان بداتێ، یان هەندێ ڕێگەی وامان بۆ پێشنیاز بکات کە بە هۆیانەوە پۆزیتیڤیزم بتوانێت خۆی لەو تەڵەزگەیە ڕزگاربکات کە تێی کەوتووە.

---

* پۆزیتیڤیزم Positivism تەوژمێکی فەلسەفییە کە لە سەدەی نۆزدە و بیستدا بەربڵاو بوو، کێشە تەقلیدییەکانی فەلسەفە ڕەتدەکاتەوە بەوپێیەی کێشەی میتافیزیکین و بە تاقیکردنەوە ناسەلمێنرێن و هەر بۆیە چارەسەریان نییە. ئەم ڕێبازە لە سێ شێوەدا پەرەی سەند: یەکەمیان پۆزیتیڤیزم لە فەرەنسا کە "کۆنت" و "لیتریە" و "لانت" نوێنەری بوون. دووەمیان لە نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەدا "باخ" و "ئەفیناریۆس" نوێنەری بوون، سێیەمیشیان کاتێ گۆڕا بۆ پۆزیتیڤیزمی مەنتیقی کە بایەخ بە شیکردنەوە زمانەوانیەکان ئەدات و گرنگی بە شیکردنەوەی مەنتیقیانەی زانست ئەدات.

بێگومان تێگەیشتنی بوونگەرایانە بۆ مرۆڤ بەوپێیەی بوونێکە بەردەوام خودی خۆی تێدەپەڕێنێت، لە هەموو ڕوویەکەوە وامان لێدەکات بیرۆکەی سنورداری ڕەتبکەینەوە بۆ ئەو شتانەی دەیانڵێین یا بیریان لێدەکەینەوە. پێم وایە زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراکانیش لەگەڵ داڤید جەنکینز David E. Jenkinzدا یەکدەگرنەوە کە دەڵێت "هێشتا بڕوام وایە کە یەکێك لەو شتانەی بە ڕووی بوونەوەری مرۆییدا دەوەستێتەوە ئەوەیە کە ڕووبەڕووی دەرفەتی بڕیاردان دەبێتەوە سەبارەت بەو شتەی کە پێویستە بیری لێبکاتەوە. گەر خەڵکی ئەو شتانەیان قبوول بکردایە کە باوانیان پەسەندیان کردوون، ئەوکات نە زانستمان دەبوو، نە هەندێ ڕەهەندی مرۆیی بەرز .." ئەم دەستەواژەیە لە بڕگەیەکدا هاتووە کە "جەنکینز" دژ بە "جیهانبینی"ی "جیهانی نوێ" دەوەستێتەوە بەوپێیەی دوا پێوەری بێ قەید و شەرت بێت بۆ ئەو شتانەی کە ئێمەی مرۆڤ دەتوانین یان دەبێ بیریان لێبکەینەوە، ئەم بڕگەیەش ئەو لێدوانەمان بیردەخاتەوە کە لە دوابەشدا سەبارەت بە چەنەبازی و "ئەوان" هاتووە کە خۆی بە بەڵگەنەویست دەزانێت و جیهان بۆ مرۆڤەکان لێکدەداتەوە بەرلەوەی هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەك لەگەڵ "خودی شتەکان"دا ڕوویدات.

هەندێ لە بوونگەراکان دژ بە "میتافیزیك"یشن، بەڵام من گومانم هەیە لەوەی بتوانین ناوی "پۆزیتیڤیست" یان لێ بنێین. پێشتر بینیمان کە چۆن ئەوان لەگەڵ ئەوەدا نین کە هزر و واقیع یەك شتن، چونکە واقیع هزر تێدەپەڕێنێت. ئەم "تێپەڕاندن"ەشە کە بوونگەراکانی شەیدا کردووە و دەیانەوێ شتێکی لە بارەوە بڵێن. مرۆڤ دەتوانێ بە دەربڕینێکی کەمێك جیاوازتر بڵێت، کاتێ فەیلەسووفی بوونگەرا وەکو دیاردەیەکی بوونگەرایانە لە زمان دەکۆڵێتەوە، بەم کارەی لە ڕێبازی پۆزیتیڤیزم دووردەکەوێتەوە. لەبەرئەوەی مرۆڤ لە زماندا گوزارشت لە خۆی دەکات، بەڵام هەر خۆیەتی ئەو بوونەی کە خودی خۆی تێدەپەڕێنێت و ئەو بوونەی کە لە قووڵایی خۆیدا نهێنیی ئەو بوونە دەزانێت کە بەردەوام لە خۆی دەردەچێت، چونکە سروشتی

ڕاستەقینەی لەو دەرچوونە و لە تێپەڕاندنی ئەو سنوورانەدایە. وات تێپەڕاندنی سنووری هەر دۆخێك كە خۆی تیا دەبینێتەوە.

هەڵبەت لای فەیلەسووفە جیاوازەکان، بە شێوازی جۆراوجۆر و بە پلەی جیا ئەم سنوورانەی هزر و زمان لادەبرێن. ئێمە هەر لە سەرەتای لێكۆڵینەوەكەمانەوە زانیمان كە ململانێیەك هەیە لە نێوان ئەو بوونگەرایانەدا كە مرۆڤ بە دوا ئامانج لە قەڵەم ئەدەن و ئەوانەی كە شیكردنەوەیان بۆ مرۆڤ بە خودا یان بە بوونەوە دەبەستنەوە. من تەنانەت سەبارەت بە كۆمەڵەی یەكەمیشیان وتم كە پۆزیتیڤیست نین. بەڵام بە تەنها كۆمەڵەی دووەمیان بایەخ بەوە دەدات كە چۆن زمان و هزر دەتوانن سنووری دیاردەكانی هەست و ئیدراكی خودیی بوونگەرایانە تێپەڕێنن.

لە لێدوانەكانی پێشووماندا باسی بیروبۆچوونە زووەكانی هایدیگەرمان كرد سەبارەت بە زمان و بەڵێنمان دا لە بیروبۆچوونەكانی دواتریشی سەبارەت بەم بابەتە بكۆڵینەوە. هایدیگەر لە نووسینەكانی زوویدا بڕوای وابووە كە زمان (یان با بڵێین: قسە) خەسڵەتێكی بوونگەرایانەیە، واتە توانایەكی بنەڕەتیی بوونە، كە سەر بە بوونەوەری مرۆییە. ئەمەش ئەو تێڕوانینە بوونگەرایانە نموونەییەیە كە بناغەی ئەو جۆرە شیكردنەوەیەیە كە تا ئێستا بابەتی ئەم بەشەمان بووە. بەڵام هایدیگەر لە كارەكانی دواتریدا لە لایەنە مرۆیی و بوونگەرایانەكانی زمان دووردەكەوێتەوە و وای بۆ دەچێت كە مرۆڤ زمانی دانەهێناوە و، توانای ئەوەی نەبووە دایبهێنێت . مرۆڤ بەرلەوەی توانای قسەكردنی هەبووبێت دەبووایە ڕووبەڕووی بوون ببوایەتەوە، چونكە زمان "ماڵی بوونە" و ئەمەش وێنەیەكی مەجازیی پەتی نییە كە لە ئەنجامی سەپاندنی وێنەی باوی ماڵەوە بەسەر بووندا دروست بووبێت. لەبەرئەوەی بیركردنەوەمان لە ماهیەتی بوون ڕێمان بۆ خۆشدەكات كە دواجار بگەینە بیرۆكەی ماڵ یان خانوو .

گەرچی هایدیگەر لە كتێبەكەیدا "بوون و زەمەن" خۆی لەوە ئەدزێتەوە كە پێی دەڵێن "سۆفێتیی وشە Wortmystic"، بەڵام نكوولی لەوە ناكرێ كە ئەو لە

نووسینەكانی دواییدا بەرەو ئەم ئاقارە هەنگاوی ناوە. زمان بە تـەنها مـاڵی بـوون نییـە، بەڵكو وردە وردە ئەو شەقڵ و ئەركانە دەگرێتە خۆی كە پێشتر دراونەتە پاڵ بوون. لـەو شێوازە ئاشكرایانەی كە سۆقێتیی وشـە لای هایدیگـەر پیـشاندەدات شـەیدابوونێتی بـە وشەسـازی و مانـا ئەسـڵی و سـەرەتاییەكانی وشـەكان (ئەمـەش پەرەسـەندنێكە لـە قۆناغێكی زووی فەلسەفەكەیدا ڕوویدا). ئەوە بوو پێشتر سەرنجی ئەو شێوازەیمان دا كە چۆن تێگەیشتنی بۆ حەقیقەت بە وشەی **A-Letheia**ی یۆنانییەوە بەستەوە كە بە مانای پەردەهەڵماڵین دێ. هەروەها لەگەڵ وشەی یۆنانیی تـری كۆڵیـەوە، لەبەرئـەوەی بـڕوای وابوو كە بوون لە ڕێی ئەم وشـانەوە گوزارشـت لـە خـۆی دەكـات. بـە هـەمان شـێوە لـە وشەی ئەڵمانیشی دەكۆڵییەوە، لەبەرئەوەی بڕوای وابـوو كـە "زمـانی ئـەڵمانی لـە ڕووی ئەو توانایانەوە كە دەیخاتە بەردەم هزر لەگەڵ زمانی یۆنانیدا وێك دێتەوە، چـونكە ئـەم دوو زمانە لە هەموو زمانەكانی تر بەهێزترن و لە هەمووشیان ڕۆحانیترن" .

دەشێ لێكۆڵینەوە فینۆمینۆجییەكەی هایدیگـەر بـۆ وشـە بـەو پێیـەی كلیلـی مانـای بوونە، هەندێ جار زۆر بە سوودبێت، بەڵام هەندێ لە ڕەخنەنووسان ڕایـان وایـە كـە ئـەو پاساوانەی هایدیگەر كە پشت بـە وشەسـازی دەبەسـتن لاوازتـرین بەشـی فەلـسەفەكەی پێكدێنن.

گومان لەوەدا نییـە كـە تێڕوانینـی هایدیگـەر بـۆ زمـان زیـاتر ڕێگـە بـە بـەكارهێنانی ڕەمزییانـــەی زمـــان ئـــەدات وەك لـــە تێڕوانینـــی ئەزموونگـــەرایی مـــەنتیقی **Logical Empiricism** . گەرچـی نـاتوانین بـە هـەمان ئـەو زمانـە پیـشەییەی كـە سـەبارەت بـە بوونەوەرە كۆتادارەكان پێی ئەدوێین، لە بارەی نهێنیی ئاڵۆزی بوونەوە بـدوێین. ئەگـەر هەر زمانێك ماڵی بوون و بەخششی بـوون بێـت، كەواتـە دەبـێ جۆرێـك لـە كەشـفبوونی شەقڵی بوون بە خۆیەوە بگرێت.

---

* هەر پـۆزیتیڤیزمی مەنیقییـە، گەرچـی نـاوی "ئەزموونگـەرایی مـەنتیقی" بەسـەر فەیلەسـووفانی پۆزیتیڤیزمی مەنتیقی لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا دابڕاوە.

کێشەی پەیوەندیی زمان بە نهێنیی ئاڵۆزی بوونەوە کارل یاسپەرزیشی بە خۆیەوە مەشغوڵ کردبوو. لێکۆڵینەوەکەی ئەو کە لە چەند گۆشەنیگایەکی دیاریکراوەوە بوو، کامڵتر بوو لە لێکۆڵینەوەکەی هایدیگەر، گەرچی ئەمیش وەك ئەو ئاڵۆز بوو. پێدەچێ یاسپەرز سێ ئاستی بۆ هزر و زمان دیاریکردبێت: "رواڵەت لە چەمکەکاندا وەسف دەکرێ و بیری لێدەکرێتەوە. ئاماژەکان Signsیش ئەوە دەگوێزنەوە کە من چیم و دەتوانم ببم بەچی. بەڵام واقیعی باڵا (یا بڵندرۆ)، کە بە تەنها ئادەمیزاد تاقیی دەکاتەوە، لە جفرە Cipersدا خۆی دەنوێنێت . جفرەش (یاسپەرز ئەم زاراوەیە بەسەر زاراوەی ڕەمز Symbolدا پەسەند دەکات) دەلالەت لە "ئەو زمانەی واقیع دەکات کە بە تەنها بەم شێوەیە نەك بە شێوەیەکی تر دەبیسترێ و ئەدوێنرێ". هەر لە ڕێی ئەم زمانەشەوەیە کە دەتوانین باڵابوون Trascendence وەك قەوارەیەکی مەعقول وێنا بکەین. بەڵام ئێمە ئەگەر تەسلیمی هەموو وردەکارییەکانی زمان بین، دەکەوینە خورافاتەوە. "مەگەر ئەوەی کە ئەم زمانە ناکۆتاو داخراو و زوو تێپەڕ بێت، ئەگینا بە بابەتبوونی باڵابوون "ترانسندنس" ئەگۆڕێ بۆ خورافە، لە ڕاستیشدا خورافە واتە باڵابوون بکەیت بە بابەت" .

یاسپەرز وا نموونە بۆ جفرەکان دەهێنێتەوە: خودای دیاریکراو، خودای تاك و تەنیا، خودای بەرجەستە. ئەمانە هەموو بە باڵابوونەوە پەیوەستن، بەڵام هیچیان بە شێوەیەکی ئەقڵانی باڵابوون وێنا ناکەن و بیرۆکەیەکی وردمان لە بارەیەوە نادەنێ: کەواتە ئایا دەتوانین بڵێین کە ئەم جفرانە ناوەرۆکێکی مەعریفییان هەیە؟ بە گوێرەی زاراوەکانی یاسپەرز، مرۆڤ ئەبی نکوڵی لەمە بکات، لەبەرئەوەی هەر مەعریفەیەك لای ئەو شێوەی خود -بابەت بە خۆیەوە دەگرێت. بەڵام جفرەکان مەعریفەیەکمان نادەنێ بە مانا تەسکەکەی، لەگەڵ ئەمەشدا جفرەکان بە تەنها کۆمەڵێك ڕەمزی بەتاڵ نین کە پەیوەندییان بەو باڵابوونەوە نەبێت کە لە بارەیەوە ئەدوێین. ململانێیەکی بەردەوام لە نێوان جفرەکاندا هەیە، ئەو جفرەیە سەرکەوتنیش بەدەستدێنێت، توانا و شایستەیی لە

جفره ڕەتكراوەكان زیاتر دەبێت. گەرچی جفرەكان ناتوانن بـاڵابوون وێنابكـەن، یـان بـە بابەتی بكەن، بەڵام بیرۆكەیەكمان لە بارەیانەوە ئەدەنێ. بەرەو ئەودیو هـزری نابـاوەوە دەمانبەن، بەڵام خۆشـیان جـۆرێكن لـە تێفكرین. گەرچـی بیروڕاكـانی یاسـپەرز ئـاڵۆزتر خۆیان دەنوێنن كاتێ باوەڕی خـۆی بـەوە نیـشان ئـەدات كـە ئێمـە دەتـوانین جفرەكـان خۆیشیان تێبپەڕێنین، لەبەرئەوەی ئـەو لـە بـارەی پـارادۆكس (موفارەقـە)ێكـی سـەیری "زمانێكەوە ئەدوێت كە كۆتایی ڕامانەكانی سۆفییەكان و سەرسامیی خـۆی بـۆ سـۆفییە ئاساییەكان پیشان دەدات، گەرچی لـەناو سـۆفییە ئەوروپاییەكانیـشدا نـاوی "مایـستەر ئیكهارت Meister Eckhart" دەهێنێتن كە هەروەكو پێشتریش سەرنجمان دا لـە هەنـدێ ڕووەوە لە هایدیگەر دەچێت، "هێزێكی سەیر لەو هەوڵانەدا هەیە كە هەر بـۆ تێپەڕانـدنی واقیع نین، بەڵكو بۆ تێپەڕاندنی جفرەكانیش، هەروەها بـۆ گەیـشتن بـەو بنـچینەیەی كـە سەراپاگیرە و بیری لێناكرێتەوە و باسی ناكرێ" . یاسـپەرز بـاس و وەسـفی ئـەو بینـا بوودابیە گەورەیە دەكات كە پێی دەڵێن "بۆرۆ بۆدۆر Boro Budor" لە دوورگەی جـاوە، بەوپێیەی نموونەیەكە بۆ بیركردنەوە (یان با بڵێین بەرهەمی بیركردنەوەیە یـان زمـانێكی ناوشەییە) كە جفرەكانیش تێدەپەڕێنێت. بە قسەی یاسپەرز، ئەم بینایە "ئاوێتەیەكە لە وێنـە و ڕەمـز و ڕێكخـستنی شـوێن و بزاوتـی دیدەنیكـەران و، هـەموو ئەمانـە پێكـەوە وێنەیـەكی سەرسـامكەری هـزری بوودابیمـان دەداتـێ كـە هـەموو جفرەكـان تێدەپەڕێنێت" .

لە ڕاستیدا ئا لێرەدا دەگەینە دوا سنوورەكانی هزر، دەگەینە هەوڵدان بۆ بیركردنەوە لەو شتەی بیری لێناكرێتەوە. لە كۆتاییدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە كە پەیوەندیی بـەتین لـە نێوان ڕێبازی سۆفیزم و ڕێبازی پۆزیتیڤیزمدا هەیە، چـونكە هـەردووكیان لـە ئاسـت ئـەو شتەدا كە بیری لێناكرێتەوە یان گوزارشتی لێناكرێ، پەنا بۆ بێدەنگی دەبـەن. شـتێكی ڕوون و ئاشكراشـە كـە ڤیتگنـشتاین لـە قۆنـاغی سـەرەتایدا، واتـە قۆنـاغی "نامـەی مەنتیقی– فەلسەفی"، لە سەرێكەوە پۆزیتیڤیـست بـوو، لـە سـەرێكی تریـشەوە سـۆفی

بوو. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا سۆفیزم و پۆزیتیڤیزم تەواو لە یەك جیاوازن، فەیلەسووفی پۆزیتیڤیست زۆر زووتر لە سۆفی خۆی بەدەستەوە ئەدات. پێدەچێ شێوەی هەڵسەنگاندنی ئێمە بۆ تەسەووف دیاریکەری شێوەی هەڵسەنگاندنی ئێمە بێت بۆ ئەو حاڵەتە میتافیزیکیانەی هزر و زمان کە لای هەندێ بیرمەندی بوونگەرای وەکو هایدیگەر و سارتەر دەیبینینەوە. لەبەرئەوەی من بڕوام وایە کە بیرکردنەوە و ڕامانی ئەقڵانی و ڕامانی ڕۆحی و نزا و فەلسەفە و خواناسی، هەموو پێکەوە پەیوەستن (گەرچی بێگومان لە یەکتریش جیاوازن) بۆیە بە بڕوای من دەشێ هزر و زمان پەل بۆ ئەو ئاقارانەش بهاوێژن کە لەم بەشەدا ئاماژەمان بۆیان کرد.

# بەشی هەشتەم

## هەستو سۆز

١–هەستو سۆزو فەلسەفە.

٢–هەندێ سەرنجی گشتی لەسەر هەستو سۆز.

٣–دڕدۆنگی (قەلەق).

٤–هەندێ هەستو سۆزی گرنگی تر.

## ١–هەستو سۆزو فەلسەفە

هەر لە زووەوە فەلسەفە لەوەی كۆڵیوەتەوە كە پێی دەڵێن: هەستو سۆزو جۆشو خرۆش. چونكە ئەمانە بەشێكن لە تانوپۆی ناوەوەی مرۆڤو هەر هەوڵدانێك بۆ ناسینی مرۆڤ ناتوانێ فەرامۆشیان بكات. هەر لە ئەفلاتوونو ئەرستۆوە تا چاخە نوێیەكانیش فەیلەسووفان هەوڵیانداوە ژیانی سۆزدارانەی مرۆڤ شیبكەنەوەو بە ئادەمیزادەوە ببیەستنەوە، بەو پێیەی بوونەوەرێكی ئاكارگەرای ئاقڵە.

بەڵام فەیلەسووفەكان بەردەوام بە چاوی گومانەوە سەیری هەستو سۆزەكانیان كردووە. لەبەرئەوەی فەلسەفە بەوپێیەی بیركردنەوەیەكی ئەقڵانییە، هەوڵدانە بۆ چوونە سەروو هەواو هەوەسەكانەوە. فەیلەسووفیش عادەتەن خۆی لە سۆزو هەڵچوون دەپارێزێتو هەوڵدەدات بەدەر لە هەستو سۆزو هەڵچوون لە شتەكان بگات. خۆ گەر هەست وسۆزی لەناو چوارچێوەی فەلسەفەدا دانابێت، لەبەرئەوە بووە بیخاتە بەر توێژینەوەی ئەقڵانی، لەم حاڵەتەشدا وەكو سەرچاوەیەك بۆ حەقیقەتی فەلسەفی دانی

پیانەناوە، بەڵکو وایداناوە کە کاریگەرییەکی زیانبەخشی هەیە. واتە پێویستە لێی تێبگەین تا بە پێی توانا نەهێڵین کاریگەریی هەبێت بۆ دوورخستنەوەی هزر لە ڕەوتی ئەقڵیی خۆی.

بێگومان بۆچوونی ئاوارتەش هەیە لەو هەڵوێستانەی بە گومانەوە دەڕواننە هەست و سۆزەکان. بۆ نموونە پاسکال **Pascal** بڕوای وابوو کە دڵ بیانووی خۆی هەیەو، دەشێ ئەم "بیانووانەی دڵ " لانی کەم لە هەندێ بۆنەی دیاریکراودا لە بیانووەکانی ئەقڵ بالادەستتر بن. تەنانەت ئەو فەیلەسووفانەش کە زۆر لایەنگری ئەقڵ بوون، هەندێ جار سەرسامیی خۆیان بۆ مۆرکی گشتگیرو ڕاستەوخۆی ئەو جۆرە تێگەیشتنە پیشان داوە کە لە هەستو سۆزەوە سەرچاوەیان گرتووەو لەگەڵ ئەو تێگەیشتنە پەرشەدا بەراوردیان کردووە کە ئەنجامی بیرکردنەوەی مەنتیقی بووە. بۆ نموونە برادلی **F. H. Bradly*** دەڵێت هەستو سۆز کلیلی بالاترین جۆری بیرکردنەوەیە، لەوانەیە هەر لەبەرئەمەش بێت کە وا وەسفیان کردووە بەوەی "دواجار ئەو دژی ئەقڵە" ، سەرەڕای ئەنجامگیرییە مەنتیقیە بەرزەکانی.

بەڵام بە شێوەیەکی گشتی مرۆڤ دەتوانێت بڵێت کە فەیلەسووفەکان بایەخ بە لێکۆڵینەوەی "فەلسەفەی ویژدان یان هەستو سۆز" نادەن، تەنها لەو ڕووەوە نەبێت کە ئەم لێکۆڵینەوەیە دەبێتە لێکۆڵینەوەیەکی ئەقڵانی بۆ هەڵچوونەکانو هەستو سۆز. هەموو جارێکیش ئەو فەلسەفەیەی کە هەستو سۆز تیایدا زاڵ بووە، ئەفەرۆز کراوە (وەکو هەر "فەلسەفەیەکی ژیان") بەو بیانووەی کە ناگاتە ئاستی فەلسەفەو ئەرکی پێداویستییەکانی حەقیقەت بە جێ ناهێنێت.

---

* فرانسیس هیربرت برادلی (١٨٤٧–١٩٢٤) نوێنەری گەورەی ئایدیالیزمی ئینگلیزی، لە پەیڕەویکارانی هیگڵیزمەو دەڵێت کە حەق کامڵەو ناگۆڕێت. لە گرنگترین کتێبەکانی: "ڕواڵەتو حەقیقەت" و "پرنسیپەکانی مەنتیق".

بەڵام لەگەڵ هاتنی بوونگەراییدا سەرلەنوێ کێشەی هەستو سۆزو پەیوەندیی بە فەلسەفەوە سەری هەڵدایەوە. لەمەشدا من مەبەستم لە لافە توندڕەوەکانی بیرمەندێکی وەکو ئۆنامۆنۆ Unamuno نییە سەبارەت بە هەڵچوونو "دڵ"، ئەوەندەی مەبەستم ئەو لێکۆڵینەوانەیە دەربارەی هەستو سۆز کە هاوسەنگترنو لای فەیلەسووفانێکی وەکو سارتەرو هایدیگەرو ریکۆرو مارسیل دەیبینینەوە. دواجاریش دەتوانین بڵێین کە ئەو فینۆمینۆلۆجیی هەڵچوونەی فەیلەسووفانێکی بوونگەرا خستوویانەتە ڕوو، وەکو یەکێك لە دەسکەوتە مەزنەکانیان دەمێنێتەوە. بەڵام من لەو باوەڕەدام کە بوونگەرایی بە تەنها فەلسەفەیەك نییە بۆ ویژدان یان هەستو سۆز بەو مانایەی کە بیروبڕواکانی زیاتر لەسەر بنەمای هەستو سۆز بێت نەك ئەقڵ.. چونکە ئێمە تەنانەت لای گەورەترین نوێنەری بوونگەراییش ڕووبەڕووی هەستو سۆزی پەتی نابینەوە. بەڵکو ڕووبەڕووی هەستو سۆزێك دەبینەوە کە ئەو فەیلەسووفە بۆ ماوەیەکی درێژ بە شێوەیەکی ئەقڵانی بیری لێکردۆتەوە. هەرچۆن ئەم فەیلەسووفانە وا سەیری هەستو سۆزمان دەکەن کە ڕێگایەکی ترە بۆ گەیشتن بە حەقیقەتی فەلسەفی. هەستو سۆز دژی ئەقڵو هزر نییە، بەڵکو سەرچاوەی هەندێ ئەنجامی ڕوانینە کە دەشێ پوخت بکرێنەوەو لە ڕێی هزری فەلسەفیەوە بۆ کەسانی دی بگوێزرێنەوە. جگە لەوەی کە دەشێ ئەمانە لە قووڵترین ئەنجامەکان بنو نزیکترینیان بن لێمانەوە.

بوونگەرایی فەلسەفەی هەستو سۆز نییە، بەڵام لە تانوپۆی گشتیی بوونی مرۆییدا دان بە گرنگیی هەستو سۆزدا ئەنێت. ئەگەر ئێمە وا سەیری هەستو سۆزمان کرد کە شتێکی دابڕاوو جیایە، واتە ئێمە مامەڵەمان لەگەڵ شتێکی ئەبستراکتی پەتیدا کرد. بەڵام ئێمە بۆمان دەرکەوت کە ڕێبازی ئەقڵپەرستیش شتێکی ئەبستراکتەو، دەشێ هێشتا ئێمە لەژێر کاریگەریی "سایکۆلۆژیای تواناکان"دا بین کە لە کۆندا هەبووە، بە جۆرێك کە لەو بڕوایەدا بین کە ئەقڵو هەڵچوونەکانو ئیرادە کۆمەڵێك هێزی جیا بن لە "دەروون"، نەك هەندێ شت کە لەناو ناواخنی گشتیی ئەزموونی مرۆییدا دیاریمان

کردبێت، ئەو ناواخنەی کە لە هەر چرکەساتێکدا تۆخمی ئەقڵیو ئینفیعالیو ئیرادی لەخۆ دەگرێتو، ناشتوانین دیوای گەورە لە نێوانیاندا دابنێین، چونکە هەموویان سەر بە گشتێکی زیندوون. هەر بۆیە ئەوەی بوونگەراکان سەبارەت بە هەستو سۆز دەیڵێن نابێ بە دابڕاوی لێی بڕوانین، بەڵکو دەبێ لە ڕەوتگەی هەوڵیاندا بۆ خستنەڕووی فەلسەفەیەکی زیندوو بۆ بوونی مرۆیی لە چوارچێوەی گشتیدا تێیبگەین.

## ٢-هەندێ سەرنجی گشتی

## لەسەر هەستو سۆز

دەمێکە دان بەو ڕاستییەدا نراوە کە هەڵچوونەکان پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان بە جەستەو حاڵەتە جۆراوجۆرەکانی جەستەوە هەیە. ئەوەتانێ کاتێ مرۆڤ تووڕە دەبێت نیشانەی جەستەیی پێوە دەبینین: لەوانەیە دەموچاوی سوور هەڵگەڕێت، یان چاوی بیریسکێتەوە، یان دەنگی بەرزبێتەوەو گڕبێتو لەشی حاڵەتی هەڕەشەکردن بە خۆیەوە بگرێت. لەم دواییەدا زۆر بە ڕوونی بنەمای جەستەیی هەڵچوونەکان شی کراوەتەوە. ئەمڕۆ شیکردنەوەی دەروونی بۆ تووڕەبوون زۆر لە شیکردنەوەی فسیۆلۆژییەوە نزیکە، چونکە ئەویش باس لە: هۆرمۆنو لێدانی دڵو کۆئەندامی دەماری سەمپەتاویو هتد.. دەکات. لانی کەم لە سەردەمی "ویلیەم جەیمس W. James"* وە دەرکەوتووە کە "زانستی ئەقڵانی"ی تیۆرەیی ناتوانێت شیکردنەوەیەکی قەناعەتپێکەری

---

* ویلیەم جەیمس (١٨٢٤-١٩١٠) فەیلەسووفێکی ئەمریکی بوو، لە دامەزرێنەرە دیارەکانی پراگماتیزمەو گەلێ باسی گرنگی لە بواری دەروونناسیدا نووسیوە. لە بەرهەمەکانی: "بنەماکانی دەروونناسی" (١٨٩٠)، "ئیرادەی باوەڕ" (١٨٩٧)، "پراگماتیزم" (١٩٠٧).

هەڵچوونەكانمان بداتێ، بەڵكو ئەبێ لە بایۆلۆجی یان زانستی ئـەركی كۆئەندامەكانـدا بـە دوای ئەوەدا بگەڕێین.

وەلێ جەختكردنـەوە لەسـەر گرنگیـی بنـەمای فـسیۆلۆجیی ئـەو هەڵـچوونانە بـەلای بوونگەرایییەوە شتێكی نائاساییی نییە. ئەوە بوو پێشتر زانیمـان كـە بـە لای فەیلەسـووفی بوونگەراوە بوونی مرۆیی واتە بوون –لـە– جیهانـدا، ئەمـەش لـە ڕێـی ئـەو جەسـتەیەوە دەبێت كە هەیەتی (یان لەبەرئەوەی خۆی جەستەیە)، بەم جۆرە ئەوان وا لـە ئـادەمیزاد دەگەن كە یەكەیەكی دەروونی– جەستەییە. هیچ لێدانەوەیەكی بوونگەرایانەش نییە كـە لایـەنی جەسـتەیی فـەرامۆش بكـات، بـەڵام بێگومـان لێكدانـەوەی بوونگەرایانـە لـە لێكدانەوەی فسۆلۆژییانەی پـەتی جیـاوازە، هـەروەها لـە لێكدانـەوەی سـایكۆلۆژییانەی پەتیش. لە كاتێكا ئەم لێكدانەوەیـەی دواییـان بـە لای لێكدانەوەیـەكی ڕەفتارگەرایانـەدا دەشكێتەوە، ئەوا فەیلەسووفی بوونگەرا كە داوای لێكدانەوەی زیندوو دەكات ڕای وایە كە لێكدانەوەی ڕەفتارگەرا لێكدانەوەیەكی ئەبستراكتە، بـەڵام ئەمـەش مانـای نكـوولێكردن نییـە لـە بـەكارهێنانیو سـوودلێوەرگرتنی لـە هەنـدێ ڕەوتگـەی دیـاریكراودا، بـەڵكو نكوولێكردنە لەوەی كە لێكدانەوەی ئەزموونگەرا بۆ هەڵـچوونەكان لێكدانەوەیـەكی كامـڵ بێت. چونكە پێویستە ئەزموونی ناوەوەیی بخرێنە سەر دیاردەكـان، ئـەو دیاردانـەی كـە دەبینرێن، ئەم ئەزموونە ناوەكیـەش ناناسـرێ بـە تـەنها لـە ڕێـی بەشـداریكردنی بـوونی هەڵچونانەوە نەبێت. بەڵام لێكدانەوەی بوونگەرایانە بۆ هەستو سۆز بە تـەنها بایـەخ بـە لایەنی ناوەوەی خود نادات (وەكو ئەوەی ئەم لایەنە شتێكی دابـڕاو بێـتو لـە بۆشـاییدا بێت)، بەڵكو بایەخ بە لایەنی فیزیكی یان جەستەییش ئەدات. بەڵام ئەو جەسـتەیەی كـە كەسێكی بەرجەستە (جەستەدار) تـاقیی دەكاتـەوە، نـەك ئـەو جەسـتەیەی كـە دەبێتـە بابەتێكی پەتی بۆ سەرنجدانی دەرەكی.

پێشتر لەم كتێبەدا بینیمان كە ئێمە لە ڕێی جەستەوە لـەم جیهانـدا هـەینو هـەر لـە ڕێی جەستەشەوە بەشداری لە ڕووداوەكانیدا دەكەین. لە ڕاستیدا ئەم هەستو سۆزانەی

کـە لـە گۆشـەنیگایەکی تایبەتییـەوە ڕووداوی جەسـتەیین (فیزیکـیو دونیـاییین) و لـە گۆشـەنیگایەکی تریـشەوە ئـەزموونی نـاوەوەی بوونـەوەرن، ڕەنگـە گـرنگترین ڕێگـای ڕاستەوخۆی ئێمە بن بۆ کرانەوە بە ڕووی جیهاندا. لەبەرئەوەی لەوانەیە بـە تـەنها ببینـە تەماشاکەرێکی جیهان کاتێ ئـەو دەرکـە هەسـتییانەمان لا دروسـت دەبێـت کـە لـە ڕێـی ئەزموونی هەستەکانەوە لامان پێکدێن، بەڵام هەستو سـۆزەکانمان وامـان لێدەکـەن بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ لـە جیهانـدا بەشـداربین. بـەم جـۆرە دەرککـردن لـە ڕێـی هەستەکانەوە دەبێتـە بناغـە بـۆ تێگەیـشتنی بابەتییانـەی جیهـان. لەبەرئـەوەی مـن لـە بابەتەکـە جیادەبمـەوە تـاوەکو بابـەتێك لەبەردەممدا قـوت بێتـەوە، بـەڵام لـە حاڵـەتی هەستو سۆزدا، من لەگەڵ ئـەو شـتەدا دەبم بـە یـەك کـە هەسـتی پێدەکـەم، نـزیکترین دەرکی هەستیش بۆ ویژدان بەرکـەوتن (لمس)ە. ئـەوەی مەبەسـتیـشە ئەوەیـە کـە بـەر شتێك کەوتن واتە هەستکردن پێیو چوونە ناو پەیوەندییەکی توندوتۆڵەوە لەگەڵیدا.

لەبەرئەوەی من لە ڕێی هەستو سـۆزەکانمەوە بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆو دانسقە بەشداری لە جیهاندا دەکەم، کەواتـە ئـەم هەسـتو سـۆزانە دەبنـە تۆمارێك –گـەر ئـەم دەربڕینـە شـیاو بێـت– بـۆ بـوونم –لـە– جیهانـدا. ئـەو زمانـەی هەنـدێ فەیلەسـووفی بوونگەراش بەکاری دەهێنن بە ئاشکرا ئەم بیرۆکەیە ڕووندەکاتەوە. ئەوەتانێ هایدیگـەر دەربارەی ئەو حاڵەتە ئەدوێت کە ناویـدەنێت Gestimmtheit واتـە تـەبایی یـان گونجـان لەگەڵ جیهاندا. ڕیکۆر Recoeurیش خوازەیەکی هاوچەشـن بـەکاردێنێت کـاتێ بـاس لـە پلەی تۆن Tonalite دەکات، وەك ئەوەی لەسـەر مـرۆڤ پێویـست بێـت کـە لەگـەڵ پلـەی تۆنی جیهاندا بگونجێت. هەر ئەم نووسەرە وشەی کەشوهەوا atmospheric بـەکاردێنێت سەبارەت بەو شتانەی بە هەستو نەستەوە پەیوەستن. کەشوهەواش ئـەو شـتانەن کـە دەورمان ئەدەن، هەروەها ئەو هەناسـەیەیە کـە ئەیـدەین، چـونکە ئێمـە بـە جۆرێك لـە جۆران لە ڕێی هەستو سۆزەوە لە جیهاندا "هەناسە ئەدەین" و تیایدا تێکەڵ ئەبین بەو پێیەی بریتییە لەو ژینگەیەی کە تیایدا ئەژینو ئەجووڵێینەوەو، بوونمان تیایدایەتی.

ئایا هەڵچوون هەیە بنەمای جەستەیی نەبێت؟ لانی کەم مرۆڤ دەتوانێ بڵێت کە هەندێ هەستو سۆز هەن کە مۆرکی جەستەییو دونیایی بە سەریاندا زاڵترە لە هەندێ هەستو سۆزی تر وبە ئاشکراش ئەوە دەبینین. بۆ نموونە پێدەچێت ئەو هەستی جوانییەی کە دیمەنی ئاسمانی ڕازاوە بە ئەستێرە لای مرۆڤ دەیبزوێنێت، پەیوەندیی زۆر بەتینتر بێت بە لایەنی جەستەییەوە لەو هەستی جوانییەی کە تێڕامان لە هاوتایی ماتماتیکی تیۆرە گەردوونیەکەی کۆپەرنیکۆس دەیبزوێنێت. گەر بمانەوێ نموونەیەکی تر بهێنینەوە، ئەوا دەبینین کە "کانت" بڕوای وابوو هەستکردن بە ڕێز کە گرنگییەکی زۆری بە ژیانی ئاکاری بەخشیوە، هەستێکی ئەقڵانیی جیاوازە لەو هەوەسانەی کە بە ئەزموونی جەستەییەوە پەیوەستن. شتێکی بەڵگەنەویستیشە کە هەستو سۆزو هەڵچوونی وا هەیە کە پەیوەندیی بە جەستەوە– بۆ نموونە– لە ترسو تووڕەیی زۆر لاوازترە. بەڵام سەربارى ئەمانەش، پێدەچێ بەرزترین هەستو سۆزەکانیشمان ڕەگوڕیشەی لە بوونمان –لە– جیهاندا بێت. یان گەر بمانەوێ وردتر بین، ئەبێ بڵێین لە بوونمان –لەگەڵ ئەوانی تردا– لە جیهاندا. چونکە بۆ نموونە ڕێز وابەستەیە بە بوونمانەوە لە کۆمەڵگایەکی ئەخلاقیدا، جگە لەوە ئاشکرایە کە ئەم ویژدانە "ئەقڵانی"یە زۆر نزیکە لە هەندێ هەستی ترەوە کە زیاتر مۆرکێکی "هەڵچوونئاسا–ئینفیعالی"یانەیان بەخۆوە گرتووە، وەکو: ڕێزو، سەرسامبوونو سام. پۆڵ ڕیکۆریش سەبارەت بە ڕێز دەڵێت کە ڕەگوڕیشەی "دەگەڕێتەوە بۆ شتێك کە لە مەیل بۆ ئەقڵانیەت" دەچێتو لەمەشدا دەشوبهێتە سەر "دەستو دڵکراوەیی لای دیکارت، کە لە یەك کاتدا هەم کردارەو هەم ئارەزوو (یا هەڵچوون): کردارێکی ئیرادەی ئازادەو، ئارەزوویەکیشە لەناو قووڵایی جەستەدا" . پێدەچێ هەستو نەستیش بکەوێتە نێوان پرۆسە بایۆلۆژییە پەتیەکانی جەستە (کە لە زۆریان بێئاگاین یان هەندێکیان تەواو نائاگایانە ڕوودەدەن) و ئەنجامدانی هۆشمەندانەی بیرکردنەوەی ئەقڵانی. بۆ نموونە، لەو دابەشکردنە سێ پارچەییەی "دڵ"دا لای ئەفلاتوون، دەبینین کە دڵ هەم لە

ئارەزووەکانی جەستەو هەم لە ئـەقڵیش جیـاوازەو، وا وەسـف دەکـرێ کـە هەنـدێ جـار لەگەڵ ئەمیانو هەندێ جاریش لەگەڵ ئەوی تریاندا کاردەکات (کۆمار ٤٤٠–٤٤١).

ئەگەر تا ئێستا شیکردنەوەمان بۆ هەستو سۆز ڕاست بووبێـت، بـە جۆرێـك بتـوانین دان بەوەدا بنێین کە وامان لێدەکات لەگـەڵ جیهانـدا بگـونجێینو، هـەروەها ئـەوەی کـە هەستو سـۆزە باڵاکـانیش بـە ئەقڵـەوە پەیوەسـتن، ئـەوا بـە دوور نـازانرێ کـە دەشـێ هەستو سۆز ڕوانینی ڕەسەنی وامان بداتێ کە بایەخی فەلسەفیی خـۆی هـەبێت، بـەڵکو ئەم پەیوەندییە بەهێزەی بە هۆی هەستو سۆزەوە لەگەڵ جیهانـدا دەمانبێـت لەوانەیـە حەقیقەتی وامان بۆ کەشف بکات کە هەرگیز نەتوانین بە تەنها لە ڕێی بینینەوەو لە ڕێـی هەستەکانی ترەوە پێی بگەین.

بەڵام ئایا ناتوانین بڵێین کە ئەمـە قـسەیەکی بێمانایـە؟ ئـاخۆ ئـەو حاڵـەتو هەسـتە تێپەڕانەی دێنو دەڕۆن بە تەنها لە زەینماندا هەن؟ ئیدی ئەم هەسـتە فریودەرانـە چـۆن دەتوانن پەردە لـە ڕووی واقیعێـك هـەڵبماڵن کـە لـە سـەروو خـودی ئێمەوەیـە؟ پێناچـێ شتێك هەبێت لە هەست "خودی" تر بێت. من کاتێك هەست بە ئازاری ددانم ئەکەم، ئـەو ئازارە بە تەنها تایبەتـە بـە خـۆم. گەرچـی ددان ئێـشەی وا هەیـە کـە هـەموو شـتێك لـە هوشـیاریدا دەسـڕێتەوە. بـەڵام بێگومـان ئـازاری ددان ئاماژەیـە بـۆ شـتێکی بابـەتی، حاڵەتێکی ماددی ئەو ئازارەی دروستکردووە کە بەشێکە لـە جەسـتەی مـن (بـەو جـۆرە بەشێکیشە لە من) و بەشـێکە لـە جیهـانیش. بـەڵام بـا نموونەیـەکی تـر بهێنینـەوە: وای دادەنێم سەیری کۆمەڵێك دارو درەختی سووتاو ئەکەم لـە بنـاری گردێکـی ڕەشـدا، دوای ئەوەی ئاگر لە دارستانێك بەربووەو دەڵێم: "ئای کە دیمەنێکی خەمناکە!" ئەم قسەیەم چی دەگەیەنێت؟ ئایا شتێکی خەمناكو خەفەتاوی لەسەر گردەکە هەیە؟ یان زمان مـنی گـومڕا کـردووە؟ ئێمـە وشـەی وەکـو "خـەمناك" و "خەفـەتاوی" بـۆ ئـەو شـتانە بەکاردەهێنین کە لە دونیادا دەیانبینین، بەڵام ئـاخۆ لـە ڕاسـتیدا ئـەم سیفەتانە بەسـەر خۆماندا ناسەپێن؟ پێدەچێ من خەمناك بم کە سەیری گردەکـە دەکـەم، نـەك گردەکـە.

ئەوە منم کە هەستو سۆزی خۆم دەخەمە سەر (ئەدەمە پاڵ) گردەکە. بەڵام دیسانەوە مەسەلەکەش بەم سادەییە نییە. چونکە مانگێك لەوەوبەرو بەر لەو ئاگر کەوتنەوەیە کـە ئەو بنار گردەم بینی، دارەکان سەوز بوونو ئەدگاری ژیانی تیا بـوو. ئـەوکات نەمـدەوت دیمەنێکی خەمناکە. کەواتە ناتوانم بڵێم خەمەکە هەر لە زەینمدایەو لـە گردەکـەدا نییـە. واتە ناتوانم بڵێم کـە بـوونو نـەبوونی خـەم لـە زەینمـدا پەیوەنـدیی بـە دۆخـی کردەیـی شتەکانەوە (لە جیهانی دەرەوەدا) نییە. ڕاستە ئێمە تا ڕادەیەك "مەزاجی"یـنو، جـاری وایە لە پڕدا دڵمان تەنگ ئەبێتو جاری واشە لە پڕدا دڵمان خۆش ئەبێت، بە جۆرێك کـە ڕۆژی وایە هەمان دیمەنی سروشتی دڵمان خۆشدەکات، کەچـی لـە ڕۆژی دواتـردا ئەبێتـە مایەی دڵتەنگیمان. هەر بۆیـە ئەوانـەی زوو مـەزاجیان تێکدەچێتو نـاتوانین پێـشبینیی حاڵەتـەکانیان بکـەین، پێیـان دەڵـێین "مـەزاجی **Temperamental**"، لەبەرئـەوەی بـە ڕادەیەکی زیاد لە پێویست هەستو سۆزی ناوەوەیان فڕێ ئەدەنە سەر جیهانو کەسانی دی. لــە حاڵەتــە توندڕەوەکانیــشدا، وەکــو حاڵــەتی پارانۆیــا **Paranoia** (شــێتیی خۆبەگەورەزانین یان هەست بە چەوساندنەوە کردن) ئەم فڕێدانە سەرە (إسقاگ) ئـەبێت بە دیاردەیـەکی نەخۆشـیو دەبێتـە مایـەی شـت تێکـەڵو پێکـەڵ کـردن. بـەڵام توانـای ناسینەوەی ئەو حاڵەتی نەخۆشییانە، خـۆی لـە خۆیـدا واتـە بـوونی پێـودان **Norm**ێـك، هـەروەها لەبەرئـەوەی هەنـدێ جـار هەسـتو سـۆز دووچـاری تونـدڕەویو لادان دێـت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە هەندێ هەڵوێستو دۆخـی دیـاریکراو هـەن کە پێویستیان بە هەستو سۆزێکی دیاریکراو هەیە.

کەواتە هەستو سۆز شتێك نییە بە تەنها لە ناوەوەی مندا یـان لـە زەینمـدا هـەبێت. دەشـتوانین بـە زمـانێکی فینۆمینۆلۆژییانـە بڵـێین کـە هەسـتو سـۆز "مەبەسـتگەران" **intentional**"، واتە بە ئاراستەی هەندێ حاڵەتی کردەیی تایبـەتی ئەچـن. کـە دەشـڵێین هەندێ جار هەستو سۆز گونجاو نین یان ناگونجێن لەگەڵ ئەو حاڵەتـە کردەییانـەی کـە لە ئاراستەیاندا مەبەستیانە، پێچەوانەی ئەو قسەیە نییە کە دەڵـێین هەسـتو سـۆزەکان

لە حاڵەتی ئاساییدا لە ڕاستیدا وامان لێدەکەن کە لەگەڵ حاڵەتی ڕاستەقینەی شتەکاندا تەبا بین یان بگونجێین attune. بگرە توانای هەستکردن بە هەستی "هەڵە" لەناو خۆیدا هەڵگری حاڵەتی دروستە، مانای ئەمەش ئەوەیە کە ئێمە دەشێ بە هەڵەدا بچین لەو شتەدا کە لە ڕێی هەستەکانمانەوە دەرکی پێ ئەکەین، بەڵام لەبەرئەوەی وڕێنە هەیە کەواتە گریمانەی ئەوە دەکرێ کە دەرکپێکردنی دروست شتێکی ڕاستەقینە بێت.

لەوانەیە یەکێك هەبێت بڵێت: "من هەست بە تووڕەیی دەکەم لەو شێوازەی کە حکومەت بۆ چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە گرتوویەتیە بەر. لەوانەشە ئەوە من بم کە هەست دەکەم ئەو شێوازە هەڵەیە". تووڕەیی ئەم کەسە مەبەستگەرایە، واتە ئاراستەی حاڵەتێکی کردەیی کراوە کە ڕەفتاری حکومەتە. پاشان ئەم تووڕەبوونەی شتێکی کوێرانە نییە، یان هەستێکی تاکەکەسییانەی پەتی نییە، بەڵکو وا گریمانە دەکرێ کە ئەو هەستە هەستێکی گونجاو بێت بەرامبەر بەو کردەوەیەی حکومەت. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو قسەکەرە دان بەوەدا دەنێت کە لەوانەیە لەو هەستکردنەیدا هەڵە بێت. لێرەدا دەکرێ سەرنجی ئەوە بدەین کە ئێمە وشەی "هەستی دروست Sensibility" بۆ دەلالەتکردن لە هەستی "دروست" بەکاردێنین. چونکە ئەو کەسەی کە خاوەنی هەستێکی دروستە ڕقی لە چەوساندنەوە دەبێتەوەو لەگەڵ ئازادیی خەڵکدا هاوسۆز دەبێت.. و بەم شێوەیە. بەڵام هەستی دروستی ئەو واتە هەستیارێتی Sensitivity، لەبەر ئەوەی هەستێکی ناسکی هەیە بەرامبەر بەو شتانەی ڕوودەدەن. ئەو لەگەڵ دونیای دەوروبەریدا "تەبا"یەو کاردانەوەی عاتیفیانەی گونجاوی هەیە.

کە وتمان هەستو نەست "مەبەستگەرا"یەو، بە ئاراستەی ئەو حاڵەتانە دەڕوات کە لە جیهاندا هەن، پێویستە ئەوەش بڵێین کە ئەم پەیوەندییە پەیوەندییەکی ئاڵوگۆڕکەرە. بێگومان ئەو ناولێنانە سوننەتیەی هەستو سۆزیش بەوەی کە بریتین لە هەڵچوون یان جۆشو خرۆش، وا پیشان ئەدات. کە خودی خاوەن ئەم هەستو سۆزانە مەزاجیو نێگەتیڤەو لە ئەنجامی هەندێ هۆکاری دەرەکییەوە (یان هەندێ جاریش لە

ئەنجامی هۆكاری ناوەوەیی واوە كە دەسەڵاتی بەسەریدا ناشكێت) تووشی ئەم هەستو سۆزانە بووە. هەستو سۆز پەیدا دەبنو نامێننو ئێمە ناتوانین وەك ئەوەی دەمانەوێ ئاوەها بیانخولقێنین. یان كەی ویستمان لە خۆمانیان دووربخەینەوە. ئەم هەستو سۆزانەش چەند لە ڕێی ئەو ڕاستییە كردەییانەوە بوروژێن كە لە جیهاندا هەن (لەوانەش جەستەمان) ئەوەندە ئەوە بەڵگەی نادروستیی ئەو بڕوایەیە كە دەڵێت هەست سۆز شتێكی خودیی پەتییە، لەبەرئەوەی هەستو سۆزەكان ڕەنگدانەوە یان كاردانەوەی ئەو ڕووداوانەن كە بە شێوەیەكی بابەتی ڕووئەدەن، بەم لەگەڵ ئەمەشدا هەستو سۆزەكانمان بە تەواوەتی ملكەچی ڕووداوەكانی دەرەوە نین. چونكە ئێمە فێردەبین چۆن بەسەر حاڵەتەكانماندا زاڵ بین، لانی كەم لە سنوورێكی دیاریكراودا.

هەموو ئەم شتانە ئەمانگەڕێنێتەوە بۆ ئەو خاڵەی كە ئەفلاتوون وروژاندیو ئاماژەمان پێداو لە لێدوانێكی پێشووترماندا سەرنجمان دا، ئەویش ئەوەیە كە "هەستو سۆز" یان "دڵ" ئەكەوێتە ناوچەیەكی ناوەڕاستەوە لە نێوان پرۆسە غەریزییە كوێرانەكانی جەستەو هێزە هۆشمەندەكانی هزرو ئەقڵداو، ئەم هەستو سۆزانەش دەشێ هەندێ جار لە خزمەتی ئەمیاندا بێتو هەندێ جاری تریش لە خزمەتی ئەوی تریاندا. هەر لێرەشەوە كە بە هەندێ هەستو سۆزی خۆمان دەڵێین "سەرەتایی" و بە هەندێكی تریان دەڵێین تا ڕادەیەك "باڵا"ن. یەكەمیان بە غەریزەوە وابەستەیەو دووەمیشیان بە ئەقڵو هزرەوە. من خۆیشم بڕوام وایە كە حاڵەتی تووڕەبوونی كوێرانەی خاڵی لە بیركردنەوە نموونەی تەرزی سەرەتایی هەستو سۆز یان ویژدانە. لە كاتێكدا ڕێزو نارەزایی ئاكاری دوو تەرزی باڵای هەستو سۆزن. بەڵام ئاسان نییە هەموو جارێك بتوانین ئەم جیاكارییە بكەین، بۆ نموونە دەشێ مەیلی سێكسی هەندێ جار سەرەتایی بێت، بەڵام پێشتریش سەرنجمان دا مەیلی سێكسی مرۆیی ڕاستەقینە بریتی نییە لە غەریزەیەكی جەستەیی ڕووت و پەتی، بەڵكو بریتییە لە دیاردەیەكی بوونگەرایانەی فرەباڵا.

هایدیگەر وا پەسەند ئەکات لە بری هەندێ وشەی سوننەتی وەکو: ویژدان، هەڵچوونو خرۆشو سۆز، واژەی Befindlichkeit بەکاربهێنێت. زەحمەتە بتوانین وەرگێڕانێکی وردی ئەم واژەیەی هایدیگەر بە دەستەوە بدەین. وەرگێڕە ئیگلیزەکەی کتێبی "بوونو زەمان Seinund Zeit" واژەی "حاڵەتی زەینی State of mindی بۆ گوزارشتکردن لە زاراوەی Befindlichkeit داناوە. ئەگەرچی ئەم واژە ئینگلیزییە بە شێوەیەکی بەجێ بیرۆکەیەکی گشتیمان ئەداتێ، بەڵام ناتوانێ "بیرۆکەی دۆزینەوە یان بینینەوە Finding"مکەمان بۆ بخاتە ڕوو کە لە وشە ئەڵمانیەکەدا هەیە. دەستەواژەی ئەڵمانی "Wie be Finden Sie Sich" ئەو دەستەواژە باوەیە کە بەرامبەر پرسیاری "حاڵت چۆنە..؟"یە کە بە واتای "خۆت چۆن دەبینیتەوە؟" واتە وشەی Befindlichkeit مانای "ئەو شێوازەی مرۆڤ خۆی پێ دەبینێتەوە".

بەم جۆرە هەستو سۆزو خرۆشانەکان ئەو شێوازەی کە مرۆڤ بە هۆیانەوە خۆی لە هەڵوێستێکدا دەبینێتەوە. ئەو شێوازەیە کە مرۆڤ بە هۆیەوە دەگونجێت. ئەو جۆری دووربینیو کەشفو زانینەی ئەو شێوازەش کە مرۆڤ بە هۆیەوە خۆی دەبینێتەوە، بریتییە لە تێگەیشتنێکی بابەتیانەی شتێك کە لە بەردەم هەستەکاندا خۆی دەنوێنێت، بەڵام هەروەها بریتی نییە لە تێگەیشتنێکی خودییش، بەڵکو بریتییە لە دووربینیی هەڵوێستێك کە هیچ کەسێکە کە خۆی تیا دەبینێتەوە. وشەی "هەڵوێست"یش وشەیەکی زۆر لاستیکییە. لەبەرئەوەی ئاماژە بۆ کۆمەڵێك هەڵوێستی دیاریکراو یان دیارینەکراو دەکات. لە حاڵەتە ئاساییەکاندا تووڕەبوون هەستێکە پەیوەندیی بە هەڵوێستێکی دیارەوە هەیە، بەڵام حاڵەتێکی مەزاجییانەی وەکو بێزاری یا وەڕسی Boredom شتێکی ناڕوونە، "بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندی بە شتەکانەوە هەیە". لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشێ کە ئاخۆ حاڵەتێکی مەزاجی یا هەستێك (ویان زیاتر) پەویەست بێت بە هەڵوێستی گشتیی مرۆڤەوە لە جیهاندا. ئێمە لە شوێنیچکی تری ئەم بەشەدا وەڵامی ئەم پرسیارە ئەدەینەوە، بەڵام ئێستا هێندە بەسە بڵێین کە ئێمە لە

ڕێی هەستو سۆزەکانەوە لە هەڵوێستەکاندا بەشدار ئەبینو، ئەم هەڵوێستاش لەو کارلێکەدا دەردەکەون یان خۆیانمان بۆ دەخەنەروو کە لە نێوان مەبەستو ئەو خرۆشانەدا هەیە کە دووچاری هەستو سۆز ئەبێت. ئەم جۆرە دەرکەوتن (کەشف)ەشە کە فەیلەسووفی بوونگەرا بایەخی پێئەداتو ئەیخاتە سەر پێدراوە فەلسەفیەکانی. کە دان بەوەشدا ئەنێت کە هەست خاوەنی سیفەتێکی دەرخەر "کەشفکەر"ە، ڕەنگە ڕێ بە خۆی بدات باس لە هەستێکی "ئۆنتۆلۆجی"یش بکات. دەشێ ئەم دەربڕینەش لای فەیلەسووفە سوننەتیەکان بریتی بێت لە ڕیسوابوونێکی فەلسەفی. بەڵام لە ڕاستیدا ئێمە گەر بمانەوێ لە چوارچێوەی بوونی گشتیمان لە جیهاندا بفەلسەفێنین، ئەوا لەم حاڵەتەدا هەستو سۆزەکانیش کلیلێکی ترمان بۆ تێگەیشتنی ئەو بوونە ئەداتێ کە چواردەورمانی تەنیوەو دەوری داوینو، بوونی مرییمان لەخۆ دەگرێت.

لەوانەیە شتێکی سوودبەخش بێت گەر لێرەدا هەندێ سەرنجی "پۆل ڕیکۆر" بخەینە ڕوو. ئەو نووسیویەتیو ئەڵێت:

"هەستو نەست لە خۆوە نابێتە شتێکی گشتی، تەنها لە ڕێی هوشیاری بە بوونی ڕاستەقینەوە نەبێت لە جیهاندا، ئەو "بوون لە...." ڕەسەنە.. بوونیش هەرچییەك بێت، هەست شایەتیی ئەوە ئەدات کە ئێمە بەشێکین لێی، چونکە ئەو ئەوەی تر نییە بە گشتی، بەڵکو ئەو نێوەندە یان شوێنە ئەسڵییەیە کە تیا دەمێنینەوە" . ئەم دەستەواژەیەش زۆر بە باشی ئەو بیروڕایانە پوخت ئەکاتەوە کە لەو چەند لاپەڕەیەی پێشوودا لێیان دواین.

ئێمە بە بێ جیاوازی قسەمان لەسەر هەست کرد (بەجیا) و هەروەها لە هەستو سۆزەکان (بە کۆ). ئەگەر بمانەوێ وردبین دەبێ بڵێین کە هەست جۆرێکە لە ئەبستراکت، لەبەرئەوەی ئێمە بە تەنها کۆمەڵێك هەستو سۆزی تا ڕادەیەك دیاریکراو ئەناسین. لەوانەیە چۆنێتیی دیاریکردنی هەستو سۆزەکانیشمان لەو ڕاستییەوە بۆ دەربکەوێت کە زمانی ئاساییمان، لە ئاستە پێش– فەلسەفیو سایکۆلۆجییەکانیدا،

ژمارەیەکی زۆر وشە دەگرێتە خۆی کە لە پلە جیاوازەکانیدا وەسفی هەستو سۆزەکانو حاڵەتە مەزاجیەکان ئەکەن، بۆ نموونە هەستگەلێکی وەکو: ترسو تۆقینو دڕدۆنگیو هەڵلەرزین، کە هەموو ئەمانەش بە یەکەوە پەیوەستن. بەلام لەناو خێزانی "هەڵچوونەکانی ترس"دا هەریەکەیانو تایبەتمەندیی خۆی هەیە . پێشتر ئاماژەمان بە هەستیارێتی Sensibilityدا وەکو خەسڵەتێکی ئەو کەسەی کە بە هەڵچوونێکی هەستیارانەوە دەرك بە شتەکان ئەکات. بەلام وێڕای ئەوە، تەنانەت لە ژیانی ڕۆژانەشماندا لەگەڵ ئەوی تردا، برێکی تێبینیکراو لە هەستیارێتیو هەروەها توانای جیاکردنەوەی سێبەرە جیاوازەکانی هەڵچوونو وەسفکردنیان هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا ئاشکرایە کە ئەو هەڵچوونانەی پێیان دەڵێین "ترس" بە شێوەیەکی گشتی بە هەندێ هەڵچونی ترەوە بەستراونەتەوە: بۆ نموونە شەرمو، هەیبەتو حورمەتو تەنانەت ئەو ڕێزگرتنەی کە "کانت"یش لە فەلسەفەکەیدا باسی دەکات، برێك ترسیان تیایە، گەرچی زیاتر بە ئیعجاب دەژمێردرێن، لە سەرێکی ترەوە ترس بە تووڕەییەوە بەستراوەتەوە، بە تایبەتیش لە ڕووی بنەڕەتە فیزیکیەکەیەوە. دیسانەوە لێرەشدا ڕووبەڕووی کۆمەڵێك جیاوازی دەبینەوە، وەکو: ڕقئەستووی، ڕقهەڵسان، تووڕەیی، پەستی، ڕووگرژی، ورووژان، هەراسانیو شتی تری لەم بابەتە.

ئەرکی ئێمەش لەم کتێبەدا ئەوە نییە کە هەستو سۆزەکان پۆلێن بکەینو جیاوازییە وردەکانیان دیاری بکەین. لە ڕاستیدا ئێمە سەرنجی ئەوەمان دا کە هەندێ هەستو سۆز هەن دەکرێ پێیانبڵێین "سەرەتایی" و هەندێکی تریشیان "بالا". بەلام دیارە کە کۆمەڵێك ڕێگای تری سەرنجڕاکێش هەن بۆ پۆلێنکردنی هەستو سۆزەکان.

بەلام سەرباری ئەوەی کە پێویستە خۆمان لە هەر هەوڵێك بۆ پۆلێنکردنی وردی هەستو سۆزەکانو لێکچوونو جیاوازییان بپارێزین، جیاوازییەکی سەرەکی هەیە کە لە لێدوانەکانی داهاتووماندا گرنگییەکی خۆی دەبێت. ئەتوانین ئەو جیاوازییەش لە نێوان هەڵچوونە "سەلبی"یەکانو هەڵچوونە "ئیجابی"یەکاندا ببینینەوە. بۆ یەکەمیان

ئەتوانین نموونەی وەكو: ترسو تووڕەییو ڕقو قێز بهێنینەوە، كە هەندێ دۆخمان بۆ ئەخەنە ڕوو كە تیایاندا‌ین، بەڵام ئەمانەوێ خۆمانیان لێ ڕزگار بكەین، یان باری دۆخەكە بگۆڕین. بەڵام هەڵچوونە "ئیجابی"یەكان، مەبەستم لێیان، هەڵچوونی وەكو: خۆشەویستیو، خۆشیو، متمانە بەخۆو هەستی تری لەم جۆرەیە. ئەمانە گوزارشت لە هەستكردن بە "ئینتیما" دەكەن.

لێكدانەوەیەكی پەسەند بۆ دۆخەكانیان بە دەستەوە ئەدەن. ئەم جیاوازیكردنەش گرنگە، لەبەرئەوەی زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراكان بڕوایان وایە كە هەندێ هەستو سۆزی بنچینەیی هەن بە شێوەیەكی تایبەتی گوزارشت لە بوون ئەكەن. لێرەشدا ئەو پرسیارە دێتەپێشێ كە ئاخۆ ئەم هەستو سۆزە بنچینەییانە "ئیجابی"ن یان "سەلبی". لە ڕاستیدا ئێمە ڕووبەڕووی وەڵامی جیاواز ئەبینەوە. هەر لێرەشەوە دیسانەوە بۆمان دەردەكەوێ كە فەیلەسووفە بوونگەراكان دەبن بە دوو ئۆردوگای گەورەوە: هەندێكیان وایدەبینن كە هەستی وەكو دڕدۆنگیو بێزاریو وەڕسیو هێڵنج هەستی "ئۆنتۆلۆجی"ی بنەڕەتینو گوزارشت لە لایەنە تاریكەكانی دۆخی مرۆیی ئەكەن. لەبەرئەوەی مرۆڤ لە دونیایەكدایە كە نامۆیەو بگرە هەڕەشە لە مرۆڤیش ئەكات و هەست ناكات "لە ماڵی خۆیدا"یەتی. هەندێكی تریشیان وایدەبینێت كە خۆشیو هیواو ئەو هەستانەی كە پۆڵ ڕیكۆر ناویان لێدەنێت هەستی "ئینتیما"، كۆمەڵێك هەستو سۆزی گشتین. ئەبێ سەرنجی ئەوەش بدەین كە ئەم جیاوازییە لێرەدا ناكاتە جیاوازیی نێوان بوونگەرایی باوەڕدارو بوونگەرایی بێباوەڕ. بۆ نموونە دڕدۆنگی لە هزری كیركەگۆردا ڕۆڵێكی سەرەكی دەبینێت، كە گەورەترین فەیلەسووفی بوونگەرای مەسیحییە، لە كاتێكدا شادمانی هەرگیز فەلسەفەی ماوتا بێباوەڕەكەی (واتە نیچە) جێناهێڵێت. شتێكی ئاشكرایە كە ئەم دوو فەیلەسووفە بوونگەرایە لە هەموو ئەوانی تر زیاتر بە یەك ناكۆكن، بەڵام هەردووكیان لەوە وریامان ئەكەنەوە كە زیاد لە پێویست شتەكان ئاسان نەكەینەوە.

بــە شــێوەیەکی گــشتی هــەروەکو ئۆنــامۆنۆ نــاوی لێــدەنێت، لای فەیلەســووفە بوونگەراکان "مانای تراجیکی ژیان" باو بووە، بـەڵام ڕاسـتکردنەوەی تـای تەرازووەکـەو هاندانی هەستی ئومێدەواری، لە قۆناغێکی درەنگتردا هاتە ئـاراوە ،بۆیـە لـە سـەرەتاداو بەر لە هەموو شتێك لە هەستی "دڕدۆنگی– قەلەق" ئەکۆڵێنـەوە، بەوپێیـەی هەسـتێکی ئۆنتۆلۆجیی بنەڕەتییەو، بگرە لەوانەیە لە تەواوی بوونگەراییدا هەستی نموونەیی بێت.

بۆ ئەوەی باسەکەشمان بە ویژدانـەوە بێـت، ئامـاژە بـۆ ئـەو ئاقـارە ئیجابیانـەی تـر دەکەین کە لای هەندێ نووسەر هەن.

## ٣–دڕدۆنگی

ڕەنگە وشەی دڕدۆنگی Anxiety باشترین هاوواتای وشەی angst ی بێـت . Anxiety ئـەو وشـەیەیە کـە لـە وەرگێڕانـە ئینگلیزییەکـەی کتێبەکـەی هایدیگـەردا (واتـە بـوون و زەمان)دا بەکارهاتووە. بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئـەم وشـەیە زۆر قەناعەتپێکـەر نەبووە، لەبەرئەوەی وشە ئینگلیزییەکە پتر گوزارشت لە جۆرەکانی نیگـەرانی لـە ژیـانی ڕۆژانەی باودا ئەکات وەك لەو هەستە دەگمەن و وردەی کە بوونگەراکان ئەیانەوێ لە ڕێی وشەی Angstی ئەڵمانیەوە ئاماژەی بۆ بکەن .

هەر بۆیە وەرگێڕەکانی "هایدیگەر" لـە پەراوێزەکانـدا ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـەن کـە ڕەنگە وشەی وەکو "Uneasiness"و "Malaise" لە هەندێ ڕووەوە وەرگێڕانێکی وردتـرو باشتر بن . کەچی لەگەڵ ئەمەشدا هەر وشەی دڕدۆنگی Anxiety دەهێڵنـەوەو، منـیش هـەروا ئەکـەم. بێگومـان وشـەی "دڕدۆنگـی"یـش وەرگێڕانێکـی پەسـەندترە لـە وشـەی Dread (کـە لـە وەرگێڕانـە ئینگلیزییـەکانی کارەکـانی کیرکـەگۆردا هەیـە) یـان وشـەی Anguish (کـە هـازل بـارنز Hazel Barnes لـە وەرگێڕانـی کتێبەکـەی سـارتەر "بـوون و

[*] هەر لەم ڕووەوە منیش بەکارهێنانی وشەی "دڕدۆنگی"م بە پەسەندتر زانی –و. کوردی–

نەبوون"دا بەکاری هێناوە، کە لە ڕاستیدا تا ڕادەیەکی زۆر بەرامبەر وشە فەرەنسیەکەیە angoisse). ناڕەزاییشمان لەسەر بەکارهێنانی وشەی Dread بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە کە لە زمانی ئینگلیزیدا زیاتر مانای ترس ئەدات، لە کاتێکا هەموو بوونگەراکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە لە دڕدۆنگی ئەدوێن، مەبەستیان لێی ترس نییە. هەر لێرەشەوە بەکارهێنانی وشەی Anguish باشترە، بەڵام بەکارهێنانی باوی مانای ئازاری زۆر دەگەیەنێت. لە کاتێکا ڕاستە دڕدۆنگی ئازاربەخشە، بەڵام بیرۆکەی ئازار بیرۆکەی سەرەکی نییە لەو لێدوانە فەلسەفیانەدا کە دەربارەی دڕدۆنگی Angstن.

گەرچی منیش هەر یەك وشە بەکاردەهێنم کە ئەویش دڕدۆنگییە بۆ ئاماژە بە دیاردەیەك کە کۆمەڵێك فەیلەسووفی بوونگەرای جیاواز لە بارەیەوە ئەدوێن، بەڵام ئەبێ ئەوەتان لا ڕوون بێت کە ئەم وشەیە لای ئەم نووسەرانە یەك مانای دیاریکراوی نییە. هەریەك لە کیرکەگۆرو هایدیگەرو سارتەر بە جۆرێکی جیاواز لە دڕدۆنگی ئەدوێت. بەڵام پەیوەندییەکی بەهێزیش لە نێوانیاندا هەیە. ئەم دوو فەیلەسووفەی دوایی بە ڕاشکاوی دانیان بەوەدا ناوە کە بیرۆکەکەیان لە کیرکەگۆرەوە وەرگرتووە. هایدیگەر ئەڵێت: "سۆرین کیرکەگۆر لە شیکردنەوەیدا بۆ چەمکی دڕدۆنگی تا دوورترین مەودا ڕۆیشتووە" . کاتێ سارتەریش بەراورد لە نێوان ئەدگارەکانی دڕدۆنگی لای کیرکەگۆرو هایدیگەر ئەکات، ئەڵێت "ناکۆك نایەنە بەرچاو، بە پێچەوانەوە هەر ئەدگارە ئەوی تریان لەخۆ دەگرێت" . ئینجا لێکدانەوەکەی خۆیشی دەخاتەڕوو.

هەموو ئەم نووسەرانە لەسەر ئەوە کۆکن کە دڕدۆنگی بە شێوەیەکی تایبەتی دۆخی مرۆیی ئاشکرا دەکات. لای هایدیگەر بریتییە لەو شێوازە سەرەکیەی کە مرۆ خۆی پێ دەبینێتەوە Grundbe Findlichkeit، بێگومان چەمکی دڕدۆنگی وەك ئەوەی کلیلێکی سەرەکییە بۆ تێگەیشتنی بوونی مرۆیی، لەناو خۆیدا ئەو ڕوانینە بوونگەرایانەو فینۆمینۆلۆجیەی ویژدان هەڵدەگرێت کە لە بەشەکانی پێشوودا لێیدواین، وەختێ جیاوازیمان لە نێوان ئەم ڕوانینەو ڕوانینی سایکۆلۆجیو ئەزموونگەریدا کرد. لێدوان

لەسەر دڕدۆنگیش وەکو نموونەیەك یارمەتیمان ئەدات بۆ ڕوونکردنەوەی لێکدانەوەی فەیلەسووفی بوونگەرا بۆ هەستو سۆزو، جەخت لەسەر ئەو بیرۆکەیەش ئەکات کە سارتەر لەم چەند وشەیەدا بە باشی گوزارشتی لێکردووە: "هەر ڕووداوێکی مرۆیی بەلای کەسی فینۆمینۆلۆجیستەوە لە گەوهەردا دەلالەتێکی تایبەتی هەیە. ئەگەر ئەو دەلالەتەی لێبکەیتەوە، واتە تۆ سروشتی ئەو ڕووداوە بەو پێیەی ڕووداوێکی مرۆییە، لەناو دەبەیت، هەر بۆیە ئەرکی فینۆمینۆلۆجیست لێکۆڵینەوەی دەلالەتی هەستو سۆزە" . ڕوانینێکی تری پێچەوانەش هەیە: "هەستو سۆز لای دەروونناس چ مانایەکی نییە، لەبەرئەوەی ئەو وەکو ڕووداوێك واتە وەکو شتێکی جیا لە هەموو شتەکانی تر لێیدەکۆڵێتەوە. هەر بۆیە لە سەرەتاوە دەلالەتێکی تایبەتی نییە. بەلام گەر لە ڕاستیدا هەر ڕووداوێکی مرۆیی دەلالەتێکی تایبەتی هەبوو، ئەوا ئەو هەستو سۆزەی دەروونناس لێدەکۆڵێتەوە، خۆی لە خۆیدا مردوو و نادەروونیو نامرۆییە" .

مادامەکی بنەڕەتی بیروبۆچوونە بوونگەراکان سەبارەت بە دڕدۆنگی ئەگەڕێتەوە بۆ کیرکەگۆر،کەواتە جێی خۆیەتی کە لەوەوە و لە لێدوانە فراوانەکانیەوە سەبارەت بە دڕدۆنگی لەو کتێبەیدا کە لە ئینگلیزیدا بە "The Concept of Dread چەمکی دڕدۆنگی" ناسراوە، دەست پێبکەین. ئەم کتێبەش قورسەو ئەو وێنایەی دەیشیخاتەڕوو ڕوون نییە. بەلام پێدەچێ ئەم ناڕوونییە شتێکی ناچاری بێت، لەبەرئەوەی دڕدۆنگی سروشتێکی وردو جیوەیی هەیە کە گرتنی ئاسان نییە.

کیرکەگۆر لە چوارچێوەی لێدوانیدا لەسەر بنەڕەتی گوناە لە چەمکی دڕدۆنگی ئەدوێت: چی وا ئەکات گوناە هەبێت؟ لێرەدا لێدوانەکە لە چوارچێوەی ئەو چیرۆکەدا ئەنجام ئەدرێ کە "کتێبی خەلق" دەربارەی کەوتنی ئادەمیزاد گێڕاویەتییەوە. بەلام کیرکەگۆر وا لەم چیرۆکە دەکات کە باسی ڕووداوێك یان پێشکەوتنێك دەکات لە ژیانی هەموو ئادەمیزادێکدا، کە ئەویش گواستنەوەیە لە پاکێتی (بەرائەت)ەوە بۆ گوناە. ئەو

حاڵەتی دڕدۆنگییەی پێشووشە وا دەکات ئەم ڕووداوە ڕووبدات. ئـەم دڕدۆنگیـەش لانـی کەم بە سێ ڕێگا وەسف دەکرێ:

١–لەگەڵ حاڵەتی پاکێتیدا هەیە، لە خەونی پاکێتیدا شتێك هەیە لە ناهاوسەنگی یان شپرزەیی دەچێت، یاخود لـە ختوورەیـەك کـە ئـارامی دەشـڵەژێنێت. "ئەمـەش نهێنیـی قووڵی پاکێتییە، کە لە هەمان کاتدا دڕدۆنگیشە" . ئـەو نموونەیـەی کـە کیرکـەگۆر بـۆ ڕوونکردنـەوەی ئەمـەش دەیهێنێتـەوە وریابوونـەوەی سێکسـیو لایـەنی جەسـتەییە لـە تاکەکەسدا، حاڵەتێك لە نائارامیو ختوورەیەك هەیـە کـە دواجـار بـە چـێژو لەدەسـتدانی پاکێتیو گۆڕانی چۆنێتیی تاکەکەس کۆتایی دێت. ئەم گۆڕانەش لـە ڕێـی شـیکردنەوەوە وەسف ناکرێ، بەڵکو بە تەنها لە ڕێی ئەزموونەوە دەزانرێ.

٢–هەروەها دڕدۆنگی بە ئازادییەوە بەندە. جۆرێك لە ناهاوسەنگیش هەیە کـە پـێش کردار دەکەوێتو بە "گێژی" یا "سەرسووڕان"ی ئازادی ناودەبرێ، لەبەرئـەوەی ئـازادی واتە ئیمکانو، وەستانیش لە قەراغ ئیمکاندا لە وەستان دەچێت لە قەراغی خەرەندێکدا. ئەگەر دەربڕینێکی تر بـەکاربهێنین (کـە دەربـڕینی منـە نـەك هـی کیرکـەگۆر، بـەڵام لـەو بڕوایەدام کە مەبەستەکە ڕوون دەکاتەوە) دەتـوانین بڵـێین کـە ئـازادی خـۆی لـە خۆیـدا ئاوسە بە ئیمکان، ئەوەشـی پێـی دەوتـرێ دڕدۆنگیـی ئەسـڵی، جـووڵانی ئیمکانـە لـەناو ڕەحمی ئازادیدا.

٣–کیرکەگۆر دڕدۆنگی بە سروشتی تایبەتی ئادەمیزادەوە ئەبەستێتەوە بەوپێیـەی: جەسـتەو دەروونـەو ڕۆح کۆیـان دەکاتـەوە. سروشـتی ئـادەمیزاد خـۆی وای لێـدەکات دووچـاری گـرژی بێـت، ئـەو گرژییـەش دڕدۆنگییـە، ئـەرکی ئـادەمیزادیش گونجانـدنی جەستەو دەروونە لە یەك ئاوێتەدا.

ئەمـەش ئەرکێکـە هـەر لـە سـەرەتاوە بارگاوییـە بـە دڕدۆنگـی، کەواتـە دڕدۆنگـی تایبەتمەندییەکـە کـە بـە تـەنها تایبەتـە بـە مـرۆڤ. گیانـەوەر نازانێـت دڕدۆنگـی چـییە، لەبەرئەوەی ژیانی ئەو ژیانێکی جەستەیی پەتییە ! هەروەها فریشتەش نازانێت دڕدۆنگی

چییە، لەبەرئەوەی ژیانی ئەو ژیانێکی زەینیی پەتییە. بەڵام ئادەمیزاد کە ئاوێتەیەکە لە هەستو زەین، لە جەستەو دەروون، لە سای دڕدۆنگیدا دەژی.

ئەم بیرۆکەیەی دواییش وامان لێدەکات سەرنجی ئەوە بدەین کە سەرباری ئەوەی ئێمە تا ئێستا وا سەیری دڕدۆنگیمان کردووە کە مەرجێکی پێشینەی گوناهە، بەڵام لای کیرکەگۆر ئەنجامی گوناهیشە. لەبەرئەوەی ئادەمیزادی "کەوتوو" هەمیشە لە قووڵایی دڕدۆنگیدا دەژی، ئەمەش بریتی نییە لە ترسێك کە بەردەوام بە حاڵەتێکی دیاریکراوی حاڵەتەکانی جیهانەوە بەستراببێتەوە، لەبەرئەوەی دڕدۆنگی بە ئاراستەی بابەتێکی دیاریکراو ناڕوات، بەڵکو هەروەکو یەکێك لە لێکۆڵەرەوەکانی کیرکەگۆریش دەڵێت "بریتییە لە کۆمەڵێك هەستی ئاڵۆز، کە ئەگەرچی لە خودی خۆیاندا هیچ نین، بەڵام وا پەرە بە خۆیان ئەدەن کە لە خۆیاندا ڕەنگبدەنەوە .

ئەم پوختکردنەوەیە بۆ بیرۆکەی دڕدۆنگی لای کیرکەگۆر جەخت لەسەر ئەو سەرنجەی من دەکاتەوە کە تیایدا وتوومە کە بۆچوونی زۆر ڕوون نییە، بگرە کۆکیش نییە. بەڵام دەشێ ئەم ناکۆکیە (یان نەبوونی نەزمە)ش لە خەسڵەتەکانی بیرکردنەوە لە دیاردە زیندووەکانی بوونی ئادەمیزاد بێت. کەسیش ناتوانێ نکووڵی لە هەندێ ڕوانینی قووڵی کیرکەگۆر بکات. گەرچی دواجار پێویستە ئاماژە بۆ حاڵەتێك لە حاڵەتەکانی تری ئەم ناکۆکیە بکەین، چونکە ئێمە تا ئێستا تا ڕادەیەك بە شێوازێکی نەگەتیڤانە قسەمان لەسەر بیرۆکەی دڕدۆنگی کردووە، بەوەی کە مەرجی پێشینەی گوناهەو، هەروەها تایەبتمەندیی بوونی کەوتووی مرۆڤە (واتە کەوتنە سەرزەویی ئادەمیزاد– و. کوردی). بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کیرکەگۆر، وەکو باقیی خواناسە بوونگەراکانی دواتر، ئەیەوێ ڕۆڵکی پۆزەتیڤانە بۆ دڕدۆنگی دیاری بکات، بەوپێیەی دەروازەیەکە بۆ ئیمان. چونکە بەرگەگرتنی دڕدۆنگی وا دەخوازێ کە مرۆڤ چاوی لە ئاست ڕاستیی بوونی مرۆییدا بکاتەوەو، خوازیاری سۆزی خودایی بێت.

كاتێك لە كیركەگۆرەوە ئەچینەوە بۆ لای هایدیگەر، سەبارەت بە دڕدۆنگی هەندێ جیاوازیی گرنگ ئەبینینەوە، لەبەرئەوەی بە بۆچوونی ئەو دیاردەی دڕدۆنگی "یەكێك لە كاریگەرترین تواناكانو ڕەسەنترینیان بۆ كەشفی بوون" ئەخاتەڕوو.

لێدوان لەسەر دڕدۆنگیش زۆر پەیوەستە بەو شیكردنەوەیەوەی كە هایدیگەر بۆ "كەوتن" Ver fallenی دەكات، گەرچی ئێمە نابێ ئەم كەوتنە لەگەڵ بیروبۆچوونە سوننەتیەكاندا سەبارەت بە كەوتن تێكەڵ بكەین. جۆرێك لە پەیوەندی لە نێوانیاندا هەیە (وەكو دواتر ئەمەمان بۆ ڕووندەبێتەوە). ئەوەش جێی سەرنجە كە هایدیگەر دڕدۆنگی بە "كەوتن"ەوە ئەبەستێتەوە، وەك چۆن كیركەگۆر بە ئەسڵی گوناهەوە بەستبوویەوە. بە ڕای هایدیگەر ئەوەی لە حاڵەتی كەوتندا ڕووئەدات ئەوەیە كە بوونەوەری مرۆیی لە خودی خۆی هەڵدێت، لەبەرئەوەی ئەو لە بوونی نارەسەنیدا لەگەڵ ئەوانی تردا، كە پێشیان دەوترێ "ئەوان They" یان لە مەشغوڵبوونو بایەخدان بە كاروباری جیهانی شتەكاندا، خودی خۆی لە دەست ئەدات. لەگەڵ ئەوەشدا، هەڵاتنی مرۆڤ لە خودی خۆی، بەڵگەی ئەوەیە كە بوونی مرۆیی "دازاین" بە شێوازێك لە شێوازەكان ڕووبەڕووی خۆی ئەبێتەوە.

ئەم هەڵاتنەش لە كەوتن تەواو جیاوازە لەو هەڵاتنەی كە لە ترسەوە سەرچاوە ئەگرێت. لەبەرئەوەی ترس هەمیشە ترسە لە شتێكی دیاریكراو لەناو جیهاندا، بەڵام ئەوەی ئێستا ئێمە لێیدەدوێین هەڵاتنی مرۆڤە لە خۆی "ئەو شتەی كە مرۆڤ هەست بە دڕدۆنگی ئەكات لە ئاستیدا بوونە -لە- جیهاندا" . هەروەها دەڵێت: "ئەو شتەی مرۆڤ لە ئاستیدا هەست بە دڕدۆنگی ئەكات، شتێكی تەواو نادیاریكراوە. ئەم دیارینەكردنەش لە ڕاستیدا ئەو شتە دیاری ناكات كە لەناو جیهاندا هەڕەشەمان لێ ئەكات، بەوەشەوە ناوەستێت، بەڵكو پێماندەڵێت كە ئەو شتانەی لەجیهاندا هەن "هیچ پەیوەندییەكیان بە مەسەلەكەوە نییە، كەواتە هیچ شتێك لەوانەی لەبەردەستماندان یان لەبەردەمماندان، بە ئەركی ئەو شتە هەڵناسن كە دڕدۆنگی لە ئاستیدا ئەنجام ئەدرێ" .

بەم جۆرە ئێمە نازانین چی وامان لێدەکات دڕدۆنگ بین، ناشتوانین ئاماژە بۆ شتێکی دیاریکراو بکەین، ئەوەی وا دەکات دڕدۆنگی بێتە ئاراوە: هیچە، لە هیچ شوێنێکیشدا نییە ، لەگەڵ ئەمەشدا پێیمان دەوترێ کە دڕدۆنگی بە ڕادەیەك پێمانەوە نووساوە کە خەریکە بە سەرماندا زاڵ دەبێتو دەمانخنکێنێت. ئەمەش شتێکی تایبەتی نییە، بەڵکو جیهانە، یان بوونە –لە– جیهاندا. بەم جۆرە حاڵەتی دڕدۆنگی شتێکمان ئەداتێ کە لە کەشفکردنێکی گشتیی دۆخی مرۆیی دەچێت.

هەروەها هایدیگەر ڕایدەگەیەنێت کە شتەکانی نێو جیهان لە حاڵەتی دڕدۆنگیدا دەیانەوێ بفەوتێن، دازاینیش دەزانێت کە ناتوانێت خۆی لە جیهاندا ببینێتەوە، بۆیە دەگەڕێتەوە بۆ ناو خۆیو بۆ ئازادییە بێهاوتاکەی. "دڕدۆنگی وا لە مرۆڤ (دازاین) ئەکات ڕووبەڕووی بوونی –ئازادی خۆی بێتەوە لە پێناوی "ڕەسەنێتیی بوونیدا" . ئێمە ئەتوانین لە ژیانی ڕۆژانەماندا لە جیهانداو، لە بوونماندا لەگەڵ ئەوانی تردا ئارامی بەدەست بهێنینو لە ڕیشەی دۆخی مرۆیی هەڵێین، بەڵام دڕدۆنگی فڕێمان ئەداتە دەرەوەی ئەم ئاسایشە ساختەیەو وامان لێدەکات هەست بە "پەشێوی" بکەینو هەست بکەین بەوەی کە "لەماڵی خۆماندا نین".

هایدیگەر لە هەندێ شیکردنەوەی دواتریدا دڕدۆنگی بە هەردوو بیرۆکەی کۆتابوونو مەرگەوە ئەبەستێتەوە. بەڵام ئێمە ئێستا لەم دوو بابەتە ناکۆڵینەوە. بەڵکو ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەین کە هەروەکو چۆن کیرکەگۆر دڕدۆنگیی بە دەروازەیەك بۆ ئیمان دەزانی، پێدەچێ لای هایدیگەریش بەهای خۆی هەبێت. لەبەرئەوەی دڕدۆنگی لە وەهمەکانمانو لە هەستکردن بە ئاسایش (ئەمنیەت)ی درۆزنانە بە ئاگامان دەهێنێتەوەو، تاکە کەس بەرەو ڕووی بەرپرسیارێتی ئەکاتەوەو، بانگەشەی ئەکات بۆ پەیبردن بە بوونی ڕەسەنی

* دڕدۆنگی بریتییە لە ترس لە بوون بە شێوەیەکی گشتیو بێ دیاریکردن، بوونی گشتیش لەم شێوەیەیدا "عەدەم"ە وەکو هیگڵ وتوویەتی. هەر لێرەشەوەیە کە دڕدۆنگی بە "عەدەم"ەوە یان بە دیارینەکردنەوە بەستراوەتەوە .

خۆی. بگرە دڕدۆنگی وەها وەسف دەکرێ کە دیاردەیەکی دەگمەنە لە ئەزموونی مرۆییدا، لەبەرئەوەی لە زۆربەی کاتداو بە هۆی هەڵاتنمانەوە لە خودی خۆمان، کە هەڵاتنی تایبەتە بە حاڵەتی کەوتن، کپو خامۆش دەبێت. بەڵام دڕدۆنگیی ئۆنتۆلۆجیی پەتی، گەرچی دەگمەنە، گرنگییەکی زۆری هەیە. چونکە کاتێك خەڵك دوچاری ئەم دڕدۆنگییە دەبن، لە کەوتن قوتاریان ئەکاتو بەرەو بوونی ڕەسەنیان ئەبات.

لە شیکردنەوەکانی هایدیگەریشدا دڕدۆنگی زۆر پەیوەستە بە دیاردەی خەم (Sorge) ەوە، ئەمەش خاسیەتێکە لە گشتگیرترین خاسیەتەکانی ژیانی مرۆیی. "چونکە ژیانی خەمەو ژیانی بایەخپێدانە (هایدیگەر بە ئەنقەست ئەم وشە جووتمانایەی بەکاربردووە، کە بە ئینگلیزییەکەی "Care"و هاوواتا لاتینییەکەی "Cura"یە). خەمیش دیاردەیەکی ئاڵۆزە، لەبەرئەوەی هەڵوەدایی مرۆڤ ئەگرێتەخۆی بەرەو پێشەوەو بە ئاراستەی وەدیهێنانی ئیمکانەکانیو ئەو گرژییەو ئەو هەلومەرجو سنوورە واقیعیەی کە لەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێت، ئەمە لە پاڵ "کەوتن"ەکەی لە ئێستادا. واش دێتە بەرچاوم کە تێگەیشتنی هایدیگەر بۆ خەم بەو پێیەی کە بونیادی بوونی ڕۆژانەیە لە جیهاندا، لە چوارچێوە گشتیەکەیدا، لە بیرۆکەی دڕدۆنگی ئەچێت لای کیرکەگۆر کە هاوشانە لەگەڵ ژیانی کەوتنداو بەردەوام قووڵترو فراوانتریشی ئەکاتەوە.

"وەسفی کیرکەگۆر بۆ دڕدۆنگی لە ڕووبەڕووبوونەوەیدا بۆ ئەو شتەی کە پێویستی پێیەتی، وای لێدەکا دڕدۆنگییەك بێت بەرامبەر ئازادی. بەڵام هایدیگەر وا لە دڕدۆنگی ئەکۆڵێتەوە کە سامە لە نەبوون (عەدەم)" . بەم جۆرە سارتەر جیاوازی لە نێوان ئەو دوو لێکدانەوەیەی دڕدۆنگیدا ئەکات کە ئێستا بە کورتی لێیان دواین، گەرچی وەکو سەرنجیش ئەدرێو ئاماژەمان پێدا، ئەم دوو لێکدانەوەیە تەواوکەری یەکن پتر لەوەی

---

* لێرەدا (خەم) بەو مانایە دێت لای هایدیگەر کە مرۆڤ بەردەوام نیگەرانیو ترسو ئومێدی هەیە کە لە خەمیدا بۆ شتەکان کۆدەبێتەوە. ئەم لەو مانایەوە نزیکە کە لە زمانی کوردیدا دەڵێن فلانە کەس ئەو شتەی کردووە بە خەم. —و. کوردی—

دژ بە یەك بن. بە بڕوای منیش حوکمی سارتەر لەسەر ئەم جیاوازییە لە گەوهەردا ڕاستە، چونکە کیرکەگۆر جەخت لەسەر گرنگیی ئازادی ئەکاتەوە لە تێڕوانینیدا بۆ دڕدۆنگی، گەرچی کۆتابوونیشی لەبەرچاو بووە، لە کاتێکا هایدیگەر جەخت لەسەر کۆتابوون ئەکاتەوە گەرچی ئازادی فەرامۆش ناکات. شتێکی باشە گەر لێرەدا بزانین ڕای سارتەریش لەم ڕووەوە چییەو ئاخۆ توانیویەتی بگاتە ئاوێتەیەك.

لە ڕاستیدا ئەو ئاوێتەیەی سارتەر دەستەبەری ئەکات لە چوارچێوەی بزاوتێکی دیالەکتیکی وردی نێوان ئازادیو نەبوون (عەدەم)دا دێتەدیٚ. ئەو لە بیرۆکەی دڕدۆنگییەوە لای کیرکەگۆر دەستپێدەکات بەو سیفەتەی "سەرەگێژە"ی ئازادییە نەك ترس لە شتێك کە لە دەرەوەی مندا ڕوونەدات. بەڵکو دڕدۆنگی ئەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە "من متمانەم بە خۆمو بە کاردانەوە تایبەتیەکانم نییە" . بە واتایەکی دی دووفاقییەکی قووڵ لە مانای ئازادیدا هەیە، هەر لێرەشەوە ئەو دەربڕینەی سارتەر دێت کە جۆرێك لە پارادۆکس (موفارەقە)ی تیایە کە دەڵێت: مرۆڤ مەحکومە بە ئازادی، چونکە نەبوون (عەدەم)ێك هەیە خۆی ئەخزێنێتە ناو کردارەکەمەوە، یان من ئەو خودە نیم کە ئەمەویٚ ببم، یاخود من ئەو خودەم بەبیٚ ئەوەی هەبم "دڕدۆنگی ڕێك ئەو هۆشیارییەمە کە من بوونی ئایندەمم، لە حاڵەتی نەبووندا" . هەر ئەمەشە دڕدۆنگی لە ئاست ئایندەدا. دڕدۆنگییەکیش هەیە کە هاوتای ئەم دڕدۆنگیەیە، لە ئاستی ڕابردوودا "دڕدۆنگیی ئەو قوماربازەیە کە بە ئازادیو بە ڕاستگۆییەوە بڕیاری داوە جارێکی تر قومار نەکات، کەچی کاتێك لە مێزی قومار نزیك دەبێتەوە، دەبینێت هەموو بڕیارەکانی پووچەڵ دەبنەوە.." .

کەواتە ئازادی بە هیچ جۆرێك ئازادییەکی سانا نییە، بەڵکو ئازادییەکە کە "نەبوون ئەیوروژێنێتو کۆتی دەکات". لە کاتی ئەنجامدانی ئەم ئازادییەشدا دڕدۆنگی تاقی دەکەمەوە، دەشتوانم بە پەنابردنە بەر کردارە باوو سواوەکان، یان پێودانە باوەکانی بەها خۆم لەم دڕدۆنگییە دوور ڕابگرم، بەڵام ئەو نرخەی بەرامبەر بەوە ئەیدەم کەوتنە

ناو "ئیمانێکی خراپ" یان بەدنیهادییە، بەڵام سارتەریش وەکو کیرکەگۆرو هایدیگەر وایدەبینێت کە دڕدۆنگی شتێکە ئەبێ بەرگەی بگرین، نەك لێی ڕابکەین.؟

لە هەموو ئەم شیکردنەوانەشدا بۆ دڕدۆنگی کلیلی تێگەیشتن لە بوونی مرۆیی دەبینینەوە، هەروەها بوون خۆی دەخاتەڕوو بەو پێیەی لە بنەڕەتدا موفارەقە ئامێزە، ئەگەر پووچ Absurdیش نەبێت. لەبەرئەوەی لە لایەکەوە گرژییەك لەناو دڵی بوونی مرۆییدا هەیە کە لە نێوان ئازادیو ئەگەرەکانیدا چارەسەر ناکرێ، لە لایەکی تریشەوە کۆتابوونو کۆتو پێوەندەکانیو هەڕەشەکردنی بە وێرانکردن هەیە. ئەم بیرمەندانە پێماندەڵێن ئەگەر ئێمە ڕووبەڕووی ئەم تایبەتمەندییە سەرەکیە نامەعقولەی بوونی مرۆیی نەبینەوە، مانای وایە لە حەقیقەتی بوونە تایبەتییەکەی خۆمان ڕادەکەین.

ئایا ئەم خوێندنەوەیە بۆ بوونی مرۆیی قبوولّ بکەین (ئایا وەکو بیرمەندە بوونگەراکان ڕۆڵی سەرەکی بە دڕدۆنگی ببەخشین؟ ئاخۆ خۆدانە دەست ئەم ڕۆڵە بەرەو تێگەیشتنێکی تراجیکیانەمان نابات، یان بەرەو تێگەیشتنێکی ڕەشبینانە بۆ مرۆڤو بۆ جیهان؟ بەرلەوەی بتوانین وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە، پێویستە بگەڕێین بە دوای ئەوەدا کە ئاخۆ ئالتەرناتیڤی تر هەیە بۆ دڕدۆنگی بەو پێیەی هەستی سەرەکیی جیاکەرەوەی ئادەمیزادە.

## ٤–هەندێ هەستو سۆزی گرنگی تر

بڕگەیەکی گرنگو سەرنجڕاکێش هەیە لە کتێبەکەی هایدیگەردا "سەرەتایەك بۆ میتافیزیکا" کە سەبارەت بە کێشەی بوون ئەدوێتو دەڵێت کە هەریەکێك لە ئێمە لانی کەم جارێكو ڕەنگە زیاتریش هەستی بە هێزی شاراوەی ئەم کێشەیە کردووە. پاشان بەردەوام ئەبێت:

"ئەم کێشەیە لە ساتەکانی نائومێدیی گەورەدا دەردەکەوێ، کاتێك تەواوی شتەکان قورسایی خۆیان لەدەست ئەدەنو هەموو ماناکان ئالۆز ئەبن، هەروەها لە ساتەکانی

خۆشـیو شادیـشدا ئامادەیـە، کاتێـك ڕواڵـەتی شـتەکانی دەوروپـشتمان دەگۆڕێـتو وا خۆیان دەنوێنن وەك ئەوەی یەکەم جاریان بێت هەبن، ئەلێیت ڕەنگە وا خۆشتر بێت کـە وا بزانین ئەو شتانە نین لەوەی کە هەبنو بە شێوەیەی کە تیایدان. ئەم کێشەیە لە کاتی بێزاریـشدا خـۆی دەسـەپێنێت، کاتێـك وەکـو یـەك لـە خۆشـیو هـەروەها لـە نائومێـدی دوورینو، هەموو شتەکانی دەوروبەرمان زۆر ئاسایی دێنە پێشچاو، بە ڕادەیەك کە چـیتر بە لامانەوە گرنگ نییە شتێك هەبێت یان نەبێت".

ئەم بڕگەیـە گرنگـە، لەبەرئـەوەی -پێدەچـێت– هایدیگـەر بیـەوێ لـە پـەنا حاڵـەتی دڕدۆنگیدا کە تیایدا هەموو شتەکان ڕوو لە نـەمانن، دان بـە دوو حاڵـەتی تـردا بنێـت کـە مەغزایەکی ئۆنتۆلۆجییان هەیە، ئەو دوو حاڵەتەش: بێزاریو خۆشین.

پێشتر کیرکەگۆر لە بێزاریو پەیوەندیی بە "قۆناغی هەستی یـان ئیـستاتیکی"یـەوە دواوەو وای بۆچووە کە ئەم حاڵەتە بەرەو پرسیارێکی ڕیشەییمان ئەبات دەربارەی ماناو بەهای ژیـان. بـەڵام ئێمـە لەسـەر کێـشەی بێـزاری نـاڕۆین، لەبەرئـەوەی ئـەمیش وەکـو کێشەی دڕدۆنگی گوزارشت لـە حاڵـەتێکی نەگـەتیڤ ئـەکات، یـان لانـی کـەم حاڵەتێکـە ئەرزشێکی وەهای نییە.

بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە کە وەکو هەستێکی ئۆنتۆلۆجی سەیری "خۆشی" بکـەین، دەنا گەر خۆشی کلیلی شـێوەی شـتەکان بێـتو بەشـداریکردنی تایبـەتی ئێمـە بێـت لـە بووندا کە تیایدا لە ڕێی ئەوەوە بوون خۆیمـان بـۆ ئەخاتـەڕوو، ئـاخۆ ئەمـە نـاکۆك نییـە لەگەڵ ئەو تێڕوانینەدا کە دڕدۆنگی بە "شێوازی بنـەڕەتی بـۆ خۆدۆزینـەوەی مـرۆڤ" لـە قەڵەم ئەداتو ئاخۆ ئەمە ناکۆکییەك نییە کە مـرۆڤ بـە زەحمـەت ئـەتوانێت چارەسـەری بکات؟

دەتوانین ئەم ناکۆکییە لە ڕێی جیـاوازیی بۆچـوونی هایدیگـەر لەگـەڵ ڕیکـۆردا ڕوون بکەینەوە. هەروەکو سەرنجمان دا هایدیگەر ئەیەوێ ڕەهەندێکی ئۆنتۆلۆجی بـە هەسـتی خۆشی بدات، بەڵام دیارە کە لەنێو تەواوی هەستو سۆزەکاندا ئەولەویـەت بـە دڕدۆنگـی

ئەدات. ئێمە كە لە ئاست جیهاندا وا هەست ئەكەین لەناو ماڵی خۆماندایینو سەر بەم جیهانەین، ئەوا ئەم هەستە هەستێكی سەرەتایی (ئەوەڵێن) نییە "ئەم جۆرەش لە بوون -لە- جیهاندا، كە ئارامبەخشو ئاشنایە شێوازێكی شپرزەبوونی بوونی مرۆیی (دازاین)ە، نەك بە پێچەوانەوە. هەر بۆیە دەبێ وای بۆ بچین كە لە ڕوانگەی بوونگەرابیانەی -ئۆنتۆلۆجییانەوە هەستكردن بەوەی كە "مرۆڤ لە ماڵی خۆیدا نییە" ڕەسەنترین دیاردەیە. بەڵام ڕیكۆر ئەمە هەڵاوگێڕ دەكاتو دەڵێت كە خۆشیو هەستكردن بە ئینتیما هەستی ئەوەڵینن: "ئەگەر بوون بریتی بێت لەوەی كە بوونەكان نین، ئەوا دڕدۆنگی هەستكردنی ڕەسەن دەبوو بە جیاوازیی ئۆنتۆلۆجی. بەڵام خۆشی (یان شادی) بەڵگەی ئەوەیە كە بەشێك لە ئێمە پەیوەستە بە لەدەستدانی بوونەوە لەناو بوونەوەرەكاندا. هەر ئەمەشە هۆی ئەوەی كە ئەو خۆشییە ڕۆحیو ئەڤینە ئەقڵیو شاگەشكەییەی كە دیكارتو مالبرانشو سپینۆزاو بێرگسۆن بە ناوی جیاو لە چوارچێوەی فەلسەفیی جیادا لێی دواون، دەلالەت لەو "حاڵەتە" سۆزدارییە دانسقەیە ئەكات كە بە ڕاستی شایانی ئەوەیە ناوی "ئۆنتۆلۆجی"ی بەسەردا دابڕین. بەڵام دڕدۆنگی بریتییە لە دیوی پشتەوەی، دیوی نائامادەبوونو مەودا" .

پێدەچێ لێرەدا ئێمە ڕووبەڕووی شتێك بووبینەوە كە لە بەریەككەوتنی پێشەوەی ئۆتۆمۆبێلەكان بچێت. لە سەرێكەوە هایدیگەر دڕدۆنگی بە هەستی ئۆنتۆلۆجیی بنەڕەتی ئەزانێتو هەستكردن بە بوون "لەناوماڵ"دا بە هەستی لاوەكیو بگرە فریودەر لە قەڵەم بدات، لە كاتێكا ڕیكۆر ،خۆشی (یا شادی) بە ئەوەڵێن هەستی ئۆنتۆلۆجیو بگرە تاقە هەستی ئۆنتۆلۆجی ئەزانێت، كە دڕدۆنگیی لێ ئەكەوێتەوە.

ئایا ڕێگایەك هەیە بۆ یەكلاكردنەوەی ئەم دوو تیۆرە بە یەك ناكۆكە؟ یان لەوانەیە جیاوازیی نێوانیان بگەڕێتەوە بۆ ئەو شێوازەی كە مرۆڤ بەرامبەر بەو مەسەلەیە هەستی پێدەكات؟ ئێمە پاش هەموو ئەو شتانەی سەبارەت بە هێزی كەشفكەری هەستو سۆز

وتمان، ئەگەری دووەم وەلاوە دەنێین‌و، لێرەدا ئێمە لە ئاست شتێکداین کە ناکرێ بڵێین حاڵەتی سایکۆلۆجیی کوێرانە یان حاڵەتی خودی‌و تایبەتین.

هەروەها ناشکرێ بڵێین هەستو سۆزە پۆزەتیڤەکان لە پێشترن لە هەستو سۆزە پاسیڤەکان، بەڵکو ئەو بیرۆکەیەی لە بەردەممانداپە ئەوەیە کە: ئایا بوون یان واقیع هەڵگری مۆرکی هەستو سۆزی پۆزەتیڤی وەکو خۆشی‌و ئومێدو ئینتیماو هەست بە هۆگری‌و حەوانەوەو شتی لەو بابەتەیە، یان بوونێکی نامۆیە تا ئەو رادەیەی کە کلیلی سەرەکی بۆ تێگەیشتنی بریتییە لە دڕدۆنگی یا بێزاریی پشتگوێ خراوو یان لەوانەشە ئەو "هێڵنج"ە بێت کە سارتەر زۆر بە جوانی لە ڕۆمانێکیدا بە هەمان ناونیشانەوە لە بارەیەوە نووسیوە.

ڕیکۆر وەختێ لەم بابەتە ئەدوێت چارەسەرێکی شیاو پێشنیاز ئەکات، ئەو دەپرسێت: "ئایا بەرخوردی نێوان دڕدۆنگی‌و شاگەشکەیی خۆی بەڵگەیەك نییە دژ بە چەمکی هەستی ئۆنتۆلۆجی؟" پاشان وەڵام دەداتەوە: "ڕەنگە ئەم بەرخوردە هیچ مانایەکی نەبێت جگە لە جیاوازیکردن لە نێوان شێوازی نەگەتیڤو شێوازی شوبهاندندا لە تێڕوانیندا بۆ بوون" *.

با لێرەشدا باسی ئەوە بکەین کە زمانی سوننەتییانەی ئایینی لە یەك کاتدا هەم بە شێوەیەکی نەگەتیڤو هەم بە شێوەیەکی پۆزەتیڤ باس لە خوا ئەکات، چونکە

---

* ڕیکۆر لێرەدا ئاماژە بە جیاوازیی نێوان خوداناسیی پاسیڤ (کەوا دەبینێت خودا بێ نموونەیە) و خوداناسیی پۆزەتیڤی شوبهێنەردا ئەکات (کە هەندێ سیفەت ئەخاتە پاڵ خودا کە هاوتای لای مرۆڤ هەیە، وەکو بیستن‌و بینین‌و خۆشەویستی‌و بەزەیی.. هتد، هەڵبەت ئەم شێوازەی دووەم لە وەسفی خودی یەزداندا پۆزەتیڤەو خودا لە مرۆڤ نزیك دەخاتەوەو ئاشنای دەکات، بەڵام شێوازی یەکەم خودا بە جیاوازو دوورو نامۆ لە مرۆڤ ئەناسێنێت. لەبەرئەوەی لە زۆربەی ئایینە ئاسمانیەکانیشدا خودا خاوەنی هەردوو جۆری ئەم سیفەتانەیە، بۆیە نووسەر وایدەبینێت کە بوونیش ئاوێتەیەکە لەم هەستە پاسیڤو پۆزەتیڤانەی کە بوونگەراکان وەکو کلیلێك بۆ کەشفی بوون ئاماژەیان پێداوە.

هەرچۆن دان بە تووڕەبوونو سزادانیدا دەنێت، ئاواش دان بە خۆشەویستیو نزیکیدا ئەنێت. لانی کەم ئەشێ لە پەنا ئەم ئاقارەدا ڕێگەچارەیەك هەبێت. لە سەرێکی تریشەوە لەوانەیە لەناو بوون خۆیدا بەدحاڵیبوونێکی بنەڕەتیو تەنانەت دوالیزمێکیش هەبێت –بوونگەرا بێباوەڕەکانیش زۆر لە دوالیزم نزیك ئەبنەوە– بەڵام پێویستە لێدوانی وردتر لەسەر ئەم کێشانە هەڵگرین بۆ ئەو بەشەی کە بۆ میتافیزیکای بوونگەرایی تەرخان دەکەین (بڕوانە بەشی سیانزدەهەم) ئێستاش هێندە بەسە لەوە تێبگەین کە بوونگەراکان چۆن پەرەیان بە تێڕوانینێکی نوێو گرنگ دا بۆ کێشەی هەستو سۆزو، چۆن هەوڵیان دا ئەم دیاردە بوونگەرایانە لە فەلسەفە گشتگیرەکەی خۆیاندا جێبکەنەوە.

* * *

# بەشی نۆیەم

## کردار Action

١–بوونەوەری مرۆیی بەوپێیەی بکەرە.

٢–ئازادی.

٣–بڕیارو هەڵبژاردن.

## ١–بوونەوەری مرۆیی بەوپێیەی بكەرە

دوای ئەوەی لەم كتێبەدا دوو بەشمان بۆ ئەقڵو بەشێكمان بۆ هەستو سۆز تەرخان كرد، بە پێویستی ئەزانین بەشێكیش بۆ ئیرادەو كردار تەرخان بكەین، تـا پـەیڕەوی لـەو بۆچوونە كۆنە بكەین كە تا ماوەیەكی زۆر ڕەچاو ئەكراو ژیانی سـایكۆلۆجیی مرۆڤـی بـۆ ئیدراكو هەستو سۆزو ئیرادە دابەش ئەكرد. بەڵام ئێمە پێشتر ئاماژەمان بۆ ئـەوە كـرد كـە سـایكۆلۆجیای كـۆنی "تواناكـان" لای بوونگـەرایی بایـەخێكی ئـەوتۆی نییـە، لەبەرئەوەی مرۆڤ وەكو گشتێك هەیـەو نـاكرێ پارچەپارچـەی بكـەین بـۆ هـزرو هەسـتو سۆزو ئیرادە. چونكە ئەمانە دابڕاندنن لەو گشتە. هەروەها هەڵەیە گەر واش دابنـێین كـە مـرۆڤ ئـەتوانێ لـە پێـشدا وێنەیـەك بـۆ بوونـەوەری مرۆیـی دروسـتبكاتو پاشـان وا لـەم بوونەوەرە بكات كردار ئەنجامبدات. لەبەرئـەوەی لـە فەلـسەفەی بوونگەراییـدا چـەمكی مرۆڤ لە هەموو ئەو هزرە وەستاو Staticانە دووردەكەوێتـەوەو هـەر لـە سـەرەتاوە مـرۆڤ وەكو بكەرێك سەیركراوە. لە بەشە سەرەتاییەكانی ئەم كتێبـەدا ئاماژەمـان بـەوە دا كـە فەیلەسـووفە بوونگـەراكان لەگـەڵ "جـۆن مـاكمۆری"دا لـەوەدا یەكدەگرنـەوە كـە خـود

بکەرە پتر لەوەی بیرکەرەوە بێت، هەروەکو تێگەیشتنە سوننەتیەکە وای بۆ دەچێت. بەر لە "ماکمۆری"یش بە شەست ساڵ فەیلەسووفێکی تری بوونگەرا هەبوو کە ناوی "مۆریس بلۆندل" بوو، کرداری کردبوو بە گوتەزای سەرەکیی فەلسەفەکەی. بلۆندل لە کتێبەکەیدا "کردار L'Action" دیالەکتێکی نوێ پێشنیاز ئەکات کە تیایدا گوتەزای گشتگیری کردار هزریش ئەگرێتە خۆی، بەڵام ڕەتیشی ناکاتەوە.

کەواتە ئێمە لەم بەشەدا قسە لەسەر ڕەهەندێکی نوێی بوونی مرۆیی ناکەین تا بیخەینە سەر ئەو ڕەهەندانەی پێشتر قسەمان لێکردن، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە هەوڵێکی زیاتر بدەین تا وەك بکەرێك لە بوونەوەری مرۆیی تێبگەین، بە سەرنجدانی ئەوەش کە ئەم تێگەیشتنە لە تەواوی ئەو لێدوانانەی پێشووترماندا ئامادەگیی هەبووە. ئەوەندەش ساویلکە نابین وا دابنێین کە ژیانی ڕۆحیی مرۆڤ بکەین بە سێ بەشەوە: هزر، هەستو سۆز، ئیرادە. بەڵکو ئێمە کردار بە چەمکێکی گشتگیر دادەنێین کە بە ڕەچاوکردنی ئەم چەمکە ئەگەینە تێگەیشتنێکی ڕوونتر بۆ زۆربەی ئەو بابەتانەی کە پێشتر بە جیاو بە دابڕاوی لێیان دواین.

دەشتوانین بۆ پاساوی دانانی ئەم بەشەش لێرەدا ئەو ڕێنماییانەی کیرکەگۆر بهێنینەوە یادی خۆمان کە دەربارەی قۆناغەکانی ژیان دیاریی کردوون (بۆ ئەوە بە تایبەتی بڕوانە (هەردوو کتێبی "ئەم یان ئەو" و "چەند قۆناغێکی ڕێگای ژیان") ئەم قۆناغانەش قۆناغی ڕاستەقینە نین، بەڵکو قووڵکردنەوەیەکی قۆناغداری ژیانن، کە تیایاندا شتەکانی ڕابردوو بە شێوەیەکی دەوڵەمەندتر دێنەوە ئارا. ئەبێ ئەوەشمان بیرنەچێت کە قۆناغی ئاکاری، یان ژیانی کردار لەم هێڵکارییەی کیرکەگۆردا پاش قۆناغی هەستی (یان ئیستاتیکی) دێت، کە لە بنەڕەتدا قۆناغی هەستو سۆزو چێژە. بڕگەیەکی "ڕۆژانەکان"یش کە لە شێوەی ژیننامەدایە گوزارشت لەم گواستنەوەیە دەکات لە قۆناغی هەستییەوە بۆ قۆناغی ئاکاری:

"لە دەریای بێ بنی چێژداو لە خەرەندی زانیندا، بێهوودە بە دوای خاڵێکدا گەڕام کە لەنگەرەکەمی تیا فڕێبدەم. هەستم بە هێزێك کرد کە بەرهەڵستی نەدەکرا: هێزی ئەو لەززەتەی کە ئەیدامە دەست لەززەتێکی دی، هەستم بەو نەشئە فریودەرەش کرد کە لەززەت دروستی ئەکات، بەڵام هەستم بە بێزاری Ennui و وەڕسیش کرد، هەروەها بەو پەرتەوازەییە زەینییەی کە دوای ئەو حاڵەتە دروست ئەبێت. تامی بەری داری زانینم کرد، زۆر چێژم لەو تامەش بینی! بەڵام ئەم چێژە بە تەنها لە ساتی زانیندا روویدەدا، پاشان نەدەما، بەبێ ئەوەی ئاسەوارێکی قووڵ لەناو دەروونمدا جێبهێڵێت" .

بەرامبەر بەم ژیانەی کە ئامانجێکی دیاریکراوی نییەو کە بەو دێڕانەی پێشوو وەسفی کردووە، دەڵێت: "لە ڕاستیدا ئەوەی من پێویستم پێیەتی ئەوەیە کە بە ڕوونی دەروونی خۆم ببینم، بزانم– پێویستە لە سەرم چی بکەم.. چ سوودێکی هەیە گەر ئەو شتەم کەشف کرد کە پێی دەوترێ حەقیقەتی بابەتیو، هەروەها لێکۆڵینەوەی ڕێبازە فەلسەفیەکانو پیاچوونەوەیانو دۆزینەوەی دژایەتیو ناتەباییەکانی نێوانیان؟ چ سوودێك دەبینم گەر گەشە بە تیۆرەیەك بدەم سەبارەت بە دەوڵەت؟ هەموو وردو درشتەکانم پۆلێن کردو بەم شێوەیە جیهانێك بنیات دەنێم کە خۆم تیا ناژیم، بەڵکو تەنها ئەیخەمە بەرچاوی خەڵك؟ ئەی چ سوودێکی هەیە بۆم گەر من توانیم مانای مەسیحیەت لێك بدەمەوە، گەر ئەم لێکدانەوەیە مەغزایەکی قووڵی بۆ خۆمو بۆ ژیانی خۆم نەبێت؟ چ سوودێکی هەیە بۆ من گەر حەقیقەت بە ڕووتیو بە ساردی لە بەردەممدا وەستا بە بێ ئەوەی بە لایەوە گرنگ بێت پەی پێ بەرم یا پەی پێ نەبەمو، موچرکی ترسم پیابهێنێت نەك گوێڕایەڵیەکی خۆبەخشانەم تیا دروست بکات..؟" .

کەواتە فەیلەسووفی بوونگەرا جەخت لەسەر کردار ئەکاتەوە، لەبەرئەوەی بوونی مرۆیی بە تەنها لە کرداردا ئەگاتە بەرکەماڵیو وەدیهاتن. بەڵام لەو دەقانەشەوە کە لە کیرکەگۆرەوە وەرمانگرتن (دەتوانین لای فەیلەسووفەکانی تری بوونگەرایی هەمان شت بسەلمێنین) دەردەکەوێ کە کردار بە تەنها ئەرکێك یان چالاییەك نییە، لەبەرئەوەی

فەیلەسووفی بوونگەرا وای بۆ دەچێت کە کردار بە مانای دروستکەری شتێکی زۆر شەخسییەو تەواوی مرۆڤ ئەگرێتەوە، لەبەرئەوەی هەم هزرو هەم سۆزو هەستیش لەخۆ دەگرێت: گەر هزر یان هەستو سۆز یاخود بڕیارێکی ناوەوە نەبێت، شتێك نابێت شایانی ئەوە بێت پێی بڵێین کردار. بەم جۆرە، لەگەڵ ئەوەشدا کە فەیلەسووفی بوونگەرا زۆر بایەخ بە کردار ئەدات، بەڵام بوونگەرایی بریتی نییە لە پراگماتیزم* Pragmatism، لەبەرئەوەی کردار لای بوونگەراکان هەمان کرداری دەرەوە نییەو بە پێوەری "سەرکەوتن" ناپێورێ.

ئەگەر بە مانایەك لە ماناکان ئەوە ڕاست بێت کە لە ڕوانگەی بوونگەراییەوە بڵێین مرۆڤ ئەو کردارەیە کە ئەنجامی ئەدات، ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەم مانایە جیاوازە لە تێگەیشتنی ئەو ئاقارەی کە مرۆڤ بە "مرۆڤی ئەرکدار" Functional man دەناسێنێت. ئەوە ڕاستە کە هەم ئەم بۆچوونەو هەم بۆچوونی بوونگەراکان، دەیانەوێ لە چوارچێوەی گوتەزا وەستاوو گەوهەرییەکان Substantial خۆیان قوتار بکەن بەرەو شێوازی دینامیکیترو گونجاوتری مرۆڤ بەوپێیەی بوونێکی زیندووی بگۆڕە. بەڵام چەمکی مرۆڤی ئەرکدار، ئەبێ وا سەیری بکەین کە تا ڕادەیەکی زۆر ئەبستراکتە، کاتێکیش دەزانین کە ئەم چەمکە لە کۆمەڵناسی ئەزموونگەراوە سەرچاوەی گرتووە زیاتر ئەمەمان بۆ دەسەلمێ، چونکە مرۆڤ بە تەنها بریتی نییە لەو ئەرکانەی جێبەجێیان دەکات. بەڵکو بریتییە لە یەکەی کەسێك کە لە گشت چالاکیەکانیدا گوزارشت لە خۆی دەکات، یان ڕەنگە وا دروستتر بێت بڵێین کە مرۆڤ لەم چالاکییانەدا (خۆی دروست ئەکات). کردارەکانیشی پترن لەوەی کە بە تەنها هەندێ کردەوەی بینراوو ئەزموونی بن، بەڵکو ئەو بەو کردارانەی هەم وێنەی کەسێتیی خۆی بە دەستەوە ئەداتو هەم کەسێتیی خۆشی بەدی دەهێنێت.

---

* پراگماتیزم: لەبەرئەوەی پراگماتیزم بایەخی تەواو بە کردار ئەدات، تەنانەت زاراوەکەش لە وشەی Pragmaی یۆنانیەوە وەرگیراوە کە بە مانای کردار دێت.

كەمن ئەو بیرمەندانەی كە لەم سەردەمەدا نزیكەدا گەیشتبن بە ڕوانینێكی دینامیكی وەك ئەوەی گابریل مارسیل پێی گەیشتووە، لەگەڵ ئەوەشدا مارسیل لە سەرسەختترین ڕەخنەگرانی چەمكی "مرۆڤی ئەركدار" بووە. ئەوەتانێ دەڵێت: "ئەگەر وەكو گشتێك بڕوانیتە فەلسەفەكەی من، سەیردەكەیت توخمی دینامیكی تیایدا لە شەڕێكی سەرسەختدایە لەگەڵ ڕۆحی ئەبستراكتدا" . مرۆڤی ئەركدار، كە وەكو یەكێك لە فاكتەرەكانی واقیعی كۆمەڵایەتیی ئەزموونگەرا سەیردەكرێ، لە نهێنیو كەرامەتو كەسێتیو دواجار لە خودی مرۆڤایەتیش بێبەرییە. ئەم هەڵەیەش بە گەڕانەوە بۆ تێڕوانینێكی وەستاو (ستاتیكی) بۆ مرۆڤ چارەسەر ناكرێ، بەڵكو بە پەرەدان بە تێگەیشتنێكی تەواوترو دەوڵەمەندتر بۆ مانای كرداری مرۆیی. ئەگەر مرۆڤ ئەو بوونەوەرە بێت كە لە خودی خۆی دەردەچێتو تێیدەپەڕێنێت، ئەوكات دەبێ لە چوارچێوەی ئەم نهێنیی خۆتێپەڕاندنەدا لە كردار بگەین، چونكە مرۆڤ بە تەنها مرۆڤێكی ئەركدار نییە، بەڵكو باشترین پێناسە بۆی (مرۆڤی گەڕۆك Homo Viator)ە (ئەمە ناونیشانی كتێبێكە كە بریتییە لە كۆمەڵێك لێكۆڵینەوەی مارسیلو بە وردی گوزارشت لە تێگەیشتنی ئەو بۆ دۆخی مرۆیی دەكات).

بە بڕوای من سڵكردنەوەی هەندێ فەیلەسووف بوونگەرا لە بەكارهێنانی وشەی باوی وەكو "ئیرادە" بۆ وەسفكردنی كرداری مرۆیی، لانی كەم ئەگەڕێتەوە بۆ ترسیان لەوەی كە ئەم دەربڕینە هێما بۆ جۆرێك لە ئەبستراكت بكات كە ئەبێتە توخمێكی سێیەم لە پاڵ توخمی هزرو هەستو سۆزدا. بەڵام كردار ئەبستراكتێكی لەم جۆرە نییە. لە كرداردا، بە مانا ڕاستەقینەكەی، تەواوی بوونی مرۆڤ كاردەكات، هەر بۆیە چەمكی كردار تەواوی نهێنیی بوونی مرۆڤ لەخۆ دەگرێت.

## ٢–ئازادی

کردار پەیوەستە بە ئازادی (Freedom) ەوە. بابەتێکیش نییە هێندەی ئازادی لە فەیلەسووفە بوونگەراکانەوە نزیك بێت وتەواوی نووسەرە بوونگەراکان خۆیان لە قەرەی داوە. لای کیرکەگۆریش بابەتێکی سەرەکییە. چونکە ئەو وایدەبینێت کە بوونی مرۆییو ئازادی تا ڕادەیەکی زۆر دوو دەربڕینی هاو واتان. بایەخدان بە ئازادی، یان خولیای ئازادی، لەسەر دەستەیەکی تایبەتی بوونگەراکان قۆرخ نییە، ئەوەتانێ دوو گەورە پەیامبەری ئازادی لە سەدەی بیستدا، دوو فەیلەسووفی بێباوەڕ بوون، کە ئەوانیش: سارتەرو کامۆن، لەبەرئەوەی بێباوەڕیی بوونگەرایی تەواو جیاوازە لە بێباوەڕیی ڕێبازی حەتمی کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا گەشەی سەند. سارتەریش وەکو کیرکەگۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئێمە ناتوانین جیاوازی لە نێوان ئازادیو بووندا بکەین، چونکە ناتوانین بڵێین مرۆڤ یەکەمجار هەیەو پاشان ئازاد دەبێت، بەڵکو لەبەرئەوەی مرۆڤە، کەواتە ئازادە.

بەلام فەیلەسووفە بوونگەراکان، کاتێك لە ئازادی ئەدوێن زۆر ڕوون نین. ئێمە دەزانین کە بوونگەراکان لەسەر ئەوە کۆکن کە واقیعی مرۆیی لەسەروو هێزی هزری شیکارەوەیەو زیندانی قالبو گوتەزاکان تێدەپەڕێنێت. ئەگەر ئێمە بە شێوەیەکی ڕەسەن بەڕووی واقیعی داینامیکدا بکرێینەوە کە پێی دەڵێین بوون Existence، ئەوکات بەردەوام لێکدانەوەکانمان بۆی کەموکورتو نوقسان دەبن. ئەوەش بە تایبەتی لە قسەکردنماندا لەسەر ئازادی دەردەکەوێت. گەرچی ئێمە ئاماژەمان بەهەریەك لە کیرکەگۆرو سارتەر دا لەو تێڕوانینەیاندا کە دەڵێت بوونی مرۆییو ئازادی یەك شتن،

---

* لە زمانی ئینگلیزیدا هەردوو زاراوەی (freedom) و (liberty) بە مانای ئازادی دێن، بەلام زاراوەی یەکەمیان مانایەکی گشتگیری هەیە کە هەم ئاماژە بۆ ئازادیی ناوەوەو هەم بۆ ئازادیی دەرەوەش ئەکات. لە کاتێکا زاراوەی دووەم بە تەنها ئاماژە بۆ ئازادیی سیاسیو هی دەرەوە ئەکات.

بەڵام ئەوە ڕێمان لێناگرێت کە بە تایبەتی قسە لەسەر کێشەی ئازادی بکەین. لەوانەیە لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە ڕەوا بێت کە بوونو ئازادی بە یەك شت لە قەڵەم بدەین، بەڵام کێشەکە بەلای فەلسەفەوە ڕوونکردنەوەی جیاوازییە شاراوەکانی بەکارهێنانی ئەم دوو وشەیەیە.

بەڵام ئاخۆ چۆن دەتوانین باس لە ئازادی بکەین، یان وێنای بکەین؟ ئێمە چەند بمانەوێ ئەم چەمکە بگرین، ئەو لە دەستمان هەڵدێت. ئەو هەر بە سروشت ناجێگیرو ناسەقامگیرە. هەر بۆیە دەبینین لای سارتەر بریتییە لە کرداری نەفیکردنی بوون وەك ئەوەی لە خۆیدا هەیە، تا ئازادیی ئەوەی بۆ خودی خۆیەتی بێتە ئاراوەو، ئەم بوونەی کە بۆ خۆیەتی بەبێ بوونەو لە گەڕاندایە بە دوای بووندا *.

هەربۆیە لە بری ئەوەی هەوڵبدەم وێنەیەکی شێواوی ئازادی بە شێوەیەکی گشتی لە فەلسەفەی بوونگەراییدا بەدەستەوە بدەم، لەسەر بیروبۆچوونەکانی یەکێك لە نووسەرەکان هەڵوەستە ئەکەمو بۆ ئەوەش نیکۆلای بێردیاییف هەڵدەبژێرم کە بیروبۆچوونەکانی سەبارەت بە ئازادی قووڵو کاریگەرن. گرنگترین سەرچاوەشم ئەو بەشە دەبێت کە بە ناونیشانی "ئازادی"یەوەیە لە کتێبی "بوونگەرایی مەسیحی" کە لە نووسینی دۆناڵد. ئەی لۆرییەو هەڵبژاردەیەکی باشی کارەکانی بێردیاییڤەو بە جۆرێك کۆکراوەتەوە کە وەکو ڕێبازێکی گونجاو دێتە بەرچاو.

کاتێك بێردیاییف پشت ئەکاتە بەڵگە سوننەتیەکان بۆ سەلماندنی ئازادی ئیرادە، بەوە گوزارشت لە ڕای گشت فەیلەسووفە بوونگەراکان ئەکات. "کێشەکە کێشەی ئازادیی ئیرادە نییە، بەو شێوەیەی کە ئەم وشەیە لە ڕێبازی سروشتگەراییو لە سایکۆلۆجیاو لە پەروەردەو ئاکاردا بەکاردەهێنرێ. کێشەی ئەم بەڵگە سوننەتییانە

---

* مەبەست لەوەیە کە لای سارتەر جیهانی بابەتی ملکەچی زەمانو شوێنەو ناتەقلانییەو حەتمییە، بە پێچەوانەی مرۆڤەوە کە بوونە بۆ خۆی (یان لە پێناوی خۆیدا) و لە چالاکیەکانیدا ئازادەو پشت بە یاسا بابەتیەکان نابەستێت.

ئەوەیە کە ویستوویانە ئازادی (بە بابەت بکەن)و وەکو بابەتێك مامەڵەی لەگەڵدا بکەن کە دەکرێ بە جۆرێك لە جۆرەکان لە دەرەوە دەرك بکرێو لێی بکۆڵرێتەوەو بسەلمێنرێ یان نەسەلمێنرێ. بەڵام لای فەیلەسووفی بوونگەرا (هەرچۆن لای "کانت"یش هەروایە) ئازادی بابەتێك نییە بسەلمێنرێ، بەڵکو بەڵگەنەویستێکە کە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ کرداردا هەیە. وەکو مەرجێك بۆ بوونمان هەر لە سەرەتاوە ئامادەیە (تەنانەت بۆ بوونی بیرکردنەوەشمان) "هەوڵدان بۆ تێگەیشتنی کردارێك لە کردارەکانی ئازادی بە شێوازێکی ئەقلانی، واتە تۆ وەکو دیاردەکانی سروشت سەیری ئەکەیت"، لە کاتێکا ئەو دیاردانە سەر بە جیهانێکی "لاوەکی"ن، بەڵام ئازادی هەیە تەنانەت بەرلەوەی بیر لەم جیهانەشیان بکەینەوە".

کاتێکیش بێردیاییڤ قسە لەسەر لەپێشبوونی ئەم ئازادییە دەکات لە چاو جیهانی دیاردەکاندا، زمانی ئەبێتە زمانێکی میتافیزیکیو تەنانەت بگرە زمانێکی سۆفیانەش. بەڵام بە دڵنیاییەوە ڕاستیش ئەکات لەوەدا کە دەڵێت ئازادی خۆی نهێنییەکی ئاڵۆزەو، مرۆڤ ناتوانێت لە بارەیەوە بدوێت تەنها بەو زمانە نەبێت کە ئەو بەکاریدەهێنێت. زۆرجاریش ئەڵێت کە ئازادی لە پێش بوونەوەیە، ئەمەش هەر بۆئەوەی جەخت لەسەر لەپێشبوونی ئازادی بکاتەوە، زمانێکی لەم جۆرە پارادۆکس (موفارەقە)ی تیایە، بەڵام لە چوارچێوەی فەلسەفەکەی بێردیاییڤدا مایەی تێگەیشتنە.

"هەر ڕێبازێکی ئۆنتۆلۆجی دان بە لەپێشبوونی ڕەهای بووندا بنێت، ئەو ڕێبازە ڕێبازێکی حەتمی (Determinism)ە. هەموو ڕێبازێکی ئەقلیی بە بابەت بوو، ڕێبازێکی حەتمییە، لەبەرئەوەی ئازادی لە بوونەوە هەڵدەهێنجێتو تیایدا وا دەردەکەوێ کە بوون ئازادی دیاریدەکاتو ئەمەش لە دوا شیکردنەوەدا بە مانای ئەوە دێت کە ئازادی لە زەرورەتەوە سەرهەڵئەدات. بەم جۆرە بوون ئەبێتە زەرورەتێکی داواکراو، بەبێ هیچ ئەگەرێکی دەرچوون لە چوارچێوەکەی. بوون دەبێتە یەکەیەکی ڕەهاو کامڵ. بەڵام ئازادی لە بوون هەڵناهێنجرێ، بەڵکو ڕەگوڕیشەی خۆی لە نەبوون (عەدەم)دا دائەکوتێت

(گەر بمانەوێ زاراوەی ئۆنتۆلۆجیی بۆ بەكاربهێنین،، ئـازادی هـیچ بنـەڕەتێكی نییـە، نـە زادەی بوونەو نە بوون ئازادی دیاریدەكات".

ئەمەش وای لێدەكات بڵێت كە ئـازادی "لـە خەرەندێكـەوە پەیـدادەبێت كـە بـەر لـە بوون هەیە.. كرداری ئازادی كردارێكی ئەوەڵێنو تەواو نائەقڵییشە".

هەڵبەت هەندێ لەو وشانەی لەو بڕگەیەی پێشوودا هاتووە مانای ئاڵۆز بـە دەسـتەوە ئـەدەن. هـەر بـۆ نموونـە وشـەی "بـوون" و "ئـەقڵی". بـەڵام بـە ڕەچـاوكردنی ئـەم ڕاستییەش دەتوانین دان بەوەدا بنێین كە بێردیاییڤ بەرەو پەیبردن بـە ڕەگوڕیـشەكانی نهێنیی ئاڵۆزی ئـازادی دەچێت. لـە ڕاستیـشدا ئـازادی "دژی بـوون meontic"ە، هیـچە (یاخود شت نییە) زیاتر لەوەی شت بێت، ئیمكانە زیاتر لەوەی كردار بێـت، چـونكە هـزر ناتوانێت پەی پێبەرێت، بەڵكو تەنها لە ڕێی پراكتیك كردنەوە دەیناسێت. بگرە تەنانـەت لەو ساتانەشدا لەوانەیە پەی بەو مۆركە ڕاستەقینە قووڵەی ئازادی نەكەین كە بێردیاییڤ جەختی لەسەر دەكات، تەنها لەو چركەساتە دەگمەنانەی ئەزموونی دڕدۆنگیدا نەبێت لـە ئاست ئازادیدا.

بەڵام سەرباری ئەو جەختكردنەوەیەی بێردیاییڤ لەسەر لەپێشبوون (ئەولەویـەت)ی نامەعقولانەی (ڕەنگە وا چاكتریش بێت بڵێت: پێش ئەقڵییانە)ی سروشـتی ئـازادی، ئـەو بیرۆكەیـەكی تـر پێـشنیاز دەكـات كـە دەیـەوێ ڕواڵـەتی كوێرانـەی ڕەهـای ئـازادی ڕاستبكاتەوە، هەر بۆیە ئەوەمان بیردەخاتەوە كـە سـانت ئۆگەسـتین باسـی دوو جـۆری ئازادیمان بۆ دەكات كە ناوی لێناون: "ئازادیی گەورە" و "ئازادیی بـچووك". بێردیـاییڤ ئەڵێت: "ئێمە دەبینین كە لێرەدا ئازادی دوو مانای جیاوازی هەیە. ئازادی یان دەبێ ئەو ئازادییە بنەڕەتییە نامەعقولە بێت كە لە پێش چاكەو خراپـەوە دێـتو ڕكێفیـان دەكـات، یاخود ئەو ئازادییەیە كە ئامانجە، ئەو ئازادییەی كە لە چـاكەو هەقـدا دێتـەدی. ئەمـەش واتە ئازادی لـە هـەمان كاتـدا وەك خـاڵی سـەرەتاو ڕێگـا سـەیردەكرێو هـەروەها وەكـو ئامانجو كۆتاییش". ئەم جیاكردنەوەیەی نێوان ئەو ئازادییەی كە پێش كردار دەكەوێتو

ئەو ئازادییەی کە دوای کردار ئەکەوێت، جیاکردنەوەیەکی ترمان بۆ دەخاتەوە کە لەو دەچێتو لای کیرکەگۆرو هەندێ بیرمەندی تر هەیە، لە نێوان ئەو دڕدۆنگییە بنەڕەتییەی کە پێش ئازادی هەیەو هەروەها ئەو دڕدۆنگییە یان خەمەی کە بە درێژایی ژیان لەگەڵ مرۆڤدایە.

جگە لەوە هەرچۆن دڕدۆنگی بە کێشەکانی خراپەو گوناهەوە وابەستەیە، ئازادییش بە هەمان شێوە. لەبەرئەوەی ئازادی خۆی لە خۆیدا دیاردەیەکی ئاڵۆزە. هەروەها وەکو بێردیاییڤیش دەڵێت ئازادی (لە هەردوو جۆرەکەیدا) لە چوارچێوەی دیالەکتیکێکدایە کە دەکرێ بە ئاسانی ببێت بە دژەکەی. دەشێ ئازادیی بنەڕەتی بگۆڕێ بۆ ئاژاوە: "کە دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی تراجیدیای ڕەوتی جیهان"، ئازادیی دووەمیش دیسانەوە دیالەکتیکی خۆی هەیە، کە دەشێ ببێتە مایەی "ناچارکردنو زۆرداری لە هەقو چاکەدا، فەزیلەتی زۆردارەکی، و هەروەها سیستمێکی دیکتاتۆریانە بۆ ژیانی ئادەمیزادە". تەنانەت مەسیحیەتیش کە دەبوایە باڵاترین ئازادیی وەدی بهێنایە، بەردەوام بووەتە هۆی نکوولی لێکردنی یان ڕێگرتن لێی. پێدەچێ ئازادی لەناو خۆیدا تۆوی فەوتانی خۆیشی هەڵگرتبێت، هەر بۆیە نهێنیی ئاڵۆزی ئەسڵی ئازادی هاوشانی نهێنیی ئاڵۆزی ئەسڵی خراپە "شر"یە. "تراجیدیای ڕەوتی جیهان خۆی تراجیدیای ئازادییە، لەبەرئەوەی لە دینامیکیەتی ناوەوەی ئازادییەوە دروست دەبێت، لەو توانستەیەوە کە دەتوانێ بگۆڕێت بۆ دژەکەی خۆی" هەڵبەت بێردیاییڤ لەم ڕووەوە لەگەڵ گەلێ لە فەیلەسووفانی بوونگەراییدا هاوڕایە. بەڵام با ئازادی مەترسیو تراجیدیای حەتمیی خۆیشی هەبێت، وێڕای ئەمە بێردیاییڤو کۆمەڵێك فەیلەسووفی تری بوونگەرا بەوپەڕی گەرمییەوە جەخت لەسەر ئەوە ئەکەن کە پێویستە ئازادی بپارێزینو فراوانتری بکەین. هۆی ئەمەش ڕوونە. ئەگەر ئازادیو بوون یەك شت بن، کەواتە بەبێ ئازادی هیچ مرۆڤایەتیەك نییە. لەوانەیە ئازادی خەتەرناك بێت، بەڵام بەبێ ئازادی هیچ کەرامەتێکی مرۆیی نییەو، پێویستە مرۆڤ بەردەوام بەرگەی مەترسیەکانی فراوانکردنی

پانتایی ئازادی بگرێت. بێردیاییڤیش بە شێوەیەكی دروست ئازادیو داهێنان پێكەوە دەبەستێتەوە، بەرزترین لوتكە مرۆڤ پێی بگات، داهێنانە، داهێنانیش واتە بەشداربوون لە خولقاندندا. "داهێنان واتە نهێنیی پەی پێنەبراوی ئازادی. لە ڕاستیشدا مرۆڤ لە توانایدایە ناشرینیو نەگریسیش دابهێنێت، وەك چۆن چاكەو جوانیو سوودمەندی دادەهێنێت".

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەبێ جڵەو بۆ داهێنان شل بكەین، لەبەرئەوەی داهێنان سیفەتی جیاكەرەوەی مرۆڤەو لەم كردارە ئازادەشدایە كە مرۆڤ خودی خۆی تێدەپەڕێنێت.

ئەم سەرنجانە بەرەو كێشەی ئازادیی سیاسی ڕاپێچمان ئەكەن، كتێبەكەی ئەلبێركامۆش "یاخی The Rebel" لەم ڕووەوە گەورەترین مانیفێستی بوونگەراییە، هەرچۆن یەكێكە لە هەستیارترینو وردترین شیكردنەوەكانی ناو كەلتووری نوێی خۆرئاوا. بێردیاییڤیش لە هەمان ڕۆحی یاخیبووندا بەشدارە دژ بە هەر شتێك كە لە ژیانی مرۆیی كەم بكاتەوە "ئازادی پێویستی بە بەرهەڵستیو تێكۆشانە. تابوو (حەرامكراو)ە كۆنەكان لە هەموو لایەكەوە دەوری مرۆڤیان تەنیوەو ژیانی ئاكاری (ئەخلاقی)یان كۆت كردووە. بۆئەوەی مرۆڤیش خۆی لەم تابووانە ڕزگار بكات، ئەبێ هەست بەوە بكات كە لە ناوەوەی خۆیدا ئازادە، ئەوكات دەتوانێ لە دەرەوەیدا لە پێناوی ئازادیدا تێبكۆشێت". ئامانجی ئەم تێكۆشانەش داهێنانە كە بە ڕاستی مرۆییە "مرۆڤیش بە تەنها لە شتێك ئازاد نابێت، بەڵكو لە پێناوی شتێكیشدا ئازاد دەبێت. ئەم وشەیە "لە پێناو"ەش واتە داهێنانی مرۆڤ".

سەرباری ئەم خۆشەویستییەی بێردیاییڤیش بۆ ئازادی (یان ڕەنگە هەر لەبەر ئەو خۆشەویستییە بێت) كە پەردە لەسەر مەیلێكی ئۆرستۆكراتی لائەدات كە لە خوێنی زۆربەی بوونگەراكاندایە. ئەو دەڵێت كە جەماوەر (یان خەڵك) بەهای ئازادی نازاننو بە جۆرە ڕۆتینیەكانی بوونی مرۆیی قایلن، هەر بۆیە زوو ئەكەونە بەر مەترسیەكانی

دیکتاتۆری کە لەسەر بنەمای دیماگۆگی* دادەمەزرێ "هێشتا ئێمە خوازیاری پەروەردەیەکین کە لە پێناوی ئازادیدا بێت، ئەمەش کارێکە بەم زووانە نایەتەدی".

گەرچی بۆ تێگەیشتن لە چەمکی ئازادی لای فەیلەسووفانی بوونگەرایی تا ڕادەیەکی زۆر پشتم بە نووسینەکانی بێردیاییف بەست، بەلاّم بڕوام وایە کە ئەمە خستنەڕووی هەلّوێستێکە کە گوزارشت لە بۆچوونی زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراکان ئەکات بۆ ئازادی. هەروەها پێویستە ئەوەش بلّێم کە من بە ئەنقەست باسی پەیوەندیی نێوان ئازادیو مەسیحیەتم نەکرد لای بێردیاییف (تەنها بە ئاماژەیەکی خێرا نەبێت) تا خستنەڕووەکە زیاتر تەعبیر لە بوونگەرایی بکات بە شێوەیەکی گشتی.لەبەر ئەوەی بیروڕای فەیلەسووفە بوونگەراکان سەبارەت بە ئازادی، هەروەکو چۆن سەبارەت بە گەلێ بابەتی تریش، لقو پۆپی زۆری لێئەبێتەوەو بۆچوونی جیاوازیان هەیە. ئەوان هەموو دان بە خەتەرناکی (ڕیسك) و بە تراجیدیادا ئەنێن لە ئازادیدا، هەروەها هەموویان عەودالّی ئازادینو بەها و ئەرزشی ئەزاننو ئەیپارێزن. لە کاتێکا بێباوەڕەکانیان بوون بە تراجیدیا یان بە پووچی Absurdity ئەزانن، ئەوا بوونگەرا مەسیحیەکان بڕوایان وایە کە ئومێدو داهێنان دەیسەلمێنن کە لە فاکتەرە پاسیڤەکان بەهێزترن. ئێمە ئەبێ ڕووبەڕووی گرنگیی ئەم دژایەتییە ببینەوە، بەلاّم لێرەدا بە پەلە جارێکی دی ئەوە بە بیر دەهێنینەوە کە ئەم دژایەتییە لە ئارادایە.

## ٣–بڕیارو هەلّبژاردن

نووسینەکانی فەیلەسووفانی بوونگەرا پڕن لە ئاماژە بۆ بڕیارو هەلّبژاردنو پەیمانو ئیلتیزام. ئەشتوانین بلّێین کە ئەمانە ئەو دیاردە بوونگەرایانەن کە تیایاندا کردارو ئازادی بە توندترین شێوە بەرجەستە ئەبن. لە کاتێکیشا بە پێویستمان زانی کە ئەو بیرۆکەیە

* دیماگۆگی:فریودانی خەلّك لەڕێی وتاری بەباق و بریق و وادەو بەلّێنی درۆوە.

ڕەتبکەینەوە، یان دەسکاریی بکەین کە دەڵێت مرۆڤ بریتییە لە کردارەکانی، نەبادا بیرۆکەیەکی ئەبستراکتمان بداتێ سەبارەت بە مرۆڤ بەوەی کە مرۆڤێکی ئەرکدارە، ئەوا کۆکین لەسەر ئەوەی کە ڕەنگە باشتر بێت بڵێین مرۆڤ بریتییە لە بڕیارەکانی، لەبەرئەوەی چەمکی بریار لایەنی ناوەوەو ئازاراویی کرداریش لە خۆی دەگرێت.

بە ئەنقەست باس لە لایەنی ئازاراویی کردار ئەکەم، لەبەرئەوەی کردار بە تەنها بە مانای وەدیهێنانی خود نایەت، بەڵکو نکوولێکردنیشە لە خود. کاتێك مرۆڤ بڕیاری هەڵبژاردنی ئیمکانێك ئەدات واتە لە هەمان کاتدا کۆمەڵێك بڕیاری دی ڕەت دەکاتەوە. بەم جۆرە دیسانەوە ڕووبەڕووی لایەنی ئازاراوی (تراجیکی) بوونی مرۆیی دەبینەوە، لەبەرئەوەی بوونەوەری مرۆیی لای فەیلەسووف بوونگەرا لە ڕێی فراوانکردنی وردەوردەی وزەکانو گەشەدان بەهێزیەوە (گەر ئەم دەربڕینە ڕەوا بێت) خودی خۆی بەدی ناهێنێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە ڕێی ئەو بڕیارانەوە خودی خۆی بەدی دەهێنێت کە دەشێ ئازاراوی بن، لەبەرئەوەی لە ژینی دەپچڕن. بە مانایەکی دی، جەختکردنەوە لەسەر بڕیار جەختکردنەوەیە لەسەر چڕیو قووڵیی ژیان نەك فراوانیو کشانی. هەموو بڕیارێك بڕیارێکە دژ بە شتێکن، هێندەی ئەوەی بڕیارێکە لە پێناوی شتێکدا. هەموو بڕیارێکیش سنوور بۆ ئەو ئیمکانانە دادەنێت کە دەشێ لە بەردەم بڕیارەکانی ئایندەدا بکرێنەوە.

بڕیار وا لە بوونەوەری مرۆیی دەکات بە شێوەیەك بەرەو ڕووی خۆی بێتەوە کە دەبێتە مایەی دڕدۆنگی. هەر بۆیە زۆربەمان ڕقی لە بڕیاردان ئەبێتەوەو چەند پێمان بکرێ خۆمانی لێ دوور ڕادەگرینو دوای دەخەین. لەبەرئەوەی بڕیاردان لە لایەکەوە واتە چوون بەرەو ئاستێکی نوێی بوونی مرۆیی، لە لایەکی تریشەوە، واتە مەترسیی بێبەشکردنی مرۆڤ خۆی لە کۆمەڵێك ئەگەر (ئیمکان– توانست)ی تر، بڕیار واتە گرەوکردن لەسەر ئایندەو خۆبەستنەوە پێوەی، لەبەرئەوەی مرۆڤیش ناتوانێ

پێشبینیی ئایندە بکات، هەر بۆیە ئەم خۆبەستنەوەیە بەردەوام پڕە لە مەترسیو هاویاری دڕدۆنگییە.

کیرکەگۆر لە کتێبەکەیدا "ئەم.. یان ئەو" لە سروشتی بڕیاری کۆڵیوەتەوەو ئاماژەیەکی تایبەتیشی بۆ سێ حاڵەتی ئاشنا بە زۆربەی خەڵك کردووە کە بریتین لە: هاوسەریو، هاوڕێیەتیو، ئەرکی ژیان Vocation (کە لێرەدا مەبەستی لە پەیامی ژیانە). ئەم سێ حاڵەتەش، بە پێچەوانەی زۆربەی بڕیارە لاوەکییەکانی ژیانی ڕۆژانەوە، ئەنجامەکانیان بە درێژایی ژیانی تاکەکەس بەردەوام ئەبێت.

هاوسەرێتی (لای کیرکەگۆر کە تێڕوانینێکی مەسیحیانەی بۆ هەیە) یەکبوونێکی هەتاهەتایی نێوان دوو کەسە، کە تیایدا ئەم دوو کەسە پەیمان ئەدەن بۆ هەتاهەتایە "تاڵیو شیرینی"ی ژیان لەگەڵ یەکدا بەش بکەنو، ئەم حاڵەتەش لە سەروو حاڵەتێکی هەوەسبازانەی تێپەڕ یان خولیایەکی ساویلکانەوەیە. دەشتوانین بڵێین نموونەی مەترسیداریی بڕیاری هاوسەرێتی ئەوەیە کە کیرکەگۆر بڕیاری هاوسەرێتیی خۆی لەگەڵ "ڕێژین ئۆڵسن" ئەنجام نەدا، گەرچی پێویستە ئەوەش بڵێین کە هەڵوەشاندنەوەی ئەم هاوسەرێتییە لە لایەن کیرکەگۆرەوە ئەگەڕێتەوە بۆ پەیمانێك کە ئەو خۆی بە پەیمانێکی جیددیتری لەقەڵەم ئەدا.

هەروەها هاوڕێیەتیش لە ڕوانگەی کیرکەگۆرەوە، پەیوەندییەکی هەمیشەییە. هاوڕێیەتی جیاوازە لە ئاشنایەتیەکی کاتی، هەرچەندە ئەو ئاشنایەتییە خۆشو دڵپەسەندیش بێت، کەواتە پێویستە هاوڕێی خۆمان هەڵبژێرینو دەبێ ژمارەشیان کەم بێت، لەبەرئەوەی ئێمە ناتوانین پەیوەندیی قووڵ دروست بکەین تەنها لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی خەڵکدا نەبێت.

ئەوەتانێ وا لێرەشدا دیسانەوە دەبینین کە بڕیاردان لەسەر شتێك بە ناچاری بڕیاردانە دژ بە شتێکی تر. ئێمە ژمارەیەکی زۆر خەڵك دەناسین کە هەم سەرنجڕاکێشنو

هەم مایەی پەسەندكردنیشمانن، بەڵام كاتێك مەسەلەكە دێتە سەر هاوڕێیەتی، ئەوا لەنێو هەموو ئەمانەدا ئەبێ ژمارەیەكی كەم هەڵبژێرین.

سەبارەت بە كیركەگۆر خۆیشی، "پەیامی ژیان" وای لێكرد خەتەرناكترین‌و گەورەترین‌و دڕدۆنگترین بڕیار هەڵبژێرێت. (دواتر قسە لەسەر ڕادەی بە ئەخلاقیبوونی ئەم جۆرە بڕیارانە دەكەین، بەڵام جارێ واز لەوە دەهێنین). كیركەگۆر وەكو بەجێهێنانێك بۆ ئەو پەیامەی كە لەو بڕوایەدا بوو خوا بۆی داناوە، دەبوو واز لە هاوسەرێتی بهێنێت. ئەم حاڵەتەی كیركەگۆر حاڵەتێكی دژوار بوو، بەڵام هەر بڕیارێكی جیددی كە پەیوەست بێت بە پەیامی مرۆڤەوە لە ژیاندا دژواریی خۆی هەیە. مرۆڤ كە پەیامێك لە ژیانیدا بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ، واتە لە هەمان كاتدا كۆمەڵێك ئیمكانی تری ڕەت كردۆتەوە.

ڕاستە زۆربەی خەڵكی ئەم ڕۆژە لەو خەتەرناكیی بڕیارە ناگات كە كیركەگۆر لە بارەیەوە نووسیوە. چونكە ئەمڕۆ زۆرینەی خەڵك دەسبەرداری چەمكی مەسیحیەت بووە بۆ هاوسەرێتی‌و هەر لەبەرئەمەش بڕیاری هاوسەرێتی خەتەرناكیی خۆی لەدەست داوە، مادامەكی ئێستا مەرجێك هەیەو بە گوێرەی ئەو مەرجەو پاش چەند ساڵێك هاوسەرەكان بۆیان هەیە لە یەك جیاببنەوەو هاوسەری دی بگرن. بەڵام هێشتا هاوڕێیەتی بەو ڕادەیە هەرەسی نەهێناوە، گەرچی بزاوتی كۆمەڵگاو هەلومەرجەكانی، كارێكیان كردووە، درێژەدان بە هاوڕێیەتی درێژخایەن‌و لەسەر ئاستێكی قووڵ زەحمەت بێت.

بەڵام دەشێ ئەو پەیامەی كە مرۆڤ بە درێژایی ژیانی پێوەی پابەند دەبێت گەورەترین هەرەسی هێنابێت. ئێستا گۆڕینی ئیشوكارو مەشقكردن لەسەر پیشەی نوێ بووەتە بەشێكی دانەبڕاوی ئابووریی نوێ. تەنانەت ژیانی ئایینیش لە لای خەڵكانێك بووە بە شتێك كە دەكرێ هەندێ كاتی خۆتی بۆ تەرخان بكەیت، نەك هەموو ژیانی خۆت.

بێگومان کیرکەگۆر جیاوازی ئەکات لە نێوان پیشەی رووتو پەیامی ژیاندا، بەلام ئەمەش دیسانەوە پێدەچێ گوزارشت بێت لە مەیلێکی ئۆرستۆکراتیانە لە بوونگەراییدا کە لەگەڵ چاخی بوونی (دەستەجەمعیانە)دا ناگونجێت، (ئیدی ئەم بوونە دەستەجەمعیەمان پێ خۆش بێت یان نا) لە چاخێکی لەم جۆرەدا، لەوانەیە ئەو شێوە هەڵبژاردنانەی کە کیرکەگۆر لێیان دواوە بۆ ئەو هەموو حەشاماتە مرۆییە دەست نەدات.

کەواتە با لەسەر ئەوە رێك بکەوین کە لێرەدا رووبەرووی تەڵەزگە Dilemna یەك دەبینەوە. پێویستە بە راستی ئەوە بڵێین کە هەروەکو کیرکەگۆر فێرمان دەکات جیددیەتی بڕیار سەر بە قووڵترین رەهەندی مرۆیی بوونی ئێمەیە، قووڵترینو تراجیکترینو بالاترین رەهەندی ناو ناخمان. بەلام گومان هەیە لەوەی کە لێکۆڵینەوەی کیرکەگۆر لەم بابەتانە لەگەڵ بارودۆخی کۆمەلایەتیی نوێدا بگونجێت. ئەم قسەیەشمان بە مانای رەخنەگرتن نییە لە کیرکەگۆر، بەڵکو رەنگە زیاتر رەخنە بێت لە کۆمەڵگایەك کە پێدەچێ تیایدا جیددیەتی بوونگەرایانە کەم بووبێتەوە.

بەلام لەگەڵ ئەمەشدا نابێ مەسەلەکە لەم سنوورەدا جێبهێڵین، چونکە دەشێ ئەمڕۆ بواری دی بۆ جیددیەتی بوونگەرایانە هەبن. ئایا بواری تر نییە جگە لە هاوسەرێتیو هاوڕێیەتیو ئەرك کە بە هەمان رادە پێویستی بە ئیلتیزام بێتو مایەی درێژنگی بێت؟ یان دیارە بیرۆکەی پەیماندان "ی هەتاهەتایی" کە بەسەر زەینی کیرکەگۆردا زاڵ بوو، هەرەسی هێناوەو ئێستا ئێمە لە چاخێکی پراگماتیو کاتیدا دەژین؟ ئایا پەیمانی گشتگیرو هەتاهەتایی بەسەرچووە؟ بەلام دەبێ جەختکردنەوەی کیرکەگۆر لەسەر بیرۆکەی هەتاهەتایی فریومان نەدات. لە راستیدا ئەو دەیەوێ بڵێت کە بڕیار یان پەیمانی گرنگ بە شتێکەوە ئەمانبەستێتەوە کە ئەو چرکەساتە تێدەپەڕێنێت کە تیایدا ئەنجام دراوەو، پێویستە لە بارودۆخە گۆڕاوو حاڵەتە جۆراوجۆرەکانی هەڵچوونیشدا خۆڕاگر بین. بەلام ئەو بڕوای وا نەبووە کە دەبێ بڕیار بۆ یەکجارو بۆ هەتاهەتایە بدرێو ئیدی دەشتوانین دەسبەرداری ئەو درێژنگییە بین کە هاوشانی ئەو بڕیارەیە. نەخێر بە

پێچەوانەوە، پێویستە بەردەوامو لە هەڵوێستە جیاجیاکانی ژیاندا جەخت لەسەر ئەو بڕیارە بکرێتەوە، ئەم بڕیارە نوێیانەش (یان جەختکردنەوە لەسەر بڕیارە ئەسڵیەکان) خەتەرناکو پڕ دڕدۆنگی دەبن، هەروەکو بڕیارە ئەسڵیەکە، بگرە ڕەنگە لەو زیاتریش بن، لەبەرئەوەی مرۆڤ تێگەیشتنی قووڵتر دەبێت بۆ ناواخنی بڕیارە ئەسڵیەکە.

هەڵبەت بڕیارێك کە کاتی بێتو لە تواناماندا بێت هەر کاتێك ویستمان لە ناوی بەرین، ئەوا ئەو بڕیارە شایانی ئەو ناوە نییە. چونکە سروشتی بڕیار خۆی وایە کە جۆرێك لە باز ئەگرێتە خۆی —هەروەکو کیرکەگۆر وای ناو دەنێت—، ئەوەش بازێکە کە ئەچێتە ئەودیو هەڵوێستە ڕاستەوخۆکەوە، بە جۆرێك کە خۆمان بە هەلومەرجێکەوە دەبەستینەوە کە هێشتا ڕوون نییەو، بۆ ئەمەش مارسیلو سارتەر وشەی پابەندبوون —یان ئیلتیزام— Engagement بەکاردەهێنن. چونکە مرۆڤ هەر بە سروشتی خۆی دەیەوێ پابەند بێتو خۆی بە ئایندەوە ببەستێتەوە: بۆیە بەڵێن ئەداتو پشتگیریی هەندێ سیاسەتی دیاریکراو ئەکاتو ئەچێتە ژیانی هاوسەرێتییەوەو هاوڕێ ئەگرێتو شتی تری لەو بابەتە، هەروەها مارسیل دڵسۆزی (Fidelity) بە فەزیلەتی مرۆیی بنەڕەتی ئەژمێرێتو هەر ئەوەشە بە ڕای ئەو، کە وا دەکات کۆمەڵگا هەبێت.

بەڵام ئەوەی مرۆڤ بە مەودای دوور هەڵیدەبژێرێت خودی خۆیەتی، خود لەو بڕیارانەوە سەرچاوە دەگرێت کە مرۆڤ ئەیاندات، ئەم بڕیارانەش هەر لە سەرەتاوە لەبەردەستدا نین، بەڵکو لە بواری ئیمکانەکاندان. کاتێکیش بوونەوەری مرۆیی خودی خۆی ئەخاتە سەر ئیمکانێك لە بری ئیمکانێکی دی، لەوێوە وردە وردە خودی خۆی دیاری دەکات. هەر لەم ڕوانگەیەشەوە پێویستە لە دژایەتیی نێوان هەتاهەتاییو کاتی بدوێین. چونکە خود ناتوانێ لە ئاست ئەو زنجیرە کردارە لێکترازاوانەدا یەك بێتو خۆی بگرێت، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە ئیلتیزامو پلانەکانی بەردەوام دەبن. دڵسۆزیو ئەمەکداریش بە تەنها مانای ئەوە نییە کە بەرامبەر کەسانی دی وا بین، بەڵکو مانای دڵسۆزیو ئەمەکە بۆ ئەو وێنەی مرۆڤایەتییەی کە مرۆڤ دەیەوێ لە بوونی کردەیی

خۆیشیدا بەدیی بهێنێت. لە لایەکی تریشەوە کاتی وایە ئەمەکداری دەگۆڕێ بۆ کەللەڕەقییەکی پەتی یان تەنانەت دەمارگرژی. با بڵێین مرۆڤ ئەتوانێ بەڵێنێکی پتەوو بەردەوام بە خۆی بدات کە بە پەیامێکی دیاریکراوەوە پابەند بێت لە ژیانیدا. لەگەڵ ئەوەشدا بەوپێیەی بوونەوەرێکی ئاقڵە ئەبێ حیساب بۆ ئەو ئەگەرە بکات کە ڕۆژێك دێت بە جۆرێکی دی شتەکان دەبینێت. دەبێ ئەوەشمان بیر نەچێت کە ناوەرۆکی ئیلتیزام لە سەرەتادا پەردە لە ڕووی خۆی هەڵناماڵێت، بەڵکو تەنها ئەو کاتە پەردە لە ڕووی هەڵدەماڵرێ کە مرۆڤ پێوەی پابەند ئەبێت. بەم جۆرە ئەتوانین کەسێك بهێنینە بەرچاوی خۆمان کە بە شێوەیەکی جیدیو بەردەوام بە ژیانێکی ئایینیەوە پابەندە، بەڵام لەبەر ڕۆشنایی ئەزموونەکانی دواتریو گۆڕانی بایەخە خواناسی (لاهوتی)یەکانی، لەوانەیە دواجار بڕیار بدات کە پەیامی لە ژیاندا شتێکی ترە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، لەم حاڵەتەدا ئەو پرسیارە هەر دەمێنێت کە ئاخۆ وای بۆ چووە دەسبەرداری ئیلتیزامە سەرەکیەکەی بووە، یاخود وای بۆ چووە کە ڕێگایەکی باشتری بۆ ئەنجامدانی دۆزیوەتەوە. سادەترین حاڵەتیش حاڵەتی ئەو کەسەیە کە بە پەیامێکەوە پابەند بووە لە ژیانیداو پاشان بە هۆی گۆڕانی بارودۆخەوە وەلاوەی ناوە. با لاوێك بهێنینە بەرچاوی خۆمان کە بڕیاری داوە ژیانی خۆی بۆ قەلاچۆکردنی نەخۆشیی سیل تەرخان بکات کە کاتی خۆی کارەساتێکی سامناك بووە. بەڵام پاش چەند ساڵێك ئەم نەخۆشییە کۆنتڕۆڵ ئەکرێ، لەبەرئەوەی ئەو لاوە ناچار دەبێت بە دوای بوارێکی نوێدا بۆ بەهرەکانی بگەڕێت. بەڵام وێڕای گۆڕانی ئاراستەی تواناکانی، ئیلتیزامە سەرەکیەکەی هەر دەمێنێت کە ئەویش مەلەسەی تەندروستییە.

هەروەکو خوێنەریش سەرنج ئەدات ئەو حاڵەتانەی کە باسمان کردن لە بواری ئاکار نزیکمان ئەخەنەوەو لە لێدوانەکانی داهاتوودا بایەخێکی زیاتر بەم مەسەلانە ئەدەین.

جەختکردنەوە لەسەر گرنگیی بڕیاردان لای فەیلەسووفە بوونگەراکان، زۆرجار بووەتە هۆی کەمکردنەوە لە بایەخی ئەو کردارەی کە توخمی بڕیاری هۆشیارانەو بگرە

ئازاراوییانەی تیا بەدی ناکرێ. چونکە ئەوان ڕەخنـە لـە دابونـەریتو شـێوازە سـوننەتیو ڕۆتینییەکانی کردار ئـەگرن، بەوپێیـەی ئاسـتیان لـە ئاسـتی کـرداری مرۆیـی ڕاسـتەقینە نزمترە. دیسانەوە ئەم جۆرەی ڕەخنەگرتنیش لە بنەڕەتـدا ئەگەڕێتـەوە بـۆ کێرکـەگۆر. چونکە ئەوەی بە تایبەتی ئەوی تووڕە کـرد ئـەوە بـوو کـە بینیـی مەسـیحیەت خۆیـشی خەریکـە ئـەبێت بـە دەزگایـەکی سـوننەتیو نەریتـە میللیـەکان خەریکـە بەسـەریدا زاڵ ئـەبێتو وای لێهـاتووە کـە ئـەڵێن فڵانـە کـەس بـووە بـە مەسـیحی واتـە لـە منداڵیـدا لـە ئاوهەڵکێشراوە (تەعمید کراوە) و تا گەورە بووە پەیوەندیی لەگـەڵ کەنیـسەدا هـەبووەو لە تەمەنی گونجاویدا وەکو باوەڕدارێك تۆمار کراوەو هتد.. ئەم مەسیحیەتە سـوننەتییە، یـان ئـەم جیهانـە مەسـیحییە "Christendom" وەکـو کێرکـەگۆر نـاوی لێنـاوە، بـە لای ئەوەوە پاشەکشێیە، لەبەرئەوەی هەرچی بڕیارە ڕاسـتەقینەکانو دڕدۆنگـیو جیدییـەتی قووڵی ئیمانە نەیهێشتووە. فەیلەسووفە بوونگەراکانی دواتریش بە شـێوازێکی نزیـك لـەم شێوازە ڕەخنەیان لەو گوشارانە گرتووە کە کۆمەڵگای جەماوەر، واتە ئـەو کۆمەڵگایـەی کە لە ڕێـی ڕۆژنامـەوانیو ریکـلامو تەلـەفزیۆنو هتـد.. کاردەکـات، خـستوویەتییە سـەر پێکهاتــەی ژیــانی خــەڵكو دروســتکردنی لــە شــێوەی هەنــدێ قــاڵبی یەکتــەرزداو، بەرهەمهێنانی جیهانێك لە مرۆڤی ملکەچ بۆ تەرزێك. لە جیهانێکی لـەم جۆرەشـدا توانـای هەڵبـژاردنو بڕیـاردان نامێنێـت، لەبەرئـەوەی بڕیارەکانمـان بـۆ هەڵبـژێردراونو هـەموو ئەوەی لەسەرمانە شوێن پێ هەڵگرتنیانو پـشتگیری لێکردنیانـە. فەیلەسـووفی بوونگـەرا لەم حاڵەتەدا بانگەشـە بـۆ بێداربوونـەوەو گـۆڕانی ڕیـشەیی ئـەکات. یەکـەمین ئـەرکیش لەسەرمان لەم هەلۆیستەدا ئەوەیە کە هەڵبژاردن هەڵبژێرینو توانای بڕیاردانمان هـەبێت، کە تەواو لاواز بووە. ناوەرۆکی بڕیارەکەش زۆر گرنگ نییە هێندەی چۆنیتییەکەی گرنگـە بـەو پێیـەی کردارێکـی تاکەکەسـییە کـە بکـەر بـە هـەموو سـووربوونێکیەوە ئەیگرێتـە ئەستۆی خۆی.

کەسیش نکوولّی لەوە ناکات کە پاساوێکی بەهێز هەیە بۆ بوونی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی لە بڕیارداندا بەرامبەر تەواوی ئەو فاکتەرە کاریگەرانەی کە دژی دەوەستنەوەو پشتیوانی لە ڕەوتێکی بێ بیرکردنەوە دەکەن. لە هەمان کاتدا لەوانەیە جۆرێك لە زێدەڕۆییش هەبێت لە بوونگەراییدا بەرامبەر بەم مەسەلانە. دەنا گەر بە زیرەکیەوە مامەڵە بکەین‌و پراکتیك بکەین، بوار بۆ دابونەریتەکانیش دەمێنێتەوەو کاریگەرییان مەترسیدار نابێت. هەڵبەت کاتێك من بە ئەنقەست خۆم لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بڕیارداندا ئەدزمەوەو شوێن پێی دابونەریت هەڵئەگرم تا لەو دڕدۆنگییە ڕزگارم بێت کە کیرکەگۆر لە دەربڕینە بەناوبانگەکەیدا دەڵێت لە کاتی کەوتنە ناو قووڵاییەکی حەفتا هەزار مەترییەوە دەستەو ئێخەی ئادەمیزاد دەبێت، ئەوا من لەو حاڵەتەدا پەیڕەوی لە "ئیمانی خراپ– یان بەدنیازی" ئەکەم. بەڵام مرۆڤ ئەکەوێتە ناو جۆرێك لە شاڵاوی ڕۆمانتیکی‌و تاکگەرایی گێلانەوە گەر وایزانی پێویستە بەردەوام بە هۆی بڕیارەکانیەوە ئازار بچێژێت، یان وا بزانێت بە تەنها ئەو شتەی کە لە بڕیارێکی قووڵ‌و هوشیارانەوە سەرچاوە ئەگرێت، بە تەنها ئەو شتە بە کردارێکی مرۆیی ڕاستەقینە دەژمێردرێ، لەبەرئەوەی مرۆڤ بە تێپەڕینی زەمان جۆرێك لە دانایی کەڵەکە ئەبێت لای‌و، بێگومان بڕواش بەوە دەهێنێت کە کۆمەڵگاش لە دابونەریت‌و ڕێسای خۆیدا دانایی خۆی هەیە.

نابێ زیاد لە پێویست پێناسەی کردار تەسك‌و بچووك بکەینەوە، چونکە زێدەڕۆیی لە گۆشەنیگای بوونگەراییدا بۆ کردار زۆر ئاسانە. بەڵام بە چاوپۆشین لەم زێدەڕۆییانە، ئەتوانین دان بەوەدا بنێین کە مرۆڤ بە تەواوی خودی خۆی نابێت بە تەنها لە حاڵەتی کرداردا نەبێت، ئەو کردارەی کە هزرو ئازادی‌و بڕیار لەخۆ ئەگرێت.

# بەشی دەیەم

## کۆتابوون و گوناه

١.راستێتیی بوونی مرۆیی (یان واقیعیبوونی بوونی مرۆیی)

٢.مەرگ

٣.زەمانمەندی

٤.گوناه و نامۆبوون (بێئاگانەبوون)

## ١.ڕاستێتیی بوونی مرۆیی(*١)

## (یان واقعیبوونی مرۆیی):

بەشی پێشوو، لەپاڵ شیکردنەوەکانی پێشووتری ئەم کتێبەدا واپیشان ئەدات کە ئێمە کاتێك مرۆڤ لە "کردار" دا سەیر دەکەین، تەواوی ڕەهەندەکانی بوونی مرۆیی دەبینین. ئەوەبوو جەختمان لەسەر گرنگیی هەندێ تایبەتمەندیی پۆزەتیڤیش کردەوە، وەکو ئازادیو داهێنانو توانای هەڵبژاردن. بەڵام ئەم تایبەتمەندییە پۆزەتیڤانە بەرامبەر بە تایبەتمەندێتییەکی ترن کە ناو بەناو ئاماژەمان پێداوە، لەو لایەنە تراجیکە خافل نەبووین کە ڕەگو ڕیشەی وا لە ناو بوونی مرۆییدا، ئیدی ئەوەمان پێ قبووڵ بێت یان ڕەتی بکەینەوە کە دڕدۆنگی گرنگترین هەستی مرۆییە، بەڵام ناتوانین نکووڵی لەوە بکەین کە دڕدۆنگی هەستێکە گرنگییەکی زۆری هەیە.بینیمان چۆن دڕدۆنگی هاوشانی ئازادییەو، تەنانەت ئەو کردارانەش کە پەیوەندییان بە بڕیاردانەوە هەیە، کە تیایاندا وا

(*)ڕاستێتی Facticity سیفەتی ئەوەیە کە هەیەو لەوشەی Factizitatی ئەڵمانییەوە وەرگیراوە کە هۆسێرڵو هایدگەر بەکاریانهێناوەو ئەمیش لە ئاوەڵناوەی (Factish) وەرگیراوە بەو حاڵەتەی مرۆڤی دەوتری کە مرۆڤ (لەجیهاندایە)، بەڵام لەبەرئەوەی خۆی بوونی خۆی هەڵدەبژێرێتو لەم هەڵبژاردنەیشدا سنووردارە. بڕوانە کتێبی (بوونو نەبوون) ی سارتەر ل٩ — دار الاداب — وەرگێڕانی: د. عەبدولڕەحمان بەدەوی، ساڵی ١٩٦٦.

دەردەکەوێ ئازادترو داهێنەرترو بەرپرسیارترە لە ئاست چارەنووسیدا، تەنانەت ئەم کردارانەش لایەنی پاسیڤو تراجیکی خۆیان هەیە.

ئازادیی مرۆیی هەرگیز ئازادییەکی رەها نییە، چونکە بەگەلێ دیوارو پەرژین گەمارۆ دراوە. تراجیدیاش بەشێوازی جۆراوجۆر پێناسە کراوە، یەکێك لەو پێناسانەی وایدەبینێت کە پێکدادانە لەنێوان خەونەکانی ئازادیو داهێنانی مرۆییو نێوان ئەو سیستمە گەردوونییەی کە بەهێزترەو تێکشکێنەرترە لەئاست مرۆڤدا. تراجیدیاو سنوورداری Limitation بەشێکی دانەبڕاون لە مانای مرۆڤ. ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە بە شێوەیەکی وردتر لەم چەمکانە بکۆڵینەوەو بیانئاخنینە ناو چوارچێوەی ئەو تێگەیشتنەمانەوە لە بوون کە لە لاپەڕەکانی پێشوودا لێی دواوین.

فەیلەسووفانی بوونگەرا وشەی "راستێتی —Facticity" بۆ سنووردارێتیی بوونی مرۆیی بەکاردەهێنن. راستێتی هەمان مانای (راستەقینەیی Factauality) نییە. کاتێك دەڵێین فلانە شت راستەقینە Factual یە، بەمە ئاماژە بۆ حاڵەتێکی بابەتی ئەکەین کە دەکرێ لە جیهاندا سەرنج بدرێ بەڵام دەکرێ بڵێین راستێتی لایەنی ناوەوەی راستەقینەیەو بریتی نییە لە حاڵەتی بینراوی شتەکان، بەڵکو بریتییە لە هۆشیاریی بوونگەرایانەی ناوەوەی بوونی تایبەتیی مرۆڤیی وەکو راستییەك کەدەبێ قبووڵبکرێ. کەس نەیویستووە بەو شێوەیە بێت کە هەیە، بەڵام خۆی لەبووندا دەبینێتەوە. ئێمە دەبینین کە بوونەوەری ئازادین لەناو دونیایەك شتدا، پاشان ئێمە خۆمان لەم جیهانەدا دروست نەکردووە، بەڵکو هەست بەسەرسوڕمان یان تەنانەت بەهێدمە ئەکەین وەختێ خۆمان وەکو راستییەك لەجیهاندا دەبینینەوە کە پێویستە رەچاوی بکەین. هەروەکو ئۆستین فارەریش جارێکیان وتوویەتی: "تەنیایی کەسێتی لەم گەردوونەدا بارێکی قورسە لە سەرشانمان خۆ گەر بمانەوێ بەشێوازێکی هێورتر بیڵێین، ئەوا دەڵێین کەپێدەچێ بەرگە گرتنی بوونمان خۆی شتێکی سەخت بێت" .

حاڵەتی راستێتی (یاواقعیبوون) حاڵەتی شتێکی پێدراوە، بەر لە هەموو شتێکیش سیفەتی بوونمانە وەکو ئەوەی کەدراوە. کە دەڵێین: ئێمە لەوێین، ئەمە راستییەکە کە نامەعقولەو شیناکرێتەوە. راستە ئادەمیزاد بیروباوەڕی سەبارەت بە رەچەڵەکو چارەنووسی خۆی دروستکردووە، یان وای بۆچووە کە لەو بارەیەوە سروش "وەحی"ی بۆهاتووە. لەوانەیە بەشێکی ئەم بیروباوەڕانە راستیش بن، لەوانەیە بەشێکی ئەو سروشەش راست بێت. بەلام ئەمانە هەموو بابەتی ئیمانن، تاقە شتێك کە ئێمە دەیزانینو گومانمان لێی نییە ئەوەیە کە ئێمە هەین، بەڵام لەکوێوە هاتووین؟ یان بۆ کوێ دەچین؟ ئەمە هەروەکو نهێنییەك دەمێنێتەوە. لەوانەیە ئێمەش لەم بارەیەوە بیروباوەڕو خولیای خۆمان هەبێت، بەلام زۆر بەسادەیی ئەو پێدراوەی کە هەیە ئەوەیە کە ئێمە هەینو دەبێ هەبین.

بەڵام پێدراوە راستەقینەکە بوونی مرۆیی نییە بەشێوەیەکی گشتی، بەڵکو بوونی منو بوونی تۆ بوونی ئەو لەهەموو حاڵەتەکاندا خاسیەتی راستێتیی هەیە. دەشتوانین ئەو لێدوانە سەرەتاییە سەبارەت بە چەمکی بوون بهێنینەوە یادی خۆمان، کە وتمان یەکێك لە ئەدگارە سەرەکیەکانی بوونی مرۆیی "تایبەتمەندی"یە. چونکە من بەتەنها پەی بەوە نابەم کە هەم، بەڵکو بەوەش کە هەم بەو پێیەی "من" ێکی تایبەتمو کەسێکی تر نیم، جەستەیەکی تایبەتیم هەیەو سەر بەفلانە رەگەزی مرۆییم، یان فلانە رەنگم، هەندێ سیفەتی بۆماوەییم تیایەو، جۆرێك لە زیرەکیم تیایەو، حاڵەتێکی دەروونیی تایبەت بە خۆمم هەیەو هتد.... جگە لەمانە لە ماوەیەکی مێژوویی دیاریکراودا هاتوومەتە دونیاوەو، هەروەها لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراویشدا کۆمەڵێك هێزی جۆراو جۆریش هەن کە لە فلانە هەڵوێست یان فلانە کۆمەڵگادا کاریگەرییان لەسەر پێکهاتەی ژیانمو سنووردانان بۆ کردارەکانم هەیە. هەروەها ئەو بڕیارانەی کە کاتی خۆی خەڵکانێك داویانە کە نە ناسیومنو نە ئەوانیش منیان ناسیوەو لەوانەیە زۆردەمێکیش بێت ئەو بڕیارانە درابن، بەڵام ئەمڕۆ لە داڕشتنی بوونی مندا ڕۆڵیان هەیە، هەروەها کاتێکیش من

خۆم لە چوارچێوەی ئەو بوارانەدا کەبۆم رەخساون، بڕیار ئەدەم، ئەوکات دەبینم کە ئەو بڕیارەم تا رادەیەك ئەو ئەگەرو رێگایانەی تر دیاری دەکات کە بۆ ئایندە لەبەردەممدا دەمێننەوە.

دەتوانین وا بڕوانینە راستێتی (یان وەکو ئاماژەمان پێداوە (واقعیبوون) کە دژی ئیمکانە (یان "ئەگەر"). لەبەشە بەراییەکانی ئەم کتێبەدا لە "ئیمکان"مان کۆڵییەوەو واتە ئەو ئاسۆیانەی کە بوونەوەری مرۆیی دەتوانێ خودی خۆی "بخاتە سەر" یان. بەڵام وە نەبێ ئەو ئاسۆیەش ئاسۆیەکی بێسنوور بێت، هیچ ئایندەیەکیش نییە بەشێوەیەکی رەها کراوە بێت، چونکە من هەرگیز لەخاڵی سفرەوە دەست پێناکەم‌و لەبەردەم پەڕەیەکی سپیدا نیم. بەڵکو من هەمیشە لەهەڵوێستێك (یان دۆخێك) دام کە هەیەو بەکۆمەڵێك توانای دیاریکراوو لەچوارچێوەیەکی دیاریکراودا رووبەڕووی دەبمەوە. هەربۆیە کاتێك مرۆڤ قسە لەسەر ئیمکان دەکات، بێگومان قسە لەسەر ئیمکانێکی واقیعی دەکات. چونکە ئیمکانی واهەن کەبێ کۆت‌و بەندن، یان لە بۆشاییدان. بەڵام ئیمکانەکان تەنها لە هەڵوێستی کردەییدا روو دەدەن. ئەمەش واتە سنووردارن. ئەو دەستەواژەیەی کە دەشڵێت "سیاسەت هونەری مومکینە" دانپیانانی تیایە بەسنووردارێتیی کرداری لەتوانادابووداو لەهەڵوێستێکی دیاریکراودا. بەڵام بەهەمان شێوە مرۆڤ ئەتوانێ بڵێت کە بوونی مرۆییش هونەری مەمکینە (ئەوەی کە لە توانادا هەیە).مارتن هایدیگەر دەستەواژەی "تووڕدان Geworfenheit"ی وەکو خوازەیەك بۆ گوزارشتکردن لەدۆخی واقعیبوونی مرۆیی بەکارهێناوە.مرۆڤ تووڕدراوە (یان فڕێ دراوە)تە بوونەوە. هەر تاکە کەسێکیش تووڕدراوەتە (یان فڕێدراوەتە) هەڵوێستێك (یان دۆخێك)ی بوونگەرایانەی تایبەت بەخۆیەوە، ئەم هەڵوێستەش لە گۆشە نیگایەکی مرۆییانەوە لە هەڵدانی زاردەچێت، هەرچۆن لەوانەیە ژمارەی سێ یان شەش بەو جۆرە لە ژیاندا ئەمریکی یان ڤیەتنامی، رەش یان سپی، دەوڵەمەند یان هەژار، خراپ یان باش، زیرەك یان دەبەنگ دێتە دونیاوە، هیچ هۆیەکی دیاریش نییە کەبۆچی تووڕدانەکە

دەبێ بەو جۆرە بێت، (ئەمەش مانای ئەوە نییە کە رەنگە هیچ هۆیەك نەبێت، دەشێ دەستێکی خودایی هەبێت لە دیاریکردنی ئەو مەسەلانەدا، بەلام ئەمە بابەتی ئیمانەو شتێك نییە بەشێوەیەکی فەلسەفی شیبکرێتەوە). هەروەکو دەبینین ئێمە هەموو لەگۆشەنیگایەکی مرۆییەوە دەستپێدەکەین، بەو پێیەی کەمرۆڤی جیاوازینو خاوەن بەهرەی جیاوازینو لە دۆخی جیاوازداینو، هیچ هۆیەکیش نییە ئەم جیاوازییانەی بۆ بگەڕێنینەوە، وەك چۆن هۆیەك نییە بۆ ئەوەی کەبۆچی زارەکە لەسەر ئەو ژمارەیە دەوەستێو لەسەر ژمارەیەکی دی ناوەستێت.

کەواتە چ بەشێوەیەکی گشتیو چ تاکەتاکە کە بیر لە بوونەوەرە مرۆییەکان بکەینەوە، ئەگەرە مرۆییەکان بەردەوام لەچوارچێوەیەکی واقعیدا هەن، دەشێ ئەم چوارچێوانەش بەشێوەیەکی رەچاوکراو جیاوازبن. هەندێ جار چوارچێوەکە بەرینەو بوارێکی فراوانی بۆ هەڵبژاردن تیایە، هەندی جاری تریش زۆر بەرتەسك ئەبێتەوە، بەلام بەردەوام هەنو، هەمیشە مۆرکی هەرەشەی تراجیكو شکستپێهێنانیان بەخۆوە گرتووە.

هەرگیز بوونی مرۆییش ناتوانێ خۆی لەم ململانێیەی نێوان ئیمکانو واقعیبوونە دەرباز بکات، چونکە لەسەرێکەوە مرۆڤ کراوەیەو هەڵدەبژێرێت، لە سەرێکی تریشەوە لەبەر ئەو دۆخە واقعییەی کە تیایەتی، داخراوە. تێگەیشتنو خەیاڵ بواری ئیمکانمان لەبەردەمدا والا دەکات، بەلام هەستو سۆزەکان دۆخی (سنووردارمان) بۆ کەشف ئەکەنو، ئێمەش بەشێوازی جیاجیا هەست بەم گرژییە ئەکەین، لەبەرئەوەی ئیرادەی هۆشمەند بەرەو ئاراستەی ئامانجێکی بەهادار ئەچێت، بەلام ئارەزووە نامەعقولەکان دەست تێوەر ئەدەن تا وامان لێبکەن بەئاراستەیەکی تردا بچین. باجارێکی تریش قسەیەکی ئۆستین فارەر بهێنینەوە کە دەڵێت: "ئێمە هەڵدەبژێرین، بەلام ئارەزوو ناهێڵێت" .

واقعیبوون کۆتابوونی ریشەیی بوونمان بۆ ئاشکرا دەکات، لەکۆتاییەکانی ئەم بەشەشدا لە هەندێ لە گرنگترین بەشەکانی کۆتابوونی مرۆیی دەکۆڵینەوە، بەلام

واقعیبوون شێوازێکی سەرەکیی وەسفکردنی کۆتابوونە. چونکە بوون بەشێوەیەکی واقعی، واتە بوون لەوێ، بەمانایەکی دی واتە داگیرکردنی پێگەیەکی تایبەتیو بینینی گشت شتەکانی تر لەو پێگەیەوە. ئەوەبوو پێشتر بینیمان کە مرۆڤ بەوپێیەی جەستەیە دۆخێکی تایبەتو گۆشەنیگایەکی سەبارەت بە جیهان هەیە. بگرە نەك هەرتاکەکەس، بەڵکو رەگەزی مرۆییش بەردەوام دۆخێکی تایبەتی هەیە، هەروەها هەرنەوەیەکیش. پۆل ریکۆر دەڵێت: "کۆتابوون یەکەمین روانگە یان گۆشەنیگایە. ئەم روانگەیە یان ئەم گۆشە نیگایە کاریگەریی لەسەر یەکەمین پەیوەندیی ئێمە هەیە کە تێگەیشتن لە شتەکان، نەك خولقاندنیان، ئەم تێگەیشتنە (یان ئەم وەرگرتنە) هاوتای وەرگرتنێکی سەلبیانە نییە کە بریتییە لە کرانەوەمان بەرووی جیهاندا، بەڵکو بریتییە لە پرنسیپی بەرتەسك کردنەوە یان داخران لەناو ئەم کرانەوەیەدا" .

هەڵبەت مرۆڤ بە درێژایی مێژوو، بەتایبەتیش لەمێژووی هاوچەرخیدا، یان لەمێژووی نوێی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیدا، تا رادەیەك توانیویەتی بەسەر هەندێ لەسنووردارێتییەکانی بوونیدا زاڵ بێت. توانیویەتی هەندێ هێز بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، کە توانای جەستەیی زۆر زیادکردووە. بگرە توانیویەتی لەسەردەمی ئەلیکترۆندا، سەردەمی ئامادەگیی راستەوخۆدا، بەسەر هەندی لە لایەنە سەلبیەکانی گۆشە نیگای سنووردارادا زاڵ بێتو، هەموو شتێك لە خۆی نزیك بخاتەوەو بیخاتە بەردەستی خۆی، لەکاتێکدا وەکو ئۆرتیگائی گاسێت **Ortega y Gasset** دەڵێت گەر خودا لەیەك کاتدا خاوەنی هەموو گۆشە نیگاکان بێتوتوانیبێتی پێکەوە بیانگونجێنێت ، کەواتە رێی تێدەچێت مرۆڤیش بەهۆی دەزگا ئەلیکترۆنیەکانیەوە توانیبێتی سنوورە بەرتەسکەکانی بوونی مرۆیی خۆی (واتە بوونی لەوێ) تێپەڕێنێت. بەڵام ئاشکرایە کە ئەو لەبنەڕەتدا ناتوانێت ئەو واقعیبوونو کۆتابوونە ریشەییە تێپەڕێنێت کە وەکو دوو سیفەتی جیاکەرەوەی دۆخی مرۆیی هەر دەمێننەوە.

## ٢.مەرگ

ئەوەبوو بەقسەکردن لەسەر روانگەو گۆشە نیگا بابەتی کۆتابوونمان دەستپێکرد. ئێمە شتەکان تێکڕاو پێکەوە بە یەك جار دەرك پێناکەین، بەڵکو یەکەیەکە دەرکیان پێ ئەکەین و لە روانگەیەك یان گۆشە نیگایەکەوە لەناو سەرجەم گۆشە نیگا بێشومارەکاندا، بەڵام بە تەنها گۆشەنیگا نییە کە کۆتابوون پێکدەهێنێت، بەڵکو راستییەش هەیە کە ئەم گۆشە نیگایە سنووردارە. چونکە هەر بۆ مەودایەك برەدەکاتو پاشان دەوەستێت.

ئەمە سەبارەت بەماوەی بوونمان لەناو زەمانیشدا راستە. ئێمە کاتێك ئاوڕ لەرابردوو ئەدەینەوەو، دەبینین کە یادو یادەوەریمان بۆ چەند دە ساڵێك برِ دەکات، پاشان وردە وردە بێهێز دەبێتو دواجاریش دەوەستێت.

"لەدایکبوون"یشمان کەوتۆتە ئەو پانتاییە بەتاڵەوە کە یاد تێدەپەڕێنێت. ماوەیەك هەبووە کە ئێمە تیایدا نەبوون. کاتێکیش سەیری پێشەوە ئەکەین، پێشبینی رووداوە جیاوازەکان ئەکەین، بەڵام لە هەمان کاتدا لەوەش دڵنیاین کە ئایندەیەك دێت تیایدا ئێمە هیچ رۆڵێکمان لەرووداوەکانی دونیادا نابێت، هەرچۆن سەرەتایەك هەیە بۆ مێژووی بوونمان، بەوجۆرە کۆتاییەکیش هەیە کەبریتییە لە مەرگ. بەڵام لە کاتێکدا سەرەتا رووداوێکی رابردووە کە ئەتوانین مێژوویەکی بۆ دیاری بکەین، ئەوا ناتوانین مێژوویەك بۆ رووداوی مەرگ دیاری بکەین کە لەئایندەدا روودەدات. ئێمە دڵنیاین لەوەی کە ئەو رووداوە لە ئایندەدا هەر روو ئەدات. بەڵام بەم گۆشە نیگایەی ئێستامانەوە ناتوانین پێشبینی ئەوە بکەین کە ئاخۆ ئەم بوونەی ئێستامان هاوشان لەگەڵ پێشبینیەکانماندا بۆ ئایندە دەڕوات، یان تێیدەپەڕێنێت.

فەیلەسووفانی بوونگەرا لە نووسینەکانیاندا بایەخێکی زۆر بە مەسەلەی مەرگ ئەدەن، هەندێ لە رەخنەگران ئەمە (هەروەها بایەخدان بەمەسەلەی دڕدۆنگی) بەبەڵگەیەك ئەزانن بۆ بوونی حاڵەتێکی نەخۆشانە لە تێڕوانینی بوونگەرایانەداو،

بایەخدانیان بەلاوازیی مرۆڤو فەوتانی، لە بری بایەخدان بەهێزو توانای. بەلام گەر ئێمە دان بەوەدا بنێین کە بایەخدان بە مەرگ لە هەندێ حاڵەتدا بایەخدانێکی نەخۆشانەیە، کەواتە ئەبێ دان بەوەشدا بنێین کە ئەوەی پێیدەڵێن هەڵوێستی "دروست" بەرامبەر بەمەرگ (کە ئەکاتە فەرامۆشکردنی) دیسانەوە دەشێ حاڵەتێکی نەخۆشانە بێت. واتە حاڵەتێکی راکردنو خۆدزینەوەی نادروستە. چونکە هیچ لێکدانەوەیەك نییە بۆ بوونی مرۆیی لاف کەمترینو واقعبینی لێبداتو رایەکی لەسەر مەرگ نەبێت بەو پێیەی خاسیەتێکی گشتیی بوونە. دەروونناسان لەم سالانەی دواییدا باسیان لەو ئاسەوارە قووڵەی مەرگو بیرۆکەی مەرگ کردووە لەسەر کەسانێك کە نەیانویستووە هیچی لە بارە بڵێن. ئەمەش چەمکی بوونگەران بۆ مەرگ روونەکاتەوە کە دەڵێن مەرگ بەتەنها کۆتاییەکی سادەو ئاسانی ژیان نییەو، بەتەنها رووداوێك نییە کە لە کۆتایی چیرۆکەکە رووئەدات، بەڵکو ئەچێتە ناو تانوپۆی چیرۆکەکە خۆیشیەوە. هەروەها زاناکانی بایۆلۆجی پێماندەڵێن کە هوشیاریی مرۆڤ بەوەی کە بوونەوەرێکەو ئەمرێت یەکێکە لەو خاسیەتانەی کە بوونی مرۆیی لە بوونی گیانەوەر جیا ئەکاتەوە. ئەم هوشیارییە بەمەرگ هەروەکو تیۆدۆتیۆس دۆبشانسکی Theodosius Dobzhansky ئەڵێت یەکێکە لە خاسیەتە بنەرەکاتی رەگەزی مرۆیی بەو پێەی ژانرێکی زیندووە .

لەنێو تەواوی فەیلەسووفە بوونگەراکاندا "هایدیگەر" لێکۆڵینەوەیەکی وردی بۆ مانای بوونگەرایانەی مەرگ کردووەو ئاخنیوویەتییە فەلسەفەکەیەوە سەبارەت بە بوونی مرۆیی . ئێمەش هەوڵئەدەین پوختەیەك لەبیروبۆچوونەکانی لەم بارەیەوە بخەینەروو.

کێشەی مەرگ پەیوەستە بە پرسیارێکی ترەوە: مرۆڤ چۆن ئەتوانێت وەك گشتێك پەی بە بوونی مرۆیی بەرێت؟ گەر سروشتی بوونی مرۆیی بریتی بێت لە "دەرچوونی" لەبوونی هەنووکەیەوە بۆ بوونێکی نوێو، هەر چرکەساتێکی ناکامڵەو دەیەوێ بەرەو بوونێکی نوێ بچێت، ئاخۆ دەکرێ لەم حاڵەتەدا بتوانین وەکو گشتێك لێی بروانین؟ پرسیارەکەش لێرەدا ئەمەیە: کەواتە ئاخۆ مەرگ نییە وامان لێدەکات بوونەری مرۆیی

(دازاین) ناهێنێت، بەجۆرێك كە ئیدی پەیبردن بە دازاین شتێكی ئەستەمە، لەبەرئەوەی مەرگ کۆتایی پێهێناوە، واتە لەبری ئەوەی بوونی بەرکەماڵتر بکات، لەناوی بردووە.

بەڵام لێرەدا ئەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کە دەکرێ بەزیاد لە شێوازێك لە مەرگ بکۆڵینەوەو تێیبگەین. لەڕوانگەی فەلسەفەی بوونگەراییەوە ئەبێ وا لەمەرگ بڕوانین کە ئەچێتە ناو ناخو تانوپۆی بوونی مرۆییەوە. ئەمەش واتە لەم حاڵەتەدا لێکۆڵینەوە تاقیکارییەکان بۆ مەرگ سوودێکی ئەوتۆمان پێناگەیەنن. ئێمە دەتوانین سەرنجی مەرگی کەسانی دی بدەینو دەتوانین هەندێ پێوەر دابنێین بۆ ئەوەی کەی مەرگ دێن، بەڵام لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا ئێمە لە دەرەوەی حۆماندا مەرگ ئەبینین، جگە لەمەش هیچی ترمان پێناکرێ. چونکە کاتێك خۆمان دەمرین، ناتوانین لە مەرگ بگەین، لەبەر هۆیەکی زۆر سادە کە ئەویش ئەوەیە مردووین! کەواتە ئاخۆ هەوڵدانی کەسێك بۆ تێگەیشتن لە مەرگ بەشێوەیەکی بوونگەرایانە، هەوڵێکی بێهوودە نییە؟

گرفتێکی تریش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ ئەتوانێ وەك "کۆتاییەك" بۆ بوونی مرۆیی قسە لەسەر مەرگ بکات. بەڵام "کۆتایی" بەکام مانا؟ دیارە کە بەمانای ئەنجامێك یان مەبەستێك نییە، راستە لە هەندێ حاڵەتی دەگمەندا –وەکو حاڵەتی مەسیحو سوکرات، کە دوو نموونەی کلاسیکن– مەرگ ئەبێتە ترۆپکی ژیان، بەلام بەشێوەیەکی گشتی مەرگ دابڕانێکی توندە لە ژیان، یان وەستانی ژیانەو یان دەشێ بۆ ماوەیەکی زۆر دوای پەککەوتنی مرۆڤ دوابکەوێت. واتە مەرگی کلینیکی (گەر ئەم دەربڕینە راست بێت) دوای مەرگی بوونی تایبەتیی مرۆڤ بەچەندەها مانگ یان ساڵ روودەدات. بەڵام ئەگەر مردن "کۆتاییەك" بێت، واتە وەستان یان دابڕانێکی پەتی بێت، ئەی چۆن دەلالەتێکی بوونگەرایانەی دەبێت لە کەشفکردنی دازایندا لەشێوە گشتیەکەیدا؟

شێوازی "هایدیگەر" لەچارەسەرکردنی ئەم گرفتانەدا ئەوەیە کە سەرنجمان لەمەرگەوە وەکو رووداوێك کە لەکۆتایی ژیاندا یەك جار روودەدات، بگوێزینەوە بۆ

هوشیارییەکی ناوەوەیی بوونەوەری مرۆیی بەوەی کەبوونی (بوونە –بەرەو– مەرگ). گەرچی چرکەساتی مردنی کلینیکیش چرکەساتێکی دیاریکراو نییەو نادیارە بەلآم، مەرگ وەکو ئیمکانێکی حەتمی ئامادەیە. بگرە ئەتوانین بلێین کە حەتمیترین ئیمکانە. من لە حاڵەتی دڕدۆنگیدا هوشیارم بەوەی کە بەرەو کۆتاییەك دەچم، چونکە بوونی مرۆیی کەبوونی منە بەمەترسی تەنراوەو، دەشێ لەهەر چرکەساتێکدا بکەوێتە عەدەمەوە (یان نەمێنێت).

هایدیگەر مەرگو خەم (بەو مانایەی کە پێشتر روونمان کردەوە–و. کوردی) پێکەوە دەبەستێتەوە. ئەبێ ئەوەش بهێنینەوە بیری خۆمان کە خەم بوونی رۆژانەی دازاین پێکدەهێنێت. پێشتر بینیمان کە خەم خۆشی دیاردەیەکی ئالۆزە، لەو گرژییەوە سەرهەڵئەدات کە لە نێوان شالآوبردن بۆ ئیمکانە لەئایندەداو واقعیبوونی ئەو دۆخەی کە بوونەوەری تیا فڕێ ئەدرێ، ئەمە جگە لە "کەوتن"ی بۆ جیهانو "ئەوانی دی". دەکرێ لە پەیوەندیدا بەم سێ چرکەساتەوە لە خەم بگەین:

یەکەم: هێندەی پەیوەندیی بە ئیمکانو بەئایندەوە هەبێت، مەرگ وەکو بالآترین ئیمکانی بوونی مرۆیی سەیر دەکرێ، لە بەرئەوەی مەرگ ئەو ئیمکانەیە کە تەواوی ئیمکانەکانی تر ملکەچین، چونکە هەموو ئیمکانەکانمان لەئاست مەرگدا پەرت دەبن (گەر ئەم دەربڕینە راست بێت). جۆرێك لە زنجیرەیەکی پلەوپایە هەیە بۆ ئیمکانەکان کە مەرگ لەسەروو هەموویانەوە. ئاشکرایە کە مەرگ لەئیمکانەکانی دی جیاوازە، چونکە وەکو هایدیگەر دەڵێت "ئیمکان نەبوونی هیچ بوونێکی مرۆییە" . مەرگ دواهەمین ئیمکانە، ئەو ئیمکانەشە کە گشت ئیمکانەکانی تر ناهێڵێت.

ئەم لێدوانەمان سەبارەت بەمەرگ بەوپێیەی ئیمکانێکە، هەندێ کێشە ئەوروژێنێت. راستە ئێمە دانمان بەوەدا ناوە کە مەرگ ئیمکانێکە لە جۆرێکی تایبەتی، بەو مانایەی کە کۆتایی ئیمکانەکانە، بەلام ئاخۆ ئەم مۆرکە تایبەتیەی وامان لێناکات کە هەر پێشی نەڵێین ئیمکان، لانی کەم بەمانا هایدیگەرییەکەی ئەم وشەیە؟ لەبەرئەوەی ئیمکان لای

هایدیگەر جۆرێکە لە بوون کە مرۆڤ ئەتوانێ هەڵیبـژێرێتو خـودی خـۆی "بخاتەسـەر"و تەنانەت مرۆڤ لەحاڵەتی خۆکوشتنیشدا مـەرگ وەکـو ئیمکانێـك هەڵدەبـژێرێت کەدەشـێ بێتەدی، هەڵبەت ئاشکراشە کە هایدیگەر بانگەشە بۆ خۆکوشتن ناکـاتو ئێمـەش جـارێ قسە لەسـەر بـوونی رەسـەن ناکـەینو هەڵیـدەگرین بـۆ بەشـی داهـاتوو. ئـەوکات ئـەوە ڕووندەبێتەوە کە مەبەستمان لەوە چییە کـە مـەرگیش یەکێکـە لـە ئیمکانـەکانی بـوون، بەڵام تەنانەت لەم قۆناغەی ئێستای قسەکردنیـشماندا لەسـەر ئـەم مەسـەلەیە دەتـوانین ئەوە ببینین کە مرۆڤ یان دەبێ مەرگ وەها قبووڵ بکات کە دارێژەری هەموو ئیمکانێتی، یاخود تابۆی دەکرێت خـۆی لـێ گێـل بکـات. چیرۆکە بەناوبانگەکـەی "تۆلـستۆی"یـش زۆرباش ئەم خاڵە ڕووندەکاتـەوە (واتـە چـیرۆکی مـەرگی ئیڤـان ئیلـیچ). لـەم چـیرۆکەدا مەرگ لای هەموو مرۆڤەکان جگە لـە ئیڤـان مەسـەلەیەکی قێزەونـە کـە شـایان تێفکـرین نییە. (بگرە لای ئیڤانیش هەروایـە تـا ئـەو سـاتە نـەبێت کـەبۆی دەردەکـەوێت تووشـی نەخۆشیەکی کوشندە بووە). بەڵام پاشان دەبێتە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ لای ئیڤانو لە هەموو شتەکانیدا ڕەنگدەداتەوە. بەم بۆنەیەوە، مـن لێـرەدا نامـەوێ بڵـێم کـە هایدیگـەر ئـەم جـۆرە بایەخدانـەی بەمـەرگ لاپەسـەندە، بگـرە ڕەتیـشی دەکاتـەوە، وەك چـۆن خۆکوشـتنیش ڕەتدەکاتـەوە. ئـەوەی ئـەو لێـی دەتوێژێتـەوە پێـشبینیکردنی مەرگـەو ڕەچاوکردنی فاکتەری مەرگە لەپڕۆژەکانمانداو لەشێوازی هەڵسەنگاندنیاندا.

مەرگیش وەکو ئیمکانێکی ڕەها یان دوا ئیمکان کێشەی وێناکردنی بـوونی مرۆییمـان وەکو گشتێك لا دەوروژێنێت، گەرچی ئێمە گوتمان کە مەرگ "کۆتاییەك" نییە بە مانـای ئامانج یان مەبەستێك، بەڵام سنوورێکە بۆ بوون. هوشیاریش بەمەرگو قبووڵکردنی فانی بـوون واتـە هوشـیاری بـەوەی کـەبوونی مرۆیـی سـنوورێکی هەیـە، دەرککردنـی ئـەم سنوورەش وا لە مرۆڤ دەکات وەکو گشتێکی کۆتادار لە بوونی مرۆیی بڕوانێت. لە بەشـی داهاتوودا لەمەغزای وردی ئەم بیرۆکەیە لەهزری هایدیگەردا دەگەین. بەڵام ئاشکرایە کـە جیاوازییەکی گەورە هەیـە لـە نێـوان هەڵوێـستی بوونگەرایانـەی مرۆڤێکدا کـە بەرامبـەر

بەکۆتاییەك دەژیو، مرۆڤێکی تر کە بەشێوازێکی میتۆدیانە بیرۆکەی مەرگ لە خۆی دوور دەخاتەوە، یان هەوڵدەدات وابکات.

دووەم: دوای ئەوە پێویستە بپرسین کە مەرگ چۆن بەدووەم توخمی پێکهێنەری خەمەوە پەیوەست دەبێت، واتە بە "واقعیبوون"ەوە. ئیمکان رووی ئایندەیە، رووی لەوەیە کە "هێشتا نییە". لەکاتێکا واقعیبوون گرنگی بەوە ئەدات کە "ئێستا هەیە". دۆخی بوونی مرۆییش بەردەوامو لەسەرەتای ژیانیەوە لەفانیبوونیدایە (واتە ڕوو لە فەنایە — و. کوردی)، چونکە ئەو بەردەوام پیر ئەبێت تا ئەگاتە مەرگ. مەرگیش لەهەموو ئیمکانەکانی تری بوون پتەوترو مەحکەمترە. راستە مرۆڤ توانیویەتی زۆرشت بکات بۆ ئەوەی کە لە فەنابوون کەمبکاتەوە، واش چاوەڕوان دەکرێ بە بەرەو پێشچوونی زانستی پزیشکی، خەڵکی تەمەنیان درێژتر بێتو ئاسەواری پیری لەسەر مرۆڤ کەمبێتەوە، بەڵام کەس نییە بڕوا بەوە بکات کە مەرگ نامێنێت یان نەمانی پەسەند بێت. عادەتەن خەڵك ئەیانەوێ مردن دوا بخەن، بەڵام مەرگو کۆتابوون دوو رەهەندی پێکهێنەری مرۆڤن، بەجۆرێك کە ژیانێکی خاڵی لە کۆتایی، ژیانێکی ترسناكو ناشرینە. هەر بۆیە مەرگ وەکو بەشێك لە دۆخی واقعیبوونی مرۆیی دەمێنێتەوە.

سێیەم: خەم چرکەساتێکی تریش لەخۆ دەگرێت کە "کەوتن **Falling**" یان ونبوونە لەناو جیهانی ئامرازەکانو لەناو حەشاماتی ناشەخسیی "ئەوانیتر" داو ئەمەش لە هەڵوێستی رۆژانەدا بەرامبەر بە مەرگ دەردەکەوێ کە هەڵوێستی هەڵاتنو خۆدزینەوەیە. بە درێژایی چاخەکان مرۆڤ خۆی لەدیمەنی مەرگو بیرکردنەوە لێی، دزیوەتەوەو شێوازی جۆراوجۆریان داهێناوە تا قەناعەت بەخۆیان بکەن (لە کاتێکا کە ناچارن رووبەڕووی مەرگ ببنەوە) بەوەی مەرگ هیچ لە مەسەکە ناگۆڕێتو پاش مەرگیش شتەکان رەوتی ئاسایی خۆیان دەبێت. بۆ نموونە لە ئەمریکای هاوچەرخدا، رەنگە لەهەموو شوێنێکی تر زیاتر هەوڵی ئەوە درابێت کە حەقیقەتی مەرگ پووچەڵبکەنەوە، یان نکووڵیی لێ بکەن، نەریتەکانی کفنو دفن، مۆمیاکردنو، دروستکردنی تابووتی گرانقیمەت بۆ دواخستنی

بۆگەنكردنو، ژەنینی مۆسیقای هێمن لەنێو گۆڕەكاندا، پاشان دانانی لاشەكان لە شوێنی بەستوودا بەو ئومێدەی رۆژێك بێت زانستی پزیشكی چارەسەرێك بۆ ئەو نەخۆشییە بدۆزێتەوە كە بووەتەهۆی مەرگی قوربانییەكەو ئەوكات سەرلەنوێ لە قیامەتێكی بەختەوەردا زیندوو ئەبێتەوە.

بێگومان ترسو دڕدۆنگیی مرۆڤ لە مردن شتێكی سروشتییە، بەلاّم ئەمە تەواو جیاوازە لە دامەزراندنی وەهمێكی ژیارییانەی گەورە (واز لەو پیشەسازییەش بێنە كەمایەی قازانجێكی زۆرە) بۆ لەبیر بردنەوەی مەرگ، یان بۆ ئەوەی قەناعەت بەخۆمان بكەین كە مەرگ شتێكی راست نییە.

هایدیگەر لە ئاوڕدانەوەیەكی زیرەكانەیدا دەڵێت: (هەروەكو دواتریش ئەمەمان بۆ دەردەكەوێ) ئەگەر راستگۆیانە چاوەڕێی مەرگ بكەینو قبوولّی بكەین، دەشێ ببێتە فاكتەرێكی تەواوكەری بوونی رەسەن. خوێنەر خۆیشی ئەتوانێ بڕیار بدات لەسەر ئەوەی ئایا ئەم تێڕوانینە پاردۆكسیانەیە بۆ كێشەی مەرگ سەركەوتووە یان نەو.

لای هەندێ فەیلەسووفی بوونگەرای تر مەرگ گەورەترین لایەنی شاراوەو ناڕوونی بوونەو دوا بەڵگەیە لەسەر پووچیی مرۆڤو جیهان. كامۆو سارتەریش وەكو هایدیگەر پێ لەسەر ئەوە دادەگرن كە پێویستە وەكو راستییەك رووبەرووی مەرگ ببینەوە. بەلاّم هەر ئەم راستییەشە كە دواجار شتەكان یەكسانو بێبایەخ لێدەكات.

ئەمەش مەرج نییە بەرەو نائومێدیمان بەرێت، تەنانەت گەر هیچ ئومێدێكیشی تیا بەدی نەكرێ. ئەمە لای "كامۆ" مرۆڤ بەرەو یاخیبوون دەبات نەك نائومێدی.

"یاخیبوونی مرۆڤ بەرەنگارییەكی درێژخایەنە دژ بەمەرگ" . مەرگ خۆی لەخۆیدا لای سارتەریش بایەخێكی تایبەتیی نییە. بەڵكو دواپووچییەو لە پووچیی ژیان كەمتر نییە، مەرگیش بەشێكە لە (سەوداو مامەڵە كە) وەكو ئەو دەڵێت:

كەواتە مەرگ سیمبۆڵی گەورەی كۆتابوونی مرۆڤو بگرە پووچیشیەتی. لەگەڵ ئەوەشدا نابێ وابزانین كە ئەو فەیلەسووفە بوونگەرایانەی كە مەرگیان كردووە بە

تەوەری فەیلەسووفاندنیان، بەم پێیە نیهیلیستن. چونکە ئەوەتانێ وەك دواتریش بۆمان دەردەکەوێ، هایدیگەر لە مەرگەوە دەروویەك بۆ بوونی رەسەن دەدۆزێتەوە.

هەرچۆن مەرگ ئیلهامی "یاخیبوونی میتافیزیکی" ئەدات بە "کامۆ". نووسەرێکی کاسۆلیك کە ئارسەر گیبسۆنە لەمبارەیەوە شتێکی راستی گوتووە کە دەڵێت: "بێباوەڕبوونی (کامۆ) بەخودا لە سەرنجدانی وردییەوە بۆ جیهانێکی شێت، جیهانێکی دڵڕەق، جیهانێکی کوێرو پووچەوە سەرچاوەی گرتووە کە ژمارەیەکی زۆر لە بوونەوەری مرۆیی تیا دیوە کە خۆیان لەو دۆخی فانیبوونە دەپارێزن کە لە هەمانکاتدا دۆخێکی باڵایە، لەبەرئەوەی لە سروشتو گیانەوەریان جیا ئەکاتەوە. کامۆ مرۆڤی هان داوە یاخی بێت تا هاوسەنگیی رابگرێت، هەر ئەمەشە وای لێئەکات جیا بێتەوەو، ئەو میانڕەوییەشی ئەو راستییە گەورەیە دەگرێتە خۆی کە هەموو شتەکان والێدەکات رێژەیی (نسبی) بن: واتە "مەرگ" .

### ٣.زەمانمەندی Temporality

لە درێژەی باسەکەماندا سەبارەت بە کۆتابوونی بوون بەمەسەلەی زەمانمەندی ئەگەین. هەر لە زووەوە شاعیران جەختیان لەسەر ئەو بیرۆکەیە کردۆتەوە کە دەڵێت مرۆڤ بوونەوەرێکە دروستکراوی زەمانەو، دێتە بوونەوەو هەر لە بوونیشدا نامێنێت. هەروەها فانیبوونی ژیانی ئادەمیزادو کورتیی ژیانی دیارترین ئەدگاری کۆتابوونە.

گەرچی لێرەدا بەشێوەیەکی ئاشکرا لەسەر زەمانمەندی ئەدوێین، بەڵام ئەم بابەتە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە باسەکانی پێشووشدا لێی دواوین، لە دایکبوونو مەرگ سەرەتاو کۆتایی هەموو بوونەوەرێکی مرۆیی دیاری دەکەنو، بوونی مرۆیی خۆی ئەکەوێتە نێوان ئەم سنوورانەوە لە زەماندا. جگە لەوە دیاردەی "خەم"یش بنەمایەکی زەمانیی هەیە. پێشتر بینیمان کە "خەم" لە ئیمکانو واقعیبوونو کەوتن پێکدێتو، هەر ساتێکیش لەم ساتانە ئاماژە بۆ زەمان ئەکات. ئیمکان لە بنەڕەتدا ئاماژە بۆ ئاینده

ئەكات، واقعیبوون پەیوەستە بەوەوەی كە لە هەڵوێستی دراودا بەئەنجام گەیەنراوە، لە كاتێكا كەوتن واتە نقومبوون لە هەنووكەدا.

بەدوایەكدا هاتن خۆی نیشانەیە بۆ ئەزموونێكی كۆتادار. ئادەمیزاد كاردەكاتو چێژ دەبینێتو یان لە ساتێكی دیاریكراودا شتێكی سەرەكی فێردەبێتو، ئەم ئەزموونەشی بە هێڵێكی راستدا دەڕواتو، لەڕەوتی ژیانیداو لە هەندێ كاتی جیاوازدا هێزو تواناكانی ئەگاتە لووتكەو، بەڵام هەرگیز هەموو ئەمانە لەیەك كاتدا بەیەكەوە نابن.

بەڵام ئەزموونی مرۆیی بەتەنها بەدوایەكدا هاتن نییەو ئادەمیزادیش بەتەنها بریتی نییە لەو ساتانەی كە دەیگوزەرێنێت، زەمانمەندیی ئادەمیزاد جۆرێكی تایبەتییە، ئەوەی وا لە "خەم" ئەكات مومكین بێتو هەروەها ئەوەی وا لە بوونی مرۆیی ئەكات مومكین بێت، تێپەڕاندنی ئەو ساتە بەدوایەكدا هاتووانەیە، بەجۆرێك كە مرۆڤ لەزنجیرەیەك مەودای زەمانی **Spans** دا ئەژی، یان ئەوەی پێی دەڵێین مەودای زەمانیی ژیان **Lifespan**.

جیاوازییەكی گەورەش هەیە لە نێوان پەیوەندیی مرۆڤ بەزەمانەوە لەگەڵ پەیوەندیی گیانەوەرانو شتەكان بەزەمانەوە. راستە ئێمە بەمانایەك لە ماناكان دەتوانین بڵێین ئەوانیش لە ناو زەماندانو بەساتی زەمانیی بەدوایەكدا هاتوودا تێدەپەڕن، ئەوانیش رابردوو و ئێستاو ئایندەیان هەیە. بەڵام "شت" لەكاتی بەدوایەكداهاتنی چركە ساتەكاندا وەكو خۆی بەردەوام ئەبێتو هەریەك لەو چركەساتانەی رابردوو و ئایندەی لە دەرەوەی ئێستادا دەمێننەوە. بەڵام لای ئادەمیزاد، رابردوو و ئایندەی تەواو بەئێستایەوە بەستراونەتەوە. چونكە ئێمەر هەرگیز ناتوانین ئادەمیزاد تەنها بەدابڕاوی لە ئێستایدا وەربگرین، لەبەرئەوەی ئادەمیزاد لەڕێی یادیەوە لەئێستادا رابردووی هەڵگرتووە، هەروەها لەڕێی پێشبینیو خەیاڵەوە، ئایندەی خۆی وێنا ئەكاتو خودی خۆی دەخاتە سەر (یان تێفڕێدەدات).

ئێمە نەماندەتوانی هەبین (بەو مانای بوونەی کە لەم کتێبەدا بەکارهاتووە، واتە لەدەرەوەی خودی خۆمان هەبین‌و تێیپەڕێنین) گەر ئەو سیفەتی زەمانمەندیەمان نەبووایە کە بەهۆیەوە "ئێستا now" تێدەپەڕێنین‌و "تا رادەیەك" رابردوو و ئێستاو ئایندە پێکەوە لەیەکەیەکدا کۆ دەکەینەوە. دەشڵێم "تا رادەیەك" لەبەرئەوەی جۆری ئەو یەکەیەی کەپێکدێت دەگۆڕێت.

لەراستیدا بوونی مرۆڤ لە بەرزترین ئاستی زێدەڕۆییدا (کە حاڵەتێکی نەخۆشانەیە) لەو حاڵەتەی بوون نزیکدەبێتەوە کەهەر لە "ئێستا" دا دەژی، کە دۆخی بوونی شتەکان‌و گیانەوەرەکانە (سەرنجی ئەو قسەیە بدە کە دەڵێت: "گیانەوەر خەمی هیچی نییە") لەبەرئەوەی سەبارەت بە شتەکان‌و گیانەوەران بەتەنها ئێستا زەمانێکی راستەقینەیە. رابردو نییەو ئایندە نییەو ئەمەش واتە ئەو دوو زەمانە ناڕاستەقینەن‌و بەتەنها ئێستا راستەقینەیە.

لای مرۆڤیش هەمان شت بڵێین، بەڵام بێگومان ئەبێ بەمانایەکی جیاواز ئەمە بڵێین، لەبەرئەوەی رابردوو و ئایندە لە دۆخی بوونی مرۆییدا، دەشێ وەها راستەقینە بن کە بێنە ناو ئێستاوە. کاتێکیش دەڵێین مرۆڤ لە زەمانمەندیی "خەم" پێکدێ، واتە بەئاراستەی ئیمکاندا خۆی بەرەو پێشەوە فڕێدەدات. ئەمەش واتە لەدەرەوەی بوونی خۆیدایە Ex-sist بەرەو ئایندە. هەروەها واتە ئەو بەشێوازێکی واقیعی‌و بەو پێیەی رابردووی هێناوەتە ئێستاوە، لەوێیە (لەئایندەدا)و لەناو ئەم گرژییانەشدا (ئەکەوێتە) ناو جیهانی هەنووکەیی بایەخپێدانەکانەوە.

کەواتە ئێمە ئەزموونە ریشەییەکەی کۆتابوونی زەمانمەندیمان بە تەنها لە بەدوایەکداهاتندا نابینینەوە، بەڵکو لە گرژیی نێوان رەهەندەکانی زەمانمەندیدا، یان بەچوون بەرەو بەرکەماڵی کە دەشێ رابردوو و ئێستاو ئایندە لە ناوخۆیدا کۆبکاتەوە. دەشێ ئەمەش بەوە وەسفبکرێ کە هەوڵدانە بۆ گەیشتن بەهەتا هەتایی، بەو مانایەی کە ئەو گشتەیە کە تەواو جیاوازە لە بەدوایەکدا هاتن.

بەڵام ئێمە دەبیستین كە ڕەهەندەكانی ئەم جۆرە زەمانمەندییە، لەئەزموونی باوی كۆتابووندا، لەم گشتێتی (كلێت)ە خاڵییەو پتر لە دۆخێكی ناهاوسنگدان.واتە ئەم ڕەهەند یان ئەو ڕەهەنگ دەشێ ڕەهەندەكەی زەمانمەندی بەبێ بیانوو زاڵە.

یەكەمین جۆری ناهاوسەنگی ئەو جۆرەیە كە تیایدا جەختێكی زیاد لە پێویست لەسەر ئیمكانو ئایندە دەكرێو هەموو كاری ئیرادە لەوەدا قەتیس دەكرێ كە بەڕێوەیە، بەڵام ئەمە دەبێتەهۆی لادان لە ئیرادەی ڕاستەقینەی ڕەسەن (كە كرداری خودە وەك گشتێك) و دەگۆڕێ بۆ خۆزگەیەك یان هیوایەكو هیچی تر. ئەم ناهاوسەنگیەش گەلێ جۆری هەیە، هەندێكیان تا ڕادەیەك بێ زیانە.

بۆ نموونە مەیلی ئایدیالیستی ناكردەیی لای لاوان، لای كەسی كامڵیش دەشێ مەیلی یۆتۆپیاییو ئایدیالیستانەی نابەرپرسیارانە، زیانبەخش بێت. بەڵام لەمەش مەترسیدارتر گۆشەگیری بێت لەنێو جیهانی ئارەزووە خەیاڵیو وەهمیەكاندا، بەڕادەیەك كە كردار ئەستەم دەبێتو خەیاڵاتێكی وەها لە ئارادا دەبێت كە وەدیهێنانیان ئەستەمە. هەموو ئیرادەیەكی ڕاستەقینە ئەبێ ڕەچاوی ئیمكانی واقیعی بكات، واتە ئەو ئیمكانەی كە لە هەڵوێستی دیاریكراودا كراوەیە هەڵبەت شتێكی سروشتیشە كە ئایندەیەك نییە بەشێوەیەكی ڕیشەیی كراوەبێت، لەبەرئەمەی بەردەوام تا ڕادەیەك داخراوەو، چركەساتێكیش نییە كە تیایدا بكەریی مرۆیی بەرامبەر بە ئیمكانێكی پەتی بێت. بەڵام كاتێكیش دوچاری ئەو وەهمە دەبێت كە بەرامبەر ئیمكانێكی پەتییە، دەشێ وەهمەكەی لەترسیەوە لەقبووڵكردنی ڕابردوو سەرچاوە بگرێت.

ئەمەش دەبێتە مایەی بوونێكی ناڕاستەقینەو ناكردەیی كە تیایدا بەپلەی جۆراو جۆر كردار دەتاسێنرێو خەیاڵات بەسەریدا زاڵدەبێت، خەریكبوون بە ڕابردووشەوە دەبێتە مایەی شڵەژانێكی هاوچەشن، لەبەرئەوەی كاتێك هوشیاری بەدۆخێك هەیە، یان كە لە ڕابردوودا ڕوویداوە، زیاد لە پێویست چڕدەبێتەوە، لەوانەیە ببێتەهۆی ئیفلیجیی هەر ئیرادەیەكی ڕاستەقینە. ئەم حاڵەتەش كۆمەڵێك شێوە بەخۆیەوە دەگرێت: لەوانەیە

دۆخەکە ببێتە هۆی دڕدۆنگیەکی قووڵی وەها کە نەهێڵێت بکەرەکە هیچ بڕیارێکی وابدات کە ببێتە مایەی گۆڕانێکی ریشەیی یان نوێبوونەوەیەکی راستەقینە، ئیدی بەمجۆرە کردارێك نابێت لەبەردەم ئیرادەدا تا وای لێبکات بەرەو ئایندە بچێت بەڵکو هەوڵدەدات ئارامیو ئاسایش لەڕۆتینی رابردوو سرووتەکانی رابردوودا بدۆزێتەوە. یان دەشێ ئەم دۆخەی دۆخێك بێت کە تیایدا مرۆڤ هەست بەگوناه بکاتو ئەمەش بەرەو بێدەربەستییەکی دەبەنگانەی بەرێت، کە تیایدا هەموو شتەکان بێ هیوا خۆیان دەنوێننو وای لێدێت مرۆڤ هەموو شتەکان بەبێهوودە دەزانێت، یان تەسلیمی دۆخەکە دەبێتو بەناچاری یان بەغەریزەو یان راهاتنو خوو پێوەگرتنو یانیش هەر هاندەرێکی دی کردارەکەی ئەنجامدەداتو، لە هەموو ئەم حاڵەتانەشدا رێ لە هەر ئایندەیەکی راستەقینەو ئیمکانێکی رەسەن ئەگرێت، بەڕادەیەك کە تیایدا کردار ئەستەم دەبێت.

هەروەها ناهاوسەنگبوونی ئێستا هەیە، لەوانەیە ئەم حاڵەتەش لە هەموو حاڵەتەکانی تر باوتربێت. ئاشکرایە کە ئەمە ئەو حاڵەتەیە کەتیایدا "بوون"ی راستەقینەی مرۆڤ لەدۆخێکدا کە لە دۆخی گیانەوەر یان تەنانەت دۆخی شت ئەچێت، بەرەو ونبوون ئەچێت. ئەم وابەستەبوونو نووسانە بەئێستاشەوە، هەروەکو ئەو دوو حاڵەتەی پێشوو، لە دەرکەوتندا شێوەی جیا بەخۆیەوە وەردەگرێت، بەڵام ئەمە سیفەتی زەقی ئەو مرۆڤەیە کە لە زمانی ئاساییدا پێی دەڵێین کەسێکە ئیرادەیەکی تایبەتی نییە، واتە کەسێکە ناتوانێت بڕیار بدات، کەسێکی بەدنیازە (یا بەدباوەڕە)، یان مرۆڤێکی پەرتە، ئەگەر بمانەوێ وەسفی باوی نووسەرە بوونگەراکانی بۆ بەکاربهێنین.

ئەم مرۆڤە لەوانەیە کەوتبێتە "ئەوان **Then**" ەوە. بەجۆرێك کە بڕیاری خۆی ئەداتە دەست بیروبۆچوونی باو، یان دەبێتە کۆیلەی دەزگایەك یان سیستمێك بۆیە بارودۆخەکەی بڕیارو کردارەکانی بۆ دیاریدەکات. یاخود چووەتە ریزی دامەزراوێك یان رێکخراوێکی دەسەڵاتگەراوە. بەهەرحاڵ، پێویست ناکات نموونەی زیاتر بهێنینەوە.

لـەم لێدوانـەی ئێـستاماندا کـە بـەکۆتابوون دەسـتی پێکـرد، کاتێـك باسمـان لـە ناهاوسەنگی کرد، بەرەو بیرۆکەی گونـاە راپێـچی کـردین. پێدەچـێ کۆتـابوون مـەرجێك بێت بۆ ئیمکانی گوناە، گەرچی کۆتابوون خۆی لەخۆیـدا گونـاە نییـە. بـەڵام دیـارە کـە گونـاە مەسـەلەیەکی تراجیکـە، ئەگـەرەکانی ناهاوسـەنگیش هێنـد زۆرن کـە زەحمەتـە شڵەژان لە بووندا روونەداتو هەر بۆیە پێویستە ئێـستا راسـتەوخۆ قـسە لەسـەر گونـاەو نامۆبوون بکەین.

## ٤.گوناە و نامۆبوون

فەلسەفەی بوونگەرایی بەپێویست فەلسەفەیەکی رەشبینانە نییە، بـەڵکو لایـەنگرانی ئەم فەلسەفەیە لە داننانیاندا بەشڵەژان لە بوونی مرۆییدا راستگۆبوون چونکە بوون واتـە خۆ فڕێدان بەرەو ئایندە، بەڵام بەردەوام کەموکورتییەك یان نەگونجانێك هەیە لـە نێـوان ئـەو خـودەدا کـە خـۆی بـەرەو ئاینـدە فڕێئـەداتو ئـەو خـودەی کـە لـە واقیعـدا هەیـە. بوونگەراکان، هەر لە کیرکە گۆرەوە تـا ریکـۆر سـەرنجی ئـەم دابڕانـەیان لەبوونـدا داوە. کەدەکرێ نـاوی بنـێین درزێـك یـان کەلەبـەرێك، گەرچـی ئەمـە کەموکورتییـەك نییـە کـە شایانی لۆمەکردن بێت، هێندەی هاو واتای ئەو وشەیەیە کە زەویناسەکان بەکاریدەهێنن کاتێك قسە لەسەر ترازان یان کەلێنێکی ریشەیی دەکات .

ئەم کەلێنەش ئەکەوێتە نێوان بوونو ماهیەتەوە، یـان واقعیبـوونو ئیمکانـەوە، یـان خود وەکو ئەوەی هەیەو خود وەکو ئەوەی خۆی بـەرەو ئاینـدە فڕێـدەدات. بـەڵام ئـەم کەلێنە هێشتا نەبۆتە کەلێنێکی ئاکاری، بەڵکو جۆرێکە لە بوونی کۆتـادار کـە وا لـەئاکار ئەکات مومکین بێت. ئەم حاڵەتەش لـە بیرۆکـەی "کـەوتن" ئەچـێت لای هایدیگـەر، کـە دەیەوێ پێمان بڵێت کە ئەوە ئیمکانێکی ئۆنتۆلۆجییـەو، ئـەو حـوکمێکی بوونگەرایانـەی راستەقینە بەسەر دۆخی ئێستای مرۆڤدا نادات.

پێکهاتــەی مــرۆڤ بەجۆرێکــە کــە ئەگــەری "کــەوتن"ی تیایــە، یــان بەواتایــەکی دی ناتەباییەك یان بێتواناییەکی تیایە لە گەیشتن بەوەدا کە شایانی ئیمکانەکانی بێت.

نیچە زۆر باش سەرنجی ئەم کەلێنە یان کەموکورتییــەی لــە پێکهاتــەی مرۆڤـدا داوە، بەوەی کە کامڵ نییە، بەڵام ئەم کەلێنە بە تەنها رێ بۆ هەرەسی خۆشناکات، بـەڵکو بـۆ چوون بەرەو باڵامرۆ Supermanیش.

کەواتــە لای بوونگــەراکان جۆرێـك لـەوێناکردنی تراجیکانـە هەیـە بـۆ گونـاه. مــرۆڤ بەحوکمی پێکهاتەی‌و، بەو پێیەی بوونێکی کۆتادارو هەروەها ئازادە، لە بەردەم ئەگەری گوناهدایـە. پێدەچـێ "بـاڵابوون"یـشی دابـڕاو نـەبێت لـە "کـەوتن"ی. خـودی بیرۆکـەی گوناهیش لای هایدیگەر مانایەکی ئۆنتۆلۆجیی سەیری هەیە، کە پـێش ئاکـار دەکـەوێت. وشەی Schuldی ئەڵمانیش دەشێ هەم مانای گوناەو هەم مانای کـەمو کـورتیش بـدات، هایدیگەریش کاتێك لە گوناه ئـەدوێت زۆر قـسە لەسـەر Schuld ئـەکات بـەو پێیـەی کـە کەموکورتییە . مرۆڤیش لە نێو خودی خۆیدا نەمان یان کەموکورتیی هەڵگرتووە، هـەر لەسەر ئەم بناغەیەش کە دەبێ بەرپرسیارێتیی بوونی خۆی لە ئەستۆ بگرێت.

چــەمکی نــامۆبوون Alienationsیـش لــە نووســینە فەلــسەفیەکانی بوونگەراکانــدا رەهەندێکی دی دەخاتە ســەر تێگەیـشتنمان لـەگوناه. هەڵبـەت ئـەم چـەمکە لـە هـزری چاخی نوێدا، تەنانەت بەر لـە سـەرهەڵدانی فەلـسەفەی بوونگـەراییش گرنگییـەکی زۆری هەبووە.

ئەم چەمکە هەم لە هزری هیگڵ‌و هەم لە هزری مارکسیشدا شوێنێکی دیـاری هـەبوو، وێڕای جیاوازیی نێوانیان.

ف.و. دیلستۆن دەڵێت:

"نـامۆبوون لای هیگـل لــە خــودی بونیــادی گــشتیی ژیاندایــە، بــەڵام لای مــارکس لەبونیادی هەلومەرجەکانی کاری مرۆییدایە کە ناچاری ئـەکات لـە کارەکـەی‌و لـە خـودی خۆی‌و هەروەها لەهاوکارەکانیشی نامۆبێت.

هیگل لە ڕێبازێكی فەلسەفیدا بۆ چارەسەری ئەم قەیرانەی مرۆڤ دەگەڕێت كە هاوتای پرۆسەی دیالەكتیكی ئەقڵی گشتییە. بەلام ماركس لە گۆڕانكارییەكی شۆڕشگێڕانەدا بەدوای ئەو چارە سەرەدا ئەگەڕێت كە هەلومەرجی ئابووریی مرۆڤ بگۆڕێت، بەجۆرێك كە تایبەتییەكی تەواو لە نێوان مرۆڤو كارەكەیدا بهێنێتە ئاراوە".

جێی ئاماژەكردنە كە ئەم سەرنجانەی "دیلستۆن"مان لە كتێبێكەوە وەرگرتووە كە دەربارەی (كەفارەت — Atonement)ە، لە بەرئەوەی هەر داننانێك بەنامۆبووندا راستەوخۆ پرسیار سەبارەت بە بیركردنەوەی ئەو كەلێنە دەهێنێتە ئاراوە، ئەمەش بەسەر بوونگەراییدا دەچەسپێت، كاتێك هەوڵدەدات نامۆبوونی مرۆڤ تێپەڕێنێت تا رێگا بەرەو گەیشتن بە گشتێتی بدۆزێتەوە.

فەیلەسووفی بوونگەرا لە مانا ناوەكیەكەیدا لە نامۆبوون دەڕوانێت، كە بریتییە لە نامۆبوونی مرۆڤ لە بوونی قووڵی خۆی، بەجۆرێك وای لێدێت كە چیدی خودی خۆی نابێت، بەڵكو وەكو سفرێكی لای چەپی لێدێت لە ناو حەشاماتدا، یان بورغوویەكی ناو مەكینەیەكی گەورەو هەر وەسفێكی تری لەم چەشنە.

تا چ رادەیەك ئەتوانین ئەم نامۆبوونە لەگەڵ چەمكی گوناهدا بەمانا ئاینییەكەی، بەراورد بكەین؟ هەندێ لە خوداناسە مەسیحییەكان سەرنجی لێكچوونی ئەم دوو چەمكەیان داوە. بۆ نمونە پۆڵ تیلیش Paul Tillich چەمكی نامۆبوونی بوونگەرایانە بۆ رۆشنایی خستنەسەر چەمكی باوی گوناە بەكاردەهێنێت، گەرچی هەروەكو پۆڵ ریكۆر لە لێكۆڵینەوە نایابەكەیدا "سیمبۆلیزمی خراپە" دەڵێت نامۆبوون وێنەیەكە لەو وێنە زۆرانەی كە چەمكی گوناە لە كتێبی پیرۆزدا ئەیانگرێتەخۆی. جیاوازییەكی ئاشكراش هەیە لە نێوان چەمكی بوونگەرایانەی نامۆبوونو چەمكی كتێبی پیرۆزدا كە گوناە بە نامۆبوون لە خودا لێكدەداتەوە. بەلام نامۆبوونی بوونگەرایانە رێك گوزارشت لە زاراوەكە خۆی دەكات، واتە نامۆبوونی مرۆڤ لە بوونی خۆی. بێگومان بوونگەرای بێباوەڕیش نامۆبوونو گوناە بەمانای ئایینیە سوننەتیەكەی بەیەك چەمك لەقەڵەم نادات. بەلام

تەنانەت لەبوونگەرایی نائایینیشدا(کە رەنگە لەفۆرمە ئەدەبیەکەیدا روونتر دەربکەوێت وەك لە فۆرمە فەلسەفییەکە) شتێك هەیە کە لە هەستکردن بەنامۆبوونێکی گەردوونی ئەچێت، واتە هەستکردنی مرۆڤ بەوەی کە جیهان بەماڵی خۆی نازانێت، ئەمەش هەروەکو پێشتر بینیمان وێنە سەرەتاییەکانی باوەڕ (ئیمان)مان بیردەخاتەوە، وەکو گنۆستیسیزم Gonsticism.

بەڵام وێڕای کۆتابوونو نامۆبوونو تەنانەت گوناهیش، مرۆڤ هەر دەیەوێ بەژیانی راستەقینە بگات. بوونگەراییش لە زۆربەی شێوەکانیدا بەتەنها بریتی نییە لە شیکردنەوەیەکی ساردی دۆخی مرۆیی، بەڵکو گەڕانێکی پڕشەوقە بەدوای بوونێکی مرۆیی رەسەندا. هەنگاوی داهاتووشمان لێکۆڵینەوەیە لەو شێوازە جیاوازانەی کەدەبێ بەهۆیانەوە بەدوای خودی راستەقینەدا بگەڕێین.

# بەشی یانزەیەم

## گەڕان بەدوای بوونێکی مرۆیی ڕەسەندا

١.کێشەی مرۆڤبوونی ڕاستەقینە

٢.ویژدان

٣.وەدیهاتنی خود (یان خۆوەدیهێنان)

## ١.کێشەی مرۆڤبوونی راستەقینە

پێدەچێ پێکهاتەی مرۆڤبوون خۆی ئەمە بەسەر ئادەمیزاددا بسەپێنێت کە دەربارەی مرۆڤبوون "ی راستەقینە" (هەروەها مرۆڤبوونی "ساختە"ش) بدوێت، لەبەرئەوەی مادامەکی مرۆڤ سروشتێکی دیاریکراو یان ماهیەتێکی پێدراوی نییە... کەواتە ئەشێ ببێتە ئەمە یان ئەوە چونکە بەپێی بڕیارو کارەکانی خۆی خۆی دروست دەکات.

لەم حاڵەتەشدا وا دەردەکەوێ کە ئەو دەتوانێت ببێتە ئەوەی کە دەیەوێت، یانیش لەوەدا شکست دەهێنێت.

لێرەشدا مرۆڤ ئەو دەستەواژەیەی بیر دەکەوێتەوە کە کاتی خۆی لە چوارچێوەی فەلسەفە ئایدیالیستیەکاندا دەگوترایەوە: "Werde was du bist! — ببە بەخۆت!". بەڵام ئەم دەستەواژەیە وادەگەیەنێت کە دیارە پێشتر جۆرە نەخشەو هێڵکارییەك هەیە کە پێویستە بە ئەنجام بگەیەنرێو لایەنەکانی روونبکرێنەوە، ئەم بیرۆکەیەش لانی کەم هەندێ لە فەیلەسووفە بوونگەراکان رەتیدەکەنەوە. ئەوان جەخت لەسەر ئەوە ئەکەنەوە کە ناولێنانی مرۆڤ بە "بوونەوەر—existent" واتە دان نەنان بەو هێڵکاریەدا، لە بەرئەوەی

مرۆڤ ئەبیٚ خۆی بڕیار بدات لەسەر ئەوەی کە ئەبێت بەچی، بگرە ئەبیٚ هەرخۆشی کێشەکانی خۆی یەکلا بکاتەوە، چونکە بوونی هەرکەسێك هی ئەو کەسەو مولٚکی ئەو کەسەیەو، مۆرکی "تایبەتمەندێتی" بەخۆیەوە دەگرێت. چونکە تاییێکی گشتی (یان نموونەیەکی گشتی) نییە بۆ مرۆڤبوونێکی رەسەن کەبەسەر هەمووانـدا بسەپێنرێ، یان هەموو لەسەری کۆك بن. لەراستیشدا سەپاندنی تاییێکی لەم جۆرە یان بانگەشەکردن بۆی واتە فەوتاندنی توانای بوونی مرۆیی راستەقینەی ئەو کەسانەی لە بارەیانەوە ئەدوێین، چونکە ئەو کەسانە ئەوەندە خۆیانن کە ئازادانە خۆیان هەڵبژێرن.

پێشتر سەرنجی خوێنەرمان بۆ ئەوە راکێشا کە فەیلەسووفە بوونگەراکان وشەی "رەسەن — authentic" بەکاردەهێنن‌و بوونەوەریش چەند خاوەنی خۆی بێت‌و چەند خولقێنەری خودی خۆی بێت لەو وێنەیەدا کە بۆ خۆی دروست کردووە، ئەوەندە بوونی رەسەنە.

بەڵام بوونی نارەسەن (یان ساختە) ئەو بوونەیە کە کۆمەڵێك کارتێکەری دەرەکی پێکیدەهێنێت، ئیدی ئەو کارتێکەرانە بارودۆخ بن یان یاسای ئەخلاقی‌و دەسەڵاتی ئایینی یاخود سیاسی‌و شتی تری لەم بابەتانە.

بەڵام ئاخۆ ئەم رایانە ئێمە بەرەو رێبازێکی رێژەیی (نیسبی)و رێبازێکی تاکگەرای پەتی نابەن؟

ئەگەر هەر مرۆڤێك دانسقە بێت‌و خۆی بڕیار بدات لەسەر ئەوەی کە ببێت بەچی، ئاخۆ بەمە ئێمە دەسبەرداری هەر چەمکێك نابین بۆ مرۆڤبوونی راستەقینە؟ ئەی ئاخۆ بەمە دەسبەرداری هەر چەمکێك نابین بۆ ئاکار "ئەخلاق"ێکی گشتی. ئایا ئەمە ئێمە بەرەو ئاژاوەیەك نابات کە هەر کەسەو بەئارەزووی خۆی چیی بوێت ئەیکات‌و هیچ حیسابێك بۆ مرۆڤەکانی تر ناکات (گەر دەربڕینە باوەکە بەکاربهێنین)؟ ئاخۆ ئەمە ئازادییەکی زیادەڕەو نییە کە بەرەو بەرەڵاییمان دەبات؟

بەر لە هەمووشتێك ئەبێ ئەوە بڵێین کەپێودانی بوونگەرایانە بۆ بـوونی مرۆیـی رەسـەن پێودانێکی وێنەییە نەك ماتەری (مادی). راستە مەسەلەکە سـەد دەرسـەد وانییـە، چـونکە ئێمـە لـە رێـی شـێوازی جـۆراو جـۆرەوە دەبیـنین کـە نـاوەرۆکی بـوونێکی وەهـا بەتـەنها مەسەلەیەك نییە کە پشتگوێ بخرێ. لەگەڵ ئەوەشـدا چـەمکی رەسـەنایەتی لـە بنەڕەتـدا پەیوەستە بـە هەنـدێ پێـوەری وێنەییـەوە، چـونکە وێنـەی بـوونی مرۆیـی یـان شـێوەی، پێـودانی رەسـەنایەتییەی، واتـە رادەی وەدیهێنـانی یەکەیـەك لـەبری ئـەوەی بـوونێکی پەرشوبڵاو بێتو، رادەی هەڵسوکەوتی بەئازادی لەبری ئەوەی بیروڕاو پێـودانو چـێژی بـاو جڵەوی بکات. سارتەر نووسـیویەتیو دەڵێـت: (تـۆ ئازادیـت، کەواتـە هەڵبـژێرە، مەبەسـتم لەوەیە دابهێنـەو بخوڵقێنـە، چـونکە دەسـتوورێکی گشتیی ئاکـار نییـە تـا پێـت بڵـێ چـی بکەیتو چی نەکەیت، هیچ نیشانەیەکیش لەم دونیایەدا نییە تا رێنومایيت بکات" .

مەبەستی سارتەر لەم "رەتکردنەوە"یەش ئەوەیە کـە خودایـەك نییـە بـەهاو ئایـدیالی بـاڵای وای بـۆ مرۆڤایـەتی دانابێـت کـە پێویـست بێـت لەسـەری بیانهێنێتـەدی، هـەر بۆیـە پێویستە هەر مرۆڤەو بەهای تایبەت بەخۆی بخوڵقێنێتو بوونیـشی ئەوەنـدە رەسـەنە کـە هەوڵبـدات بـۆ بـەدیهێنانی بەهاگـەلێك کـە بـەهای تایبـەت بـەخۆی بـن، بـەڵام هـەروەکو دۆستۆیڤـسکی دەڵێـت: "ئەگـەر خودایـەك نـەبێت، کەواتـە هـەموو شـتێك بـۆ ئـادەمیزاد رەوایە."

هەروەکو دەبینین رەتکردنەوە (یان لانی کەم هەڵپەسـاردن)ی ئاکـاری بـاو یەکێکـە لـە سـیفەتی هاوبەشـی فەیلەسـووفە بوونگـەراکان، تەنانـەت هەنـدێ لـە بوونگـەرا مەسیحیەکانیش. دواتریش لە مانای ئەمە دەتوێژینەوە.

بەڵام هیچ فەیلەسووفێکی بوونگەرا نییە هەموو شتێکی بەڕەوا زانیبێـت بـۆ ئـادەمیزاد، تەنانەت گەر پێودانی خودی راستو مرۆڤبوونی راستەقینە یا بوونی مرۆیـی رەسـەنو هـەر ناوێکی تری لێ بنێیت، پێودانێکی وێنەیی بێت، بەڵام هێشتا هەندێ پرنـسیپی مـادی دێنـە ئاراوە. بۆ نموونە لـە فەلـسەفەکەی سـارتەردا، چـەمکی بەرپرسـیاری رۆڵـی دیـسپلینکردن

دەبینێت. سەرچاوەی ئازاریش کە هەڵبژاردنە، هەروەکو سارتەر ئەڵێت، ئەوەی کەمن کاتێك هەڵدەبژێرم بەتەنها خودی خۆم بەو هەڵبژاردنەوە نابەستمەوە، بەڵکو بەجۆرێك لەجۆران هەموو مرۆڤایەتیی پێوە دەبەستمەوە.

((بوونگەرا بەڕاشکاوی رادەگەیەنێت کە مرۆڤ هەست بە ئازار دەکات لەبەرئەوەیە کە ئەو: کاتێك هەڵدەبژێرێت بەوپەڕی هوشیارییەوە دەزانێت کە بەتەنها ئەوە هەڵنابژێرێت کە دەیەوێ ببێت، بەڵکو لە هەمانکاتدا بڕیارێکی یاسا ئاسایانە بۆ هەموو مرۆڤایەتی هەڵدەبژێرێت، مرۆڤ لەچرکەساتێکی وەهادا ناتوانێ لە هەستکردن بە بەرپرسیارێتیی قووڵو تەواو هەبێت" . ئەم بەرپرسیارێتییە ئازاراویە لەو پرسیارکردنەوەی دێت کە ئەو وێنەیە بۆ مرۆڤ یان ئەو وێنایەی کە بۆ خۆمی هەڵدەبژێرم ئاخۆ دەبێتە وێنەیەك بتوانم بۆ هەمووانی هەڵبژێرم. هەڵبەت ئەم هەستکردن بەبەرپرسیارییە دوورە لەهەڵبژاردنی هەندێ ئەگەرەوە، بۆ نموونە ئەگەری هەڵبژاردنی خۆپەرستی یان دڵڕەقیو یان تەنانەت بوون بەکەسێکی فاشیست. چونکە هەڵبژاردنی ئەم ئەگەرانە زەحمەتە هەڵبژاردنێکی بەرپرسیارانە بێت.

بەڵام لای سارتەر جۆرە تێکەڵکردنێك هەیە لەنێوان ئەم مەسەلانەدا. ئەگەر مرۆڤ لە بنەڕەتدا ئارەزووی ئەوە بکات (هەروەکو سارتەر لافی ئەوە لێدەدات) ببێت بەخوداو ئەگەر "ئەویتر" کۆسپ بێت لە بەردەمیدا بۆ وەدیهێنانی ئەم ئارەزووە، کەواتە چ بیانوویەك هەیە وای لێبکات ئەو پرەنسیپە بئاخنێتە هەڵبژاردنەکەیەوە کە تا رادەیەك پرنسیپەکەی "کانت"مان بیردەخاتەوە کە دەڵێت "پێویستە لەسەرم کە بتوانم بڕیاری گشتیو جیهانی بدەم." ئایا ئەوەی سارتەر دەیکات تێهەڵکێشکردنی پرنسیپێك یان بەهایەك نییە کە من خۆم دامنەهێناوەو، بگرە بەر لەمنیش هەبووە؟

دەتوانین سەرنجی ئەم دەستەواژەیە بدەین:

"کێ دەتوانێ بیسەلمێنێت کە من ئەو کەسە شایستەیەم لە توانامدایە کە بەهەڵبژاردنی تایبەتیی خۆم، وێناکردنی خۆم بەسەر مرۆڤایەتیدا بسەپێنم؟" .

بەڕای من لەم دەستەواژەیەدا وشەی "شایستە" پێویستی بە روونكردنەوەیەكی زۆر هەیە. چۆن دەتوانین وشەیەكی بەهادارانەی وا بئاخنینە باسێكی لەمجۆرەوە؟

هەڵبەت سارتەر دەڵێت كە كەس ناتوانێت پاساوی پێویست بەدەستەوە بدات. هەركەسەو ریسكی بڕیاری خۆی لە ئەستۆی خۆی. بەڵام بەگوێرەی پێشڕا تایبەتیەكانی خۆی، هیچ ریسكێك لە ئارادا نییەو، قسەكردن سەبارەت بەوەی ئەو كەسە "شایستە"یە، یان بۆی هەیە یاسا بۆ كەسانی دی دابنێت، هەروەكو سارتەر دەڵێت، قسەكردنێكی بێهوودەیە. یان بەواتایەكی دی، كەسێك كە لەراستیدا نیهیلیزمی ئاكاریی قبووڵ كردبێت، ئەم قسەیە بەلایەوە بێمانایە، سارتەر واناكاتو، ئەو پرسیارەی كە لێرەشدا دێتە پێشیٚ ئەوەیە كە ئایا ئەو خۆیشی سەرەنجام دوچاری "بەدنیازی" نەبووەو نەبۆتە قوربانیی ئەو خۆفریودانەی كەبەردەوام رەخنەی لێدەگرت.

"كامۆ" بەشێوەیەكی روونتر سەبارەت بەمۆركی ناودژێتیی نیهلیزم دواوە. "من رایدەگەیەنم كە باوەڕم بەهیچ نییەو، هەموو شتێك پووچ (عبپ)ە، بەڵام ناتوانم گومان لە راستیو دروستیی ئەم راگەیاندنەم بكەمو، لانی كەم ئەبیٚ باوەڕم بەم ناڕازیبوونەی خۆم هەبێت" .

رەنگە لەمەش سەرنجراكێشتر ئەو جەختكردنەوەیە بێت كە ناوەڕۆك بەسروشتی ئەم ناڕازیبوونە دەبەخشێت، كاتێك "كامۆ" پێماندەڵێت كە یاخیبوون لە مرۆڤدا بریتییە لە رافزیبوونی لەوەی كە وەكو شت (بابەت) مامەڵەی لەگەڵدا بكریٚ . چونكە كاتێك من ئەوە رەتدەكەمەوە كەوەكو شتێك مامەڵەم لەگەڵدا بكریٚ، ئەوا بەوە —جەخت— لەسەر خودی خۆم دەكەمەوە بەو پێیەی كەسێكم، ئەمەش واتە جەختكردنەوە لەسەر كەرامەت (یان شایستەیی یاخود بەها)ی بوونی تاكە كەس. بەڵام گەر جیهانێك بیٚ خودا هەبێت، جیهانێكی پووچی راستەقینە، ئەوا كەسەكانیش بەهەمان ئەندازەی شتەكانی تر پووچو بێبەها دەبن.

خەسلەتی وێنەیی وێناکردنی بوونگەرایانە بۆ بوونی رەسەن بە رێگایەکی تریش ناوەرۆك پەیدا دەکات، بوون –لەگەڵ– ئەوانیتردا یەکێکە لە بونیادە بنچینەییەکانی بوونی مرۆیی. هەروەکو پێشتریش بینیمان مرۆڤێك نییە بتوانێت بەبێ خودەکانی تر ببێت بەخود، هەربۆیە هیچ وێناکردنێك نییە بۆ بوونی رەسەن کە لە رەهەندی کۆمەڵایەتی خاڵی بێت. سارتەر دەبووایە ئەو پرنسیپە کانتییەی وەربگرتایە، لەبەرئەوەی تیۆرییەکی پێویستی سەبارەت بەمۆرکی کۆمەڵایەتیی بوونی مرۆیی نەبوو.

ئەگەر بروایەك بەوە لە ئارادا بێت کە بونیادێکی کۆمەڵایەتیی بنەڕەتی هەیە بۆ بوون، ئەوکات ئەوە رووندەبێتەوە کەهیچ مرۆڤبوونێکی راستەقینە یان خودێکی رەسەن نییە هێندەی فاشیزم بە تەوەری خودی خۆیدا سووڕابێتەوەو دوژمنایەتیی هەموو شتێکی کۆمەڵایەتیی کردبێت. هەرکەسێکیش ئەم وێنانە پشتگوێ بخات، ناتوانێ بەڕاستی ببێت بەخودی خۆی، لەبەرئەوەی ئەم وێنانە وێنەی بوونێکی ئیفلیجو کەموکورتن.

کاتێکیش ئەمە دەڵێم، هەڵبەت ئەو تێڕوانینەی سارتەریش رەتدەکەمەوە کەدەڵێت مرۆڤ لە هیچەوە دەستپێدەکاتو خۆی بەهاو وێنەی دەخولقێنێت. بەپێچەوانەوە، بەبۆچوونی من لەگەڵ بوونی مرۆییدا وێنە یا مەبەستێکی پێدراو هەیە.

بێگومان نموونەیەك یان تایپێك نییە وردو درشتی داڕێژرابێت، بەڵکو لە شێوەی هوشیارییەکی بنەڕەتیدایە بەئاقاری بەرکەماڵیی مرۆڤ. ئەم هوشیارییەش هوشیاریی ویژدانە کە ئێستا لێی ئەدوێین.

## ٢.ویژدان:

پێگەی ویژدان لەنێو فەیلەسووفە بوونگەراکاندا تا رادەیەك پێگەیەکی ناڕوونە. هۆکەشی ئەوەیە کە وشەی ویژدان خۆی دەشێ بەچەند جۆرێك لێکبدرێتەوە. بۆ نموونە دەشێ وا لێکبدرێتەوە کە بریتییە لە دەرککردنی کەسێك بە رێسای باوی ئاکار لە کۆمەڵگاکەیدا، هەروەها هەستکردن بە تووڕەیی یان خۆشحاڵی لەکاتی سەرپێچکردن یان

پـەیڕەویکردنی ئـەو رێسایەدا. بـەڵام ویـژدان وشـەیەکە بـەجۆرێك لـە بـاوەڕی ئـەخلاقیش بەکاردەهێنرێ کە هەندێ جار وا لە مرۆڤ دەکات پێوەرە ئەخلاقییە باوەکانی کۆمەڵگاکـەی رەتبکاتەوە، لەو قەناعەتەوەی کە رەگوریشەی باوەڕە ئەخلاقیەکەی خـۆی لـەو پێوەرانـە قووڵترە. فەیلەسووفانی بوونگەرا بەمانای یەکەمی ئەم وشەیە رەخنە لـە ویـژدان ئـەگرن، بە تـەنها ماناکەی دووەمی بە گرنگ ئەزانن.

کیرکەگۆر لە لێکۆڵینەوەیەکیدا بۆ چیرۆکەکەی ئیـبراهیمو ئیـسحاق لـە کتـێبی "تـرس و لەرز"دا بە شێوازێکی سەرنجراکێش پێکدادانی ئەم دوو ئاستەی ویژدانی خستۆتەڕوو.

فـەرمانی خـودا بەسـەر ئیبراهیمدا دەسـەپێنرێ تـا کوڕەکـەی (واتـە ئیـسحاق کـە لـە ئیسلامدا ئیسماعیلە) بکـات بـەقوربانی، یـان وەکـو کیرکـەگۆر ناویـدەنێت "هەڵپەسـاردنی مەبەستگەرایانەی ئاکار" . ئیبراهیم ئامادەبوو دژ بە پرەنـسیپە ئاکارییـەکانیو هەسـتو سـۆزە مرۆییـەکانی خـۆی بوەسـتێتەوەو گوێڕایـەڵیی فـەرمانی خـودا بکـات. هەرچـۆن ئامادەبوو "گشت" بخاتەلاوە، واتە ئەو پێوەرەی وەکو سیفەتێکی گشتی بۆ شـتی راسـت قبووڵدەکرێ، تا ئەو ئەرکـە بـەجێبهێنێت کـە خراوەتـە ئەسـتۆی وەکـو تاکـە کەسـێك کـە لـەحزووری خوادایـە. دەتـوانین بڵـێین کـە ئیـبراهیم فریـودراوە تـا تـاوانی "کوشـتن" ئەنجامبدات، بەڵام فریودان چییە؟ فریودان شتێکە سەرهەڵئەدات تـا رێ لـەمرۆڤێك بگرێـت ئـەرکی سـەر شـانی بـەجێبهێنێت. بـەڵام ئێمـە لـەم حاڵەتـەدا دەبیـنین کـە ئاکـار خـۆی هەوڵدەدات رێی لێ بگرێت تا ئیرادەی خودا بەجێ نەهێنێت. بـەڵام ئـەی ئـەرکی سەرشـان نییە؟ زۆر بەسادەیی، ئەرکی سەرشان بریتییە لە گوزارشتکردن لە ئیرادەی خودا .

"بەڵام هەروەکو ئاشکرایە ئەبێ وا نەڕوانینە ئیرادەی خـودا کەشـتێکە تـەواو ئەکەوێتـە دەرەوەی ئەو کەسەی کە بەجێیـدەهێنێت. ئیـبراهیم بڕیاریـدا کوڕەکـەی بکـات بـەقوربانی

---

(*)وا پێویست دەکات ئاکار (ئەخلاق) رێ لەباوکەکە بگرێتو نەهێڵێت کوڕەکەی بکوژێت، لێرەوە "هەڵپەرستان"ی ئاکار هاتووە لەپێناوی مەبەستێکی بالاتردا کـە لێـرەدا بریتییـە لەگوێڕایـەڵی بـۆ فەرمانی خودا.

"لە پێناوی خوادا، هەروەها لە پێناوی خۆیشیدا، ئەم دوو شتەش رێك یەك مانا دەبەخشن" .

ئێمە لێرەدا لەبەردەم ململانێی ویژدانەکاندایین، یان با بڵێین ململانێ لە نێوان دوو ئاستی جیاوازی ویژداندا. یەکەمیان ئەو ویژدانەی کە رەنگدەرەوەی ئاکاری گشتییە، کە ویژدانی دووەم ئەفەرۆزی کردووە، ئەو ویژدانەی لە هەمانکاتدا فەرمانی خودایەو قووڵترین لایەنە ناوەکیەکانی خودی تاکە کەسیشە.

جۆرج پرایس George Price لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەوەی لەبەردەم مەترسیدا بوو، خودی ئیبراهیم بوو. تێکۆشانی لە پێناوی ئەوەدا کە –ببێت– وەکو تاکە کەسێك بوونی هەبێت کە ئەزانێ پێویستە لەسەری کە هەبێت، هەربۆیە ئیبراهیم دەبووایە بەردەوام کاتیگۆریی تایبەت بەخۆی دابڕشتایە. بەمجۆرە، ئەو نموونەی هەموو تاکەکەسێکە کەخۆی لە سنوورەکانی ئەوپەڕی ئاکاردا دەبینێتەوە" .

دەستەواژەی "وەکو تاکە کەسێك بوونی هەبێت کە ئەزانێ پێویستە لەسەری کە هەبێت" زۆر بەڕوونی مەبەستی من لە مانای دووەمی ویژدان روونەکاتەوە.

هەڵبەت ئاماژەکردنیش بۆ ئیبراهیم بەو سیفەتەی کە نموونەی هەموو تاکە کەسێکە کە لەسنوورەکانی ئەوپەڕی ئاکاردا خۆی دەبینێتەوە، ئەوەمان بیردەخاتەوە کە کیرکەگۆر خۆی لە ململانێیەکی تایبەتیی و ویژدانیدا دەژیاو، بەهەمان شێوەی ئیبراهیم ململانێکەی یەکلا کردەوە. بێگومان مەبەستیشم لەمە پرۆژەی هاوسەرێتییەکەی بوو لەگەڵ "رێژینا ئۆڵسن"دا. ئەوەبوو مارەی کردو، پەیمانێکی ئەخلاقیی بەسەر خۆیدا سەپاند کە بیهێنێت، پێشتر باسمان لەوە کرد کە کیرکەگۆر ئەمجۆرە پەیمانانەی بەجیددی وەردەگرت، بەڵام رێگای هەڵوەشاندنەوەی مارەییەکەی هەڵبژاردو ویژدانی (بەمانا یەکەمەکە) خستە لاوە، هەروەها پرنسیپی ئاکاری "گشتی"یشی پشتگوێ خست . ئەمەشی لەو باوەڕەوە کرد

---

(*)پرنسیپی ئاکاری گشتی بریتییە لەو ئەرکە ئەخلاقیانەی کە کۆمەڵگای مرۆیی بەشێوەیەکی گشتی لەسەری رێککەوتوون، "گشتی"یشن لەبەرئەوەی بەسەر هەموو خەڵکدا دەچەسپێن.

كە ئەوە ئیرادەی خوایە ئەوەی پێدەكات،. بەڵام لە هەمانكاتـدا ئـەم ئیرادەیـە بریتییـە لـە بانگەوازی ناوەوەی خۆیشی، بەجۆرێك دەشتوانین بڵێین كە ئەوەی كرد تا خودی خۆیـشی وەدیبهێنێت.

ئێستا رای خۆیشم سەبارەت بـە "هەڵپەسـاردنی مەبەسـتگەرایانەی ئاكـار" ناكـەم، تـا هەندێ نموونەی قابیلی بەراورد لای هەندێ فەیلەسووفی بوونگەرای تر بهێنمەوە.

نیچە كیركەگۆر تێدەپڕێنێت، ئەو تەنها كاری هەڵپەساردنی ئەركی ئاكاریی بـاو ئـەنجام نادات، بەڵكو بەتەواوی پشتگوێی دەخات. ئاكاری بـاوی قبـوڵكراوی كۆمەڵایـەتی لای ئـەو لە "لەوحە كۆنە شڕو پڕەكان"ی قانون دەچێت، بەڵام لەوحی تازە جـارێ پەیـدا نـەبوون‌و نیوەیان نووسراون. نیچە لەسەر زمانی زەردەشت ئەڵێت:

"كاتێ هاتمە كن خەڵكی، سەیرم كرد هەموویان بە هەڵوێستێكی كۆنەوە وابەستەن كـە گوزارشت لە لەخۆباییبوونیان دەكـات، لـە هـەموویان وایـە لەمێـژە دەزانـن بـەلای مرۆڤـەوە چاكەو خراپە چییە. هەر قسەكردنێكیش سـەبارەت بـەكردەوەی بـاش بەلایانـەوە شـتێكی كۆنەو تۆزی لێ نیشتووە، هەر كامیشیان ویستی خەوێكی قووڵی لێبكـەوێت، بـەر لـە خـەو باس لە "چاكەو خراپە" دەكات. بەڵام من لەو خەوەم كردن كاتێك فێرمكردن كـە كەسـیان (نازانێ) چاكەو خراپە چییە گەر خۆی خولقێنەریان نەبێت! بەڵام خولقێنـەر ئـەو كەسـەیە كە ئامانجەكانی مرۆڤ دەخولقێنێت‌و ماناو پاشەرۆژ بەزەمین ئەبەخشێت: ئـەو كەسـەیە كـە یەكەمین خولقێنەری چاكەو خراپەیە" .

ئاكاری سوننەتی دەیویست ژیانی مرۆیی بپارێزێت‌وو خودا بكات بـەزامنی، بـەڵام خـودا لای نیـچە مـردو، ئـەوەی لـە ئەسـتۆی مرۆڤدایـە خولقانـدنی ئاكـارێكی نوێیـە كـە كـاری پاراستنی ئەوە نەبێت كە باوەو هەیە، وەكو ئەوەی ئاكاری رەشـۆكیەكان دەیكـات، بـەڵكو دەبێت لە باڵامرۆی ئایندە بڕوانێت.

"نیگـەرانترین كەسـانی ئـەمرۆ ئەپرسـن: چـۆن ئـەتوانین مـرۆ بپـارێزین؟ وەلێ تـەنها زەردەشـتە كـە یەكـەمین كەسـە دەپرسـێت: "چـۆن ئـەتوانین مـرۆ تێپـەرێنین؟" بـاڵامرۆ

(سوپەرمان) مەبەستی من و جێی بایەخی منە، نەك هاوسێکەم، یان هەژارترین کەس، یـان بەئازارترینو یاخود باشترینیان ... خەڵکە رەمەکییـە هیـچەکان ئـەمڕۆ بوونەتـە سـەروەر، هەر ئەوانیشن ئەمڕۆ ملکەچیو خـۆ بەبـچووکزانینو وریـاییو زرنگـیو رێزلێنـانو کۆمـەڵێك فەزیلـەتی هیـچی تـر فێری خـەڵك ئەکـەن. ئەوانـەی لەجنـسی ژنو کۆیلـەن، ئەوانـەی کـە رابەرایەتیی رشوکیو رەمەکییـەکان دەکـەن، ئەوانـەن کـە سـەروەری چارەنووسـی گـشت مرۆڤایـەتین. براکـانم، لێمگـەڕێن بـا بـچمە سـەر پـشتی ئـەم سـەروەرانەی ئـەمڕۆ، ئـەم حەشاماتە هیچەی ئەمڕۆ کە گەورەترین مەترسین بۆ سەر باڵامرۆ" .

لێرەدا سووکایەتیکردنێکی ئاشکرا هەیە بە مرۆڤ لەو دۆخەی ئێستا تیایـەتیو هـەروەها بەپێودانە ئەخلاقیەکانی. نیچە گرنگی بەو باڵامرۆیە ئەدات کـەمرۆی ئێـستا تێدەپـەڕێنێت. لێرەشدا نامەوێ بەپەلە راڤەی ئەم مەسەلەیە بکەم.

"هایدیگەر"یش بابەتی نموونـەی سـێیەممان ئـەداتێ. ئـەو سـەبارەت بەمـەی کـەناوی دەنێـت ویـژدانی گـشتی دەپرسـێت: "ئـەم ویژدانـە جگـە لـەوەی کەبریتییـە لـەدەنگی "ئـەوانیتر" چـیی تـرە؟ . ئـەمجۆرە ویژدانـە رەنگـدەرەوەی پێـوەرە قبـووڵکراوە گشتیەکانی راستو هەڵەیە. بەڵام ویژدانی راستەقینە، یـان ویـژدان لـە ئاسـتە قووڵەکەیـدا، کاردەکات تـا لـەدەنگی "ئـەوان" رزگارمـان بکـات. "ویـژدان ناهێڵێـت خـودی بوونـەوەری مرۆیی "دازاین" لەناو "ئەوانیتر"دا ون بێت" .

هەروەها بوونەوەری مرۆیـی ناتوانێـت بەڕاسـتی گـوێ بـۆ دەنگـی ویـژدان شـل بکـات، ئەوکاتە نەبێت کە چیدی گوێ بۆ دەنگی "ئەوانیتر" شل ناکات.

دەنگی ویژدان لەکوێوە دێت؟ لـەقووڵایی بـوونی مـرۆڤ خۆیـەوە. ئەمـە دەنگـی خـودی رەسەن کە تێدەکۆشێت لەدایك بێـت، ئـەی ئـەم دەنگـە روو لـەکێ دەکـات؟ روو لـەخودی کەوتووی ناڕەسەن دەکات، ئەو خودەی "ئەوانیتر" بەسەریدا زاڵـنو بووەتـە نێـچیری ئـەو بایەخانەی کەجڵەوی دەکەن، لەبری ئەوەی ئەم ئـەوان جڵـەو بکـات، ئـەی نـاوەرۆکی ئـەم دەنگە (یان ئەم بانگەوازەی نـاوەوە) چـیە؟ بـێ ناوەرۆکـە. ئـەم بانگـەوازە لەحاڵـەتێکی

سەیری پاراستنی بێدەنگیدا ئەدوێت. بۆیە واشدەكات لەبەرئەوەی كاتێك ئەو كەسە بانگ ئەكات كە بانگەوازەكەی ئاراستە دەكات، بەو چەنەبازییە باوە لەناو بانگی ناكات كە سیفەتی "ئەوانیتر"ە. بەڵكو بانگی دەكات تا ئەو چەنەبازییە قوتاری بكات تا بێتەوە ناو ئەو بێدەنگییەی كە خەسڵەتی ئیمكانی بوونەوەرە بۆ بوون" . بەمجۆرە واجارێكی دی دەگەینەوە بەخەسڵەتی وێنەیی چەمكی بوونگەرایی بۆ بوونی رەسەن، ناوەرۆكێك نییە كە بەگشتی بكرێ (تەعمیم بكرێ)، بەڵكو پێویستە هەر تاكەكەسێك هەوڵبدات ئیمكانەكانی بوونی خۆی بەدیبهێنێت.

لەگەڵ ئەم نموونانەی بەردەمماندا چی بڵێین سەبارەت بەوەی كەبوونگەراكان رقیان لە ئاكاری باو دەبێتەوەو، بانگەشەی ئەوە دەكەن كە ئاستێكی قووڵتری ویژدان هەیەو داوامان لێدەكات لە هەرشتێكی دی زیاتر گوێ لەو بگرین؟ من بڕوام وایە كە لەم هەڵوێستەدا راستبینی هەیە، بەڵام پراكتیك كردنی بێئەندازە خەتەرناكە.

راستبینییەكەش لەوەدایە هەرگیز هیچ داهێنانێكی ئاكاری یان پێشكەوتن لەمێژووی ئادەمیزاددا نەدەبوو گەر خەڵك بەناوی دەنگێكی قووڵتری ویژدانەوە دژایەتیی دەستووری خێڵێك یان ئاكاری باویان نەكردایە. لە مێژوودا كاتی وا هەبووە كە خەڵك بڵێن "پێویستە گوێڕایەڵی خوا بین نەك خەڵك!" یان بەزمانێكی مرۆڤگەرایانەتر "مرۆڤایەتی وامان لێدەكات دژایەتیی ئەوە بكەین كە زۆرینەی خەڵك بەڕاستی دەزانن!".

بەڵام مەترسییەكە لەمەدایە كە تۆ ویژدانێكی تاكەكەسی شك نابەیت لەتوانایدا بێت بەردەوام بە پاكژیو بێگەردییەوە بدوێت. ئێمە هەموو دەزانین كە یاریكردن بەوشەی ویژدان ئاسانە. خۆ ئەگەر بگەڕێینەوەو بیرێك لەو نموونانەی پێشوو بكەینەوەو بپرسین:

ئایا كیركەگۆر لەسەر هەق بوو كە بڕوای وابوو ئیرادەی خوا دەناسێتو ئەو ئیرادەیەش كاری ئەخلاقی هەڵدەپەسێرێت؟ لەراستیدا دەكرێ "ئیرادەی خوا" بكرێ بەبیانوو بۆ گەلێ رەفتاری ناشرینی ئادەمیزاد.، گەر حاڵەتی ئیبراهیم بخەینەلاوە، كە لەنێوەندێكی كەلتووری جیاوازەوە سەرچاوەی گرتووە، چۆن دەتوانین حوكم بەسەر كیركەگۆردا بدەین

کاتێك مارەییەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە؟ ئایا ئەوکارەی راست بوو و گوێی بۆ بانگەوازی ناوەوەی شلکردو پەیڕەوی لێکرد، یان ئەوە جۆرێك بوو لەخۆپەرستیو هیچی دی؟ خۆ گەر بڕیار بێت هەرکەسێك دەسبەرداری ئەرکە ئەخلاقییە باوەکان بێت لەپێناوی داخوازییە رەهاکانی خودە رەسەنە راستەقینەکەی، ئەوا ئەوەندە نابات ئەکەوینە ناو ئاژاوەیەکی ئەخلاقییەوە. رەنگە دۆخەکە تونئدو تیژتریش بێت لای نیچە، بابپرسین: ئاخۆ ئەو بالآمرۆیە (سوپەرمانە) کێیە کە لە توانایدایە ئاکاری "حەشامەتی رەمەکیو هیچ" رەتبکاتەوە؟ تەنانەت گەر ئەوانەش بەهەڵدا چووین کە نیچە بەباوکی نازیزم لەقەڵەم ئەدەنو شتەکەیان زۆر ساکارانەیەو گیانی سەربازی بەسەریدا زاڵە، بەڵام لایەنێکی هاوبەش لەنێوان نیچەو نازیزمدا هەیە کە بەسە بۆ ئەوەی وا لەمرۆڤ بکات بەقووڵی گومان لەو هەڵوێستە بکات کە لێرەدا بەرامبەر بەئاکار هەیە، بەڵام کێشەکە لایەنێکی تریشی هەیە. گەر ئێمە لەسەر ئەوە کۆك بین کە هەڵوێستی بوونگەراکان بەرامبەر بەئاکاری باو هەڵوێستێکە تەواو بەمەترسی تەنراوە، کەواتە نابێ سەرمان لەوە سووڕبمێنێت گەر وەڵامەکە ئەوەبێت کە هەموو بوونێکی مرۆیی خۆی لەخۆیدا کارێکی پڕ لەمەترسییەو، هەندێ جار پێویستە مەترسیی رووبەڕووبوونەوەی ئاکاری باو قبوولبکەین.

لەم حاڵەتەشدا گەر مەترسیی کەوتنە ناو نیهیلیزمێکی ئەخلاقیش هەبێت، بەهەمانشێوە ئەگەری پێشکەوتنی ئەخلاقیش هەیە.

له راستیدا پێدەچێ مرۆڤ لەبەردەمی هەڵبژاردنێکدا بێت: ئەو دەتوانێ ئاسوودەبێتو پێوەرە ئەخلاقییە باوەکان قبووڵبکاتو بەگوێرەی ئەو پێوەرانە رەفتار بکات. لەوانەیە ئەوە "بەدنیازی"یش نەبێت چونکە دەشێ ئەو مرۆڤە ئەو پێوەرانەی پێ رەسەن بنو بیانکاتە پێوەری ناوەکیی خۆیو وەکو پێوەری دەرەکیی سەپێنراو سەیریان نەکات. بەڵام رەنگە ئەوە وای لێبکات دوچاری مەترسیی دۆگماتیزم بێتو بەوە کۆتایی بێت کە "کارل یاسپەرز" –کەزۆر میانڕەوبوو– ناویدەنێت ئاسوودەیی جیهانی کەلتووری مەسیحیی بۆرژوایانە، کەبووەهۆی شێواندنی ئازادییەکەیو دابڕانی راستەوخۆی لەگەڵ

ئەسڵەکەیدا . ئەگەری دووەمیش کاتێك دێتەدی،' لەگەڵ خۆیدا دڕدۆنگییەکی بوونگەرایانەش دەهێنێت — بریتییە لەبەگژداچوونەوەی هەندێ لایەنی سیستەمە باوەکانو هەوڵدان بۆ داهێنانو نوێکردنەوە. لێرەشدا مەترسیی دۆگماتیزمی ئەخلاقی لە ئارادا نابێت، بەڵکو مەرگی ئەخلاقی.

بەڵام لەهەردوو حاڵەتەکەدا مەترسی هەیە، هەندێ جاریش گەر مەترسییەکە لەجۆری دووەم نەبێت، هیچ پێشکەوتنێکی ئەخلاقی نایەتە ئاراوە. پێدەچێ جۆری دووەمی مەترسیەکەش — کە ئەو جۆرەیە زۆربەی بوونگەراکان بانگەشەی بۆ دەکەن— گونجاوترین جۆربێت بۆ ئێمە لە سەردەمەکانی گۆڕاندا. دەشتوانین رۆشنایی زیاتر بخەینە سەر ئەم بابەتە گەر بەشێوەیەکی وردتر لەو شێوازانەمان کۆڵیەوە کە دەکرێ بەهۆیانەوە بوونی مرۆیی رەسەن وەدیبهێنین.

## ٣.وەدیهاتنی خود (یان خۆ وەدیهێنان)

ئەو شیکردنەوانەی لە لاپەڕەکانی پێشوودا ئەنجاممان دان وردە وردە وێنەیەکیان بۆ ئەو ملامنێو گرژییانە دروستکرد کە بەناچاری لە واقیعی دینامیکیی بوونی مرۆییدا هەن: هەروەکو بینیمان مرۆڤ لەسەرێکەوە مومارەسەی ئازادیو ئیرادەو بڕیاردانو داهێنان دەکاتو ئامانج بۆ خۆی دادەنێتو هەوڵ دەدات پێی بگات، بەمجۆرە وادەنوێنێت بوونەوەرێك بێت "هەستکردنو مەیل بەرەو ناکۆتابوون" بەسەریدا زاڵبێت (هەروەکو شلایەر ماخر Schleiermachers دەڵێت). لەسەرێکی تریشەوە بینیمان کە مرۆڤ "تووڕدراوە" یان فڕێدراوەو بوونەوەرێکە خەسڵەتی خەمو زەمانمەندیی هەیەو، دواجاریش مەحکومە بەمەرگ، بەجۆرێك کە ئەگاتە سنووری کۆتابوونێکی ریشەیی، ئیدی هەستکردن بە ناکۆتابوونی لانامێنێت. هەروەها بینیمان کە لەڕووە کۆمەڵایەتییە گەوهەرییەکەیەوە بریتییە لە (بوون — لەگەڵ— ئەوانیتر)دا، لەکۆبوونەوەی نارەسەنی "ئەوانیتر"دا قووتی ئەدات. هەندێ لەگەورە بیرمەندەکانی بوونگەرایی (بوبەرو مارسیلیان لێ دەربکەین)

بڕوایان وابووە کە پێویستە جەخت لەسەر تاکە کەس بکەین تا لە حەشامات ڕزگاری بێتو بە تەواوی خودی خۆی بەدی بهێنێت. هەروەها بینیمان کە مرۆڤ بوونێکی خاوەن ویژدانە کە هوشیاریی بە چارەنووسی خۆی هەیەو هەوڵدەدات بیهێنێتەدی، بەلام بەرامبەر بەمە گوناەو نامۆبوونیش هەیە.

ئاخۆ لەنێو هەموو ئەم ئاقارە یەکتربڕانەدا دەتوانین شتێکی مانادار بدۆزینەوە؟ ئایا ئەتوانین بڵێین کە بوون لەبنەڕەتدا پووچە؟ یان بڵێین کە سەرباری ئەوەی بوون موفارەقە ئامێزە و سەرباری ئەوەی کەناتوانین لەڕێی بیرکردنەوەی ئەقلانیەوە بەتەواوەتی لەبوون بگەین (هەروەکو پێشتر لەم لێکۆڵینەوەیەدا باسمان لێوەکرد) بەلام بوون بێمانا نییەو دەتوانین لە چوارچێوەی گشتێکی داینامیکدا بەسەر شڵەژانەکانیدا زاڵ بین؟ مرۆڤ هەرگیز دەسبەرداری گشتێتی نابێت. پێشتر بینیمان کە تەنانەت توندڕەوترین فەیلەسووفی بوونگەراش پەیڕەویی لەتیۆرەیەکی نیهیلیستی یان پووچییەکی ڕەها نەکردووە.

بەلام، هەروەك چۆن کۆمەڵێك ململانێو گرژیی قووڵ لەناو بوونی مرۆڤدا هەیە، بەهەمانشێوە جیاوازیی گەورە لەنێوان بوونگەراکاندا هەیە لەسەر ئەو شێوازەی کەدەکرێ لە ڕێیەوە مرۆڤ بەسەر ئەو ئاقارە وێرانکەرانەدا زاڵبێت کە هەڕەشەی لێ دەکەن. دیسانەوە لێرەشدا ئەگەینەوە بەو جیاوازیەی کەلەنێوان بوونگەرا دیندارەکانو بوونگەرا بێدینەکاندا هەیە. بەلام ئەو جیاوازییە چ نییە جگە لە دابەشکردنێکی فراوان: هەندی لەبوونگەرا دیندارەکان هێندەی بوونگەرا بێدینەکان لەدۆخی مرۆڤ نائومێدن. بەلام نائومێدی حاڵەتێك نییە تیا بمێننەوە. بوونگەرای مەسیحی بەباوەڕوە دڵنیایە کە ئەو حاڵەتە تێدەپەڕێنێت، وەك چۆن بوونگەرای بێدینیش هەوڵدەدات لانی کەم گەر بەشێوەیەکی بەشەکی (جزئی)یش بێت خۆی لێ قوتار بکات. لەبری ئەوەی بوونگەراکان بۆ بێدینو مەسیحی دابەش بکەین، ڕەنگە واچاکتر بێت دابەشیان بکەین بەسەر ئەوانەدا کەباوەڕیان بەلوتفی خودایی grace هەیەو ئەوانەی باوەڕیان پێ نییە. من لێرەشدا کە دەستەواژەی لوتفی خودایی بەکاردەهێنم مەبەستم لەو بیرۆکەیەیە کە دەڵێت هێزێکی

رزگارکەر یان چارەساز هەیە کە لەسەرچاوەیەکی سەروو مرۆڤەوەیەو لەڕێی وەیدهێنانی ئاشتکردنەوەو بەرکەماڵبوونەوە بەسەر نامۆبوونەکەیدا زاڵدەبێت. هەندێ لەبوونگەرا مەسیحیەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، گەر ئێمە بەدابڕاوی لەدۆخی مرۆڤ بکۆڵینەوە، ئەوا هەروەکو بوونگەرا بێدینەکان دەڵێن، دۆخێکی بێ ئومێدو پووچە. چونکە ئەوان نکوڵی لەوە دەکەن مرۆڤ حیکمەتو توانای ڕێکخستنی بوونی خۆی هەبێت، چونکە ئەوە بەتەنها لەڕێی لوتفی خوداییەوە دێتەدی. ئەگەر رووکاری ئەم هەڵوێستەش وەربگرین، وا دەنوێنێت کە دەسهەڵگرتن بێت لەهەندێ خەسڵەتی سەرەکیی بوونگەراییو شێوەیەکی تازەی "بەدنیازی". بەڵام بوونگەرای مەسیحی کاتێ قسە لەسەر لوتفی خودایی دەکات، عادەتەن نکوڵی لە حەقیقەتی ئازادیی مرۆڤ ناکات، بەڵکو دەیەوێ تێگەیشتنی خۆی بۆ لوتفی خودایی بە بڕیاری ئازادانەی مرۆڤەوە ببەستێتەوە. لەلایەکی تریشەوە بوونگەرای بێدین هەن کە باوەڕیان بە لوتفی خودایی نییە، بەڵام دەڵێن کە مرۆڤ لەڕێی گوێڕایەڵیی ئازادانەوە بۆ ویژدانی خۆیو بانگەوازی ویژدانی، دەتوانێ بە بەرکەماڵیو خودێتیی رەسەن بگات. بەمجۆرە سەربەخۆیی خودیی بوونی مرۆیی دەپارێزن، بەڵام بەردەوام حاڵەتی واش هەیە کە ئەکەوێتە بەینی ئەم دوو حاڵەتەوە. بۆ نموونە هایدیگەر لەکتێبەکەیدا "بوونو زەمان" وێنەی ئەو مرۆڤە سەربەخۆیەمان ئەخاتە بەردەم کە بەپشتبەستن بەسەرچاوە تایبەتەکانی خۆی، تێدەکۆشێت کەخودی خۆی بێت. بەڵام لە کتێبەکانی دواتریدا باس لە نیعمەت **Grace**ی بوون دەکاتو ستایشی جۆرێك لە بیرکردنەوەو گوێهەڵخستن دەکات کە لەلایەنی نەگەتیڤو پۆزەتیڤی خۆی هەیە. یاسپەرزیش لەگەڵ ئەوەدا کە نکوڵی لەو کرداری نیعمەتە دەکات کە خودا ئاراستەی مرۆڤی دەکات، بەڵام دان بەوەدا دەنێت کە لەنێو بوون خۆیدا جۆرێك لە نیعمەت هەیە.

بەڵام وێڕای ئەم جیاوازییانەش شتێکی هاوبەش لەنێو بوونگەراکاندا هەیە. ئیدی گەرچی هەندێکیان بڕوایان وابێت کە کرداری ئیرادەیان بڕیار سەربەخۆیە یاخود بەهۆی لوتفی خوداییەوە ئاراستە دەکرێ، بەڵام پێدەچێ ئەم کردارە تەوەری هەر تێگەیشتنێکی

بوونگەرایانە بێت سەبارەت بە بەرکەماڵیی مرۆڤ، لەبەرئەوەی هەر ئەم کردارەشە خود بەرەو یەکەیەکی پتەو راپێچ ئەکات (گەر ئەم دەربڕینە رەوابێت). کۆکردنەوەی خودیش وەکو گشتێك لە کردارێکی چڕکراوەی ئیرادەدا، لەراستیدا واتە مرۆڤ خۆی بێت بەشێوەیەکی رەسەن، لە پەرشوبڵاوی و ونبوون لەناو بایەخی هیچوپووچی ناو حەشامات رزگاری بێت، بەمجۆرە، پێدەچێ رۆڵی سەرەکیی ئیرادە هەمان گرنگیی هەبێت، چ لەگۆشەنیگای ئیمانی مەسیحییەوە لای کیرکەگۆرو چ لەویستی "دونیابیانەوە لای هایدیگەر". مەسیحیەتی چەرخی تازە بەندە بەئیرادەی مرۆڤەوە، هەموو شتێك بەئاقاری گۆڕینی ئیرادەدا دەڕوات. هەر دەستەواژەیەکی لەبابەت (تەرکی دنیا بکە، ئینکاری نەفسی خۆت بکە، گوێ مەدەرە دونیا، رقت لەخۆت بێتەوە، خوات خۆشبوێت) لەمەسیحیەتدا بەستراوەتەوە بەو بیرۆکە سەرەکیەوەی کەوا لە مەسیحیەت ئەکات هەبێت، مەبەستم لەگۆڕینی ئیرادەیە". ئیرادەش لای هایدیگەر گشتگیرییەکی تیایە، ئەو زاراوە سوننەتیەکانی ئیرادەو کرداری ئیرادە زۆر بەکار ناهێنێت بەڵکو وای پێ باشترە "ویست" یا بڕیار بەکاربهێنێت، بەڵام لەدوو برگەدا بە راشکاوی دەربارەی ئیرادەو کرداری ئیرادە ئەدوێت و دەڵێت کە ئیرادە جۆرێك نییە لەبەرد بۆ بیناکردنی خود، بەڵکو "لەڕێی ئەوەوە گشتێتیی خەمی پەنهان لەدیاردەی ئیرادەدا دەردەکەوێ".

لەو بڕوایەشدام کارێکی خراپ نییە گەر بەکورتی باس لە شێوازی تێگەیشتنی وەدیهاتنی خودی راستەقینە لای کیرکەگۆرو هایدیگەر بکەین. ئەم لێدوانەشمان لە دوو بواری تەواو جیاوازەوە دێت لە چوارچێوەی بوونگەراییدا: یەکێکیان پەنا دەباتە بەر ئیمان و لوتفی خودایی، ئەوی تریشیان وەك بوونەوەرێکی سەربەخۆ لە مرۆڤ دەڕوانێت، بەڵام وێڕای جیاوازیی نێوانیشیان، پەردە لە لێکچوونێکی بنەڕەتی لە نێوانیاندا هەڵدەماڵن.

بەبۆچوونی کیرکەگۆر هیچ چارەسەرێکی ئەقڵانی یان مرۆیی بۆ بوون نییە. چارەسەری مرۆیی نیە، لەبەرئەوەی کۆتابوون و گوناهباریی مرۆڤ کارێك ئەکەن گەیشتن بە قوتاربوونی تایبەتی مەحاڵ بێت، هیچ چارەسەرێکی ئەقڵانیش نییە، لەبەرئەوەی

پارادۆکس (موفارەقە)ی بوونی مرۆیی بەکاتیگۆری (مقولە)ی ئەقڵانی چارەسەر ناکرێ، تاقە چارەسەری پارادۆکسی بوونی مرۆیی بەتەنها بە پارادۆکسێکی گەورەتر دەبێت، کە ئەویش پارادۆکسی رەهای مەسیحیەتە، لەسەروو هەمووشەوە پارادۆکسی بەرجەستەبوون، لوتفی خودایی بۆ مرۆڤ.

بەڕای کیرکەگۆر هیچ بەرگرییەك یان لێکدانەوەیەکی ئەقڵانیش بۆ مەسیحیەت نییە. لیسینگ وتوویەتی حەقیقەتە تێپەڕەکانی مێژوو نابنە بنەما بۆ حەقیقەتە هەتا هەتاییەکانی ئەقڵ، لەگۆشەنیگای ئەقڵیشەوە راستیکردووە. بەڵام کیرکەگۆر رێگای تەرتولیان ی گرتەبەرو وتی مەسیحیەت کۆسپە لەبەردەم ئەقڵدا و ئێمە ناتوانین لێی تێبگەین مەگەر بەکرداری ئیرادە کە ئەقڵ تێدەپەڕێنێتو ئەوەش"باز"ی ئیمانە.

ئەمەش ئەو "چرکەسات"ەیە کە تیایدا مرۆڤ لەبەردەمی خوادا دەوەستێت، ئەو چرکەساتەی تیایدا ئەزەلی لەگەڵ زەماندا پێکدادێن، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە ئیماندار لەزەمانو ململانێکانی قوتار بووە، بەڵکو واتە رەهەندێکی ئەزەلی لە ژیانیدا هەیە. هەروەکو مارتن ج. هاینکن ئەڵێت "تاکە کەس لەبوونیدا پێکهاتەیەکە لەزەمانو ئەزەلیو بەردەوام لە پرۆسەی دروستبووندایە، تا ببێت بەوەی کە دەبێت، بەڵام بەمانایەکی دیکەش، بەردەوام وا بەسەر پشتی شەپۆلی بڕیارەوە" .

---

(*) لیسینگ (١٧٢٩ – ١٧٨١) بیرمەندو شانۆنووسێکی ئەڵمانییەو لەڕابەرانی رۆشنگەریی ئەڵمانی بوو. لەگرنگترین کتێبدا "پەروەردەکردنی رەگەزی مرۆیی" پێشبینی پاشەرۆژێکی ئازاد دەکات.

(**) تەرتولیان (١٦٠–٢٣٠) بیرمەندێکی خواناسی مەسیحی بوو کە دەیوت بابەتی ئیمان مەحاڵو نامەعقولە. "هەربۆیە بەرجەستەبوونی مەسیح راستە لەبەرئەوەی مەحاڵە". هەر ئەمیشە خاوەنی ئەو دەستەواژە بەناوبانگە لەمێژووی فەلسەفەدا کە دەڵێت "ئیمان دەهێنم لەبەرئەوەی نامەعقولە".

(***) کۆسپ offense زاراوەیەکی خواناسییانەی مەسیحییە کە کیرکەگۆر لە سانت پۆڵسەوە وەریگرتووە، مەبەستیش لێی ئەوەیە کە ئەقڵ رووبەڕووی بابەتەکانی ئیمان ئەبێتەوەو لێیان تێناگات.

بەمجۆرە، بەبۆچوونی کیرکەگۆر، ئێمە لەو چرکە ساتەدا بوونی رەسەن بەدی دەهێنین کە لەبەردەم خوادابین، هەر ئەو چرکەساتەش چرکەساتی خۆناسینەو، لەو کردارەدا دێتەدی کە تیایدا مەسیحمان دەوێت، کە هەر ئەو کردارەشە کەتیایدا خۆمان دەوێت. "من هیچم ناوێت بەتەنها یەك شت نەبێت، ئەمەوێ سەر بە مەسیح بم، ئەمەوێ ببمە مەسیحی!" بەمجۆرە ئیمان ویستنی شتێکە کە ئەویش بالآترین شتە، واتە پارادۆکسی مەسیحو ژیانی مەسیحیانە — هەر ئەمەشە کیرکەگۆر ناوی دەنێت "دڵپاکی"، واتە: بێگەردیو رەسەنایەتیی بوونگەرایانە.

بەرامبەر بەم تێروانینەی کیرکەگۆر تێروانینی هایدیگەر هەیە کە دەڵێت چرکەساتی گرنگ چرکەساتی "رووبەڕوو بوونەوەمان نییە لەئاست خوادا"، بەڵکو رووبەڕوو بوونەوەمانە لەئاست مەرگدا. مەرگ دیاردەیەکی تەواو نەگەتیڤ نییە. ئاگامەندیی پێشینە بەرامبەر بەمەرگ بە بڕیارەوە واتە بینینی جۆرێك لە بەرکەماڵیی تیایدا، لەبەرئەوەی مەرگ سنوورێك بۆ بوونم دادەنێت، بەمەش رێ بۆ یەکەیەك بۆ بوون هەموار دەکات. جگە لەوەش مادامەکی ئەم ئیمکانەش بەر لەهەرشتێك ئیمکانی منەو ئەبێ بیگرمە ئەستۆو بەمجۆرە مەرگ من لە "ئەوانیتر" رزگار دەکات.

کاتێ دەربارەی تێروانینەکەی هایدیگەر دوام، بەئەنقەست دەستەواژەی "چرکەساتی رووبەڕوو بوونەوە لەئاست مەرگدا"م بەکارهێنا، تا لایەنی لێکچوونو جیاوازیی لەگەڵ دەستەواژەی "چرکەساتی رووبەڕوبونەوە لەئاست خوادا" لای کیرکەگۆر بخەمەڕوو. هەردوو دەستەواژەکە هێمایان بۆ کۆتابوون تیایە. بەڵام ئەو ئەزەلیەتەی کە زەمان تێدەپەڕێنێتو کیرکەگۆر لێی دواوە، لای هایدیگەر دەبێت بەجۆرێك لە ئەزەلیەت لەناو زەماندا. ئەو چرکەساتەی کە لەهەمانکاتداو لەیەکەی ویستمەندی خوددا رابردوو و ئێستاو ئایندەمی تیا کۆدەبێتەوە.

ئەم لێدوانە کورتەمان لەسەر خودی راستەقینە لە گۆشەنیگای هەریەك لەکیرکەگۆرو هایدیگەرەوە، بۆ جارێکی دی ئەوەمان بیر دەهێنێتەوە کە بوونگەرایی یەك ناوەڕۆکمان

ناداتێ، بەڵكو كۆمەڵێك ناوەڕۆك ئەخاتە بەردەممانو، زیاتریش بایەخ بەو گرژیو هەڵچوونە ئەدات كەبەسەر بڕیارەكانماندا زاڵە، نەك بە ناوەڕۆكی راستەقینەی بڕیارەكانمان ئەمەش جۆرێك لەناكۆتابوون یان ئەزەلیەت (بەمانایەك لەماناكان) لەناو زەماندا دەهێنێتەدی. پێدەچێ كیركەگۆر زۆر لەهایدیگەر نزیكبووبێتەوە لەوەدا كە دەڵێت: "زەمانمەند هەنگاوی كیسەڵێكە لەزەمانو شوێندا، بەڵام هەتاهەتایی ئەو خاڵە چڕەیە كە بەهەڵەداوانەوە بەرەو دیداری مەرگ ئەچێت" .

ئەگەر بكرێ دەستەواژەكەی پۆڵ تیلیش بەكاربهێنین ئەوا دەڵێین كە ئەو "بایەخە رەهایە" یە كە دواجار بایەخە بێشومارە لەیەك نزیكەكانی ژیانی مرۆیی كۆدەكاتەوەو یەكێتیو بەركەماڵی بە بوون ئەبەخشێت. دەشێ ناوەڕۆكی ئەم بایەخە رەهایە لەكەسێكەوە بۆ كەسێكی تر زۆر جیاواز بێت. بەڵام هەندێ هۆ هەن وامان لێدەكەن باوەڕ بهێنین بەوەی هەندێ لەناوەڕۆكە مومكینەكان ئەفەرۆزكراون. لەبەرئەوەی گەر ئەم بایەخانە بە بایەخی رەها لەقەڵەمبدرێن، دەبنە مایەی لێكترازان نەك یەكبوون. ئەمەش راستییەكە بەشاراوەیی دەمێنێتەوە، مادامەكی مرۆڤ بەپلەی یەكەم بوونی تاكەكەس لەبەرچاو دەگرێت. بەڵام ئەگەر رەهەندە كۆمەڵایەتیەكانی بوونی مرۆڤ بە هەند وەربگرین ئەو راستیەمان بۆ روندەبێتەوە. هەر بۆیە پێویستە ئێستا ئاسۆی بەردەممان فراوانتر بكەینو لەچوارچێوەی مێژوو و كۆمەڵگادا لەبوونی مرۆڤ بكۆڵینەوە.

# بەشی دوانزەیەم

## مێژوو و کۆمەڵگا

١.لە بوونی تاکە کەسەوە تامێژووی مرۆڤایەتی
٢.بیروبۆچوونی جیاوازی فەیلەسووفە بوونگەراکان سەبارەت بە مێژوو
٣.فەلسەفەی بوونگەرایی وەك رەخنەیەکی کۆمەڵایەتیو سیاسی

## ١. لەبوونی تاکە کەسەوە تا مێژووی مرۆڤایەتی

تا ئێستا شیکردنەوەکانمان لە بنەڕەتدا سەبارەت بە دیاردەکانی بوونی تاکەکەس بوون‌و، ناتوانین نکوولّی لەوە بکەین کە ڕەوتی سەرەکیی بوونگەرایی — هەر لە کیرکەگۆرەوە کە زۆر بەهای بۆ تاکەکەس دادەنا — لایەنگری تاکەکەس بووە. هەروەها زەحمەتە، گەر نەڵێین مەحاڵیشە، بوونگەرایی لەم لایەنگرییە ڕزگار بکەین، بەبێ ئەوەی نەکەوینە ناو ڕێبازێکی دەستە جەمعی (Collectivism)ەوە کەلەبەهای تاکە کەس کەمدەکاتەوە، بوونگەرایی خۆیشی وەکو نارەزاییەك دژ بەمە هاتە ئاراوەو، ئەم نارەزاییەشی پاساوی خۆی هەیە.

لەگەڵ ئەمەشدا، ئێمە ناو بەناو پێمان لەسەر ئەوە داگرتووە کە هیچ شیکردنەوەیەکی بوونگەرایانەی قەناعەتپێکەر نییە ڕەهەندە کۆمەڵایەتیەکانی بوونی مرۆیی ئەفەرۆز بکات. هەروەکو بینیمان، تەنانەت لای ئەو فەیلەسووفە بوونگەرایانەی کەزۆر تاکگەراش بوون، بابەتگەلێکی وایان وروژاندووە کە دەکرێت پەرەیان پێ بدرێت

بەئاقاری گەیشتن بە تێگەیشتنێکی باشتر بۆ ئەو چوارچێوە کۆمەڵایەتییەی کە مرۆڤەکانی تیایە. بەشێوەیەکی تایبەتیش سەرنجی ئەوەماندا کە هەموو بوونێکی مرۆیی بوونە –لەگەڵ– ئەوانیتردا، جگە لەوەی بوونە –لەناو– جیهانداو لێرەشدا "جیهان" لەچوارچێوەیەکی مرۆییدا سەیر ئەکرێ، بەو پێیەی ئەو شانۆیەیە کە چالاکیەکانی خودی تیا پیشان ئەدرێت (گەر ئەم دەربڕینە رەوابێت).

ئێستا پێویستە لەسەرمان بەشێوەیەکی باشتر پەرە بەو بارەمان بدەین کە سەبارەت بە رەهەندە کۆمەڵایەتیەکانی بوون خستمانە ڕوو. لەم ئاقارەشدا ئەو ڕێگایە ئەگرینەبەر کە زۆر لە فەیلەسووفە بوونگەراکان گرتوویانەتە بەر کاتێك ویستوویانە کاتیگۆرییە تایبەتیەکانو، کاتیگۆریەکانی پەیوەندییە تایبەتەکان تێپەڕێننو بەرەو لێکۆڵینەوەی گروپی فراوانترو تەنانەت لێکۆڵینەوەی رەگەزی مرۆییش بچن لەگشتێکی یەکگرتوودا. بەڵام پرسیارکردن لەوەی کە ئاخۆ دەکرێ گۆشەنیگایەکی بوونگەرایانە خاڵی دەستپێکردنمان بێت بۆ مەسەلەیەکی وەها، بەجۆرێك کەجێی رەزامەندی بێت، پرسیاریسێکە بۆ کاتێکی تری هەڵدەگرین.

پێشتر بۆمان روونبۆوە کە زەمانمەندیی ریشەیی یەکێکە لە گرنگترین خاسیەتە بنەڕەتیەکانی بوونی تاکەکەس، مرۆڤ بوونەوەرێکی زەمانمەندە، پڕ بە پێستی ئەم وشەیە.

دەتوانین ئەم تێگەیشتنە بۆ بوونی مرۆڤ فراوانتر بکەینەوەو بەسەر مۆرکی مێژوویی ریشەیی مرۆڤیشدا بیچەسپێنینو بڵێین کە مرۆڤ بوونەوەرێکی مێژووییە، پڕ بەپێستی ئەم وشەیە. کاتێکیش دەربارەی "مێژوو" ئەدوێین لەبری "زەمانمەندی"، ئەوا سەرنجمان بۆ رەوتێکی فراوانتر لە زەمان دەچێت کەهەموو خەڵکی ئەگرێتەوە.

کۆمەڵێك بیرمەند کە ناتوانین بە بوونگەرا ناویان بەرین، لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا جەختیان لەسەر مۆرکی مێژوویی ریشەیی ژیانو هزری مرۆڤ یان با بڵێین بوونی مرۆڤ کردۆتەوە. لە بەناوبانگترینیشیان ڤیلهێلم دیلتا (١٨٣٣ – ١٩١١) کە

هێنـدەی پەیوەنـدیی بـە مێـژووەوە هـەبێت، کاریگەرییـەکی گـەورەی لەسـەر بـیری بوونگەرایانەی هاوچەرخ هەبووە.

"دیلتـای" بـڕوای وابـوو کـە مێـژوو دیاردەیـەکی مرۆییـەو، هـەر لەبـەر ئەمـەش لێکۆڵینـەوەی مێـژوو بەزانـستێکی مرۆیـی لەقەڵـەم ئـەدرێ. کـاتێکیش دەڵێـت مێـژوو دیاردەیەکی مرۆییە، بەمە ئاماژە بۆ جیاوازیی نێوان ئەوە دەکـات کـە بەڕاسـتی شـایانی ئەمەیە پێی بوترێ "مێژوو" و نێوان "رەوت" یـان رووداوی پـەتی، لەبەرئـەوەی رەوتو رووداو دوو رووداوی سروشتینو دەتوانین لە چوارچێوەی هۆکارێتیی سروشتیدا سەیریان بکەین، بەڵام رووداوە مێژووییەکان شتێکی جیاوازن: چونکە بەرەنجامی کارایی مـرۆیین. دەشێ ئەم کاراییەش خولیاو خۆزگە بێت، یان دوژمنایەتی، یا برسـێتی، یـا تـرسو یـان بڕیاری بەئەنقەستو شتی تری لەم بابەتە.

بێگومان دەشێ هەنـدێ جـار رووداوی سروشـتیش بێتـە نـاو رەوتـی مێـژووەوە، بـۆ نموونە دەشێ زریانو تۆفـانێکی کتـوپڕ هێنـدەی لێهـاتوویی دەریاوانـەکانو ئازایـەتییان کاریگەریی لەسەر ئەنجامی شەڕێکی دەریایی هەبێت، بەڵام رووداوێکـی لـەمجۆرە نابێـت بەرووداوێکی مێژوویی تەنها لەبـەر ئـەوە نـەبێت کـە تێکـەڵ بـە رووداوی تـر دەبێـت کـە زادەی کارایی مرۆیین.

لێرەدا سەرنجی خەسڵەتی ئاوێتـەیی مێـژوو ئـەدەین، کـە لەسـەرێکەوە ئافەریـدەی دەسـتی مرۆڤـەو لـە ئـازادیو بڕیاردانـەوە سەرچـاوە ئـەگرێت، لەسـەرێکی تریـشەوە بەرەنجامی کۆمەڵێك بارودۆخی دەوروبەرە کـە ئـەو هەڵوێـستە واقیعیانـە دەڕەخسێنێت کە پێویستە بڕیارە مرۆییەکانی تیا بدرێت. دەشتوانین بەشـێوەیەکی تـر گوزارشـت لـەم بیرۆکەیـە بکـەینو بڵـێین: رەوتـی درێـژی پەرەسـەندنی گـەردوونیو بـایۆلۆجی پێکـەوە رەوتێکـی سروشـتی بـوو کـە دەکـرێ لـە چوارچـێوەی یاسـاکانی سروشـتدا یـان ئـەو رێـسایانەدا لێکیبدەینــەوە کـە زانـستە سروشـتیەکان دەیاندۆزنــەوە. بـەڵام لەگـەڵ پەیدابوونی مرۆڤدا فاکتەرێکی نـوێ هاتـە ئـاراوە کـە فاکتـەری مێژووییـەو، لەسـای ئـەم

فاکتەرەدا وای لێهات ژیانی ناوەوەی مرۆڤ لە کردارەکانیدا گوزارشت لە خۆی بکاتو رۆڵی لە فۆرمولەکردنی جیهاندا هەبێت. بەڵام سەرباری پتر مرۆڤزدەبوون Hominization ی جیهان، گواستنی تەواوەتی لە "سروشتی"یەوە بۆ "مێژوویی" رووی نەدا، بەبڕوای زۆرم، هەرگیز ئەمەش روونادات. لەبەرئەوەی هەرچۆن ئازادی، لەسەر ئاستی بوونی تاکەکەس، لە دەرکەوتە جیاجیاکانیدا کۆتادارە، بە هەمانشێوە لەسەر ئاستی کۆمەڵگاو میللەتان، ئەو سیاسەتانەی بەگوێرەی بڕیاری مرۆڤ دادەڕێژرێن، ئەبێ بەپێی هەندی رووداو بگونجێنرێن کە مرۆڤ دەسەڵاتی بەسەریاندا نییە (هەندێ جار کار ئەگاتە ئەوەی پێکدادانێك لەنێوان ئەم رووداوانەو ئەو سیاسەتانەدا روو ئەدات). وێڕای ئەوەی کە زاڵبوونی ئادەمیزاد بەسەر سروشتدا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن زیادی کردووە، بەڵام هەرگیز ناتوانێت بەشێوەیەکی رەها بە سەریدا زاڵبێت.

جا لەبەر ئەوەی کە پێویستە جیاکاری لە نێوان دیاردەکانی مێژوو و رووداوەکانی سروشتو پرۆسەکانیدا بکەین، دیارە شتێکی ئاشکرایە کە دەبێ میتۆدی لێکۆڵینەوەشیان جیاواز بێت. ئەوەتانێ دیلتای Dilthey پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە لێکۆڵینەوەی مێژوو بخرێتە خانەی ئەوەی کە ناوی دەنێت لێکۆڵینەوە مرۆڤگەرا (ئینسانی)یەکان. لە راستیدا کۆمەڵێك هەوڵ ئەدران بۆ سەپاندنی هەندێك میتۆد بەسەر زانستە مرۆییەکاندا، کە بە تەنها لەگەڵ زانستە سروشتییەکاندا دەگونجان بەڵام ئەو جۆرە سەرنجدانە دەرەکییەی کە لەگەڵ زانستە سروشتیەکاندا دەگونجێت، پێویستە جۆرێك لە مەعریفە بە بەشداریکردن لەحاڵەتسی زانستە مرۆییەکان جێی بگرێتەوە. خۆ ئەگەر "مرۆڤایەتی هەر بەتەنها لەڕێی پەیبردنی حیسسیو زانینی حیسیسیەوە مەیسەر بووایە، ئەوا وەك رووداوێکی فیزیکی دەبوو بەلامانەوەو، لەم حاڵەتەشدا هەر بەتەنها زانینی زانستیانەی سروشتیی بۆ دەبوو. بەڵام مرۆڤایەتی نابێتە بابەتێك بۆ لێکۆڵینەوە مرۆییەکان ئەوکات نەبێت کە بە هوشیارییەوە حاڵەتە مرۆییەکان بژینو بەدەستەواژەی زیندوو گوزارشتیان لێ بکەینو ئەم دەستەواژانەش قابیلی تێگەیشتن بن" . دەشزانین

كه ئه‌م جۆره مه‌عریفه‌یه به به‌شداریكردنه ئه‌و تایبه نموونه‌ییه‌یه كه بوونگه‌رایی جه‌ختی له‌سه‌ر كردووه. له به‌شێكی پێشوودا له‌مه دواین‌و له‌ڕاستیدا ئه‌توانین بڵێین به‌كورتی تیۆره‌كه‌ی دیلتای ئه‌وه‌یه كه پێویسته به‌شێوازێكی بوونگه‌رایانه له مێژوو بكۆڵینه‌وه، گه‌رچی ئێمه لێره‌دا زاراوه‌یه‌ك به‌كارده‌هێنین كه ناچێته ناو زاراوه‌كانی "دیلتای"ه‌وه.

هه‌ر لێره‌شه‌وه كه به‌ڕێكه‌وت نییه "هایدیگه‌ر" له یه‌كێك له لێدوانه سه‌ره‌كیه‌كانیدا سه‌باره‌ت به مێژوو، به‌ڕاشكاوی رایده‌گه‌یه‌نێت كه قه‌رزاری "دیلتای"ه .

سه‌ر به ته‌نها دیلتای نییه كه په‌ره‌ی به بیروبۆچوونه‌كانی خۆی سه‌باره‌ت به‌مێژوو داوه‌و، سیفه‌تی بوونگه‌رایانه‌یان به‌خۆوه گرتووه، به‌ڵكو هه‌ندێ نووسه‌ری تریش هه‌ن كه به ڕاشكاوی له‌ده‌ره‌وه‌ی كه‌لتووری بوونگه‌راییشن ده‌شتوانین له‌نێو ئه‌م نووسه‌رانه‌دا ناوی ئێرنست ترۆلچ (١٨٦٥ — ١٩٢٣) بهێنین كه بیروبۆچوونه‌كانی زۆر له بیروبۆچوونه‌كانی "دیلتای"ه‌وه نزیكن. هه‌روه‌ها بینیدێتۆ كرۆچه (١٨٦٦ — ١٩٥٣) كه جۆرێك له ئایدیالیزمی مێژوویی دامه‌زراندو له ئیتاڵیادا گه‌شه‌ی سه‌ند. هه‌روه‌ها فه‌یله‌سووفی ئینگلیز ر.گ. كۆلینگوود (١٨٨٩ — ١٩٤٣)ی ئایدیالیست كه له‌هه‌ندێك سه‌رچاوه‌ی ئه‌ڵمانی‌و ئیتاڵییه‌وه سوودی وه‌رگرتو كتێبی "چه‌مكی مێژوو"شی (١٩٤٦) كه دوای مه‌رگی بڵاوكرایه‌وه، تا ئێستاش كاریگه‌ریی خۆی هه‌یه. كاتێكیش ده‌بینین كه ده‌شێ هه‌ندێك بیروبۆچوونی هاوچه‌شن سه‌باره‌ت به مێژوو لای هه‌ندێك فه‌یله‌سووفی ته‌واو له‌یه‌ك جیا هه‌ن، ئه‌م راستییه به‌ئاگامان ده‌هێنێته‌وه كه نابێ سیفه‌تی "بوونگه‌را" به مانا به‌رته‌سكه‌كه‌ی ئه‌م وشه‌یه، بده‌ینه‌پاڵ ئه‌م فه‌یله‌سووفانه، به‌ڵكو ئه‌وه وریاكردنه‌وه‌یه دژ به به‌كارهێنانی دۆگماییانه‌ی وه‌سفه‌كان له لێدوانه‌دا له‌سه‌ر بیروبۆچوونه فه‌لسه‌فیه‌كان.

ئه‌م داننانه‌مان به‌مۆركی مێژوویی ریشه‌یی بوونی مرۆییدا، ئه‌نجامێكی تریشی لێده‌كه‌وێته‌وه، ئه‌ویش ئه‌وه‌یه كه پێویسته دان به‌وه‌دا بنێین كه فه‌لسه‌فه خۆیشی له‌ناو مێژوودا رووئه‌دات، هه‌ر بۆیه بیروڕا فه‌لسه‌فیه‌كانیش به دۆخه مێژووییه‌كانه‌وه

بەستراونەتەوە، ئەمەش واتە رەتکردنەوەی بیرۆکەی حەقیقەتی هەتا هەتایی یان (نا–زەمانی)، هەرچۆن واتە رەتکردنەوەی هەر رێبازێکی فەلسەفیی گشتگیر کە لافی ئەوە لێدەدات گوزارشت لەو حەقیقەتە ئەکات، بەڵام هەندێك نووسەری مێژووگەرا دەبینینەوە کە زیادەڕەوییان ئەگاتە رادەیەك تەنانەت ماتماتیكو زانستەکانیش بەقۆناغی مێژوویی‌و کەلتووری دیاریکراوەوە دەبەستنەوە. بەڵام ئاخۆ دەکرێت ئەم لافە لێ بدەین؟ ئەمە جێی گومانە، بەڵام میتافیزیکا، تەنانەت گەر میتافیزیکایەکی بوونگەرایانەش بێت، چوارچێوەیەکی مێژوویی بەشەکیی دیاریکراودا وەسفی شێوەی واقیع دەکات، بەڵام ئەم تێگەیشتنە لە رێژەییبوونی فەلسەفەکان تەواو لەگەڵ تیۆرەی بوونگەرایی سەبارەت بە حەقیقەتو، هەروەها لەگەڵ کۆتابوونی بوونی مرۆیی‌و واقعیبوونیدا یەکدەگرێتەوە، لەبەرئەوەی تەنانەت رەخنەی هوشیارانەش لە گۆشەنیگا مێژووییەکانو پێشگریمانە ژیارییەکان هەرگیز ناگاتە ئەو پلەیە لە بابەتیبوون (واتە مەوزوعیەت)و گشتێتی، کەوامان لێ بکەن لەڕوانگەیەکی ئەزەلییەوە شتەکان ببینین.

لەم بەشە بەراییە کورتەدا ئەو چوارچێوەیەم دەسنیشان کرد کە تیایدا گفتوگۆی بوونگەرایانە سەبارەت بەمێژوو دەکرێت. بەڵام ئاشکرایە کە جیاوازیی گەورە لە بیروبۆچوونەکاندا دەبینینەوە. لێرەشدا وەك چۆن لەهەموو بوارەکانی تریشدا دەبینین بوونگەرایی دەبێتە دیاردەیەکی فرە لقی‌و پۆپ. لەم بەشەی داهاتوودا لەهەندێك نموونەی زیندووی بیروبۆچوونی بوونگەرایانە دەربارەی مێژوو دەکۆڵینەوە.

## ٢.بیروبۆچوونی جیاوازی فەیلەسووفە بوونگەراکان سەبارەت بەمێژوو

کیرکەگۆر شتی زۆری لەبارەی مێژووەوە نەنووسیوەو لەڕاستیدا ئەو پتر لە جارێكو بەڕوونی ئاماژەی بەوە داوە کە ئەوەی جێی بایەخی ئەوە تاکە کەسە نەك مێژووی مرۆڤایەتی‌و، رزگاربوون لەتاکە کەسدایە نەك لە مێژوودا. ئەم وابەستەبوونەشی بە رێبازی تاکگەراییەوە بەتەواوەتی لە گەشەسەندنی دواتری بوونگەراییدا رەنگیداوەتەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا لانی کەم دوو بیرۆکە هەن لای کیرکەگۆر کە بەشێوەیەکی تر لە هزری بوونگەرایانەی دوای خۆیدا سەبارەت بەمێژوو، دووبارە دەبنەوە.

بیرۆکەی یەکەمیان ئەوەیە کە دەڵێت: مێژوو بەئاقارێك دەڕوات کەتیایدا هەرچی شتی گەورەو تایبەتمەندە وردو بێ شوێنەوار دەبێت. "مێژوو رەوتێکە کە هیچ ئیزافە نابێتە سەری، بەتەنها لە هەندێك حاڵەتی زۆر دەگمەندا نەبێت، کە دڵۆپێکی بچووك لە هزری بۆ ئیزافە دەبێت. ئەم رەوتەش بریتیە لە گۆڕینی ئەم بیرۆکەیە بۆ هەڵەوەڕی، هەندێك جار ئەم گۆڕانەش پێویستی بەچەندەها سەدەو ملیۆنەها کەڕەت ملیۆن مرۆڤ هەیە. (هەموو ئەمەش بەبیانووی بەرکەماڵکردنی ئەو بیرۆکەیە ئەکرێت کە ئیزافە ئەکرێت) ، ئەم چەمکە بۆ مێژوو کە تەواو جیاوازە لەو چەمکەی لە سەدەی نۆزدەدا باوبوو، دەکرێت لە سەرێکەوە وەکو کاردانەوەیەکی توند سەیری بکەین دژ بەچەمکی هیگل بۆ مێژوو، کەوا لە مێژوو دەڕوانێت دەوڵەمەندکردنو باڵابوونی بەردەوامی رۆحە هەروەها لەسەرێکی تریشەوە دەتوانین بە بەستنەوەو بە تێگەیشتنی کیرکەگۆر بۆ مەسیحیەت سەیری بکەین. رووداوی گەورە لەمێژوودا لای کیرکەگۆر بەزەیی خودایە بۆ مرۆڤ کە لە ناردنی مەسیحدا بەرجەستە دەبێت. بەواتایەکی تر، ئەمە هەموو ئەو شتەیە کە پێویستە مرۆڤ سەبارەت بەمێژوو بیزانێت، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەمە مێژوویەك نییە کە تێپەڕبێت، بەڵکو راستییەکی هاوچەرخە. کیرکەگۆر لە بڕگەیەکی بەناوبانگدا دەڵێت: ئەو قوتابیانەی مەسیح کە لەسەردەمی ئودا ژیاونو دەرفەتی ئەوەیان بۆ رەخساوە کە وردودرشتی ژیانی ئەو بزانن، هیچیان زیاتر نییە لەو قوتابیانەی تر لە نۆزدە سەدەی دواتردا هاتوون، گەر نەوەی هاوچەرخ جگە لەم وشانە هیچی تری دوای خۆی جێنەهێشتایە: "ئێمە بڕوامان وایە کە لەفلانو فیسار ساڵدا خودا لەشێوەی خزمەتکارێکی خاکیدا پەیدا بوو و لەناوماندا ژیاو خەڵکی فێرکردو دواجاریش مرد" هەرئەوەندە بەس دەبوو.

لەسـەدەكانی دوای ئـەو رووداوەدا چارەنووسـی مەسـيحيەت گـۆڕا بـۆ مێـژوو، هـەر ئەمەش گۆڕان بوو لەمەسيحيەت "Christianity" وە بـۆ جيهـانی مەسـيحی Christen dom لە حەقيقەتی بوونگەرايانەی رزگاركەرەوە بۆ ديـاردەی مێـژوويی دەسـتە جـەمعی، كە تيايدا حەقيقەتی رزگاركەر هێزی خۆی لە دەست داوە.

"خودا لەڕێی كەسـێتيی مەسـيحەوە ويـستی پەيوەنديیـەك لەگـەڵ رەگـەزی مرۆڤـدا سازبكات. بەڵام ئايا رەگەزی مرۆڤ چيی كرد؟ لە بـری ئـەوەی پەيوەنـدی لەگـەڵ خـوادا سازبكات، ئەوەی گۆڕی بە مێژوويەك كـە ئـەوە پيـشان ئـەدات چـۆن خـودا لـە شـێوەی مەسيحدا پەيوەنديی لەگەڵ پێغەمبەرەكان سازكردووە، يان مێژوويەك كـە ئـەوە پيـشان ئـەدات چـۆن خـودا لەشـێوەی مەسـيحدا پەيوەنـديی لەگـەڵ ئـادەميزاددا سـازكردووە. بەكورتی لەبری ئەوەی خەڵكی بچنە ناو پەيوەندييەكـەوە لەگـەڵ خـوادا، ئـەوەيان كـرد بەمەسەلەيەكی مێژوويیو لە شێوازێكی سووكو ئاساندا، نەوە بە نەوە ئەوەيان دووپـات كردەوە. ئەو فاكتەرە شێوێنەرەشـی وای كـرد كـە "جيهـانی مەسـيحی" دروسـت ببێـت ئەوە بوو كە هەر نەوەيەك لە ڕەوتی زەماندا، لەبری ئەوەی كە بە "پەيمانی نوێ" (واتە ئينجيـل–و–) دەسـتپێبكات، بـەو "ئيمانـەی كـە بـاوو باپيرانمـان هـەيانبووە" دەسـتی پێكـردووەو خـۆی بـە ئيمـانی باوانـدا هەڵواسـيوە. ئـەم هەڵخەڵەتاندنـەش كـە مێـژوو و رەگەزی مرۆڤ ئەخاتە روو لەبری ئايدياليتی Idealit و لەبری تاكـە كـەس كـە كـاتيگۆريی مەسيحيەتە، بەردەوام دەبێت" .

ئەم زمانە زمانێكی بەهێزە، لەگەڵ ئەوەشدا پێويستە قسە لەسەر بيرۆكەيەكی تريش بكـەين، كـە بـەجۆرێك لـەجۆرەكان رێنوێنيیـەكانی كيركـەگۆر راسـتدەكاتەوە، ئـەويش بيرۆكـــەی گرنگـــی دووپاتبوونەوەيـــە. دووپاتبوونـــەوەی رەســـەن هەيـــەو هـــەروەها دووپاتبوونەوەی خاڵی لەبيركردنەوە كە "لەوێنەيەكی سووكو ئاساندا، لەنەوەيەكەوە بۆ نەوەيەكی دی نەقڵ دەبێت" هەروەكو لەو برگەيەی پێشوودا ئاماژەمان پێداوە. گەرچـی كيركـەگۆر چـەمكەكانی پێـشكەوتنو بەركـەماڵبوون رەتدەكاتـەوە، بـەڵام شـێوەيەكی

دووپاتبوونـەوە هەیـە کـە مـژدەی بەرکـەماڵبوون لـە مەسـیحدا ئـەدات. ئەشـتوانین ئـەم دووپاتبوونەوەیـە بـەو وەبیرهاتنەوەیـە بـشوبهێنین کـە لای یۆنانیـەکان هـەبووە، بـەڵام بەجیاوازییەکەوە: "دووپاتبوونەوەو وەبیرهاتنەوە یەك جووڵەن بـەڵام بـە دوو ئاراسـتەی پێـــچەوانەدا، ئـــەوەی وەبیرماندێتـــەوە بـــۆ دواوە دووپاتدەبێتـــەوە، لـــە کاتێکـــدا دووپاتبوونەوە، بەمانای راسـتەقینەی، وەبیرهێنانەوەیەکـە بـە ئاراسـتەی پێشەوە" .

دیارە کە ئەم دەستەواژەیە زۆر ئاڵۆزە، بەڵام وێدەچێ گوزارشت لەو بیرۆکەیە بکـات کـە حاڵەتێکی رەسەنی بوون هەیە دووپات دەبێتەوە، بەو مانایەی کە لەرێی ئەو ئیمانـەوەی لـە چرکەسـاتی بڕیـاردا هەیـە وەبـیر دەهێنرێتـەوە. بـۆ ئەمـەش نموونـەی "ئیـبراهیم"و "ئـەیوب" دەهێنێتـەوە کـە دووکـەس بـوون توانییـان ئـەم جـۆرە دووپاتبوونـەوەەو وەبیرهێنانەوەیـە بـەدیبهێنن. جـارێکی دی سـەرنج ئـەدەین کـە کیرکـەگۆر لەتاکەکـەس ئـەدوێتو، مێـژووش ئـەو شـێوازەیە کـە تیایـدا تـەژیبوون (امـتلاء)ی بنـەرەتی بـوون لەسەرەتادا ون دەبێت، تا لەکۆتاییدا لەرێی دووپاتبوونەوەوە دەهێنرێتـەوە ئـارا. بـەڵام گەرچی کیرکەگۆر لـەرووی پەیوەنـدیی بەتاکەکەسـەوە دەروانێتـە دووپاتبوونـەوە، لـەم لێدوانەمانـدا بـۆ مێـژوو لەبـەر دوو هـۆ قسەمان لەسـەر چـەمکی دووپاتبوونـەوە کـرد: یەکەمیان گرنگیی بیرۆکەی دووپاتبوونەوەیە (گەرچـی لـە زۆربـەی کاتـدا تێگەیـشتنێکی جیاوازی بۆ هەیە) لای فەیلەسووفە بوونگەراکانی دواتـر، بەتایبـەتیش نیـچەو هایدیگـەر. هۆی دووەمیش لێکچوونی نێوان بیرۆکەکـەی کیرکـەگۆرو بیرۆکـەی دووپاتبوونەوەیـە لـە هزری مەسیحیی سەرەتادا، کە دەلالەتێکی مێژوویی گشتگیری هەبوو.

وەکــو بەرجەســتەکردنێکی بیرۆکـــەی خـــودایی تێیگەیـــشتبوون، بـــەو پێیـــەی دووپاتبوونـەوەو پوختکردنەوەیـەکی رۆڵـی وشـەیە لـە پرۆسـەی خـەلق (خولقانـدن)دا، هەرچۆن بڕوایـان وابـوو کـە لـە کۆتـایی هـەموو شـتەکاندا سـەرلەنوێ تـەژیبوونی بـوون لەخوادا دووپاتدەبێتەوە، بەتایبەتیش سانت ئیرینایۆس پەرەی بەو بیرۆکەیە دا کە باس

لە پەرەسەندنی پلـە بـە پلـەی مێـژوویی گـەردوونی دەکـات، کـە کیرکـەگۆر بەتـەنها لـە چوارچێوەی ئەزموونی تاکە کەسیدا قەتیسی کرد.

کاتێ لە کیرکەگۆرەوە ئەچینە لای نیچە، بەرەو ڕووی کۆمەڵێك بیروڕای تەواو جیاواز ئەبینەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێکچوونی گرنگ هەیە لەنێوانیاندا، نیچەش وایدەبینێت کە مێژوو بریتییە لە بەسەرهاتی داڕمانی شـتە گـەورەکانو کـەوتنی لەشـتی هیـچدا، کـە دواجار کەوتنێکی لـەناو هیـچگەرایی (نیهلیـزم)دا. بەبۆچـوونی ئـەو مەسـیحیەت ڕۆڵێکـی سـەرەکیی لـە بەدەرخـستنی لاوازیـی مرۆڤایەتیـدا بینیـوە. بـەڵام لەسـەرێکی تریـشەوە تیۆرەی پەرەسەندنی کاریگەرییەکی زۆری کردۆتە سەر هزری نیچە. ئەو وایدەبینێت کـە لــەودیو رووکەشــی کۆمــەڵگاو شــتە پــڕو پووچــەکانیەوە بگــرە تەنانــەت لــەودیو هیچگەراییشەوە توانای بوون بە باڵامرۆ و ئەگەری تایپێکی باڵای بوون هەیە.

لە وتارە بەناوبانگەکەی نیچەدا "سوودو زیانی مێـژوو" . لێـدوانێکی سـەرنجڕاکێش هەیـە سـەبارەت بەمێـژوو، لـەو برگەیـەدا کـە لـە "گۆتـە"ی وەرگرتـووەو سـەرەتای بابەتەکەی دەستپێدەکات، گوزارشت لە تێڕوانینێکی بوونگەرایانـەی ئاشـکرا دەکـات بـۆ مێژوو کە دەڵێت: "من رقم لەهەموو ئەو شتانە دەبێتەوە کە بەتەنها فێرم دەکەن، بـەبێ ئەوەی چالاکیم زیاد بکـەن، یـان بـەبێ ئـەوەی راسـتەوخۆ تـینو تـاوێکی تـر بەچـالاکیم بدەن". ئێمە بۆ ئەوە لە مێژوو ناکۆڵینەوە تـا زانیـاریی گرنگمـان سـەبارەت بـە رابـردوو دەسـتبکەوێت، بـەڵکو بۆیـە لـە مێـژوو دەکۆڵینـەوە لەبەرئـەوەی "بـۆ ژیـانو کردارمـان پێویستمانە".

پاشان نیچە سـێ رێگـا دەستنیـشان دەکـات کـە بەهۆیانـەوە بەمێـژووەوە وابەسـتە ئەبین:

رێگای یادگارە گەورەکان، رێگای ئاسەواردۆستیو پاشانیش رێگای رەخنەگرانە.

لە حاڵەتی تێگەیشتنماندا بۆ مێژوو لەرێی یادگارە گەورەکانـەوە، پەیوەنـدیی نێـوان ژیانو کردار روونتر دەبینین. هەندێك چرکەساتی گەورە هەبوون لە مێژوودا، ئەو سـاتانە

بوون كە هەروەكو نیچە دەڵێت: مرۆڤ تیایاندا وێناكردنی فراوان بووە، تێڕوانینێكی نوی بۆ توانستە مرۆییەكان هاتۆتە ئاراوە.

لەبەرئەوە چركەساتی یادگارە گەورەكان بریتییە لە چركەساتە دانسقەو كلاسیكو مەزنەكانو ئەو چركەساتانەن كە ئاستی مامناوەندی تێدەپەڕێنن. خەڵكیش كە لەم چركەساتە دانسقانەی مێژوو رادەمێنن، بۆ ئەوە نییە تەنها بەڕابردوو سەرسام بن، بەڵكو لەبەرئەوەی ئەم جۆرە زانینە ئازایەتیو رۆشنایی بە ئێستا ئەبەخشن "زانینە بەوەی كە شتی مەزن هەبووە، كەواتە شتێكی مومكینە، كەواتە دەشێ جارێكی تریش هەبێت...." .

بەڵام رێگای ئاسەواردۆستی لە تێگەیشتنی مێژوودا گوزارشتە لە هەڵوێستی ئەو كەسەی رێز لەرابردوو دەگرێتو بەدڵنیاییەوە جۆرێك لە سەقامگیریی تیا ئەبینێتەوە، بەڵام خاڵی مەترسیدار لێرەدا ئەوەیە كە هەموو كۆنێك بەپیرۆز رابگرین تەنها لەبەر ئەوەی كۆنە. لە رێگای ئاسەوار دۆستیدا نەتێڕوانینو نە بایەخێك هەیە بە ئەگەرەكانی ئێستا، كە لە رێگای یادگاری گەورەكاندا ئەمەمان بینییەوە. ئەم رێگایە لە باشترین حاڵەتیدا "تێگەیشتنە لەوەی چۆن ژیان بپارێزین، نەك لەوەی چۆن بیخوڵقێنین". لە خراپترین حاڵەتیشدا بریتییە: لەو دیمەنە ناشرینەی كە دەبینین كۆمەڵێك شێت تەپوتۆز لەتەپۆڵكەی رابردوو ئەتەكێنن" .

بەڵام رێگای رەخنەگرانەی روانینە مێژوو بۆ راستكردنەوەی هەریەك لە رێگای یادگاری گەورەكانو رێگای ئاسەوار دۆستی شیاوە ."ئەبێ مرۆڤ توانایەكی وای هەبێت كە سنوورێك بۆ رابردوو دابنێت ... پێویستە رابردوو دادگایی بكات، بێبەزەییانە پرسیاری لێ بكاتو دواجاریش تاوانباری بكات" .

نیچە هیچ یەكێك لەم سێ رێگایەی بۆ مێژوو نەگرتە بەر، لەبەرئەوەی دەكرێت هەرسێكیان پێكەوە سوودیان لێ وەربگیردرێت. ئەگەر هەر كامێكیان بەجیا لەوانی تر بگرین، دەشێت لە بەهای كەم بكەینەوە. بەڵام مەسەلەكە لایەنێكی تریشی هەیە، ئەگەر

رابردوو بتوانێت ئێستا رۆشن بکاتەوە، ئەوەش راستە کە ئێستاش لەتوانیدایە رابردوو رۆشن بکاتەوە "تۆ بەتەنها لەرێی ئەو شتەوە کە لە ئێستادا بالآترینە، دەتوانیت رابردوو رۆشن بکەیتەوە". ئەو مرۆڤەی کە لە خودی خۆیدا گەورەیە دەتوانێت بچێتە ناو رووداوە گەورەکانی رابردووەوە. بەلأم ئێمە لێرەدا دیسانەوە دەچینەوە سەر رەخنەی نیچە لە کۆمەلگاکەی. ئەوەی راستە کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا زانیارییەکی وەها زۆر کۆکرایەوە کە پێشتر شتی وا رووی نەدابوو، بەلأم چونکە رۆحی ئەو سەدەیە رۆحێك بوو زسیاتر ئاسایی بوو ئەمە بووە کۆسپ لەرێی تێگەیشتنێکی راستەقینەی رەسەندا بۆ مێژوو. هەر بۆیە نیچە لەگەڵ کیرکەگۆردا هاورِا بوو کە دەیوت تاکەکەسی بەهرەمەند ئەو کەسەیە کە "بەشێوازی گەرانەوە بۆ دواوە بیر لە خۆی بکاتەوە" تا بە دوای پێداویستییە راستەقینەکانی خۆیدا بگەرێت.

بیرۆکەی "بیرکردنەوەی مرۆڤ لەخۆی بەشێوازی گەرانەوە بۆ دواوە" لە بیرۆکەی "دووپاتبوونەوە" ئەچێت، بەلأم دواجار چەمکی دووپاتبوونەوە لای نیچە تەواو جیاوازە، دەبێت بەچەمکی "گەرانەوەی هەتا هەتایی"، لە کۆتاییشدا دەبینین کە تێگەیشتن لە مێژوو واتە خۆ رزگارکردن لەهەموو خەیالآتە دڵخۆشکەرەکانو، بزانین کە ئەوەی روویداوە جارێکی تریش روو دەداتەوەو، ئەوەی دەشبێت پێشتر بووە. نیچە مێژوو بەکاتژمێرێکی لمین دەشوبهێنێت کە لمەکەی ناوی لە لایەکیەوە دەچێت بۆ لاکەی تری، پاشان کاتژمێرەکە هەڵوگێرِ دەبێتو لمەکە وەکو خۆی لێ دێتەوە، ملی شووشەکەش کە ئەکەوێتە نێوان هەردوو لاکەوە بریتییە لە "چرکەسات".

هەروەها چرکەسات لەو دەروازەیە دەچێت کە راڕەوێکی درێژ پیا تێدەپەرێت کە باریکە رێیەکیان بۆ دواوە دەچێتو ئەوی تریشیان بۆ پێشوە.

"ئەی ئێمە هەمووومان پێشتر لێرە نەبووین؟ ئەی دیسانەوە، ناگەرێینەوە تا بەو باریکە رێیەی تردا بێینەوە، ئەو باریکە رێیە ترسناکو درێژە، ئەی ئێمە گەرانەوەیەکی هەتا هەتایی ناگەرێینەوە؟" .

چۆن ئەم تیۆرەی "گەڕانەوەی هەتا هەتایی"ە بەڕاست وەربگرین؟ ئایا بەڕاستی ئەمە بەشێکە لە تێگەیشتنی بوونگەرایانە لە مێژوو، یان ئەمە میتافیزیکای مێژووە؟ راستە نیچە هەوڵیداوە هەندێك سەرنجی زانستی سەبارەت بە تیۆرەکەی بخاتەڕوو — تا ئێستاش لەنێو کۆسمۆلۆجییە زانستیەکاندا لایەنگری تیۆرەی گەردوونی لەنگیو هەیە — بەڵام رەگوڕیشەی تیۆرەکەی نیچە لە بنەڕەتدا، رەگو ریشەیەکی بوونگەرایانەیە. دەتوانین وا لەهێمای گەڕانەوەی هەتا هەتایی بگەین کە گوزارشتە لە کۆتابوونی بوونی مرۆڤ. خواوەند مردووەو، مرۆڤ جێی گرتۆتەوە، بەڵام سەرباری بەڵێندان بە باڵامرۆ، ناتوانین لە دەست جێگۆڕکێی بێپایانی کۆتادار هەڵێین. "هەموو دەڕۆن، هەمووش دەگەڕێنەوە چەرخی بوونیش تا ئەبەد دەسوورێتەوە، هەموو شتێك دەمرێو هەموو شتێکیش دەگەڕێتەوەو دەگەشێتەوەو، نەریتی بوونیش تا ئەبەد بەردەوام دەبێت، هەموو شتێك تێکدەشکێتو پاشان دەگەڕێتەوەو پارچەکانی پێکەوە دەلکێنەوە، تانوپۆی بوون خۆیشی تا ئەبەد خودی خۆی بینا دەکات، هەموو شتەکان لێك جودا دەبنەوە، پاشان هەموویان کۆدەبنەوەو، ئەڵقەی بوون تا ئەبەد لەگەڵ خۆیدا ئەمەکدار دەبێتو تەوەرەکە لە هەموو شوێنێك دەبێت" . کاتێکیش لە تێگەیشتنی نیچەدا بۆ مێژوو، ئازادیو سەربەخۆییو ئومێد سەرهەڵئەدەن، دواجار هەموو ئەمانە ئەچنە ژێر رکێفی تراجیدیاو خۆشەویستیی چارەنووس "**Amor – Fati**"ەوە.

لە لێدوانی "هایدیگەر"یشدا لەسەر مێژوو رووبەرووی هەندێك بابەت ئەبینەوە کەپێشتر لە لێدوانماندا لەسەر کیرکەگۆرو نیچە رووبەڕوویان بووینەتەوە.

بەڵام ئەم بابەتانە لای ئەم شێوەی جیاوازی بەخۆیەوە دەگرێت. هایدیگەر دوای ئەوەی لەو مانا جیاوازانە ئەکۆڵێتەوە کە دراونەتە پاڵ وشەی "مێژوو"، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بوونەوەری مرۆیی (یان دازاین خۆی بابەتی مێژووە) لەزەمانمەندی کەمێژوویەکی سەرەکییەو هەروەها لە جیهان کە مێژوویەکی لاوەکییە، پێکدێت، لەبەرئەوەی جیهان بەردەوام رەهەندێکی بوونگەرایانەی هەیە.

"لەگەڵ سەرهەڵدانی بوونی مێژوویی لە جیهاندا، ئەوەی ئامادەبووەو ئەوەی لەبەر دەستدا بووە لە هەموو حاڵەتێکدا، ئاوێتەی مێژووی جیهان بووە" . تەنانەت سروشتیش بەڕادەیەك ئاوێتەی مێژوو بووە کەبووە بە شانۆیەك بۆ کردارەکانی مرۆڤ (دازاین)، بەو پێیەی مەیدانی نەبەردو شوێنی پەرستن‌و شتی تری لەو بابەتانەی بووە.

مادامەکی مرۆڤیش بەر لە هەموو شتێك بوونەوەرێکی مێژووییە، کەواتە لەمەوە ئەگەین بەوەی کە تێگەیشتنی هایدیگەر بۆ مێژوو بریتییە لە تێگەیشتنی بۆ بوونی مرۆڤ بەشێوەیەکی گەورەکراوە. ئەم بوونەی مرۆڤ بەو پێیەی بریتییە "خەم"ە، لە پێکهاتەیەکی زەمانیی سێ لایەنە: ئەوەی هەیە (واقعیبوون) ئیمکان‌و ئەگەری ئاییندە، مەشغوڵبوون (یان خەریکبوون) بە هەنووکەوە (کەوتن). ئەو شتەی کە ئەم سێ لایەنەش لە یەکەیەکی رەسەندا کۆدەکاتەوە روانینە چارەنووسی بوونی مرۆڤە (کە مەرگە) بە ویستەوە. "ویست ئەمەکی بوونی مرۆڤە بۆ خودی تایبەتیی خۆی" . بەڵام مرۆڤی نارەسەن مرۆڤێکی بێویستەو، ئەمجۆرە مرۆڤەش لای هایدیگەر، بێ چارەنووسە. کاتێ ئەم شیکردنەوەیە لە بەرچاو ئەگرین، ئەتوانین پەی بە هێڵە گشتیەکانی تێگەیشتنی هایدیگەر بۆ مێژوو بەرین. "مادامەکی بوونی مرۆڤ لە رووی چارەنووسەوەو بەو پێیەی بوونەر لە جیهاندا، لە بنەڕەتدا لەلایەن بوونیەوە —لەگەڵ— ئەوانیتردا دیاریدەکرێت، کەواتە چوونە ناوەوەی بۆ مێژوو چوونە ناوەوەیەکی دەستە جەمعییەو وەکو چارەنووسێك بەلایەوە دیاریدەکرێت" . چەمکی "چارەنووس" لە مێژووی فەلسەفەی ئەڵمانیدا رۆڵێکی گرنگی بینیوە، کە هەندێ جار شوومیش بووە. بەکارهێنانی ئەم چەمکەش لەلایەن هایدیگەرەوە بەکارهێنانێکی تا رادەیەك ئاڵۆزە، جارێکی ترو لە بەکارهێنانێکی کەمێك جیاوازتردا لێی ئەدوێینەوە. بەڵام لەم لێدوانەی ئێستاماندا دەتوانین وا سەیری چارەنووس بکەین کە بە ئەندازەی پەیوەستبوونی قەدەر Fate بەتاکە کەسەوە، ئەویش بەکۆمەڵگا یان ئەو کۆمەڵە خەڵکەوە پەیوەستە کە لە سەردەمێکدا دەژین. هەرچۆن ئیمکانەکانی تاکەکەس بەردەوام واقعیبوونێکە

شـەقڵی ئـەوە بەخۆیـەوە دەگـرێ کـە روویـداوە ئاینـدەی هـەر کۆمـەڵێکیش ئەچـێتە چوارچێوەیەکی مێژووییەوە. گـەر بـۆ ئەمـە نموونەیـەکیش بهێنینـەوە کـە "هایدیگـەر" بەکاریهێناوە، ئەوا دەڵێین هەر نەوەیە چارەنووسی خـۆی هەیـە، هـەر تاکـە کەسـێکیش لەم نەوەیەدا لەو چارەنووسەدا بەشدارە.

هەروەها هەرچۆن سەبارەت بە تاکەکەس بوونی رەسەنو نارەسەن هەیە، سەبارەت بە هەر گەلێکیش مێژووی رەسەنو نارەسەن هەیە. مێژووی نارەسەن خۆ تەسـلیمکردنە بەرووداوەکان، بەڵام مێژووی رەسەن (یان باشتر وایـە بڵـێن: کـارابوونی رەسـەنانە لـەناو مێژوودا) واتە جڵەوکردنی دۆخی واقعیبوونو چوونە پێشەوە بـەرەو ئـەو چارەنووسـەی کـە بـەکراوەیی دەمێنێتـەوە. لـەم خاڵەشـدا ئەگەینـە تێگەیـشتنی هایدیگـەر بـۆ دووپاتبوونـەوە کـە تـەواو لەتێگەیـشتنەکەی کیرکـەگۆر جیـاوازە. بوونـەوەری مرۆیـی (دازاین) ئەگەرێتەوە بۆ ئەو شتانەی کە روویانداوەو خـۆی ئەداتـە دەسـت ئـەو ئیمکانـە رەسەنانەی کە لەوێدا دەیانبینێتەوەو دەشێ لەو چرکەساتەدا دووپات ببنـەوە. ئەمـەش بەمانای ئەوە نایەت کەمرۆڤ یان دەبێ رابردوو بەتەنها وەکو نموونەیەك سەیر بکات، یـان لەرابردوودا قەتیس بێـتو ببێتـە کۆیلـەی. دووپاتبوونـەوەی "دازایـن" لەسـەر بنـەرەتی زەمانمەندیو مێژووییبوونی بریتییـە لـەجۆرێك "بەدەسـتهێنانەوە"ی ئیمکـانی رابـردوو. (لە وشە ئەڵمانیەکەشدا کە دەلالـەت لـە دووپاتبوونـەوە دەکـات مانایـەکی وا پـۆزەتیڤ هەیــە **Wiederholung**) لەســەرێکی تریــشەوە دووپاتبوونــەوە (یــا دووپاتکردنــەوە) لەرابردوو خۆی قوتار دەکات، لێککـاری یـەك هەیـە لـەنێوان رابـردوو و ئێـستاداو، بـریتی نییە لەکۆپیکردنەوەیەکی دەقاودەقی رابردوو.

لێکـچوونی وێنــەییو بونیــادیی نێــوان مێــژوو و بــوونی تاکــە کەسیــشە وادەکـات لێکۆڵینەوەی مێژوو مومکین بێت. بەبۆچوونی هایدیگەر (هەروەها دیلتـایو نیـچە) ئێمـە ناتوانین پەرە بە بایەخدانی زانستیانە بـە مێـژوو **Historie** بـدەینو نابینـە مێـژوونووسو

مێــژووناس تــەنها لــەڕێی بەشــداریکردنمانەوە نــەبێت لــە مێــژوودا Geschichte، یــان لەبەرئەوەی مێژوو چووەتەناو پێکهاتەمانەوە.

بەڵام مادامەکی مێژوو لێکۆڵینەوەیەکی بوونگەرایانەیە، هایدیگەر ناچاربوو دوو لاف باو سەبارەت بە مێژوو رەتبکاتەوە. سەرەتا ئەو دەڵێت مێژوو بایەخ بە رووداوە واقعیەکان نادات بەڵکو بە ئیمکانەکان، مەبەستم لەوەیە کە بایەخ بەو رووداوانە نادات کە سەرلەنوێ بینا ئەکرێنەوە، یان زنجیرەی رووداوەکان لە ڕابردوودا، بەڵکو بایەخ بە کەشفکردنی ئەو ئیمکانانە ئەدات کە لە رەوتی مێژوودا لەبەردەم بوونەوەری مرۆیی (دازاین)دا کراونەتەوە.

پاشان دەڵێت کە مێژوو بایەخ بە رابردوو نادات، بەڵکو لە بنەڕەتدا بایەخ بە ئاینده ئەدات، مێژوو ئیمکانە رەسەنەکانی رابردووی مرۆڤ دەهێنێتەوە کە دەشێ دووپاتبکرێنەوە، تا بیانخاتە سەر (بەمانای اسقاط) هەروەکو لە بەشە بەراییەکانی ئەم کتێبەدا ئەم چەمکەمان روونکردەوە—و—) ئاینده.

هەڵبەت ئەم سەرنجانە راوبۆچوونەکانی نیچە سەبارەت بە "تایپی یادگارە گەورەکان" بیری خوێنەر ئەخاتەوە، نەك هەر ئەم تایپە، بەڵکو دابەشکردنە سێینەکەی نیچەشی بۆ مێژوو بیردەخاتەوە کە "هایدیگەر" وای سەیر دەکات کە هەر بەڕاستی مژدەدەری پێکهاتەی سێلایەنەی مرۆڤە (دازاین).

بە بۆچوونی ئەو لێکۆڵینەوەی رەسەنی مێژوو هەر سێ ئیمکانەکە بەشێوەیەکی واقعیانەو بابەتیانە لەیەکەیەکدا پێکەوە کۆدەکاتەوە. وا لێرەشدا پەرەگرافێکی تەواو لەهایدیگەر وەردەگرم کە تیایدا باسی پەیوەندیی ئاڵۆزی نێوان رای نیچەو رای خۆی دەکات:

"بوونەوەری مرۆیی (دازاین) لەڕووی مێژووییەوە تەنها بەهۆی زەمانمەندییەوە مومکین دەبێت. زەمانمەندییش خۆی لەیەکەیەکی ئاسۆییدا بەزەمانی دەکات Temporizes itelf کە بەلای خۆیدا رایدەکێشێت، دازاین کاتێك رەسەن دەبێت کە

بوونـــەوەرێکی ئایـنــدەیی بێــت لەکەشــفکردنی ویــستمەندانەی ئــەو ئیمکانــەدا کــە هەڵیبــژاردووە، کــاتێکیش بــە ویــستەوە ئەگەڕێتــەوە بــۆ خــودی خــۆی، لــەڕێی دووپاتبوونەوەوە لەبەردەم ئیمکانە "گەورە"کانی بووندا دەکرێتـەوە، زانـستی مێـژووش کە لەم تێڕوانینە مێژووییەوە سەرهەڵئەدات، بریتییە لە مێـژووی "یادگـارە گـەورەکان"، هەروەکو لە رەوتی رابردووشدا هەیە، دازاین ئەچێتە حاڵەتی تـووڕدان (Throwness)ەوە کـاتێکیش لـەڕێی دووپاتکردنـەوەوە ئیمکـان تایبـەت ئـەبێت بەتاکـە کـەس، ئـەوە لـە هەمانکاتدا مژدەدەری ئەوەیە کە توانای ئەوە هەیە بەرێزەوە ئەو بوونە مرۆییە بپارێزین کە لەوێ —بووەو، ئەو توانستەی تیا روونبۆتەوە کە دەرك کراوە. بـەمجۆرە مێژووناسـی (زانـستی مێـژوو)ی رەسـەنیش بەوپێیـەی زانـستی یادگـارە گەورەکانـە، لەهەمانکاتـدا "ئاسەواردۆسـت"یـشە، لەبەرئـەوەی بوونـەوەری مرۆیـی بەشـێوازێك خـۆی ئەخاتـە زەمانەوە کەتیایدا رابردوو و ئاینـدە لەئێستادا دەبن بەیـەك. ئێستاش پـەردە لـەڕووی رەسـەنایەتیی "ئـەمڕۆ *Today*" هەڵـدەماڵێت بـەو پێیـەی چرکەسـاتی بینینـە. بـەڵام لەبەرئەوەی ئەم "ئەمڕۆ"یە لەچوارچێوەی تێگەیشتنێکدا بۆ بوونی مرۆیـی لێکراوەتـەوە کـە دەرك کـراوە —کـە ئەمـەش تێگەیـشتنێکە بەشـێوەیەکی ئایندەییانـە دووپـات دەبێتەوە— بۆیە زانستی مێژووی رەسەن ئەو شێوازەیە کـە تیایـدا "ئـەمڕۆ" خەسـڵەتی هەنووکـەیی خـۆی لەدەسـت ئـەدات، بەواتایـەکی دی ئـەبێت بـەو شـێوازەی کـە مـرۆڤ بەسەختییەکی زۆرەوە بەهۆیەوە لە راشکاویی سووکی "ئەمڕۆ" رزگاری ئەبێت، چـونکە زانستی مێژوو (مێژووناسی)یش — بەو پێیەی زانـستی "یادگـارە گـەورەکان"و هـەروەها زانستی ئاسەوار دۆستیشە زانستێکی رەسەنە، بەپێویست دەبێتە رەخنـە لـە "ئێـستا". حاڵەتی مێژوویی رەسەنیش دەبێتە بناغـە بـۆ توانـای یەکخـستنی ئـەم سـێ ڕێگایـە لـە مێژووناسیدا. بەڵام بناغەی مەعریفەی مێژوویی رەسەن زەمانمەندییە بـەو پێیـەی مانـای بوونگەرایانەی بوونی خەمە" .

پێشتر بینیمان کە پێویستە گۆشەنیگای نیچە بۆ مێژووی جیهان، کە لەبیرۆکەی گەڕانەوەی هەتا هەتاییدا ئەگاتە چلە پۆپەی تراجیدیانە، لەپەنا تیۆرەکەیدا سەبارەت بە سێ ڕێگاکەی مێژوو دابینێین. لای "هایدیگەر"یش پێویستە تیۆرەکەی سەرەتای سەبارەت بە مێژووو کە لە کتێبی "بوونو زەمان"دا خستوویەتییە ڕوو، بەهەندێك لەدەستووروو ڕاکانی دواتریەوە ببەستینەوە، لە ڕاستیشدا ئەم دەستوورانە هێندەی ئەوانەی نیچە ڕەشبینانە نین، بەڵکو پتر جەخت لە سەر چەمکی چارەنووس دەکەنەوە. بەواتایەکی دی دەتوانین بڵێین کە دەستوورەکانی سەرەتای جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە مێژوو بەر لەهەموو شتێك دیاردەیەکی مرۆیی یان دیاردەیەکی بوونگەرایانەیە. بەڵام لە دەستوورەکانی دواتریدا، سەبارەت بەمێژووش، هەروەکو مەسەلەکانی تر، جەخت لەسەر ڕۆڵی بوون دەکاتەوە وەکو ئەوەی هەیە.

لەکتێبی "سەرەتایەك بۆ میتافیزیکا"دا هایدیگەر، هەر بەشێوازی باوی فەیلەسووفانی بوون، نکوڵی لەوە دەکات تیۆرەیەك هەبێت سەبارەت بە پێشکەوتنو لەبری ئەوە دەڵێت کە مێژوو بریتییە لەدارمانێکی یەکجۆرسازو چلۆنی (کیفی). سەبارەت بە برگەی سروودی کۆرسێکی "سۆفۆکلیس"یش (لەشانۆنامەی ئەنتیگۆنادا) کە باس لەوە دەکات مرۆڤ گیانەوەر ڕامدەکاتو زەوی دەکێڵێتو شار دروستدەکات، دەڵێت نابێت ئەوە وا لێکبدەینەوە کە "ریوایەتێکە دەربارەی پێشکەوتنی مرۆڤ لەراوچییەکی درندەو دەریاوانێکی سەرەتاییەوە، بۆ بەناییەکی ژیاریی شارەکان" پاشان بەردەوام دەبێتو دەڵێت: "ئەم بیرۆکەیە بەرەنجامی ئەنتۆلۆجیاو ئەنترۆپۆلۆجیا دەروونییە کە لە پراکتیزەکردنێکی بێ پاساوو ساختەی زانستی سروشتییەوە بەسەر بوونی مرۆڤدا سەرچاوەی گرتووە. بەهەڵەداچوونی بنەڕەتیی پەنهانی پشت ئەم جۆرە بیرکردنەوانەش باوەڕە بەوەی کە مێژوو لە سەرەتاییو دواکەوتوو و لە لاوازو بێدەسەڵاتەوە دەستپێدەکات، لە ڕاستیشدا پێچەوانەی ئەمە ڕاستە، چونکە هەمیشە سەرەتا سەرسوڕهێنەرترو بەهێزترو، ئەوەی دوای ئەو دێت پەرەسەندن نییە، بەڵکو

یەکجۆر سازییە کە لە بڵاوبوونەوەی چەندێتیی پەتییەوە دێت، ئەمەش بریتییە لە بێتوانایی لەپاراستنی ئەوەی کە لەسەرەتادا هەبووە. چونکە ئەو سەرەتایە گەورە دەکرێتەوەو بەشێوەیەکی کاریکاتێریانە زێدەڕۆیی تیا دەکرێت بەو پێیەی قەوارەیەکو کشانێکی ژمارەییو چەندێتیی پەتییە، مرۆڤیش کە لەهەموو بوونەکانی دی سەیرترە بۆیە –ئەوەیە– کە –هەیە– لەبەرئەوەی ئەو سەرەتایەی تیایە کە لەیەك چرکەساتدا هەموو شتێکی تیا دەتەقێتەوە، لەسەر شارا بوونەوە تا هێزی رکێفکەر، لەبەرئەوەش کە هەوڵیدا بەسەریدا زاڵبێت" .

هێزی رکێفکەریش ئەو بوونو ژینگە نامرۆییە یە یان ئەو ژینگەیەی کە مرۆڤ تێدەپەڕێنێتو چوارچێوەیەك بۆ بوونی مرۆڤ پێکدەهێنێت. لەوەش دەچێت هایدیگەر وردە وردە جەخت لەسەر ئەو رۆڵە بکات کە بوون خۆی لە مێژوودا دەبینێت، چونکە ئەم جۆرە بوونە بوونێکی نازەمانی نییە بەو مانایەی کە لە میتافیزیکای کۆندا دەیبینینەوە، بەڵکو بوونە بە مانا داینامیکییەکەی بەم جۆرەش ئەمکی چارەنووس مانایەکی نوێ لەخۆ دەگرێت. وشەی چارەنووس Geschick یش لە کرداری Schicken ی ئەڵمانییەوە وەرگیراوە کە بەمانای "دەنێرێت" دێت، هایدیگەر لێکچوونی ئەم وشەیەشی بە وشەی Geschichte (کەبەمانای مێژوو دێ) قۆستۆتەوە. و.جەی. ریچاردسۆن W.J Richardson وشەی (حەواڵەکردن)ی وەکو وەرگێڕانێکی گونجاو پێشنیار دەکات. نوسیویەتی دەڵێت:

"بوون بەو پێیەی لە "ئەوێ"یەو بۆ "ئەوێ" خۆی ئەخاتەڕوو. بەڵام لەبەرئەوەی بوون خۆی ئەولەویەتی هەیە، بۆیە وا دەرك ئەکرێت کە خۆی بۆ "ئەوێ There" حەواڵە ئەکات. ئێمە ئەتوانین ئەم خۆ حەواڵەکردنە وا وەسفبکەین کە لەبوون خۆیەوە سەرهەڵدەداتو ناوی بنێین "خۆ سەرهەڵدانی بوون"، یان ئەگەر بۆمان بکرێت وشەیەکی نوی بەکاربهێنین تا دەلالەت لە چەمکێکی تەواو نوێ بکات. ئەوا دەڵێین "حەواڵەکردنی بوون – Mittence of Being). ئەشتوانین بڵێین ئەوەی کە لە "ئەوێ" کۆتایی دێتو

ئــەوکات نــاوی بنــێین "پــەیمان"ی "ئــەویٚ"، بــە وابەســتەبوونی لــە چارەنووســی تایبەتییەوە، وەکو شوانێکی بوون."

ئەگەر "ریچاردسۆن" لەوەدا راست بێت، پێدەچێت ئەوەی کە لـە هەنـدیٚ نووسـینی دواتـری هایدیگـەردا دەبیینـین لەوانەشـی لێـدوانێکی ورد لـە لێکۆڵینەوەیەکـدا کـەناوی "قسەکانی ئەناکسیماندەر"ە) بریتی بێت لەهەولێکی تیۆرییانە بۆ لێکۆڵینەوەی هـەردوو چەمکی مێژوویی: (Geschick) و (Schicksal) نەك بە شـێوازێکی بوونگەرایانـە (لەلایـەن مرۆڤەوە). بەڵکو بە شێوازێکی ئۆنتۆلۆجیانە (لەلایەن بوونەوە) بـوون لـەڕەوتی مێـژوودا بۆ "بوون لەویٚ" خۆی ئاشکرا دەکات یان خۆی دەشارێتەوە، ئەو "بوون لەویٚ"یەی کە بوونــەوەرێکی ئۆنتۆلـۆجیی تایبەتمەنـدە، کـە مـرۆڤ (دازایـن)ە. بـەمجۆرە لەمێـژوودا بەگوێرەی ئەو شێوازانەی کە بوون خۆی پێیان ئاشکرا دەکات یان دەشارێتەوە قۆنـاغی جیا جیا هەن، ئەم قۆناغە جیایانەش بریتین لە حەواڵەکردنەکانی بـوونو ئێمـەش لـەڕێی چارەنووسی نەوە جیاجیاکانەوە تاقییان دەکەینەوە. لـەم قۆنـاغی بوونەشـەوە قۆنـاغی ماهیەتی حەواڵەکردنی دیٚ کە مێژووی رەسەنی جیهانی تێدایە.

ماهیەتی قۆناغی بوونیش سەر بەمۆرکی زەمانمەندیی پەنهانی بوونەو، دەلالـەت لـەو ماهیەتی زەمانەش دەکات کەبیرکردنەوەیە لەبوون".

ئەمەش تیۆرەیەکی ئـاڵۆزەو بـە ئاشـکرا دیـارە کـە لـەو شـیکردنەوە بوونگەرایانـەی مێژوو دوور دەکەوێتەوە کە لە کتـێبی "بـوونو زەمـان"دا دەیبینینـەوەو، پـاش ئـەوەی لەسەر بابەتی میتافیزیکای بوونگەرایی ئەدوێین، ئەمەمان زیاتر بۆ روون دەبێتەوە.

"یاسـپەرز"یـش یـەکێکی تـرە لـەو فەیلەسـووفە بوونگەرایانـەی کـە بیروبۆچـوونی سەرنجڕاکێشیان سەبارەت بە مێژوو هەبوو. ئەوە بوو لەبەشە بەراییـەکانی ئـەم کتێبـەدا ئاماژەمان بۆ تیۆرەکەی سەبارەت بە "چـاخی تـەوەرەیی Axial Age لەمێـژوودا" کـرد، هــەروەکو لەکتێبەکەیـدا "ســەرەتاو ئامــانجی مێــژوو" خــستوویەتییە ڕوو. چـاخی تەوەرەییش ئەو قۆناغە مێژووییەیە کە دەکەوێتە نزیکەی (٥٠٠ پ.ن)ەوە، کە تیایداو لـە

بەشی جیاجیای دونیادا، خەڵکی کەوتنە بیرکردنەوەیەکی جیدی لەکێشەکانی بوونیان. بەڵام بنەڕەتی یەکەمو دوا ئامانجی مێژوو هەر بەپەنهانی دەمێننەوە. لەبەرئەوەی کە مرۆڤ کۆتاداره لە دەرەوەی مێژووی خۆیدا ئەژیو، بەبێ ئەوەی بزانێت دوا ڕەوتی چییە. "مێژوو نووسان ناتوانن لە بنەڕەتی مێژوو بکۆڵنەوە، واتە لەوەی کە مێژوو چۆن دەستی پێکردووەو هەروەها ئامانجەکەشی یان ئەگەر ئامانجێکی هەبێت زانستەکەیان ئەکەوێتە ناوجەرگەی ڕاستیی مێژوویی‌و بەردەوامیش لەهەنووکەدایەو، لەچرکە ساتێکی دیاریکراوی زەماندا کە بەهەردوو سەردا کراوەیە. ئەو زانستە خۆی مێژووەو هەر بەشێکیشە لە بابەتەکەی خۆی" .

بەڵام گەرچی مێژوو وەکو زانستێك لەناو ئاسۆیەکی سنووورداردا کاردەکات، وەلێ مرۆڤەکان بەڕاستی هەوڵئەدەن کە ڕوانینێکی فراوانتریان هەبێت. چونکە ئەوان بە زنجیرەیەك ڕووداو قایل نین کە نە سەرەتایەکو نە کۆتاییەکی وایان هەبێت کە مانایان پێ ببەخشێت. هەر بۆیە مێّژوو لە چوارچێوەی جفرەی مێژوودا دەبینن ئەم جفرانەش وەکو جفرەکانی تر، نابێ بەمانایەکی حەرفی یان بابەتی وەریبگرین. بەڵکو ئەم جفرانە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆو زوو تێپەڕ ئاماژە بەو شتانە ئەدەن کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەرك ناکرێن. یاسپەرز تەواوی ئەو ئەفسانەو میتافیزیکای مێژووە کە هەوڵئەدەن مۆرکی گشتگیری مێژوو پیشانبدەن ئەخاتە خانەی جفرەکانی مێژووەوە. وەکو بیرۆکەی پێشکەوتن‌و تیۆرەی گەڕانەوەی هەتا هەتایی‌و چاودێریی یەزادنی‌و ژیانی ئاخیرەت‌و هتد.... ئەم جفرانەش ڕوانگەو ئاراستەیەك بەو ڕووداوانە ئەدەن کە مێژووناسی کەشفیاندەکاتو، وا دەناسرێن کە بەجۆرێك هانی جیددیەتو کردار ئەدەن کە لەوە تێدەپەڕێت مێژوو بە بازدانی بێهوودە بزانین لەم ڕووداوە بۆ ئەو ڕووداوە لە سەرێکی تریشەوە ململانێی پێکەوە لکاوی نێوان جفرەکانی مێژوو بەردەوام دەبێت — هەروەکو چۆن لەنێوان هەموو جفرەکاندا ئەمە هەیە — هێندەی ئەم جفرە یان ئەو جفرە

ئـەتوانێ کاردانەوەیـەکی بوونگەرایانـە بوروژێنێـتو ڕێگـای مـرۆڤ ڕۆشـن بکاتـەوە یـان نەیکاتەوە.

ئەمانە هەندێك تەوژمی جیاواز بوون لە بوونگەراییدا سـەبارەت بەمێـژوو. بـۆ نموونـە ڕێکـەوتنێك لـە نێـوان بوونگەراکانـدا هەیـە کـە وەسـفکردنی مێـژوو بـەوەی زانـستییەو دەرەکییە، بەس نییەو، بەڵکو مێژوو بەتەنها لەڕێی دەرگیربوونـەوە تیایـدا، دەناسـرێت. هەروەها لەسەر ڕەتکردنەوەی هەر تیۆرەیەکی سـادەو نابەرپرسـانە سـەبارەت بەمێـژوو کۆکن.

بەڵام بەدەر لەم ڕێکەوتنە بەرتەسکانە، ئێمە ڕووبەڕووی کۆمەڵێك جیاوازی ئەبینـەوە کەهیـچیان لـەو جیاوازییانـە کـەمتر نییـە کـە لـە هەنـدێك شـوێنی تـری ئـەم باسـەدا ڕووبەڕوویان بووینەوە. کەواتە ئایا مێژوو لە بنەڕەتدا مرۆڤ دروستی دەکات، یان قـەدەرو چـارەنووس (لەوانەشـە هێـزی تراجیکـی تـریش) سـەرباری هەوڵـەکانی مـرۆڤ ڕوخساری "شەقڵ"ی مێژوو دەگۆڕن؟ ئایا مێژوو بەرەو ئامانجێك دەچێت یـان لەکۆمـەڵێك بازنـەی بێکۆتاییدا خۆی دووبارە دەکاتەوە؟ هەروەها ئایا لەمێـژوودا مانـاو هیوایـەك هەیـە، یـان مەسەلەکە لە گەوهەردا پووچە؟ کاتێکیش قسە لەسەر کێشەی میتافیزیکا دەکەین، ئـەم جیاوازییانە بەشێوەیەکی چڕتر خۆیان دەنوێنن.

### ٣.فەلسەفەی بوونگەرایی وەك ڕەخنەیەکی کۆمەڵایەتیو سیاسی

بینیمان چـۆن کێـشەی مێـژوو سـەنتەری بایەخپێـدانی بوونگەرانـەی لـە تاکـەوە بـۆ کۆمـەڵگا گواسـتەوە. هـەروەها بینیمـان کـە بایەخـدان بەمێـژوو لـەناو فەیلەسـووفە بوونگەراکاندا لە بنەڕەتدا بایەخدانێك نییە بـە ڕابـردوو، بـەڵکو هەوڵێکـە بـۆ دۆزینـەوەی ڕێگامان لەئێستاو ئایندەدا، ئەمەش لە میانی لێکۆڵینەوە لەو ئیمکانە مرۆییانـەی کـە لـە مێژوودا بەدەردەکەون چونکە بوونی مرۆیی خۆی واتـە ڕوانینـە پرۆژەیـەکی ئاینـدە یـان تێپەڕاندن بەرەو ئایندە، هەر بۆیە جێی خۆیەتی کە لە کۆتـایی ئـەم بەشـەدا سـەبارەت

بەمێژوو هەندێك پرسیاری کۆمەڵایەتیو سیاسی لەدۆخی ئێستای جیهانو ئەگەرەکانی ئاینده بکەین: پەیوەندیی بوونگەرایی بەشۆڕشی تەکنۆلۆجیو تەقینەوەی دانیشتووان (الانفجار السکانی) و گەشتە ئاسمانیەکانو پێشبڕکێی خۆ چەکدارکردنو ئەو ڕووداوانەی تری کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمەوە چییە...؟

لەوانەیە هەندێك لە ڕەخنەگران لەفەلسەفەی بوونگەرایی وا وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە کە بوونگەرایی هیچ پەیوەندییەکی بەم مەسەلە گەورانەوە نەبووە، یان لەوانەیە بڵێین کە بوونگەرایی لەبنەڕەتدا فەلسەفەیەکی تاکەکەسیو شەخسییە. تەنانەت لەو شێوانەشیدا کە بوونگەرایی هەوڵیداوە پەرە بە تێگەیشتنێك بۆ پەیوەندیی نێوان کەسەکان بدات، کاتێك مرۆڤ دەیەوێت لەمیللەتانو کۆمپانیا گەورەکانو سەندیکاکانی کرێکارانو حیزبە سیاسیەکان بکۆڵێتەوە، ئەوا لەبوونگەراییدا پەیوەندییەك بۆ ئەم بابەتانە نابینینەوە.

من نکوڵی لەوە ناکەم کە ئەم ڕەخنەیە سەرنجدانێکی بەهێزە لەبوونگەرایی، ئەوەبوو لە لێدوانە جۆراو جۆرەکانماندا بینیمان کە لەهزری بوونگەراییدا کاتیگۆریی تاکەکەس کاریگەرە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کاتێك بەشێوەیەکی قووڵتر لەبابەتەکە ئەکۆڵینەوە، پێویستە دان بەمەشدا بنێین کە کۆمەڵێك فەیلەسووفی بوونگەرا هەن بەقووڵی چوونەتە ناو گفتوگۆو باسی سیاسییەوەو، هێندەش بەسە هەر بۆ نموونە ناوی "ئۆنامۆنۆ"و "بێردیاییڤ" و "سارتەر" و "کامۆ" بهێنین. لە ڕاستیشدا نە شتێك هەیەو نەدەبێ شتێکیش هەبێت وامان لیّ بکات لایەنی تاکەکەسیو لایەنی کۆمەڵایەتی لە ژیانی مرۆڤایەتییدا لەیەك دابڕین. شایانی باسە "سانت ئۆگەستین" کە لە زۆر ڕووەوە لە فەیلەسووفەکانی دوایی بوونگەرایی دەچێت، هوشیارییەکی قووڵی بە نهێنیو ئازاری تاکەکەس هەبوو بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کارە گرنگەکەی بریتی بوو لە لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بەمێژوو لەچوارچێوەی نێوان دوو شارستانیدا.

کۆمەڵگای مرۆیی نموونەیی، ئەگەر بتوانین بیهێنینە بەرچاوی خۆمان، ئەو کۆمەڵگایەیە کە بونیادە کۆمەڵایەتیەکان تیایدا هانی تاکەکەس ئەدەن بە باڵاترین ئاستی بەرکەماڵی بگاتو، پێچەوانەکەشی دروستە، واتە کۆمەڵگایەکە کە باڵابوونی تاکەکەس تیایدا نابێتە هۆی لێکترازاندنی بونیادی کۆمەڵایەتی.

لێرەدا بەکورتی لە دوو کێشە دەکۆڵینەوە: یەکەمیان دەربارەی پەیوەندییەکانی بوونگەراییە بەکۆمەڵگای هاوچەرخەوە.

دووەمیشیان پەیوەستە بە ناوەڕۆکە سیاسیەکانی بوونگەراییەوە. (ئەگەر ناوەڕۆکی وای هەبێت).

١.ئەو ژمارە زۆرەی ئادەمیزاد (کە بەردەوام لە زیادبوونیشدایە) کە ئەمڕۆ لەسەر گۆی زەوی دەژین، گەر بیانەوێ درێژە بەمانەوەی خۆیان بدەن، پێویستیان بە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیی ڕێکوپێکتر دەبێت لەو ژینگەیەی کە لەچاخەکانی پێشووتردا تیا ژیاون. لەچاخەکانی ڕابردوودا ناوچەو شاری بچووکو تەنانەت لادێکان یەکەی کۆمەڵایەتیی سروشتی بوونو، لە توانادا بووە لەناو ئەم یەکە بچووکانەدا پەیوەندیی تایبەتی لە نێوان تاکەکەسو کۆمەڵدا هەبێت، کە بەپلەیەکی زۆر یان کەم بەشداریی لە پێکهێنانی بونیادی کۆمەڵایەتیدا کردووە. بەڵام ئێستا هەروەکو مارشاڵ ماکلۆهان M.Mcluhan دەڵێت جیهان بووە بەدێیەکی بچکۆلانەو دروستکردنی پەیوەندیی تایبەتی لەمجۆرە زەحمەت بووەو، ئێستا ڕێکخراوی گەورەی حکومیو بازرگانیو نەتەوەییو نێودەوڵەتی ژیانی هەموومان فۆرمولە دەکات. بەر لەهەموو ئەمانەش لەجیهانێکی لەم چەشنەدا پلاندانان بووە بە پێداویستییەکو ئەم پلاندانانەش بەتەنها بەشێوازێکی ناشەخسی دێتەدی.

هەندێك هەن ئاماژە بۆ دەسکەوتەکانی کۆمەڵگای تەکنۆلۆجی ئەکەن — لەناوبردنی نەخۆشیو برسێتیو هەژاریو هەلڕەخساندن بۆ فێرکردنو پەرەسەندن. بەڵام هەندێکی تر هەن کە ئاماژە بۆ مەترسییەکان دەکەن: واتە نەمانی هاوسەنگی لەژینگەداو،

بـەتاڵانبردنی سەرچـاوەکانی زەوی‌و، بەتایبـەتیش ئامـاژە بـۆ مەترسـیی لەدەسـتدانی لایـەنی شەخـسی‌و لایـەنی مرۆیـی دەکـەن لەجیهانـدا. لێرەشـدا نامـەوێت ئـەو پاسـاوە باوانەش بژمێرم کە بۆ لایەنگیری لەم را یـان ئـەو را دەهێنرێنـەوە. چـونکە ئێمـە بـەرەو رووی هەڵوێستێکی زۆر ئاڵۆز بووینەتەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کـە هەڵوێـستێکە نـاتوانین لێی رابکەین، چونکە بەشێکە لەواقعیبوونی بوونی مرۆیی هاوچەرخ.

هەندێك جار بوونگەراکان بەوە تاوانبار ئەکرێن کە لەواقیع هەڵدێن‌و کەمتر واقعبینن‌و، دەگوترێـت کـە ئەمانـە دەیانـەوێت میلـی سـەعات بـۆ دواوە بگەڕێننـەوەو، سـۆزێکی رۆمانسیانەیان بۆ "ژیانێکی سادە"ی دێهاتیانـە هەیـە لەکۆمـەڵگادا. دەشـێت پاسـاو بـۆ هەنـدێك لـەم تۆمەتانـە بهێنرێتـەوە، بـەڵام هەڵوێـستەکە زۆر لـەوە ئـاڵۆزترەو ئـەبێت بەشێوەیەکی قووڵتر لە کێشەکە بکۆڵینەوە.

ئـەوەبوو پێـشتر بینیمـان کـە بەبۆچـوونی هەنـدێك لـە فەیلەسـووفە بوونگـەراکان کـەتێڕوانینی "ئامرازگەرایانـە" بـۆ جیهـان پرنـسیپی فەلـسەفیی چەوسـاندنەوەی تەکنۆلۆجییە. بوونگەراکان کۆمەڵگای تەکنۆلۆجیان رەت نەکردۆتەوە، وەکو ئەوەی کـە هەیـە. بـەڵکو سـنووردارکردنی ژیـانی مرۆییـان رەتکردۆتـەوە بـەوجۆرەی کـە هەرچـی بایەخمان هەیە بەتەنها ئاراستەی شتە دەرەکیەکان بکرێت.

فەیلەسـووفە بوونگـەراکان لـەوەدا زۆر راسـتن کـە دەڵـێن رادەی نـامۆبوون (لەخۆبێگانـەبوون) لـەجیهانی هاوچـەرخدا لـەنێو لاوان‌و رۆشـنبیران‌و هونەرمەنـدان‌و نیهیلیستیەکاندا زۆر بووە. فەلسەفەی بوونگەراییش تـا رادەیـەك بریتییـە لـەهاواری ئـەم توێژە نامۆیانەو، پێویستە هەر لەبەر رۆشـنایی لێکدانـەوەی ئـەم فەلـسەفەیە خۆیـدا بـۆ مێـژوو، وەکـو دیاردەیـەکی مێـژوویی سـەیری بوونگـەرایی بکـەین. ئـەم فەلـسەفەیە تەعبیرکردنە لەو شتانەی کە لەقووڵایی ئەقڵ‌و رۆحی مرۆڤی هاوچەرخدایە.

هەر بۆیە نابێ وا بڕوانینە رەخنەی بوونگەرایانە بۆ کۆمەڵگا کـە لادان (انحـراف)ێکـی رۆمانتیکییەو هیچی تر. بەڵکو بریتییە لە دەنگێکی پێشبینانە، کە هەوڵدەدات پشتیوانی

لە ئینسانیەتی ئینسان بکاتو لەگومڕابوون بیپارێزێت. هەروەها ئەمجۆرە رەخنەیە خوازیاری کۆمەڵگای کشتوکاڵیی بەر لەکۆمەڵگای پیشەسازی نییە، بەڵکو خوازیاری دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی پاش – پیشەسازییە (دەشێ کۆمەڵگایەکی ئۆتۆماتیکیش بێت)، کۆمەڵگایەکی ئایندە کە تیایدا پتر لە ئێستا رێز لە نرخو بەهاکانی ژیان بگرێت.

٢.ئێستاش با بچینە سەر کێشەی لایەنە سیاسییەکان لە فەلسەفەی بوونگەراییداو ئاخۆ ئەمجۆرە فەلسەفەیە لەگەڵ ئایدیۆلۆجیایەکی سیاسیی تایبەتدا یەکدەگرێتەوە یان ئایدۆلۆجیایەکی تایبەت بەخۆی دادەمەزرێنێت؟

دەبێ بە نەرێ وەڵامی هەردوو ئەو پرسیارە بدەینەوە، هەروەکو پێشتر بینیمان تێڕوانینی بوونگەرایانە بۆ بوونی مرۆیی رەسەن لایەنگری هیچ ئایدیالێکی ئاکاریی دیاریکراو نییە، بەڵکو دەکرێت بەشێوازی جیاجیا ئەوە بەدیبهێنرێت. بەهەمانشێوە لەنێو ئەوانەدا کە پێیان دەڵێن بوونگەراکان، لایەنگریی سیاسیی جیاجیا دەبینینەوە، بۆ نموونە، هایدیگەر بۆ ماوەیەکی کەم نازی بوو، بەڵام یاسپەرز بەردەوام دژایەتیی نازیزمی دەکرد. سارتەریش بەلای مارکسیزمدا شکاندبوویەوە، بەڵام کەم کەس هەیە توانیبێتی وەکو "کامۆ"و "بێردیاییڤ" رەخنەی توند ئاراستەی مارکسیزم بکات. ئەوەی وا دەکات ئەم رەخنانەشیان گرنگ بێت ئەوەیە کە ئەم دوو بیرمەندەش (لە سەردەمێکدا) مەیلیان بەلای مارکسیزمدا هەبووە.

لەکاتێکدا بوونگەرایی لەگەڵ هیچ تاپێکی سیاسیدا یەکناگرێتەوە، بەهەمانشێوە ئایدیۆلۆجیایەکی تایبەت بەخۆیشی دانەمەزراندووە. لەراستیدا چەمکی ئایدۆلۆجیا خۆیشی هێما بۆ جۆرێك لەدووڕوویی فیکریو بەدنیازی دەکات. بەڵام لەکاتێکدا بوونگەرایی لەگەڵ هیچ باوەڕێکی سیاسیدا یەکناگرێتەوە، ئاخۆ ئەمە ئاماژەیە بۆ نەبوونی حکومەت یان ئانارشیزم (ئاژاوەگەرایی)، بەڵام مەگەر کەسێکی دەمارگیر لەئانارشیزم بکات. لەجیهانێکی بەرکەماڵیشدا دەشێت دەزگای مەدەنی پێویست نەبێت، بەڵام لەجیهانێکدا کە بەرکەماڵ نییە، هەڵبەت بوونی حکومەت لەنەبوونی باشترە.

کەواتە ئایا ئەمە بەو مانایە دێت کە فەلسەفەی بوونگەرایی فەلسەفەیەکی ناسیاسییەو بایەخ بە ڕێکخراوی سیاسی نادات؟ بڕوام وا نییە. بەڵام من وایدەبینم کە هەڵوێستی کەسی بوونگەرا بەرامبەر بە سیاسەت دەشێ لە تێڕوانینی "یۆهانز میتز"ی مەسیحی بچێت بۆ ئەوەی پێی دەڵێت "خوداناسیی سیاسی" .

بەبڕوای میتز ئەرکی بنەڕەتیی کەسی مەسیحی لە سیاسەتدا ئەرکێکی ڕەخنەییە. نە بانگەشە بۆ هیچ ئایدۆلۆجیایەکی دیاریکراو دەکاتو نە دەچێتە بەرەی هیچ ئایدۆلۆجیەتێکەوە، بەڵکو لەڕێی ڕەخنەی کۆمەڵایەتییەوە هەوڵئەدات هەلومەرجێکی وا بڕەخسێنێتو پەرەی پێبدات کە بۆ وەدیهێنانی بوونێکی مرۆیی ڕەسەن پێویستە.

بەبڕوای منیش ئەتوانین بڵێین کە زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراکان ئەم کارەیان ئەنجامداوە. ئەوان بەو مانایە تاکگەرانین کە بایەخ بە ڕێکخراوە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکان نادەن، بەڵکو ئەوان دەیانەوێت بەسەربەخۆیی بمێننەوە تا بەئازادییەوە ڕەخنە لەهەر بزاوتێکی سیاسی بگرن کە سنوور بۆ ئازادیی مرۆیی دادەنێتو لەکەرامەتی ئینسان کەمدەکاتەوە. هەروەها ڕەخنە لە هەر ڕێبازێك دەگرن کە ڕێبازەکە بخاتە سەروو بوونی ئەو کەسانەوە کە پێویستە ڕێبازەکە لە خزمەتیاندا بێت.

ئەمەش خاڵی گەوهەرییە لە ڕەخنەی بوونگەرایانەدا بۆ مارکسیزم، ئەوەتانێ بێردیاییڤ دەڵێت: "لای مارکس چین لە مرۆڤ ڕاستەقینەترە" .

هەروەها "کامۆ"ش قسەیەکی لەمجۆرە دەکاتو دەڵێت "هێندەی مارکس پێشبینی حەتمیەتی هاتنی کۆمەڵگای بێچینی کردو، هێندەی بەمجۆرە ئیرادەی خێرخوازی مێژووی سەلماند، کەواتە هەر کۆسپێك لەبەردەم مێژووی سەلماند، کەواتە هەر کۆسپێك لەبەر پێشکەوتنماندا بەرەو ئازادی ئەدرێتە پاڵ ئیرادەی شەڕخوازانەی مرۆڤ. مارکسیزم بەڕوویەکدا تیۆرەیەکە جەخت لەسەر گوناهباریی مرۆڤو بێگوناهیی مێژوو دەکاتەوە".هەروەکو دەشبینین فاشیزم لە شێوە جۆربەجۆرەکانیدا دەوڵەت دەخاتە سەروو بوونی مرۆییەوە، بەڵام فەیلەسووفی بوونگەرا وایدەبینێت کە ئەرکی لەبواری

فەلسەفەی سیاسیدا، هەروەها لقەکانی تری فەلسەفەشدا دژایەتیکردنی هەموو جۆرە تەجریدکردنێکە کە مرۆڤ بشێوێنێت. چەمکی کەسێتیی جەستەیی دەوڵەتیش تەجریدکردنێکی لەم چەشنەیە. ئەمەش وێناکردنێکی خەیاڵییە بۆ دەوڵەتو نابێت بەهای بخەینە سەروو بەهای کەسێتیی راستەقینەی هاوولاتیانەوە.

بەم پێیە، وێڕای ئەوەی فەلسەفەی بوونگەرایی لەگەڵ هیچ ڕێبازێکی سیاسیدا یەکناگرێتەوە، بەڵام توانای رەخنەگرتنێکی سیاسیی وەهای بە بیرمەندان بەخشیوە کە دژ بە هەموو پێشێلکارییە سیاسیەکان بەرگری لەکەرامەتی مرۆڤ دەکات.

## ١.ڕەهەندە میتافیزیکەکانی بوونگەرایی

دۆخی میتافیزیکا لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر زۆر ئەگۆڕێت. سەردەمانێك هەبووە کە تیایدا بەڕاشکاوی بایەخ بە کێشەی دوا راستی دراوە، هەر لەو سەردەمانەشدا هەزری میتافیزیکی لەگەشەدا بووە. بەڵام لەسەردەمانێکدا کە تیایدا خەڵك "نازانمگەرا –لا ادری– agnostic" بوون، یان لە تێڕوانینیاندا پۆزیتیڤیست بوون، ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە سست دەبوو، یان هەر ئەستەم دەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا من گومانم هەیە لەوەی بتوانین بە جیددییەتێکی تەواوەوە لەمیتافیزیکادا دابڕێین، لەبەرئەوەی ئەوانەی نکوڵی لەمیتافیزیکا ئەکەن زۆرجار خۆیان بەشێوەیەکی پەنهان سەرگەرمی میتافیزیکای تایبەت بەخۆیانن.

ئەمڕۆ ئێمە دەزانین کە پتر لەیەك جۆر میتافیزیکا هەیەو هەندێکیان دەتوانن خۆیان لەو رەخنانە بپارێزن کە زیانی زۆر بە هەندێکی تریان دەگەیەنن. دەتوانین میتافیزیکای

تیۆریی باو بە هەوڵێك لەقەڵەم بدەین بۆ گشتگیرکردنی ئەقڵ بەجۆرێك کە دیاردە ئەزموونیەکان لەجیهاندا تێپەڕێنێت، وەکو تەقەلایەك بۆ پەیبردن بە راستییەك، کەوا گریمانە ئەکرێت لەسەروو هەستو لەودیو ئەم دیاردانەوەیە.

ئەمەش بەتەماحترین جۆری میتافیزیکایە، هەر ئەم جۆرەش لەزەینی کانت Kant و هیوم D. Hume دا بووە وەختێك رەخنەکانیان ئاراستەی میتافیزیکا کردووە. ئەم دوو فەیلەسووفە کۆتاییان بەمیتافیزیکا نەهێنا — چونکە لەسەدەی نۆزدەدا هێزی میتافیزیکی لەوپەڕی گەشەسەندندا بوو — بەڵکو نیشانەیەکی گەورەی پرسیاریان خستە سەر ئەم باسەی کە لای گەلێ خەڵك ناوی زڕابوو. بەڵام هەندێك جۆری تری میتافیزیکا هەن کە میانڕەوترنو، میتافیزیکایەکی وەسفین پتر لەوەی تیۆری بنو وەسفی ئەو کاتیگۆری (مقوله)یە گشتیانە دەکەن کە بەهۆیانەوە لەجیهان ئەگەین هەروەها گرنگترین هەلومەرجەکانی ئەزموونیش دەخەنە روو. هەندێك لە فەیلەسووفان کە نکوولی لەمیتافیزیکای تیۆری دەکەن، لەهەمانکاتدا ئامادەن بێ هیچ دوودڵیەك ئەوەی کەمن ناوم لێنا میتافیزیکای میانڕەو بەڕەوای بزانن. کانت گەرچی رەخنەی لەمیتافیزیکای ئەقڵی دەگرت، بەڵام لەوەدا دوودڵ نەبوو کە زاراوەی (میتافیزیکا) بۆ لێکۆڵینەوەی رەخنەیی خۆی سەبارەت بە هەلومەرجی گشتیی ئەزموون بەکاربهێنێت.

وەك چۆن ئاقاری جیاجیاش هەیە بۆ تێگەیشتن لە مانای میتافیزیکا، لە هەمانکاتدا جۆرێك لە دووفاقی بۆ هەڵسەنگاندنی بوونگەرایانەی ئەمجۆرەی باسی فەلسەفی دەبینینەوە. فەیلەسووفانی بوونگەرایی ئەوەندەی پەیوەندیی بە میتافیزیکای تیۆرییەوە هەبێت، هەروەکو زۆربەی فەیلەسووفە هاوچەرخەکان متمانەیەکی زۆریان بەتواناکانی ئەقڵ نییە. ئەوە بوو پێشتر لە شوێنێکی تری ئەم باسەدا زانیمان کە فەیلەسووفی بوونگەرا نکوولی لەوە دەکات هزر لەتوانایدا بێت پەی بە راستییە واقعییە زیندووەکانی بوونی مرۆڤ بەرێتو لە ڕێبازێکی ئەقڵیی گشتگیردا سیستماتیزەی بکات. سەبارەت بە بوونگەراییەکەی کیرکەگۆر وتوویانە کە بەرەنگاربوونەوەیەکی رێبازی

میتافیزیكی زاڵە لای هیگل، بوونگەراكانی دواتریش هەر بەم مانایـە بـە "دژە میتافیزیكـا anti–metaphysica" مانەوە. بەڵام بوونگەراكان پراگماتیست نین، لەكاتێكیشدا ئەوان كە متمانـەیان بـەمیتافیزیكای ئـەقڵی نـەماوە، مانـای وا نییـە هـەموو میتافیزیكایـەك رەتدەكەنەوە. هەر ئەوەندەش كە بوونی مرۆیی بابەتی سەرەكیی بوونگەراییە پرسیاری لەجۆری میتافیزیكی دەوروژێنێت، لەبەرئـەوەی فەیلەسـووفی بوونگـەرا نكـوولّی دەكـات لەوەی كە بـوون دیاردەیـەكی ئـەزموونیو بابـەتیكراو بێـت. بـەڵكو ئـەو لەگـەڵ "سـانت ئۆگەستین"دا یەكدەگرێتەوە كـە دەڵێـت مـرۆڤ خەرەندێكـەو لـەبوونی مرۆییـدا بـاڵابوون هەیەو، سەرچاوەیەكی لەبن نـەهاتووەو، پـەیبردن بـە قووڵاییـەكانی ئـەم بوونـەش واتـە رۆچوونە ناو جۆرێك لـە جۆرەكـانی توێژینـەوەی میتافیزیكیـەوە. هـەروەها بینیمـان كـە بوونـەوەری مرۆیـی لـە روانگـەی فەیلەسـووفی بوونگـەراوە لـە ژینگـەی دانابڕێـتو، بـەم پێیەش پرسیار كردن لە مرۆڤ پرسیاریشە لەجیهانو زەمـانو مێـژوو و پەیوەنـدیی مـرۆڤ بەم بابەتانەوە.

هەندێك لە فەیلەسـووفە بوونگـەراكان بەڕاشـكاوی وشـەی میتافیزیكـا بـەكاردێنن بـۆ گوزارشتكردن لەو بەشانەی فەلسەفەكانیان كە لە كۆمـەڵێك پرسـیاری گـشتی سـەبارەت بە پێگەی مرۆڤ لەجیهاندا ئـەدوێن، سـەرباری ئـەوەی كـە ئـەوان جیـاوازی لـەنێوان ئـەو جۆرەی میتافیزیكادا دەكـەن كـە جـەختی لەسـەر دەكـەنو لـە میتافیزیكـای سـوننەتی جیـای ئەكەنـەوە. هەنـدێك فەیلەسـووفی بوونگـەرای تـر خۆیـان لەوشـەی میتافیزیكـا دەپارێزنو، یان تەنانەت بەئەنقەست رەتیشی دەكەنەوە، بەڵام رەنگـە وشـەی تـری بـۆ نموو وەكو "ئۆنتۆلۆجیا" لەبری ئەو بەكاربهێننو پاشان دەسـت بـە لێكۆڵینەوەیـەكی وا دەكەن كە لەلێكۆڵینەوەی میتافیزیكی دەچێت.

لەو فەیلەسووفە بوونگەرایانەی كە بەئەنقەسـتیش وشـەی "میتافیزیكـا" بـەكاردێنن "بێردیـاییف"ە. راسـتە ئـەو دان بـەوەدا دەنێـت كـە "كانـت" نـاڕەوابوونی میتافیزكـای ئـەقڵانیی روونكردۆتـەوە، بـەڵام بـە بۆچـوونی ئـەو "هـەر كانـت خـۆی وایكـردووە كـە

میتافیزیکای بوونگەرایی شیاو بێت" . ئەوەی لێرەشدا پێی دەوترێت میتافیزیکای بوونگەرایی دەشێ "بێردیاییڤ" ناویشی بنێت میتافیزیکای "خود"، بەرامبەر بە میتافیزیکای بابەت. بەڵام دەستەواژەی میتافیزیکای خود دەستەواژەیەکی سەرلێشێوێنە، چونکە لەوانەیە لەم حاڵەتەدا وەك "خودێکی بیرکەرەوە" لە "خود" تێبگەین، لەکاتێکا "بێردیاییڤ" دەیەوێت جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە کە میتافیزیکا کاری مرۆڤە وەکو گشتێك، دەنا گەڕان بەدوای میتافیزیکایەکدا کە شێوەیەکی زانستیی پەتی هەبێت، یان زانستێکی بابەتیی ورد بێت، جگە لە سەرابێك هیچی دی نییە. لەبەرئەوەی میتافیزیکا بریتییە لە پەیبردن بە رۆحو لە رۆحداو لەرێی رۆحەوە. میتافیزیکا لەو خودەدایە کە بەها روحیەکان دەخولقێنێتو کرداری باڵاڕۆ ئەنجامدەدات، نەك لەبابەتدا بەڵکو لەو قووڵاییە تایبەتیدا کە پەردە لە رووی خۆی هەڵدەماڵێت . ئەم دەستەواژەیەی دواییش حەتمیەتی میتافیزیکا روونەدەکاتەوە بەو مانایەی کەبێردیاییڤ مەبەستی بوو. ئەمەش لەبەرئەوەی کە مرۆڤ لە رێی وەسفی ئەزمونیی بابەتیانەوە دەرك ناکرێت، بەڵکو مرۆڤ خاوەن رەهەندی وەهایە کە بەتەنها لەرێی توێژینەوەی میتافیزیکیەوە پەی پێ دەبرێت.

هایدیگەر "ئۆنتۆلۆجیا"ی کرد بەتەوەری بایەخدانی ژیانی ئەکادیمیانەی خۆی. وا سەیری لێکۆڵینەوەکەی بۆ بوونی مرۆیی دەکرێت کە وەسیلەیەکە بۆ گەیشتن بە کێشەی مانای بوون. هایدیگەر لە نووسینەکانی سەرەتایدا جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان "ئۆنتۆلۆجیا"و "میتافیزیکا"دا ناکات. لەکتێبەکەیدا: "میتافیزیکا چییە؟" پرسیارکردن لە نەبوون (عەدەم) ئەکاتە نموونەیەك بۆ پرسیاری میتافیزیکیو ئەوەش روونەدەکاتەوە کە ئەم پرسیارە لەپرسیاری بوون جیا نابێتەوە. بەڵام هایدیگەر وردە وردە گەیشتە ئەوەی کە توێژینەوەی ئۆنتۆلۆجی لەمیتافیزیکا جیا بکاتەوەو باس لە "زاڵبوون" بەسەر میتافیزیکادا بکات. بەڕای ئەو میتافیزیکا لەبری ئەوەی بایەخ بەبوون بدات وەکو

ئەوەی هەیە، بایەخی بە بوونەوەرەكان داوەو، جگە لەمەش نەیتوانیوە بگاتە ئاستی بیركردنەوەی ئۆنتۆلۆجیی راستەقینە.

"یاسپەرز" رقی لەهەردوو وشەی "میتافیزیكا" و "ئۆنتۆلۆجیا" دەبێتەوە، بەڵام ئەویش میتافیزیكایەكی تایبەت بەخۆی هەبوو كەناوێكی قورسی لێنابوو Periechontology واتە: ئۆنتۆلۆجیای گشتگیر "باسی ئێمە باسێكی ئۆنتۆلۆجی نییە بۆ جیهانێك لەپێناسەی بابەتی، بەڵكو ئۆنتۆلۆجیای گشتگیرە بۆ سەرچاوەی خودو بابەتو پەیوەندیی نێوانیانو پەیوەندییە ئاڵوگۆڕكەرەكانی نێوانیان" .

بابەتی ئۆنتۆلۆجیای گشتگیریش گشتگیرە، واتە ئەو بوارەی كە هەم خودو هەم بابەتیش ئەگرێتە خۆی. لەبەرئەوەی گشتگیریشە، كەواتە دیارە كە نابێتە بابەتێك بۆ لێكۆڵینەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئاشكرایە كە وێڕای ئەوەی "یاسپەرز" توێژینەوەكەی خۆی ناو نەناوە "میتافیزیكا" یان "ئۆنتۆلۆجیا" بەڵام بایەخدانی بە گشتگیر مۆركێكی رەها بەخۆیەوە دەگرێت كە ئەمەش مۆركی میتافیزیكایە، تۆژەر هەیە فەلسەفەكەی "یاسپەرز"ی بەجۆرێك لەخوداناسیی دونایی شوبهاندووە. بەدڵنیاییشەوە چەمكی "ئیمانی فەلسەفی" رۆڵێكی گرنگی تیا دەبینێت .

مرۆڤ دەتوانێت جۆرەها "میتافیزیكا" یان "ئۆنتۆلۆجیا" لای زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراكانی تریش ببینێتەوە. پێویستە مرۆڤ لەگەڵ ئەو رایەی رۆناڵد گریمسی"یشدا بێت كە دەڵێت: "ئەو بزاوتەی كە وەكو هێرشێكی توند كرایەسەر میتافیزیكای هیگلی، خۆیشی بەمانایەك لەماناكان بزاوتێكی میتافیزكییە. لەبەرئەوەی داگرتنی ئەقڵانیەتی ئایدیالیستیی باو لەسەر عەرشەكەی لەپێناوی تێڕوانینێكی "بوونگەرایانە"دا گرنگییەكی زۆر بە گەواهیی ئەزموونی ئینفیعالی ئەدات، لەبنەڕەتدا مەبەست لەمەش ئەوەیە كە ببێتە رێگایەك بۆ مرۆڤ تا بەرەو هۆشیارییەكی نوێ بەبوون بچێت" .

ئێستاش پێویستە بەوردەكارییەكی زیاترەوە لە شێوەی گشتیی ئۆنتۆلۆجیای بوونگەرایی بكۆڵینەوە.

## ٢.لەبوونی تاکە کەسەوە بۆ بوونی گشتی

لەبەشی پێشسوودا وتم مادامەکی مرۆڤ خەرەندێکە قووڵاییەکی بێکۆتایی هەیەو، مادامەکی تێگەیشتنی ئەستەمە گەر لەژینگەکەی (بە فراوانترین مانای ئەم وشەیە) دابڕین، کەواتە شیکردنەوەی بوونگەرایانە ئەمانگەیەنێتە سنوورەکانی بیرکردنەوەی ئۆنتۆلۆجی. بەڵام لای زۆربەی فەیلەسووفە بوونگەراکان شێوازێك هەیە کەدەکرێت بیناسینەوە، ئەمەش ئەوەیە کە ئەوان خاڵی سەرەتا لایان بوونی مرۆڤە، شێوە گشتگیرەکەیدا، نەك ئەقڵ Reason یان تێگەیشتنی پەتی Intellect وەك ئەوەی هەیە. سەرباری ئەمە خاڵی سەرەتا لایان بوونی مرۆڤە لە دۆخە قەیراناویەکانیدا یان دوا سنوورەکانیدا، بەجۆرێك کەڕۆشنایی ئەخرێتە سەر ئەم سنوورانە، یان تەنانەت ئەودیو ئەم سنوورانە. بەم پێیە، هەروەکو لەبەشێکی پێشتریشدا بینیمان، فەیلەسووفی بوونگەرا ئەتوانێت تەنانەت دەربارەی "هەستو سۆز"ی ئۆنتۆلۆجیو حاڵاتو گونجانانە بدوێت کە تیایاندا مرۆڤ بەدۆخی گشتگیری خۆی هۆشمەند دەبێت. هەر لەم دۆخانەشدایە کە ئەو وای بۆ دەچێت کە گەیشتووە بە ڕوانینە ئۆنتۆلۆجیەکانی خۆی، یان تێڕوانینی بۆ بوون، بەڵام ئێمە چی دەربارەی ئەم ڕوانینو تێڕوانینانە بڵێین؟ من پێشتر وتم کە ناتوانین سنوورێکی جیاکەرەوەی بنجبڕانە لەنێوان هەستو تێگەیشتندا دابنێین. بەڵام ئەمجۆرەی میتافیزیکاو ئۆنتۆلۆجیا کە بەشێوازێکی بوونگەرایانە پێی دەگەین، تەنانەت گەر بەمانایەك لەماناکان جۆرێك بن لەزانینیش، ئەوا بەدڵنیاییەوە هەمان ئەو دۆخە مەعریفیەیان نییە کە تایبەتن بەقسەکردنمان سەبارەت بەشتە واقعییە باوەکان. بێگومان کەسی بوونگەرا لەتێڕوانینە ئۆنتۆلۆجیەکەیدا لافی برێك لە (( حەقیقەت)) لێئەدات، کە جۆرێك لە کەشفکردن و ڕوونکردنەوەی تیایە، بەڵام ئەمە حەقیقەتێك نییە بسەلمێنرێ. ڕەنگە تاقە تاقیکردنەوەش ئەوە بێت کە داوا لەوانی تریش بکەین تا لەو تێڕوانینەماندا بەشدار بن، یان بەهەمان ڕێگادا برۆن کە ئێمە پیایدا ڕۆیشتووین، پاشان

لەوە دڵنیایین کە ئاخۆ ئەوانیش بەهەمان ڕوانینی ئۆنتۆلۆجی گەیشتوون، ئەمەش پێدەچێ هێمایەك بێت بۆ ئەوەی کە زمانی ئۆنتۆلۆجی زمانێك نییە وەسفبکات، بەڵکو زمانێکە دەوروژێنێت، چونکە والەویتر دەکات بێتە سەر هەمان ئەو خاڵەی کە ئومێد دەکرێ لێیەوە بگات بە کەشفکردنی بوون، بەمجۆرە پێویستە لەسەرمان بپرسین تا چ ڕادەیك مرۆڤ ئەتوانێ بڵێت کەئەم جۆرە کارە کارێکی مەعریفییە؟ ئاشکرا یە کە ئەم بیرکردنەوە ئۆنتۆلۆجییەی کە زۆر بەقووڵی بەگوێرەی هەست و سۆزەکان وحاڵەتەکان دروست دەبێت و لەزمانێکدا گوزارت لەخۆی دەکات کە زیاتر دەوروژێنێت نەك وەسفبکات، بریتی نییە لەجۆرێکی باوی مەعریفە بەڵکو لە هەندێ ئەزموونی ئایینیی وەکو سرۆش (وەحی) و بینینی سۆفینانە و یاخود لەو ئەزموونە ئیستاتیکیانە دەچێت کە لەقووڵایی پەیوەندیيە ئاڵۆگۆڕەکانیدا پەی بە شتەکان دەبات، تاقە زمانیش کە پێدەچێ دواجار بۆ دەربڕینی ئەم شتانە گونجاو بێت، زمانی ئەفسانە و شیعرە، یان دەشێ مرۆڤ بەتەنها بێدەنگی هەڵبژێرێت، تەنانەت گەر بکرێ سەبارەت بەشتێك بڵێین کەشتێکی زانراوە، یان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ تەعبیری لێ بکرێ، ئەوا ئەم زانینەش هەر دەبێ لەدۆخێکدا و لەگۆشەنیگایەکی دیاریکراوەوە بێت، هەروەها تەنانەت گەر بتوانین لە وانیتریش بکەین لەم تێڕوانینە ئۆنتۆلۆجیەدا بەشداربن، ئەوا ڕێژەییبوونی دۆخە مێژووییەکە هەر دەمێنێتەوە.

بەمجۆرە خۆمان لەناو جەرگەی کۆمەڵێك کێشەی دژواردا دەبینینەوە: ئاخۆ دەکرێ مرۆڤ باس لە فەلسەفەو حەقیقەت و تێگەیشتن بکات، لەکاتێکا وادێتە بەرچاو مرۆڤ کەوتبێتە سنوورێکەوە کەتیایدا هزرپیەویی خۆی لە دەستداوە و هەموو شتەکان لەناو تەمی شیعرو تەسەووفدا ئەدرەوشێنەوە ؟ یان ئاخۆ مرۆڤ دەتوانێ باس لەمەعریفە بکات ، یان وشەی قەبەی وەکو (( میتافیزیکا) و (( ئۆنتۆلۆجیا)) بەکاربهێنێت تا وەسفی تێڕوانینی بوونگەرایانەی خۆی بۆ بوون بکات؟ هەڵبەت فەیلەسووفی بوونگەرا نایەوێ بکەوێتە ژێر کاریگەریی کۆمەڵێك وەهمەوە سەبارەت بەوەی کە مومکینە، بۆ

نموونه ئەو نایەوێ بچێتە دەرەووی بوونی مرۆییەوە — گەر ئەم دەربڕینە ڕاست بێت — تاوەسفێکی وەهای بوون بەدەستەوە بدات کە ڕاستەقینە و گشتگیر بێت، واتە وەسفێك کە بەفراوانترین مانای ئەم وشەیە بابەتی و زانستی بێت و بەسەر هەمووکات و شوێنێکدا بچەسپێت. لەوانەیە هەندێ لە لایەنگرانی کۆنی میتافیزیکا بڕوایان وابووبێت کە لەتوانایاندا بووە وەسفێکی لەمجۆرە بەدەستەوە بدەن، بەڵام فەیلەسووفی بوونگەرا دوای ئەم ئامانجە ناکەوێت، ئەو لەباشترین حاڵەتدا بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ و کاوەخۆ سەبارەت بەبوون ئەدوێت، وەك ئەوەی لەڕوانگەیەکی نادیاریکراوی ناوبوون خۆیەوە لە بوون بڕوانێت بەڵام لەهەمەنکاتدا ئەو بەوە قایل نابێت کە قسەکانی بەقسەی بۆش لەقەڵەم بدرێت، یان بەوەی کە بەتەنها گوزارشتکردنە لەهەڵوونێکی خودی، ئەو دەیەوێ بڵێت کە جۆرێك لە زانین و بەشداریکردنی لەحەقیقەتدا هەیە، گەرچی ئەم لافلێدانەی گەلێ میانڕەوترە و مەرجدارترە لە لافە سوننەتیەکانی میتافیزیکای ئەقڵی.

من لەو باوەڕەدام کە باشترین ڕێگا بۆ هەڵسەنگاندنی سروشتی میتافیزیکای بوونگەرایی ولافەکانی ئەوەیە کە بەشتێك وردەکارییەوە لەنموونەیەکی بابەتیانە ڕابمێنین، بۆ ئەم مەبەستەش فەلسەفەکەی ((یاسپەرز)) و ئەوەی کە پێی دەڵێت ((ئۆنتۆلۆجیای گشتگیر))م هەڵبژاردووە، بەڵام گەلێك لەخەسڵەت و ئەدگارەکانی ئەم میتافیزیکا تایبەتەی بوونگەرایی ( گەر بۆم هەبێت ئەم دەربڕینە بەکاربهێنم) خەسڵەتی جیاکەرەوەی هەر میتا فیزیکایەکی بوونگەرایانەن.

بەبۆچوونی یاسپەرز، ئەو حاڵەی کە تیایدا پرسیارەکانی بوونی تاکەکەسی دەگۆڕێت بۆ پرسیاری فراوانتری وابەستە بەبوون و واقیعەوە بریتییە لە (( هەڵوێستە سنووردارەکان))، ئەم بیرۆکەیەش لەنووسینەکانی زوویدا سەریهەڵدا کەسەبارەت بەچارەسەری دەروونی بوون و لەکتێبی (( سایکۆپاتۆلۆجیای گشتی )) دا لەساڵی ١٩١٣ دا بڵاوبوونەتەوە، لەنووسینەکانی دواتریشدا ڕۆڵێکی گرنگی بینی .

(( هەڵوێستی سنووردار))یش هەروەکو بەناوەکەیدا دیارە، ئەو هەڵویستەیە کەتیایدا مرۆڤ ئەگاتە سنوورەکانی بوونی، بۆنموونە وەکو مەرگ یان گوناه و یان ئازار.

بەڵام پێویستە لێرەدا سەرنجی ئەوە بدەین کە سەرباری ئەوەی هەردوو چەمکی کۆتابوون و دڕدۆنگی هەروەکو چۆن لای زۆربەی بوونگەراکان هەیە، لای یاسپەرزیش هەیە، بەڵام یاسپەرز بەتەنها وێنەیەکی نەگەتیڤمان ناداتێ. ڕاستە مرۆڤ لەهەڵوێستی سنووردارد((هەرەسدەهێنێت)) یان(( تێکدەشکێت))، گەر بمانەوێ دوو دەستەواژەی خۆشەویستی خۆی بەکاربێنین، هەرچۆن ئەو شێوازە باوانە بەس نین کە مرۆڤ لەڕێیانەوە لەگەڵ دونیایەکەی خۆیدا دەکونجێت و لێی تێدەگات. لەگەڵ ئەمەشدا خەسڵەتی هەڵوێستی سنووردار ئەوەیە کەوا لە مرۆڤ دەکات پەی بەوە بەرێت کە بوونی بەخششێکە لە ((باڵاڕۆ ـــ المتعالی))ەوە ـــ ئەمەش پەیبردنێکە زۆر جیاواز نییە لە ئەزموونی لوتفی خودایی لە ئاییندا، بەدەربرینێکی تر، هەڵوێستی سنووردار لەیەك کاتدا هەم هەڵوێستێکی تێکشکێنەر و هەم هەڵوێستێکی ئازادکەرە، واتە ڕێی بۆ خۆشدەکات بەمانای تەواو ببێت بەمرۆڤ (( ئازادیی مرۆڤ جیانابێتەوە لە هۆشیاری بەسروشتی کۆتاداری خۆی (٦) کاتێکیش مرۆڤ هۆشیاری بەو باڵاڕۆ و بەوناکۆتایە لا دروست دەبێت کەبەرامبەر بەکۆتابوونی تایبەتیی خۆیەتی، ئەو کۆتابوونە تێدەپەڕێت و بەرەو (( سەرچاوەیەکی جیاواز لەو سەرچاوەیە دەچێت کە زانست لەبوونی کۆتاداریدا ئەیدۆزێتەوە))(٧).

ئایا دەتوانین بەشێوەیەکی ڕوونتر بڵێین کە یاسپەرز مەبەستی لەو باڵاڕۆیە چییە کە لەسنووری بوونیدا ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە. ئاخۆ وشەی باڵاڕۆ کە یاسپەرز بەکاریهێناوە، هاو واتای خودایە؟. بێگومان پەیوەندییەك لە نێوانیاندا هەیە، بەڵام ئەگەر مرۆڤ وێنایەکی دیاریکراوی بۆ خودا هەبێت، وەك ئەوەی خودایەکی تایبەت بەخۆی هەبێت، ئەوا ئەوکات ئەو وێنایە بەتەنها دەبێتە جفرییەکی باڵاڕۆ بیری لێ ناکرێتەوە، ناشبێت بە بابەتی هزر لەبەرئەوەی سەر بەبواری گشتگیرە، واتە ئەوەی کەبەر لە

خودوبابەت دێت، لە راستیشدا بالآرۆ گشتگیری هـەموو گـشتگیرێکە (( ئـەزەلی و نـەمر و جێگیر وسەرچاوە و گشتگیری هەمو گشتگیرێك ــ ئەمەنـە بەرجەسـتە دەکـرێ و نـە لـە هزردا دەرك دەکرێ، کاتێکیش بەوتەزای وەکو بوون و هۆ و بنەما و ئەزەلیـەت و فـەنا و فەنابوون وەسفی دەکەین، کاتێك جفرەی ئەم وتەزایانەی بەسەردا دادەبڕین، ئەوکات لـە دەستی ئەدەین)).(٨).

بەڵام یاسپەرز، دوای هەموو ئەمانە بەردەوام دەبێت و دەڵێت کە بالآرۆ : ((سـنوورێك نییە بوون و نەبوونی وەك یەك بێت و ئیدی بەمجۆرە لە هەربیرکردنەوەیەکدا لە دەسـتی بدەین، شتێك نییە کە هیٚ چاوو هزرێك پێـی نـەگات و بـەمجۆرەش بەلامانـەوە مەبەسـت نەبێت، بەڵکو مەبەستمانە تا ئەو ڕادەیەی کە هـیچ سەرچـاوەیەکی تـری ڕۆشـنایی نییـە وەکو ئەو هەموو بوون و لەگەڵیدا بوونی خۆشمان ڕوون بکاتەوە. بالآرۆ کەخۆی جفـرەی نییـە بـەڵام شـتێکە لـەڕێی زمـانی جفـرەوە پەویەنـدیی لەگـەڵ سـاز دەکـەین، بـیری لێ ناکرێتەوە  بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویـستە بـیری لێ بکەینـەوە، بەهـەمان ئەنـدازەی کـە بوونە نەبوونیشە))(٩).

ئاخۆ ئەمەزانین (مەعریفە)یە یان نا؟ ئاخۆ ئێمە دەزانـین یـان نـازانین؟ وەڵامـی ئـەم پرسیارە بەسـتراوەتەوە بـەڕادەی ئامادەییمانـەوە بـۆ دیـاریکردنی زانـین بەشـێوەیەکی فـراوان، لێـرەدا زانینێکـی وێنـەیی نییـە و ، نـاتوانین هـیچ شـتێك بـسەلمێنین. بـەڵام ((یاسپەرز)) ئامادە نییە بڵێت کـە مەسـەلەکە لێـرەدا بەتـەنها پەیوەنـدی یـە هەسـت و سـۆزی خودییـەوە هەیـە.، بەهـەرحاڵ ئـەم جفرانـەی بەشـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ و دیارینـەکراو ئامـاژە بـۆ ڕاسـتییەکی ئـەودیو خۆیـان دەکـەن. یاسـپەرز زۆری لـەبارەی ((ئیمانی فەلسەفی))یەوە نووسـیوە، ئـەم ئیمانـەش بریتـی نییـە لەکۆمـەڵێك مەسـەلەی سەلمێنراو سەبارەت بەگێتی، جەخت لەسەر ئەوەش دەکاتەوە کە بەتەنها بریتیـی نییـە لە حاڵەتێکی ئیمانهێنانی زەینی، چونکە ئەمـە ئیمانێکـە نـاوەڕۆکێکی هەیـە، ئیمانێکـە

ناسینی باڵاڕۆ و مەسەلەی ئاکاری و سروشتی کۆتاداری ناسەربەخۆی بوونی مرۆیی ئـەم دونیایە لەخۆدەگرێت.(١٠).

ئەم ڕێگایەی لەگەڵ یاسپەرزدا گرتمانەبەر، دەشـێ لای هەنـدێ فەیلەسـووفی تـری بوونگەراش ببینینەوە، بەنموونە لای هایدیگەر ))یش ئەمە دەبینین، دیارە کە ئـەو بـەو ئومێدە دەستی پێ کرد کـە بەڕێگایـەکی ((زانـستیانە " Wisseenschaftlich) لـە میـانی شیکردنەوەی بوونی مرۆڤ( dasein)ەوە بگاتە وێناکردنێکی تەواو بۆمانای بـوون (Sein)، بەڵام هەورەکو ئەو خۆیشی دەڵێت سەیری کرد ڕێگاکە لەبەردەمیدا داخراوە و پێویـستە لەسەری بەدوای ڕێگایەکی تردا بگـەڕێت بەدرێـژایی ئـەم ڕێگایـەی تـریش دەتـوانین ئـەو ئەدگارانـە ببینینـەوە کـە لای یاسـپەرز هـەبوون، گەرچـی لەبـەرگێکی تـردا و بـەناوێکی تـرەوەن، ئـەوەی هایدیگـەر لەلێکۆلێنەوەکەیدا : (( میتافیزکـا چـییە ؟)) باسـیدەکات، شتێکە لە هەڵوێستی سنووردار دەچێت لای یاسپەرز؟ ئـەویش ئەوەیـە کـە خـود لـەڕێی ئـەزموونی ئۆنتۆلـۆجی دڕدۆنگییـەوە بەرامبـەر بـە مـەرگ لەئاسـت نـەبوون (عـەدەم) و کۆتابوونی خۆیدا هۆشیار دەبێت. بەڵام ڕێك ئەمەش ئەو ڕێگایەیـە کـە وامـان لێ دەکـات ڕووبەڕووی بوون ببینەوە.

گەرچـی هایدیگـەر بـاس لـەوە دەکـات کـە لـەم ڕووبەڕوونەوەیـەدا هـیچ لۆجیکێـك نامێنێـت، بـەڵام هـەوڵی نـەداوە تیۆرەیـەکی وەهـا سـەبارەت بەلێـدوانێکی ناڕاسـتەوخۆ دابمەزرێنێت کەبتوانین بەبیرۆکـەی یاسـپەرز لـەبارەی جفرەکانـەوە بیـشوبهێنین. بگـرە تێڕوانینی ئـەو پـتر لەتەسـەووف و خوداناسـییەوە نزیکـە. بـەڵام ئـەو واتەماشـای زمـان دەکات ئەو ئامرازەیە کە بوون بەهۆیەوە لەگەڵ مرۆڤ (دازایـن)دا ئـەدوێت، بـەجۆرێك کـە بوون بێ شێوە نامێنێتەوە. لەراستیشدا بوون بەهەمانـشێوەی بوونـەوەرە کۆتادارەکـان نانـــسرێ و وێنانـــاکرێ، لەبەرئـــەوەی بـــوون خـــۆی (( ئـــەویتر)) ێکـــە ســـەبارەت بەبوونـەوەرەکانی دی، بـەڵام لەگـەڵ ئەمەشـدا بەتـەنها بریتـی نییـە لەتەمومـژێك یـان

وشەیەکی بۆش ( وەکو نیە وتوویەتی) ، بەڵکو لە هەموو ڕاستییە واقعییەکانی تر بابەتیترە.

هەروەها لای سارتەریش ئۆنتۆلۆجیا هەیە، گەر چی بوونگەرایی لای ئەو زیاتر پەیوەستە بە دیاردەکانی بوونی مرۆییەوە وەك لای یاسپەرز و هایدیگەر ( گەر شیاو بێت مرۆڤ قسە لەسەر (( بوونگەرایی)) بکات لای ئەمان). ئەوەش ڕاستە کە بڵێین لای سارتەر هەڵوونی ئۆنتۆلۆجی دەبینینەوە کە تاڕادەیەك لەوەحی یان ئیلهام دەچێت، بەڵام هەرگیز ناگات بەو سازشی نێوان بوونی مرۆڤ و بوونی گشتییەی کە لای فەیلەسووفە بوونگەراکانی ئەڵمان دەیبینینەوە.

لەڕاستیدا میتافیزیکاکەی سارتەر لەبنەڕەتدا دوالیست دێتە بەرچاو، لەبەرئەوەی مەودایەکی جیاکەرەوە، لەنێوان (( لەپێناو خۆیدا pour – soi)) و (( لەناوخۆیدا en soi)) هەیە.

## ٣.گەڕان بەدوای دوا ڕاستیدا

ئێستا زیاتر شێوی گشتی میتافیزیکا یان ئۆنتۆلۆجیای بوونگەراییمان بۆ ڕوونبۆوە، دیارە کە جیاوازیشە لەشێوازی باوی میتافیزیکای ئەقڵانی سوونەتی و لافی زانستێتی یان ڕاستیی (( بابەتێتی — مەوزوعیەت)) لێنادات. لەگەڵ ئەمەشدا نابێ وا سەیری میتافیزیکای بوونگەرایی بکەین کە میتافیزیکایەکی ئینفعالی و خودیەو بەس، ڕاستە هاوتەریبیەك لەنێوان ئەم و شیعردا هەیە، بەڵام ئەو لایەنگرانەی میتافیزیکا کە بوونگەراش نین، میتافیزیکایان بە شیعر شوبهاندووە، (( وایتهید))یش نموونەیەکی زەقی ئەمەیە بەڵام کەسیش وای دانەناوە کە شیعر لە جۆرێك حیکمەت و ڕوانینی تایبەت بەخۆی خاڵیە.

دەشێ تێڕوانینی دوالیستیانەی فەیلەسووفی بوونگەرا بۆمیتافیزیکا ئاماژە بۆ ڕێگایەکی تێگەیشتنی نوێ بۆ ئەو ئەنگێزە بەهێزەی دۆزینەوەی لێکدانەوەیەکی تەواو بۆ واقیع بکات. لەسەرێکی ترەوە دابڕانێك هەیە لەلافلێدانەکانی میتافیزیکای سوننەتی.

لەبەرئەوەی کۆتابوونی مرۆڤ و واقیعیبوونی و هەروەها مێژوویبوونی، ناهێڵن بگات بەتێڕوانینێکی تەواو بۆ هەموو شتەکان، لەگەڵ ئەوەشدا فەیلەسوفی بوونگەرا نایەوێ بچێتە ریزی پۆزیتیڤستەکانەوە لافی ئەوەش لێ ئەدات کە مرۆڤ دەتوانێ لایەنێکی ڕاستی ببینێت، گەرچی ئەم بینینەش خێراو بەش بەش بێت، تەنانەت زمانیش لەمەدا یارمەتی نادات، خۆ ئەگەر شتێکیش لەو ڕاستییە بدرکێنرێ هەر دەبێ بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ ئەوە بکرێ. لەڕاستیدا زمان لای ئەمانە هەندێ جار ئاڵۆز و ناڕوونە قسەکەریش هێندە بەسڵەوە ئەدوێت کە مرۆڤ گومان ئەکات لەوەی کە ئاخۆ شتێك سەبارەت ڕاستی وتراوە یان نا.

بەڵام فەیلەسووف هەر ڕێگای تایبەت بەخۆی هەیە، تەنانەت گەر ئەم ڕێگایەش دواجار لەگەڵ ڕێگای سۆفی و شاعیرەکاندا یەکبگرێتەوە. ڕێگای فەیلەسووفیش ڕێگای توێژینەوە و بیرکردنەوەی ئەقڵانیەو، ئەم ڕێگایە یان شێوازەش شێوازێکی ((زانستی))یە بە مانا فراوانەکەی ئەم وشەیە و ئامانجی پەیبردنە لە ڕێی چەمکسازییەوە و هێزی خۆشی دەخاتە ژێر ڕەخنەو شیکردنەوەی ئەقڵانییەوە. زۆربەی بوونگەراکانیش ئەم شێوازە ئەگرنە بەر، گەرچی دەشزانن کە ئەم شێوازە یان ڕێگایە بەو ئامانجەیان ناگەیەنێت کە بۆ خۆیان دیاری کردووە، بێگومان (( یاسپەرز)) گوزارشتی لەڕۆحێکی فەلسەفی کردووە بەمانا دروستەکەی کاتێك دەڵێت : ((دەبێ بیرۆکە بچێتە ژێر تاقیکردنەوەی توێژینەوەی زانستی هێمن و بێلایەنانەوە ، ئەگینا هەر زوو لەئاگری سۆز و هەڵچووندا دەفەوتێت، یان لەدەمارگیرییەکی وشك و بەرتەسکدا پەژموورده دەبێت)).

بەم بۆنەیەوە ئەم دەقەش لەکتێبێك وەرگیراوە کە لەناونیشانە ئینگلیزیەکەیدا مەغزایەك دەبینینەوە ((ڕێگای حیکمەت))(١١). ئیدی ئەو شێوازانە هەرچیەك بن کە

شاعیر یان سۆفی دەیگرنە بەر، بەڵام ڕێگای فەیلەسووف بۆ حیکمەت هەر دەبێت بە مکومبوونی هزری ئەقڵانیدا تێپەرێت،گەر بیەوێ ببێت بە فەیلەسووف.

بەڵام لەفەلسەفەی بوونگەراییدا ڕەخنە ئالۆگۆڕ دەکرێ. گەر زانست بیەوێ ڕەها بێت و ئاقارێکی ئەقڵانی بەسەرماندا زاڵبێت کە مۆرکێکی تاقیکاریانەی بەرتەسکی هەبێت، ئەوکات هەر بوونی مرۆیی خۆی ئەوە قبوولٚ ناکات. هەرلێرەشەوە ئەو هاوارە پڕ خرۆشەی ئۆنامۆنۆ هاتووە کەدەڵێت: (( ماتماتیک کاتێک دەکوژێت دەبێتە درۆیەک))(١٢). لای یاسپەرز ڕەخنەیەکی ئەقڵانیترانە بۆ زانست دەبینینەوە، بەڵام لەگەوهەردا لەو ڕەخنەیەی پێشوو دەچێت.

فەلسەفەی بوون وامان لێدەکات ئاگامان لەسنوورەکانی زانست بێت، هەروەها لەو شتانەش کە لەرێی میتۆدەکانی زانستەوە پێیاندەگەین. یۆجین ت. لۆنگ Eugene T.Long بەشێوەیەکی ورد ڕای یاسپەرز سەبارەت بەم بابەتە پوخت دەکاتەوە و دەڵێت: (( زانست ناتوانێ زانینی خودی بوون بەرهەم بهێنێت، بگرە ئەو بەتەنها زانینێکمان سەبارەت بەدیاردەکان و بابەتە بەشەکی ( جزئی) یەکانی ناو سیستمێکی کۆتادار دەخاتە بەردەست . هەروەها زانست ناتوانێت مانا یا ئامانج بەهاو یان ئاراستە بەژیان ببەخشێت. بەڵکو ئێمە لە ناوجەرگەی بیرکردنەوەی زانستیدا دەشێ لە سنورەکانی ئاگادار بین، هەربەمجۆرە لەو شتەش ئاگادار بین کە سەرچاوەکەی لە شتێکی تردایە و بە توێژینەوەی زانستی پێی ناگەین، هەربۆیە ئێمە دەتوانین لە تەقەلاکردن لە پێناوی گەیشتن بەیەکەیەکی پێدراوە بەشەکیەکانی زانست بەئاگابین))(١٣).

لە ڕاستیشدا فەیلەسووفی بوونگەرا لە فەیلەسووفی پۆزیتیڤیست واقیعترە، لەبەرئەوەی دان بەوەدا دەنێت کە میتافیزیکا هەروەکو کانت جارێک لە جاران وتوویەتی(( ئامادەگیەکی سروشتی ئەقڵە)). هەربۆیە سەرباری وریاکردنەوە پۆزیتیڤیستیەکان ئەقڵی مرۆیی لەودیو دیاردە ئەزموونیەکانەوە سەرچڵیی خۆی هەر

دەکــات. بــەڵام ئەمــە بەتــەنها تینووێتیەیــەکی فیکــری نییــە، بــەڵکو هانــدەرێکی بوونگەرایانەی بنەڕەتیەیـە لـە مرۆڤـدا. چـونکە کێـشەی ئۆنتۆلـۆجی گرێـدراوی کێـشەی بوونگەراییە کەسـیش ناتوانـێ رێ لـە خـۆی بگرێـت تاپرسـیار لـە کێـشەی بوونگەرایانـە نەکات، لەبەرئـەوەی ناتوانـێ رێ لـە خـۆی بگرێـت ئـەو برسـیارانە نـەدات کەبـەبوونی و دیاریکردنی ئامانج و بەهاکانیەوە پەیوەستن. بەڵام کاتێکیش ئەمە دەکات پێویـستی بـە ئاراستەکردنێکە لەجیهانەکەیدا و هەروەها بەڕوانینێکی یەکگرتوو (رۆیە موحدە).

هــەروەکو بینیمــان، فەیلەســووفە بوونگــەراکان بەوپــەڕی هۆشــیاریەوە دەرکیــان بەوەکردوە کە ناتوانین ڕێبازێکی میتـافیزیکی و دابمـەزرێنین کـە بەشـێوەیەکی ئـەقڵانی بیسەلمێنین.، کاتێك بڕیار لەسەر ئەوە ئەدەین چ شتێك ڕاستە و چ شتێك ڕاسـت نییـە، ئەم بڕیارە جۆرێك لەریسك و ئیلتیزام لـە خـۆ دەگرێـت.، لـەم خاڵەدایـە کەفەیلەسـووفی بوونگـەرا دەچـێتە سـەروو کـردەی سـەلماندنەوە و ، لەگـەڵ شـاعیران و سـۆفیەکاندا یەکدەگرێتەوە. بەڵام ئەو شتەی ئـەم وەکـو فەیلەسـوفێك لـەوان جیادەکاتـەوە ئەوەیـە کەئەم بازدانەی ئەو بـازدانێکی نارەخنـەیی نییـە، هـەروەکو کیرکـەگۆریش بـۆی چـووە. بەڵکو تەنانەت دوای ئەم بازدانەش ڕەخنەگرتن هەر بەردەوام دەبێت.

ڕەگوڕیشەی زانین و هاندەری ئەقڵ بەشێوەیەکی قووڵ لەگەڵ ڕەگو ڕیشەی حەز بۆ بوون و هاندەری ناوەوەی کەس و گشتێك تێکەڵدەبێت.

لەهەموو زانینێکدا فاکتەرێکی کەسی (یان شەخسی) هەیە. تەنانەت گەر ئـەو زانینـە لەو جۆرانە بێت کە باوو ئاشنان.

چەند بەرەو ئەو جۆرەی زانینیش بچین کە پـێی دەوترێ ((میتافیزیکا)) گرنگی ئـەو فاکتەرە زیاتر دەبێت، لەبەرئەوەی ئەم زانینە پەیوەندی لەگەڵ ئەو بیرو باوەڕانەدا هەیە کە ژیانی ئێمە فۆرمولە دەکەن. بەواتایەکی دی میتافیزیکـا ڕەهەنـدێکی ئـایینیی هەیـە، لێرەشـدا وشـەی ((ئـایینی)) بـەفراوانترین مانـانی بەکاریـدەهێنین، واتـە لـەو کەسـانەدا قەتیس نەکرێ کە دواجار بەمیتافیزیکایەکی خودایی دەگەن. ف. هـ. برادلی دەڵێت:

(( مـن لـەو بڕوایـەدام کـە هەریـەکێك لـە ئێمـە کـەم تـا زۆر سـنووری واقیعـی بـاو تێدەپەڕێنین، هەریەکەو بەشێوازێك ئـەگات بەشـتێك کـە جیهـانی بینـراو تێدەپـەڕێنێت. ئێمە بەشێوازی جیاجیا شتێکی باڵاتر ئەدۆزینەوە، شتێك کە لەیـەك کاتـدا پـشتیوانیمان دەکات و ئازاریشمان ئەدات، پاکمان دەکاتەوە و نەشئەمان تیا دەبزوێنێـت. لای هەنـدێ کەسیش تەقەلای ئەقڵ بۆ تێگەیشتنی گەردوون شێوازی سەرەکی تاقیکردنەوەی بوونی خوایە، هەڵبەت ئەو کەسەی هەستیشی بەمە نـەکردبێت ــ ئیـدی شـێوازی وەسـفکردنی چـەند جیـاوازیش بێـت ــ ناچـێتە ڕیـزی ئـەو کەسـانەوە کـە میتـا فیزیکایـان بـەلاوە گرنگە))(١٤).

بەڵام وێڕای ئەوەی کە ڕەهەندی کەسی (یان شەخسی) و بگرە ئاینیش لەو جـۆرەی زانیندا زۆرگرنگە کە پێی دەڵێن میتافیزیکا، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کـە چـیتر کـەس ناتوانێ باس لە زانین بکات، ڕاستە فەیلەسووفی بوونگـەرا دان بـەوەدا دەنێـت کـە مـرۆڤ ناتوانێ لافی ئەوە لێبدات کە ئەم زانینە مۆرکی گشتگیریی زانستیانەی بەخۆوە گرتووە، لەبەرئـــەوەی میتافیزیکـــا بـــە هەلومـــەرجی ڕەوتـــی مێژووییـــەوە و ، هـــەروەها بەگۆشـەنیگایەکی کۆتـادار و بگـرە بەکەسـێتیی ئـەو لایـەنگرەی میتافیزیکـا و ڕادەی هەسـتیارێتیەوە بەسـتراوەتەوە. هـیچ ئۆنتۆلۆجیایـەك نییـە کامـڵ و تـەواو بێـت. بـەڵام دەشـێ درەوشـانەوەی ڕوانینـی ئۆنتۆلـۆجی بـەنرخترین زانـین بێـت بـۆ ئێمـە گەرچـی ناشتوانین بەشێوازێکی بابەتیانە (مەوزوعیانـە) ڕاسـتی ئەمـە بسەلمێنین، بـەڵام هێنـدە ڕاستە کە بەرەو لێکدانەوەیەکی کامڵتری بوونی ئەو کەسانەمان بەرێت کە بانگەشەی بـۆ دەکەن. من مەبەستم لەوەش نییە کە ئەو زانینە بەتەنها شتێکی (( بەسوودە بۆ ژیـان)) یان ئەوەی کە دەبێ بەشێویەکی پراگماتیانەی پەتی و حـوکمی بەسـەردا بـدرێ، بـەڵکو مەبەستم ئەوەیەکە ئەو زانینە بناغەیەکمان ئەداتێ بۆ بیناکردنی بوون ومانـا، کـە تابێـت فراوانتر دەبێت، لەگەڵ فراوانبوونی بەردەوامی ئەم بینایەشدا، خودی ئۆنتۆلۆجیاش قایم و پتەو دەبێت.

میتافیزیکا گەڕانە بەدوای دوا ڕاستیدا (یان ڕاستیەکی ڕەهادا)، ئاینیش دەڵێت کە ئەو دوا ڕاستیە خودایە. لایەنگرانی میتافیزیکا هەندێ جار هەوڵیانداوە بوونی خودا بسەلمێنن. هەندێ جاری تریش میتافیزکایەکیان دامەزراندنووە کەدانی بەبوونی خودا نەناوە. هەڵبەت زۆرجاریش گوتراوە کەخودای فەیلەسووفان جیاوازە لەخودای ئایین، ئەمەش دەستەواژەیەکە کەتەواو لەگەڵ رۆحی بوونگەراییدا دەگونجێت، لەبەرئەوەی کاتێك فەیلەسووفی بوونگەرا دەربارەی خوا ئەدوێت، ئەم لێدوانەی پشت بەبەڵگەیەکی ئەقڵانی نابەستێت تابوونی بسەلمێنێت، بەڵکو دەرەنجامێکی بیرکردنەوەیەتی لەمانای بوونی مرۆیی، کاتێك پەی بەدوورترین سنوورەکانی بوون دەبات. هەندێ لەفەیلەسووفە بوونگەراکان باس لەخوا دەکەن و هەندێکی تریان باسی لێ ناکەن. بەمجۆرە سەرلەنوێ دەگەڕێینەوە بۆ جیاوازی نێوان بوونگەرایی ئیماندار کە نوێنەرانی بریتین لە(کیرکەگۆر و مارسیل و بوبەر و هەندێکی تر) و بوونگەرایی بێئیمان (کە سارتەر و کامۆ نوێنەرایەتی دەکەن). پێشتریش وتم نابێ مۆرکێکی ڕەها بدرێ بەم جیاوازیەیە و ، بەبڕوای من ئەو لێدوانەی لەم بەشەدا خستمانە ڕوو ڕوونیکردەوە کە جیاکردنەوەی دان نان بەبوونی خودا و نەبوونیدا لای هەندێ لەبوونگەراکانی ئەستەمە، لەبەرئەوەی بوونگەرایی خۆی لە شێوازی چارەسەرکردنیدا بۆ ئەم کێشەیە، لەنێوان ئیمان و گوماندایە، بۆ نمونە ئیمانەکەی کیرکەگۆر شل و شێواوە و ڕیسکئامێزە، بەڵام لەبێباوەڕیەکەی ((کامۆ))دا هەندێ توخمی ئیمان دەبینینەوە ئەگینا ئەگەر هەموو شتێك پووچ و بێمانا بێت، کەواتە یاخیبوون دژ بەمامەڵەکردنی مرۆڤ وەکو شتێك، چ مانایەکی دەبێت. دەبێ مانای خوداناسی لە میتافیزیکای بوونگەراییدا لە سەرچاوەکانی بەخشش وداوەری جیانەکەینەوە کە لە قووڵاییەکانی بوونی مرۆڤدا خۆیان حەشارداوە. ناشبێ لەڕووی باوەڕهێنان یا باوەڕنەهێنان بە بوونەوەرێکی باڵاوە کە لە سەروو دونیای هەستەوەیە ( ئەمەش مانای خوداناسیەیە لە زۆربەی ڕێبازە میتافیزیکییە سوننەتیەکاندا) بڕوانینە جیاوازیی نێوان بوونگەرا ئیماندار و بوونگەرا بێئیمانەکان.

بەڵکو لەرووی باوەڕیانەوە بەوەی کە ئاخۆ لێکدانـەوەی بنـەڕەتی بـۆ بـوونی مرۆیـی مانایەکی هەیە یان نییە، هەروەها ئاخۆ چاودێرییەکی خودایی بۆ مرۆڤ هەیە یـان نـەخێر و جگە لەپووچی هێی دی نییەو لێرەدا دەتـوانین ئـەو بیرۆکەیـەی ((ریکـۆر)) بهێنینـەوە یادی خۆمان کە دەڵێت دەشێ ئەم جیاوازییە گوزارت لە جیاوازیی نێوان نامۆییبوون یان ئاشنایەتی پێمان دەکات. ئـەوەش جیاوازییەکـە کـە بۆماوەیـەکی زۆر لـەتیۆلۆجیادا بـۆ بـەجیاوازیی نێـوان رێگـای نەگـەتیڤ (( via negatie)) و رێگـای لێکـچوواندن (( via eminentia)).

یاسـپەرز و هایدیگـەر بایـەخێکی تایبـەتیان بـەوەدا کـە لـە بوونگەراییـدا زەحمەتـە جیاوازییەکی بنجبڕانە لەنێوان خوداناسـی وخودانەناسـیدا بکـەین. هـەروەها بوونگـەرایی شێوەی لێدوانی سوننەتیانەی سەبارەت بـەبوونی خـودا گـۆڕی.، لەبەرئـەوەی ئـەم دوو فەیلەسـووفە خۆشـیان تاڕادەیـەك ئەکەونـە مابـەینی داننـانی ڕاشـکاو بـەبوونی خـودا و نکووڵی لێکردنیدا. چونکە نە((باڵابوون)) لای یاسپەرز و نە (( بوون))یـش لای هایدیگـەر مانای ((خودا)) ناگەیەنن بەمانا – سـوونەتیەکەی ئـەم وشـەیە. بـەڵام ناشـتوانین بلـێین بێباوەڕن، لەبەرئەوەی هەم ((باڵابوون)) و هەم ((بوون))یـش بـەمانای فراوانـی ئـەم دوو وشـەیە خەسـڵەتی خـودایی لـەخۆدەگرن. ئەمانـە ئـەو جیاوازییـەمان دەهێننـەوە یـاد کەمایستەر ئیکهارت لەنێوان خـودا deitas و ((پـەرسـتراو)) dues دا کردوویـەتی. یـان (( ئەو خودایەی کە لە سەروو پەرستنەوەیە)) و پۆڵ تیلیش لێی دواوە. لەبەرئەوە شـتێکی سەیر نییە هایدیگەر ئەوە رەتبکاتەوە کە ئاخۆ باوەڕی بەخودا هەیە یـان نـا. لەڕاسـتیدا وەختێ بوونگەرایی دەگۆڕێ بۆ ئۆنتۆلۆجیا، کۆمەڵێك توانستی نـوێ بـۆ بیرۆکـەی خـودا فەراهـەم دەکـات، کـە دەشـێ لـە چـەمکی سـوننەتیی خـودا پەرەسـەندووترین، بـەڵام فەلـسەفەی بوونگـەراییش لەهـەر فەلـسفەیەکی تـر زیـاتر ناتوانـێ تەمومـژی دونیـا ڕوونبکاتەوە.

## ٤.چارەنووسی تاکەکەس

ئەگەر گەڕان بەدوای دوا ڕاستیدا و لێدوانی بەردەوام لەسەر سروشتی خودا یەکێك بێت لە گەورەترین کێشەکانی میتافیزیکا، ئەوا کێشەیەکی دیکەش هەیە کە ئەویش کێشەی خولیای زانینی دوا چارەنووسی تاکەکەس و هیواو ڕامانەکانێتی سەبارەت بەنەمربوون.

عادەتەن وا سەیری ئەم دوو کێشەیەش دەکرێ کە تەواو پێکەوە پەیوەستن، چونکە وەڵامدانەوەی ئەرێ بەیەکێکیان وەڵامدانەوەی ئەرێ بە کێشەکەی تریش لەخۆدەگرێت.

بەڵام ئەم حاڵەتە بەردەوام وانەبووە، پێدەچێ بایەخی بوونگەرایانەی ئەم دوو کێشەیەش لەیەکێکەوە بۆ یەکێکەی تر بگۆڕێت. کەسانێك هەبوون کە بەخودا مەست بوون و خودا لایان هەموو شتێك بووە و گوێیان بەچارەنووسی تاکەکەس نەداوە، چونکە ئەمانە ویستوویانە تاکەکەس لە خودادا فانی بێت گەر ئەو فەنابوونەی بە شێوازێك لەشێوازەکانی بوونی دەوڵەمەند بکات. کەسانێکی تریش هەبوون نکۆڵییان لەبوونی خودا کردووە، کەچی باوەڕی تەواویان بە نەمریی ڕۆح هەبووە پاش مەرگ ((هەر بۆ نموونەش فەیلەسووفی ئینگلیز ماکتاگارت)).

لەوانەیە مرۆڤ وابزانێت کە بوونگەراکان زۆر خۆیان بە کێشەی دواچارەنووسی تاکەکەسەوە خەریك کردبێت، مادامەکی جەخت لەسەر دانسقەیی تاکەکەس و بێهاوتایی دەکەنەوە، بەڵام ئەمە ڕاست نییە. ڕاستە هەندێکیان باوەڕیان بەجۆرێك لەنەمری هەیە، هەروەکو کیرکەگۆر. ئەو بڕوای وایە کە مرۆڤ ئاوێتەیەکە لە زەمانمەندی و ئەزەلیەت. هەروەها (( بێردیاییڤ)) نکوولّی لە نەمری میتافیزکی یان سروشتی دەکات، بەڵام باوەڕی بەوە هەیە کە دەکرێ بگەینە جۆرێك لە بوونی مرۆیی کەبتوانێت (( بەسەرمەرگدا زاڵبێت)). بەڵام نزیکترین هەڵوێست لە نموونەی بوونگەراییەوە ئەو هەڵوێستەیە کە مەرگ وەکو دوا سنوور سەیردەکات. پێشتر بینیمان کە چەمکی مەرگ

چ ڕۆڵێکی گرنگی لە هـزری کەسـانێکی وەکـو ((هایدیگـەر)) و ((سـارتەر)) و ((کـامۆ))دا بینیوە.

بەلای ئەوانەوە بەر لـە هـەموو شـتێك مـەرگ کۆتـابوونی مـرۆڤ پێکـدێنێت. زاڵبـوونی بیرۆکەی مەرگ بەسەر بیرکردنەوەیاندا بووەتە مایەی نەغمەیەکی خـەمناك لـە فەلـسەفە کانیانـدا ، بـەڵام تەنانـەت ئـەمانیش لـەناو جەرگـەی زەمانمەندیـدا و لـەڕەوتی هـەوڵ و تەقەلایاندا بۆ یتێپەڕاندنی بەدوایەکدا هاتنی فانیانەی بوونی مرۆییدا، بەدوای جۆرێـك لـە (( ژیانی ئەزەلی))دا دەگەڕێن.

بەبڕوای من دوو سـەرنج هـەن کـە لـە فەلـسەفەی بوونگەراییـەوە سەرچـاوە دەگـرن وکاریگەرییان لەسەر کێشەی دواچارەنووسی تاکەکەس هەیە. ئـەم دوو سـەرنجە بـەهیچ شـێوەیەك لـە (( بەڵگـەکان))ی نـەمری ناچـن، بـەمانا سـوننەتیەکەی، بـەڵکو بەوپـەڕی سادەییەوە بریتین لە دوو ڕێنیشاندەر کە ناچـارمان ناکـەن قبووڵیـان بکـەین. بـەڵام مـن لەوبڕوایەدام کە دوو سەرنجی گرنگن و ئومێدێکمان ئەدەنێ بەوەی کە ئـەو تاکەکەسـەی کەسی تر جێی ناگرێتەوە،چارەنووسی فەنابوونی تەواوەتی نییە.

سەرنجی یەکەم: پەیوەستە بە سەرڕابوونی بوونی مرۆڤەوە. ژیـان لای مـرۆڤ بـریتی نیە لە ژیانێکی بایۆلۆجی یان چـەندێتی (کمـی) و بـەس، بـەڵکو ئەچـێتە ژێـر کاریگـەری کۆمەڵێك گۆڕانکاریی چـۆنێتیانەوە کـە لەگەڵیـدا خولیایـەك هەیـە بـۆ ڕزگـاربوون لـەوەی فانییە و درێژەدان بە ((چرکە سـات))ی سەرشـار. لانـی کـەم لای هەنـدێك فەیلەسـووف هەستێکی قووڵ هەیە بەوەی کە ژیان بەسەربردن بەمجۆرە چارەنووسی فەنابوون نییـە. بەتایبەتی ئۆنامۆنۆ (( گوزارتێکی کلاسیکانەی لەم شەوقە پڕ تامەزۆرییـە بـۆ ئەزەلیـەت کردووە)). هەستکردن بەفەنابوونی ئەم جیهانە گـڕی عیـشق لەناخمانـدا دادەگیرسـێنێت و، هەر بەتەنها عیشقیش لەتوانایدایە بەسەر ئەم فەنابوونەدا زاڵبێت و سەرلەنوێ ژیانمان سەر شـار بکـات و ئەبەدیـەتی پـێ ببەخـشێت.. کـاتێکیش عیـشق لەگـەڵ چارەنووسـدا دەرگـیر دەبێـت، هەسـتێکی وامـان لادەوروژێنێـت کـە ئـەم جیهانـە ڕووکەشـە فانییـە و

ڕوخساری جیهانێکی ترمان پیشاندەدات کەتیایدا چارەنووس بێدەسەڵاتە و ئازادی فەرمانڕوایە (١٥).

بەمجۆرە ئەم شەوقە پڕتامەزرۆییەی دڵ زاڵە ، ئیدی ((پاساوەکانی ئەقڵ)) هەرچییەك بن. ئەوەتانێ ئۆنامۆنۆ دەڵێت: لێگەڕێن بالانی کەم شایستەی نەمری بین. ئێمە کە چارەنووسمان هەرنەمانە، ئەمە واتە مەحکومکردنی گەردوون خۆی : (( ئێمە کە هەرنەمان (عەدەم) چاوەڕێمان دەکات ، دەبا کارێك بکەین پیشانی بدات کە ئەم قەدەرە قەدەرێکی ستەمکارە))(١٦).

بەڵام سەرنجی دووەم سەرنجێکی شیکارییە پتر لەوەی سۆزداری بێت و پشت بەو ڕایە دەبەستێت کەشیکردنەوەی بوونگەرایی ماهیەتێکی بەجۆش و خرۆشی وەها لە مرۆڤدا دەدۆزێتەوە کە لەناو سنووری ژیانە دونیاییەکەیدا نایەتەدی و ئاماژە بۆئەوە دەکات کە دەشێ دوای مردنی بێتە دی. گەرچی خوداناسی ئەڵمانی ((ڤ. پانینبێرگ)) بەبوونگەرا ناژمێردرێ، بەڵام ئەو شیکردنەوەیەکی فینۆمینۆلۆجی بۆ مانای هیوا لەبوونی مرۆییدا دەکات تا پشتیوانی لەوە بکات کە پێیدەڵێن ((قیامەت – زیندووبوونەوە)) نەك نەمری. لەمبارەیەشەوە دەڵێت: ((فینۆمینۆلۆجیای هیوا ئاماژە بۆئەوە دەکات کە بوونی مرۆیی هۆشیار هیوا بە ژیانی پاش مەرگ دەخوازێت)).

لەسەرێکەوە (( پانینبێرگ)) پشت بە هۆشیاریی مرۆڤ بە مەرگ دەبەستێت، ئەمەش لەبەرئەوەی هۆشیاری بە مەرگ وەکو سنوورێك لەهەمانکاتدا بریتیە لە توانای وێناکردنی شتێك کە ئەم سنوورە تێدەپەڕێنێت.

هەرچۆن لەسەرێکی ترەوە پشت بە کرانەوەی مرۆڤ و تێپەڕاندنی خودی خۆی دەبەستێت، ئەو خودەی کە هانی ئەدات بەردەوام حاڵەتە هەنووکەییەکانی خۆی تێپەڕێنێت. بەمجۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە شێوازی لە بەڵگە هێنانەوەدا لە دوو توخمی سەرەکیی فەیلەسووفەبوونگەراکانەوە وەرگیراوە.(١٧).

دەشێ مرۆڤ وا وەڵامی ئۆنامۆنۆ بداتەوە کە گەردوون ستەمکارە، هەورەها وەهاش وەڵامی پانینبێرگ بداتەوە کەماهیەتی مرۆڤ وەدی نایەت و دوچاری شکست دێ، ئەمەش ڕێی تێدەچێت. لەوانەشە سەرشاربوونی ژیان و دیاردەی هیواش دوو ڕێپیشاندەری وەهمی دواچارەنووسی مرۆڤ بن. بەڵام شتێکی ئاشکرایە کە کێشەی چارەنووسی تاکەکەس لە کێشەی دوا ڕاستی جیانابێتەوە. خۆ ئەگەر ئەم دونیایەش دونیایەکی پووچ و بێ خودایە، ئەوا هیچ چارەنووسێك بۆ تاکەکەس نییە، خۆ ئەگەر دونیاش بریتی یە لە ڕەوتێکی مانادار کە تیایدا خودا یان باڵابوون کۆمەڵێك ئیمکانی داهێنەرانە لە ناو بوونەوەرە کۆتادارەکاندا وەدی دەهێنێت، ئەوکات ئەقڵ ئەیبڕێت کە هیوامان بەهەر شتێکی بەهادار هەبێت کە بەمجۆرە بەدی بێت ودواجاریش لەناو نەچێت.

# بەشی چواردەیەم

## کاریگەریی فەلسەفەی بوونگەرایی لەسەر بوارەکانی هونەرو زانست

١.فەلسەفەو کەلتوور

٢.بوونگەراییو دەروونناسیو دەروونپزیشکی

٣.بوونگەراییو پەروەردە

٤.بوونگەراییو ئەدەب

٥.بوونگەراییو هونەرە بینراوەکان

٦.بوونگەراییو ئاکار

٧.بوونگەراییو خوداناسی

## ١.فەلسەفەو كەلتوور

پەیوەندیی فەلسەفە چییە بەو كەلتوورەوەی كە تیایدا نەشو نما دەكات؟ ئەمە پرسیارێكە وەڵامدانەوەی ئاسان نییە. ئەمڕۆش كفتوگۆیەكی تازە سەبارەت بە بەرپرسیارێتیی كۆمەڵایەتیی فەیلەسووف لە ئارادایە، ئەوەندەی پەیوەندیی بە بوونگەراییەوە هەبێت، وەكو دەردەكەوێت پەیوەندییەكی ئاڵوگۆڕی لەگەڵ كەلتووری باودا هەیە. لە سەرێكەوە، بوونگەرایی بەشێوەیەكی ئەقڵانیی راشكاو گوزارشتە لەو تەوژمانەی كە لەقووڵایی كەلتووری هاوچەرخدانو ئەو چاوپیاخشانە مێژووییەی كە لە سەرەتاكانی ئەم كتێبەشدا ئەنجامدان دا بەڵگەی ئەمە قسەیەمانە.

لەسەرێكی تریشەوە، بوونگەرایی ئەركێكی پێشبینانەی هەیەو رەخنە لە جیهانی هاوچەرخ دەگرێتو، بەتایبەتیش رەخنە لە هەموو ئەو شتانە دەگرێت كە پێدەچێت هەڕەشە لە ئیمكانی بوونێكی مرۆیی رەسەن بكەن.

هەڵبەت ئەم قسەیەش دانانە بە دوو فاقێتیی ئاقاری كەلتووری هاوچەرخدا، كە كۆمەڵێك ئاراستەی دژ بەیەك لە خۆدەگرێتو، یەكەیەك پێكناهێنێت.

دەکرێت لەو ڕووەشەوە بڕیار لەسەر گرنگیی فەلسەفەی بوونگەرایی بدەین (هەروەها هەر فەلسەفەیەکی تر) کە تا چەند توانیویەتی چێوەی ئەو بازنە تەسکانە بکشێنێت کە فەیلەسووفە پسپۆڕەکان خۆیانی تیا قەتیس دەکەن، بە مەبەستی کاریگەرییەکی کەلتوورییانەی فراوانتر، ئەمەش یان بەگوزارشتکردن لەرۆحی کەلتوورەکەو یاخود بە رەخنەلێگرتنی، گەر ئەمە بکەین بەپێوەر، دەبێت دان بە گرنگیی بوونگەراییدا بنێین، چونکە کاریگەرییەکی زۆر زەقی لەسەر بوارەکانی مەعریفەو گەلێ جۆری هونەر هەیە. بێگومان ئەمەش مانای وانییە کە دەروونناس یان رۆماننوس لە فەلسەفەی بوونگەراییان کۆڵیوەوەتەوە ئینجا هاتوون بە هوشیاریەوە لە کارەکانیاندا پراکتیکیان کردووە. (گەرچی لە زۆر حاڵەتدا ئەمەش کراوە) چونکە "بوونگەرایی"ی رۆماننووس یان پەروەردەکار لە هەندێك حاڵەتدا لەدەرەوەی لێکۆڵینەوەی فەلسەفەدا سەریهەڵداوەو، دەربڕینێکی هاوتەریب بووە لەهەمان ئەو هەڵوێستانەی کە لەسەردەمی نوێدا بەدەرکەوتوون.

لەم بەشەدا بەگرنگترین ئەو بوارانە ئاشنا دەبین کە کاریگەریی بوونگەراییان لەسەر هەبووە، کە بریتین لە دەروونناسی گشتی (هەروەها دەروونپزیشکی)و پەروەردەو ئەدەبو، هونەرە بینراوەکانو ئاکارو خوداناسی (تیۆلۆجیا). بێگومان مرۆڤ ئەتوانێت قسە لەسەر بواری تریش بکات، بەڵام لەوانەیە رەنگدانەوەکە لەم بوارانەدا روونتربن. بەشێوەیەکی تایبەتی بیروبۆچوونی بوونگەرایانە چووە ناو بوارەکانی دەروونناسیو ئەدەبو خوداناسییەوەو، کاریگەرییەکانی لەسەر ئەم بوارانە بووە بابەتی گەلێ نووسین.

من لێرەدا هەر ئەوەندە ئەتوانم قسە لەسەر بوارە جیاوازەکان بکەم، بەڵام ئاماژە بۆ کۆمەڵێك نووسەریش ئەکەم کە خوێنەر دەتوانێت لە کارەکانیاندا لێدوانی فراوانتر ببینێتەوە، لیستی سەرچاوەکانی کۆتایی ئەم کتێبەش ناوی کۆمەڵێك نووسراوی تیایە کە بە بابەتەکانی ئەم بەشەوە پەیوەستن.

## ٢.بوونگەرایی‌و دەروونناسی‌و دەروونپزیشکی

لە گرنگترین کاریگەرییەکانی بوونگەرایی لەسەر لقەکانی تری مەعریفە، کاریگەرییەتی لەسەر دەروونناسیی گشتی‌و بەکاربردنی لە دەروونپزیشکیداو، بەمجۆرە قوتابخانەیەکی نویێ لە دەروونپزیشکیی بوونگەرا دامەزرا.

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە شیکردنەوەی بوونگەرایانە کە پەیڕەوی لەمیتۆدی فینۆمینۆلۆجی کردووە، لە دەروونناسی جیاوازە، هەڵبەتە مەبەستمان لە دەروونناسیی ئەزموونی بووە کە تەقەلای داوە دەروونناسی بکاتە زانستێکی سروشتی. بەڵام هەندێك لە دەروونناسان ئێستا لەو بڕوایەدان کە هەوڵدان بۆ ئەوەی دەروونناسی هاوشانی میتۆدەکانی زانستە سروشتیەکان بێت، هەوڵدانێکی هەڵەبووە، یان لانی کەم سوودێکی زۆر کەمی هەبووە. لەمەش زیاتر، هەندێك لە دەروونناسان بڕوایان وایە کە بوونگەرایی شێوازێك بۆ تێگەیشتن لە سروشتی خودو کەسێتی لە هەردوو حاڵەتی ساغی‌و نەخۆشیدا دەخاتە ڕوو، کە لە شێوازە کۆنەکان باشترە، تەنانەت لە شێوازی فرۆیدیش.

ئێمەش لەم بەشەدا بایەخ بەم زانایانەی دەروونپزیشکیی بوونگەرایانە ئەدەین.

دەتوانین بە ئاماژە کردن بۆ ئەوە دەستپێبکەین کە هەندێك لە فەیلەسووفە بوونگەراکان خۆیان بایەخێکی زۆریان بەدەروونناسیی گشتی‌و دەروونپزیشکی داوە.

ئەوە بوو پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە کارل یاسپەرز سەرەتای ژیانی خۆی وەکو دەروونپزیشکێك دەستپێکردو یەکەم کتێبی سەرەکیی "دەروونناسیی گشتیی نەخۆشی" بوو. لەم کتێبەیدا دەڵێت کە بوونی مرۆیی بە بابەت ناکرێ‌و ناگۆڕێ بۆ پێدراوی زانستی، بەڵکو ئەوەی پێویستە لە سەرمان لەم بوونەدا لێیبکۆڵینەوە "شێوەی ناوەوەی ڕەفتارو، تێگەیشتنی خودو، هەڵبژاردنی خودو، خۆ تەرخانکردنە". هەروەها جان پۆڵ سارتەریش بایەخێکی زۆری بە دەروونناسی داوەو، لەم بوارەدا لێکۆڵینەوەی باشی نووسیوە.

لە کتێبەکەیدا "بوون‌و نەبوون" "هێڵە سەرەکیەکانی دەروونشیکارییەکی بوونگەرایانە" بڕوای وایە کە ئارەزوو بۆ بوون کە لە هەژاریی "بوون بۆ خۆی"یەوە

سەرچاوە دەگرێت، لە لیبیدۆ گرنگترە کە شیکردنەوەکەی فرۆید جەختی لەسەر دەکات .

جگە لەم فەیلەسووفانە هەندێ زانا هەن کە لەژێر کاریگەریی فەلسەفەی بوونگەراییدا بایەخی سەرەکییان بە دەروونناسیو دەروونپزیشکی داوەو لە گرنگترین نوێنەرانی ئەم قوتابخانە فیکرییەش، هەردوو دەروونپزیشکی سویسری: لۆدڤیگ بنز ڤانگەر کە لە ١٨٨١ دا لە دایکبووە، هەروەها مێدارد بۆس کە لەساڵی ١٩٠٣ دا هاتۆتە دونیاوە. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانیش رۆڵۆ مای ١٩٠٩ هەڵوێستێکی هاوچەشنی گرتۆتە بەر. هەروەها لە بەریتانیاش ر.د. لینگ (١٩٢٧).

وێڕای ئەوەی هەریەك لە بنزڤانگەرو بۆس زۆر بە "فرۆید"ەوە پەیوەستن‌و، تەواوی لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە بە رێزەوە باسی "فرۆید" دەکەن، بەڵام لە هەمانکاتدا رەخنەیان لەو جۆرەی خود یان کەسێتی یەکگرتووە کە فرۆید لێکۆڵیوەتەوەو ئەمان بڕوایان وایە کە دەرونشیکاری لای فرۆید کەوتە هەمان هەڵەی دەروونناسیی ئەزموونیی سوننەتییەوە کاتێك هەوڵیدا مرۆڤ لەسەر ئاستی هەندێك زاراوەی میکانیکی وێنا بکات، نەك لەسەر ئاستی کەسێتی. بۆ نموونە بە بۆچوونی "بۆس"فرۆید وەها سەیری بوونی مرۆڤی کردووە وەك ئەوەی دەزگایەکی سایکۆلۆجی بێت کە لە تیلیسکۆب دەچێت‌و دەپرسێت: "دەزگایەکی سایکۆلۆجی کە لە تیلیسکۆب دەچێت، یان دەزگایەکی لیبیدۆیی خۆڕێکخەر، چۆن دەتوانێ دەرك بەشتێك بکات، یان لە ماناکەی بگات، یان کەسێکی خۆشبوێت، یان رقی لێبێت؟" .

بنزڤانگەر باسی وتووێژێك دەکات کە لەنێوان خۆی‌و فرۆیددا روویداوەو دەڵێت کە پێویستە دەروونشیکار وەکو یەك دان بە رۆح‌و بە غەریزەدا بنێت، بەڵام فرۆید وەڵامێکی

---

(*) لیبیدۆ Libido ناوێکە لەوشەی Libetی لاتینییەوە وەرگیراوە کە بەمانای حەزی لەشت کرد دێ‌و بەئارەزووی هەستی یان سێکسی دەگوترێ‌و فرۆید، بۆ غەریزەی سێکس‌و وزەی دەروونی ویژدانی بەکاریهێناوە.

داوەتەوە کە سەری لێ سووڕماوە، کە وتوویەتی: "ڕەگەزی مرۆیی بەردەوام زانیویەتی کە ڕۆحی هەیە، لەسەر من پێویستە ڕوونیبکەمەوە کە غەریزەش هەیەو دەبێت مرۆڤ لە خاڵێکەوە دەستپێبکاتو، زۆر بە هێواشی بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێت".

بنزڤانگەریش دەپرسێت کە ئاخۆ دەکرێت لەڕێی "فراوانکردنی" ئەو چوارچێوە فرۆیدییەوە بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێین، بەجۆرێك کە ڕۆح شانبەشانی غەریزەکان بڕوات. پاشان لەسەری دەڕواتو ڕەخنە لەو "کاریگەرییە شووم"ە دەگرێت کە لە نموونەی فرۆیدییەوە سەریهەڵداوە، واتە نەمانی کەسێتیی مرۆڤ. لە ئێستادا ئەم نەمانی کەسێتییەی مرۆڤ بەڕادەیەك گەورە بووە کە چیتر دەروونپزیشکی (لە دەروونشیکار زیاتریش) ناتوانێت بەئاسانی بڵێت "من" (یان تۆ یان ئەو) ئەمەویٚ و حەز ئەکەم .... هتد، کە ئەمانە کۆمەڵێك دەستەواژەی هاوتای واقعین ... بەڵکو بنەما تیۆرییەکانی ناچاری دەکەن بڵێت "منەکەی من" — myego — (یان منی تۆو منی ئەو) حەز لەو شتە دەکات .

بەڵام ڕ.د. لینگ کە لە بنەڕەتدا لێکۆڵینەوەکانی لەسەر "شیزۆفرینیا"یە، دوو خەوشی سەرەکیی لەو زەمانە سووننەتییە (هەروەها چەمکانە)ی بۆ وەسفی دەروون نەخۆشەکان بەکاردێنن، دۆزیوەتەوە. یەکەمیان ئەوەیە کە ئەو زاراوانە نەخۆشەکان پارچە پارچە دەکەن، بەڕادەیەك کە زۆر زەحمەت ئەبێت دەروونپزیشك ئەو خودە بەکاملی بەدەستبهێنێتەوە، کە ئەمەش مەبەستی ئەو بوو. ئێمە "لەبری پەیوەندیی ئەسڵیی" نێوان "من"و "تۆ"، دەچین مرۆڤەکە بەتەنیا دادەبڕینو هەندێك زاراوەی بەسەردا ئەسەپێنین کە گوزارشت لە لایەنە جیاوازەکانی دەکات، وەکو "من" و "منی باڵا"و "ئەو" Id .

خەوشی دووەمیش ئەوەیە کە ئەم زمانە لەسەر گریمانەیەك بەندە، ئەویش ئەوەیە کە هەر دەبێت نەخۆش وا وەسفبکرێت کە "میکانیزم"ێکە. لە ڕاستیشدا زۆربەی ئەو نەخۆشانەی دەچوونە لای لینگ (ئەوانەی شیزۆ فرینیایان هەبوو) خۆیان بەدەزگاو ئامێرو ڕۆبۆتو شتی لەو جۆرە دەهاتە بەرچاو. کێشەی دەروونپزیشکەکەش ئەوەبوو وایان لێ

بکاتـەوە هەسـتبکەن بـەوەی کەسـانێکی راسـتەقینەن. لیـنگ دەڵێـت ئـەو کەسـانەی وا هەسـتدەکەن بەشـێکن لـە ئامێرێـك "وەکـو شـێتی راسـتەقینە سـەیر دەکـرێن" بـەڵام دەشپرسـێت "کەواتـە ئـەی بـۆ ئـەو تیۆرەیـە بـە شـێت لـە قەڵـەم نـەدەین کـە دەیـەوێت کەسەکان بکات بەئامێرو گیانەوەر؟" .

کەواتە ئامانجی ئـەم دەروونپزیـشکانە دامەزرانـدنی "زانستێکی رەسـەنی کەسـەکانە" (لیـنگ) یـان "دەروونناسـییەکی راسـتەقینەیە" (بنزڤانگـەر)، وێـرای ئـەو جیاوازییـەی لـە نێوانیاندا هەیە، بنز ڤانگەرو بۆس شیکردنەوەی بوونگەرایانەی هایدیگەر بە بناغەی پتـەوی دامەزراندنی زانستێك بۆ کەسەکان دەژمێرن. بۆس دەڵێت "گرنگیی گەورەی شـیکردنەوەی بوونـەوەری مرۆیـی بـەو مانایـەی لـە ئۆنتۆلۆجیـای بنەڕەتیـدا لای مـارتن هایدیگـەر بەکارهاتووە، لەوەدایـە کـە یارمـەتیمان ئـەدات بەسـەر خەوشـە سـەرەکیەکانی وێناکردنـە ئەنترۆپۆلۆجیەکانماندا زاڵبین لە بیرکردنەوەی سایکۆلۆجیماندا، ئەمانەش کۆمەڵێك خـەوش بوون کە وایان لێکردووین تا ئێستا بەناو تاریکییەکی ئەنگوستەچاودا برۆین" . بەڵام رۆڵـۆ مای لەژێر کاریگەریی کارەکـانی تیۆلۆجیـستی فەیلەسـووف" پـۆڵ تـیلش Poul Tillich" ە کە لە کتێبەکەیدا " ئازایـەتیو بـوون The Courage to Be" ئەگاتـە ئـەو سـنوورەکەی کـە تیایدا دەروونـشیکاریو بوونگـەراییو خوداناسـی پێکدەگـەن. هـەروەها لینگـیش سـوودی لەگـەڵ فەیلەسـووف وەرگـرت، لەوانـە هایدیگـەرو کیرکـەگۆرو میرلۆپـۆنتیو سـارتەرو ماکمۆری. بیرۆکەکەی ئەو سـەبارەت بـە "نادڵنیـایی ئۆنتۆلـۆجی" ئاوێتـەکردنی بۆچـوونی چەند فەیلەسووفێکەو ئامرازێکە بۆ پێکەوەگرێدانی ئەو شیکردنەوانەی بوونی ژیـانی رۆژانـە کە لە بەشەکانی پێشوودا لێیـدواوین، هـەر لـەو حاڵەتـە نامۆیانـەی لای کەسـانێکی وەکـو: هامانو کیرکەگۆرو کافکا هەبوون، تا شڵەژانی نەخۆشیانەی "خودی کەرتبوو".

ئەم بڕگانە، وێڕای کورتییان، ئەو کاریگەرییـە بـە پیتـە رووندەکەنـەوە کـە بوونگـەرایی لەسەر دەروونناسیو دەروونپزیـشکی هـەیبووەو وا لـەمرۆڤ دەکـات لـەم ڕووەوە چـاوەڕێی پەرەسەندنی زیاتربێت. بێگومان لەم ڕێیەدا مەترسیش هەیە. بۆ نموونە رۆڵۆ مای ئامـاژەی

بۆ هەندێکیان کردووەو بەتایبەتیش "ئەو مەیلی دژایەتیکردنەی لای هەندێك دەروونپزیشکی بوونگەرا هەیە دژ بە زانست" . مەعریفە تاقە رێیەکی نییەو هەموو تیۆرەیەکی تازەش مەترسیی شێواندنو زێدەڕۆیی لە بەردەمدایە.

بەڵام هەموو زانستێك دەبێت تایبەتمەندییەکانی ئەو بابەتانەی خۆی بناسێت کە لێیدەکۆڵێتەوە. دەروونناسانی بوونگەراش لە پێناوی چارەسەرکردنی ئالۆزترین کێشەدا تێدەکۆشن: واتە مەعریفەی زانستیانە بەخەڵك.

## ٣.بوونگەراییو پەروەردە

مەودایەکی کورت لەنێوان کاریگەریی بوونگەرایی لەسەر دەروونناسیو کاریگەریی لەسەر بواری پەروەردە کردن هەیە. شتێکی سەیر نییە کە بوونگەرایی لە بواری پرۆسەی پەروەردەکرندا ئەنجام بەدەستەوە بدات، لەبەرئەوەی وشەی پەروەردە دەکات to educate (لە لاتینیدا educare) بەمانای خستنەڕووە، واتە پەروەردە کردن بەمانا فراوانەکەی کارکردنە لە پێناوی خستنەڕووی تواناکانی تاکەکەس. وشەی "بوونی مرۆیی Ex-Sistence)یش واتە خستنەڕووی تواناکانی مرۆڤ. کەواتە پەروەردەکردن واتە لێگەڕێین مرۆڤ "هەبێت"، واتە لەحاڵەتی هەنووکەیی خۆی دەربچێتو بەرەو بواری بوونگەرایانە تێیپەڕێنێت، واتە ببێتە کەسێکی تاك.

لەڕاستیدا بایەخدان بەوەی کە لێگەڕێین تاکەکەس خۆی بێت شتێکی تازە نییە، پێشتر سەرنجماندا چۆن تێڕوانینی میتۆدی مامانی لای سوکرات بۆ پەروەردە، هەندێ خەسڵەتی بوونگەرایانەی بەخۆوە گرتووە، هەروەها لەسەردەمی تازەشدا فەلسەفەی پەروەردەیی وا هەیە کە دژ بە ئاقاری دەسەڵاتخوازیانەیەو هەڵوێستی "لێبوردەیی" گرتۆتەبەرو دەیەوێت خوێندکار خودی خۆی بێت.

بەڵام زەحمەتە بڵێین ئەم بۆچوونە بۆچوونێکی بوونگەرایانە بووە، بەڵکو بۆچوونێك بووە لەمابەینی ئاقاری نائەقڵانی لای رۆدۆڵف شتاینەرو ئاقاری سروشتگەرا لای جۆن دیوی.

بەڵام بوونگەرایی نموونەیەکی نوێو زاراوەی نوی بۆ پەرەپێدان بەتایپێکی مرۆیی فەلسەفەی پەروەردە ئەخاتەروو.

هەرچۆن پێدەچێ ئەم هەلومەرجی ئەم سەردەمەشمان پێویستی بەمجۆرە فەلسەفەیە بێت، ئێمە بەئاشکرا دەبینین کە چۆن خوێندکار لە زانکۆ گەورەکانو خوێندنگە گشتیەکانی کۆمەڵگایەکی جەماوەریدا، هەست بە ونبوونو نامۆبوون دەکات، یان دەکەوێتە ژێر گوشاری وەهاوە کە رێی پێنادات خودی خۆی بێت. ئەمەش یەکێکە لە هۆکارەکانی تووڕەبوونی خوێندکاران. لێرەوە بوونی فەلسەفەیەکی پەروەدەریی وەها کە حسابێکی زیاتر بۆ تاکەکەس بکات پێویستە (بەبڕوای من ئەو فەلسەفەی پەروەردەیەی کە لەژێر کاریگەریی بوونگەراییدا ئەم کارە ئەنجامدەدات). ئەم تێڕوانینەش ئەو ئاقارە راستدەکاتەوە کە زێدەڕۆیی دەکات لەو "بە یەکسانکردن **Egalitarianism**"ەی کە لە بەرنامەی پەروەدەیی نوێدا هەیەو دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی بەرهەمهێنان. چونکە ئەم تێڕوانینە بواری فراوانتر بۆ پەرەدان بە تواناکانی تاکەکەسی بەهرەمەند دەرەخسێنێت، ئەو کەسانەی کە کۆمەڵگای تەکنۆلۆجی پێویستی پێیان دەبێت.

ئەوەندەی بزانم هێشتا تیۆرەی بوونگەرایی لە پەروەردەدا شێوەی تەواوی خۆی وەرنەگرتووە، بەڵام کۆمەڵێك بیروڕای گرنگ هەن لەم بوارەدا دەردەکەون، هەر بۆ نموونە دەتوانین ناوی کارەکانی دواین هۆبنەر **Dwayne Huebner** بهێنین کە لە کۆلیجی مامۆستایانی نیویۆرك مامۆستایە. لەوتارێکیدا بەناوی "میتۆد" بەو پێیەی بایەخدانە بە زەمانمەندیی مرۆڤ" وا سەیری خوێندکار دەکات کە بوونەوەرێکە "دەتوانێ خۆی تێپەڕێنێت وەکو ئەوەی کە هەیە تا ببێت بەوەی کە هێشتا نەبووە". کەواتە پێویستە پرۆگرامی خوێندن لەم روانگەی تێپەڕاندنە زەمانیەوە بۆ خود دابنرێت، لە کاتێکدا

مامۆستا وادەزانێت ئەوە ئەوە یارمەتی خوێندکار ئەدات خۆی تێپەڕێنێت. "هۆبنەر" لەوتارێکی تریدا "زمانو وانەوتنەوە: چەند تێڕامانێك لە فێرکردن لەبەر رۆشنایی نووسینەکانی هایدیگەردا بۆ زمان" بە شێوەیەکی وردتر بیروبۆچوونەکانی خۆی رووندەکاتەوە. لەم وتارەدا وا سەیری فێرکردن دەکات کە جۆرێکە لە "بوون لەگەڵ"، کە جۆرێکی ئیجابییە لەمەشغوڵبوون بەویترەوە، تیایدا مرۆڤ لەبەردەم ئەویتردا بازدەدات تا ئیمکانەکانی بۆ ئاشکرا بکات، بەڵام بۆ شوێنێکی دی باز نادات لەبەرئەوەی ئەمە واتە بێبەشکردنی ئەو لەئیمکانەکانی، ئەم بوون –لەگەڵ– ئەویترەش پێویستی بە بەکارهێنانێکی رەسەنی زمانە.

ئەم سەرنجانە ئاماژە بۆ هەندێ ئیمکان دەکەن کە دەکرێ لەپراکتیکردنی شیکردنەوەی بوونگەرایانەدا بەسەر پەروەردەدا بێنەدی.

## ٤.بوونگەرایی‌و ئەدەب

ناونیشانی ئەم بەشە بوارێکی زۆر فراوانمان پیشاندەدات کە ئێمە بەتەنها دەتوانین چاوێکی خێرای پیا بخشێنین، لە بەرئەوەی فەلسەفەی بوونگەرایی بە جەختکردنەوەی لەسەر شتە بابەتی‌و زیندووەکان، رەنگە بتوانێ بەشێوەیەکی باشتر لە شانۆنامەو رۆماندا گوزارشت لەخۆی بکات، کە رەنگە گوزارشتێکی بەهێزتریش بێت لەتوێژینەوە فەلسەفیەکان. هەندێ لە پێشڕەوانی ئەم قوتابخانەیە بە هوشیاریەوە دەرکیان بەم راستییە کردووەو چۆن لە فەلسەفەدا توانای خۆیان خستۆتە روو ئاوەها لەئەدەبیشدا وەکو نووسەری داهێنەر ناسراون. لە نموونە بەناوبانگەکانی ئەم نووسەرانەش "کامۆ"و "سارتەر" و "مارسیل". دیارە کۆمەڵێك کاری ئەدەبیی وەکو "تاعوون" و "هێڵنج" و "دەرگا داخراوەکان"یش بنەماکانی فەلسەفەی بوونگەراییان بەهەزاران کەسی وا گەیاندووە کە هەرگیز ناتوانن لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکان بخوێننەوە.

بەڵام ئێمە لەبواری ئەدەبدا بەتایبەتی، لەو ئاڵوگۆڕی کاریگەریە ئاگادار ئەبین کە لەسەرەتای ئەم بەشەدا باسمان لێوەکرد. بەرهەمی ئەدەبیی گەورە هەبووە کە سەربەخۆ بووەو هیچ کاریگەرییەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی فەیلەسووفە بوونگەراکانی بەسەرەوە نەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەدەبێکی "بوونگەرا" بووەو، هەندێجار کاری کردۆتە سەر فەیلەسووفەکانیش. هەر بۆ نموونە کاریگەریی شیعری "هۆڵدەرلین" لەسەر هایدیگەر. بەڵام دەبێت وریابین‌و هەر ئەدەبێك رۆچوبووە ناو قووڵایی کێشەکانی مرۆڤەوە، بەئەدەبێکی "بوونگەرا"ی لەقەڵەم نەدەین. ئەگینا وشەکە لەناواخنی مەغزاداری خۆی رووتدەکەینەوە. ئەگەر باس لە کاریگەرییەکانی بوونگەرایی لەسەر ئەدەب بکەین، ئەوا دەبێ ئاماژە بۆ شتێکی دیاریکراو بکەین، نەك لەو لێکچوونانەی کە بە رێکەوت لەنێوان تێگەیشتنی ئەدیبان‌و فەیلەسووفە بوونگەراکاندا بۆ مرۆڤ دەیانبینینەوە. ئێمە دەبێ بایەخ بەو بەرهەمە ئەدەبیانە بدەین کە ئەو شتە بەسەریاندا زاڵە کەناومان نا "بابەتە دووپاتبووەوەکان" لەفەلسەفەی بوونگەراییدا. واتە بابەتگەلێکی وەکو: ئازادی، بڕیار، بەرپرسیاری. هەروەها لەمانەش گرنگتر بابەتی وەکو: کۆتابوون‌و نامۆبوون‌و گوناەو مەرگو پاشانیش ئەو هەستە توندو نامۆیەی کە لای زۆربەی بوونگەراکان هەیەو پێناسە ناکرێ، هەر لەکیرکەگۆرەوە تا ئەوانی دواتر. لەو بڕوایەدام ئاماژەیەکی سوودمەند لەم دەستەواژانەی لایۆنیل تریلینگ دا ببینینەوە کە دەڵێت: "بەچاوپۆشین لەڕادەی بلیمەتیی هەردووکیان، ئەگەر بەراوردێك لەنێوان شەکسپیرو کافکادا بکەین‌و لەو گۆشە نیگایەوە سەیریان بکەین کە هەردووکیان ئازارو نامۆبوونی گەردوونیی مرۆڤ دەخەنەڕوو، ئەوا دەبینین کە خستنە ڕووەکەی کافکا چڕوپڕترو کامڵترە.

لە راستیدا ئەوەی واشدەکات ئەم حوکمە راست بێت ئەوەیە کە هەستکردن بە خراپە (شر) لای کافکا لە هەستکردن بە شوناسی کەسی (شەخسی) جیا نابێتەوە. جیهانەکەی شەکسپیریش وەکو جیهانەکەی کافکا هەمان ئەو زیندانی بەندیخانەیەیە کە پاسکال بەجیهانی ناو دەبات. ئەمەش ئەو زیندانەیە کە رۆژانە زیندانییەکانی تیا بەرەو مەرگ

راپێچدەکەن. شەکسپیریش وەکو کافکا جەخت لەسەر ئەو نامەعقولیەتە بێبەزەییانەیەی دۆخی ژیانی مرۆیی دەکاتەوە، ئەویش حیکایەتێکمان پێشکەش دەکات کە دەبەنگێك دەیگێڕێتەوەو، خواوەندگەلێکی هەرزە کەبۆ تەمێکردن نا، بەڵکو هەر بۆ رابواردن‌و خۆشی خۆیان ئازارمان ئەدەن. شەکسپیریش وەکو کافکا بەهۆی ئەو بۆنە ناخۆشەوەی کە لە بەندیخانەی ئەم دونیایە دێ، یاخی دەبێت‌و، لە کارەکانیدا هیچ شتێك لە بەرجەستەکردنی بێزاری زەقتر نییە. بەڵام هاوەڵی لە زیندانەکەی شەکسپیردا باشترە وەك لە هاوەڵی لە زیندانەکەی کافکادا. سەرکردە سەربازیەکان‌و پاشاکان‌و دڵدارو لێبوکەکان لای شەکسپیر، بەر لەوەی بمرن چالاك‌و زیندوون. بەڵام لای کافکا، بەماوەیەکی زۆر بەر لەوەی حوکمەکەش دەربچێت‌و تەنانەت بەماوەیەکی زۆر بەر لە دەسپێکردنی رێورەسمی شوومی دادگاییەکە، شتێکی سامناك بەسەر تاوانبارەکەدا هاتبوو" .

پێم وابێت تا رادەیەك ئەم دەستەواژانە ئەوە روون دەکەنەوە کە بۆچی مرۆڤ دەتوانێت بە کافکا بڵێت "بوونگەرا" بەڵام ناتوانێ بەشەکسپیر وا بڵێت. پێدەچێ نووسەرە بوونگەراکانی سەدەی نۆزدەیەم‌و بیستەم هەستیان بە قەیران‌و هەڕەشەو پەرتبوون‌و نامۆ بوون کردبێت، ئەمانەش هەستگەلێکن کە موچڕك بەمرۆڤدا دەهێنن. ولیەم بارێت William Barret کاتێك سەبارەت بەم قەیرانە دەنووسێت، دەڵێت: وێنەی مرۆڤی نوێ لەو دێرە شیعرەی "ت.س. ئیلیوت" دا دەبینینەوە کە دەڵێت "خەڵکی کۆمەڵێك پارچە کاغەزن بەدەم بای ساردەوە" .

با بۆ تاوێکیش بچینەوە لای "یۆهان کریستیان فریدریش هۆڵدەرلین" (١٧٧٠ – ١٨٤٣)ی شاعیر کە دەکرێت بە رابەری هەست‌و خرۆشی بوونگەرایانەی نوێی لە قەڵەم بدەین لە دونیای ئەدەبدا. ئەو لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا گوزارشتی لەو گۆڕانەی هەست‌و خرۆشەکان کرد کە دواتر نیچە بە فەلسەفە گوزارشتی لێ کرد، واتە زیادبوونی هەستکردن بە نامۆیی‌و ونبوون لە گەردووندا. ئەم هەستە تایبەتییەی ئەوی بەرەو

"نادڵنیایی ئۆنتۆلۆجی" برد — گەر دەربڕینەکەی لینگ بەکاربهێنین — وەك چۆن نیـچەشی بەرەو شێتی راپێچ کرد.

هۆڵدەرلن لەقەسیدەی "نانو شەراب"دا بەجۆرێك گوزارشت لەم حاڵەتە تازەیە دەکات کە لە گوزارشتێکی گنۆستیکی دەچێتو دەڵێت:

"هاورێ، ئێمە درەنگ هاتینە ئێرە

بێگومان خواکان ماون، بەڵام لەجیهانێکی تری

ژوور سەرمانەوەن

ئەوان بەردەوام سەرگەرمن، بەڵام پێدەچێ

گوێ بە بوونو نەبوونی ئێمە نەدەن

ئەمە برِێکە لەسەرقاڵیی ئەم بوونەوەرە ئاسمانیانە

دەبینی، ماوەیەک بەر لەئێستا — کە بەلای ئێمەوە

ماوەیەکی درێژە

هەموو ئەوانەی کە بایەخیان بە ژیانی ئێمە ئەدا

بەرەو ژوور کشانەوە دواوە

کاتێ "باوک" رووی خۆی لەمرۆڤ وەرگێڕا

خەم باڵی بەسەر تەواوی زەویدا کێشا..."[١٣].

ئەم وشانە ناڵێن کە خودا مردووە، بەڵکو دەڵێن ونـەو بێدەنگە. بـاوك رووی خـۆی لـە مرۆڤ وەرگێـڕاوەو مـرۆڤیش هەسـت بـە تەنیاییـەکی زۆر دەکـات. لـەو کەسـە دەچـێت کـە درەنگ بە کۆڕێك گەیشتووە کە پێشتر کۆڕێکی گەرمو خۆش بووە، بەڵام ئێستا خەم بـاڵی بەسـەردا کێشاوە، لەبەرئـەوەی ئەوانـەی کـە مایـەی خۆشـیو کامـەرانیی کۆڕەکـە بـوون رۆیشتوونو لـەوێ نـەماون. هۆڵـدەرلین لـە شـیعرەکانیی تریـشیدا، خـۆی لـە قـەرەی ئـەم بابەتانەو گەلێ بابەتی تریش داوە، بەڵام لێرەدا بواری ئەوە نییـە بـەفراوانی لێیـان بـدوێین. پێشتر ئامـاژەم بـۆ دوو رۆمـانی رووسـیی گـەورە کـرد کـە لەسـەدەی نۆزدەیەمـدا هەنـدێ

بابەتی بوونگەرایانەیان خستۆتەڕوو، کە ئەوانەش: توێژینەوەکەی "تۆڵستۆی"ە لە مەرگ لە ڕۆمانی "مەرگی ئیڤان ئیلیچ" و توێژینەوەکەی "تۆرگنیڤ"ە لە نیهیلیزم لەرۆمانی "باوکانو کوڕان" دا. بەڵام بێگومان گەورەترین نموونەی ئەدەبی بوونگەرا ئەدەبەکەی هاووڵاتییە هاوچەرخەکەی ئەو دووانەیە، واتە فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی (١٨٢١ — ١٨٨١) بە تایبەتیش لەکارەکانی وەکو "برایانی کارامازۆڤ" و "یادەوەرییەکانی ژێر زەمین". "والتەر کاوفمان" رایگەیاند کە ئەم چیرۆکەی دوایی "باشترین سەرەتایەکە تا ئێستا بۆ بوونگەرایی نووسرابێ" پاشان دەڵێت "لێرەدا بەهێزێکی زۆرو ناسکییەکی بێوێنەوە ئەو بابەتە سەرەکیانە خراونەتە ڕوو کە لای فەیلەسووفانی بوونگەرایی دەیانبینینەوە، هەر لەکیرکەگۆرەوە تا کامۆ" .

ئەم وروژاندنە بچووکەی ئەم نووسەرانە لە "چاخی پێشکەوتن"دا، گۆڕا بۆ زریانێك لەنێو ئەو نائومێدیەدا کە باڵی بەسەر سەدەی بیستدا کێشابوو. رەنگە "فرانز کافکا" (١٨٨٣ — ١٩٢٤) گەورەترین نووسەری بوونگەرا بێت. هەر بۆ نموونە لە چ چیرۆکێکدا هێندەی چیرۆکی "دادگایی" خستنەڕوویەکی وا جوان بۆ بیرۆکەی "تووڕدان" دەبینینەوە؟ لە پڕێکا ئادەمیزاد خۆی بەرامبەر بە دادگا دەبینێتەوەو تەنانەت ناشزانێ ئەو تاوانە چییە کە خراوەتە پاڵی! ! یان لە کوێ ئەو هەستکردنە نوێیە بە ونبوون و سەرسامیی ئۆنتۆلۆجی دەبینین، وەکو ئەوەی لە ڕۆمانی "کۆشك" دا بەرچاومان دەکەوێت؟ کاتێك کابرای ڕووپێو دەبینین کە چەند هەوڵی بێهوودە ئەدات تا پەی بەو هێزە راستەقینانە بەرێت کە ژیانی دیاری دەکەن؟ هەروەها دەتوانین لەپاڵ کافکادا ناوی گەلێ نووسەری ناوداری تری ئەم سەدەیە بهێنین، وەکو: ت.س. ئیلیوتو سامۆییل بێکیتو جەیمس جۆیسو هەندێکی دی.

لایەنگرانی تەکنۆلۆجیاو خۆشگوزەرانی کەیفیان بە ئەدەبی نامۆبوونو پووچیو نائومێدی نایەت. بە بۆچوونی ئەوان ئەم نووسەرە رەشبینانە ناتوانن رووی چاکی ئەم دونیایە ببینن. راستە نووسەرە بوونگەراکان یەکلانە روانیویانەتە دونیا، بەڵام هیچ گومان

لەوە نییە کە کۆمەڵگای هاوچەرخمان پێویستی بە رەخنەکانیان هەبووە، لەبەر ئەوەی بە دیوەکەی تریشدا خەتەری ئەوە هەیە کە کۆمەڵگا بە ئاقاری پێچەوانەدا بڕوات، واتە بخلیسکێتە ناو گەشبینییەکەی درۆزنانەوە کە بەها مادییەکان حوکمی بکەن. فەیلەسووفە بوونگەراکان دەیانەوێ ئەوەمان بیر بهێننەوە کە بەتەنها تەکنۆلۆجیا ناتوانێ کێشەی مرۆڤ چارەسەر بکات، لەبەرئەوەی کێشەی مرۆڤ دواجار کێشەیەکی بوونگەرایانەیە. پاشان فەیلەسووفانی بوونگەرا ئەوەندەی واقیعبینن ئەوەندە رەشبین نین‌و دەزانن کە چارەسەری یۆتۆپیایی نییە بۆ تراجیدیای بوونی مرۆیی. گۆتە دەڵێت: "خەڵك تا بێت زیرەك‌و ورياتر دەبن، بەڵام باشترو بەختەوەرترو چالاکتر نابن".

رەوتی رووداوەکانیش پێشبینییەکەی گۆتەیان هێنایەدی. ساویلکەییە گەر وا بزانین کێشەکانی مرۆڤایەتی بەرەو نەمان دەچن، یان وا بزانین ئەگەر چاومان لە ئاست ئەو پرسیارانەدا نووقاند کە ئەدەبی بوونگەرا دەیانخاتە ڕوو، ئەوا ئیدی کاریگەرییان لەسەرمان نابێت.

## ٥.بوونگەرایی‌و هونەرە بینراوەکان

لێدوان لەسەر بابەتی بوونگەرایی‌و هونەرە بینراوەکان وامان لێدەکات دیسانەوە بچینەوە ناو بابەتێکی هێند فراوان کە بە ئاسانی کتێبێکی تەواوی لەسەر دەنووسرێ. جگە لەوە ئەم بوارەش بوارێکە کە تیایدا ئاڵوگۆڕی کاریگەری هەیە.

مەسەلەکەش لێرەدا بریتی نییە لەوەی کە کاریگەریی بوونگەرایی لەسەر هونەری نوێ راستەوخۆ بووە، هێندەی ئەوەی کە ئێمە لەشێوە جۆراو جۆرەکانی هونەری نوێدا — کوبیزم Cubism و سوریالیزم Surrealism و رێبازە هونەرییەکانی تردا شێوەی هاوتا بە فەلسەفەی بوونگەرایی دەبینین، لەبەرئەوەی ئەم شێوانەی هونەر بەشێوازی تایبەتی خۆیان گوزارشت لەو بیروبۆچوونانە دەکەن کە بوونگەراکان لە بەرگێکی فەلسەفیدا گوزارشتیان لێکردووە.

وەها سەیری "پۆڵ سیزان" (١٨٣٩ — ١٩٠٦) دەکرێ کە لە هونەری نوێدا گەورەترین کەسێتیی کاریگەرەو کارەکانی بە جۆرێك لە جۆرەکان لەگەڵ بزاوتی بوونگەراییدا هاوتەریبە، چونکە لای سیزان شێوە باوەکانی هونەر کۆتایی دێو خولقاندنی شێوەی نوێ دەستپێدەکات. ئەمەش وامان لێدەکات بە شێوازێکی نوێو لەپەیوەندیی نوێدا سەیری شتەکان بکەین. یەکێك لە رەخنەگرەکانی سیزان دەڵێت:

"هونەری سەدەی هەژدەیەم هونەرێکی ئەقڵانیی سیستماتیك بوو. هونەری رەسمیی سەدەی نۆزدەیەم بێهوودە هەوڵیدا پشتیوانی لەم سیستمە ئەقڵانییە بکات (کە وردە وردە بێمانا بووبوو، لەبەرئەوەی نەیدەتوانی گوزارشت لە پێداویستیەکانی سەردەم بکات) بەرامبەر بە شالاوی ئەو هونەرمەندە دەرەوشاوە رەسەنانەی کە بەشێوازی جۆراو جۆر هونەریان بۆ گوزارشتکردن لە هەستو سۆزە کەسیەکان یان گرتنی لایەنە شاراوەکانی سروشت بەکار برد. دواهەمینیشیان پیرەمێردێکی نامۆو چالاك بوو ... کە بە ئەزموونی بەردەوام لە تەنیاییەکەی خۆیدا رێگایەکی تری دۆزییەوەو بۆ ئەو خاڵی سەرەتایە گەڕایەوە کە وا سەیری هونەر ئەکرێ لێوەی، کە سەرلەنوێ رێکخستنەوەی جیهانی سروشتییە" .

بەبڕوای من لەم لێدوانەی "بارتۆن"دا دوو خاڵ هەیە کە لە دەرککردنی لایەنە بوونگەرایانەکانی هونەری نوێدا گرنگیی خۆیان هەیە. یەکەمیان ئەوەیە کە "سیزان" وەکو هونەرمەندەکانی تر هونەرەکەی بۆ "دەربڕینی هەستو سۆزی کەسی"ی خۆی بەکارنەبردووە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە سیزان گوزارشتی لە هەستو سۆزی تایبەتیی خۆی نەکردووە، ئاشکرایە کە ئەوەی کردووە، ئەمەش زیاتر بەسەر نیگارکێشێکی وەکو "ڤینسنت ڤان گوخ"دا دەچەسپێ، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئەمانە لەپێناوی سۆزدا گوزارشتیان لە سۆز نەکردووە، بەڵکو سۆز لایان هۆیەك بووە بۆ رۆشنکردنەوەی جیهان.

لێرەشدا لێکچوونێکی سەرسوڕهێنەر لەگەڵ بوونگەراییدا دەبینینەوە. خاڵی دووەمیش ئەوەیە کە وازهێنان لە وێناکردنێکی دیاریکراو بۆ شێوەیەك و سیستمێك، مانای وازهێنان

نییە لە هەموو شێوەیەك. هونەری نوێ دەرکی بەو کەلێن و کەلەبەرانە کردووە کە لە شێوە سوونەتیەکاندا هەیە، لەوانەشە هێدمە (صدمە)ی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم کەلێنانە بێت ئەو کاریگەرییەی لای خەڵکانێك جێهێشتووە کە واز لەشێوە هێنراوە.

گەرچی بەپێەوانەوە، ڕەنگە لەوشێوە نوێیەدا هەندێ شتی وا ببینین کە پێشتر نەمانبینیبون. باشترین نموونەش بۆ ئەمە تابلۆی ((گۆرنیکا))ی پیکاسۆی هونەرمەندە، کە بریتیە لە هەندێ کەس و شت و بابەتی وەرگیراو لە شارۆچکەی ((گۆرنکا))ی ئیسپانی یەوە کە جەنگی ناوخۆی ئیسپانیا وێرانی کرد. ئەم هونەرمەندە شتەکانی لە کۆمەڵێك پەیوەندیی ((ناواقیعی))دا پیشانداون. بەڵام هەروەکو پۆل تیلیش سەرنجی داوە، ئەم تابلۆیە ((بێ پەردە دۆخی مرۆیی پیشاندەدات.))(١٦).

هەروەها ئەم تابلۆیە لەگەڵ فەلسەفەی بوونگەرایاندا یەکدەگرێتەوە، لەربەرئەوەی خاڵی سەرەتاش لەم فەلسەفەیەدا ئەو پەردەهەڵماڵینەیە کە کێرکەگۆر ئەنجامیدا لەسەر ئەو کەلێنانەی کە ((ڕێبان)) دەیانپۆشێت.

بەڵام لەهەمان کاتدا ئەمە سەرەتای گەڕان بوو بەدوای شێوەیەکی نوێ و پەیوەندیی نوێ گەڕانە بەدوای ئۆنتۆلۆجیایەکی نوێی داینامیکیتردا، هەروەکو لە هونەریشدا بەهەمان شێوەیە، سامۆییل تێریان دەڵێت: ((لە ماوەی حەفتاساڵی ڕابردوودا پرۆژەیەکی نوێ سەریهەڵدا کە تیایدا هونەرمەند تەقەلا ئەدات بە بوونی جیهان بگات. هەربۆیە تابلۆکانی ناکۆتا دێنە بەرچاو، لەبەرئەوەی لەگەڵ لێدانی دڵی گەردووندا ئەوانیش لێدەدەن و ڕادەچەنن. بەڵام ئەو ئۆنتۆلۆجیایەی لەقۆناغی سەرهەڵداندایە جارێ ناتوانین لەچوارچێوەی مەسەلەکاندا گوزارشتی لێ بکەین. لەبەرئەوەی هێشتا بەحاڵەتێکی پرسیارکردنی شاراوەوە بەندە)).(١٧)

ئاشکرایە لەچوارچێوەی ئەم ئۆنتۆلۆجیا داینامیکیەدا جوانی بە بەهایەکی هەتا هەتایی لەقەڵەم نادرێ کە وا لە ئاسماندا بەڵکو لەبری ئەوە، هەروەکو وێناکردنی بوونگەرایانە بۆ حەقیقەت، لەدۆخێکی مێژوویدا دێتە دی. دەکرێ لەگەڵ (( ئەلبێرت هۆفشتاتەر))دا کۆك

بـین لەســەرئەوەی كــە ((جــوانی جۆرێـك نییــە لــە بــەها، بــەڵكو جــۆرێكی دانــسقەیە لەوەدیهاتن))(١٨).

كاتێك دەچینە لای هەندێ لە نوێنەرە دیارەكانی بوونگەرایی و لە تێڕوانینیان بۆ هونـەر دەكۆڵینــەوە، ڕاســتی ئــەو بڕگانــەی پێــشوومان بــۆ دەســەلمێنێ. ئــەوەتانێ بــۆ نموونــە هایدیگەر جــەخت لەســەر ئــەوە دەكاتــەوە كــە نــابێ واســەیری كــاری هونــەری بكــەین كــە گوزارشتكردنە لە هەست و سۆزەی هونەرمەندەكە، لەبەرئــەوەی لــە كــاری هونەریــدا ئــەوە خودی بوون خۆیەتی كەلەبەر ڕۆشـنایی حەقیقەتـدا ئاشـكرا دەبێـت. ((هونەرمەنـد و كـارە هونەرییەكەشی یەك ڕەچەڵەكیان هەیە، هونەرمەند ڕەچــەڵەكی كارەكــەیتی و ، كارەكــەش ڕەچەڵەكی هونەرمەندەكەیە و هێیان بەبێ ئەوی تر بوونیان نییە.)) (١٩).

هایدیگەر لەبڕگەیەكی بەناوبانگدا ئاماژە بۆ ئەم پەیوەندییە ئاڵوگۆڕكەرە دەكـات كـاتێ دەربارەی پەرستگایەكی یۆنانی ئەدوێت: پەرستگاكە هــێ نانوێنێـت، بــەڵام ئەمــە واناكـات شتێك بێت قابیلی دیاری كـردنیش نـەبێت. ئـەو پەرسـتگایە هـەم جیهـان و هـەم زەویـش بەرجەستە دەكات. ئـەو جیهانـەی بەرجەسـتەی دەكـات بریتیـە لـە قەوارەیـەكی مێـژوویی كەلتووری كەتیایدا چارەنووسـی ئـادەمیزد دیـاری دەكـرێ. زەویـش ئـەو توخمـە ماددیـە ئەســڵیەیە كــە ســەریهەڵداوە و لەپەرســتگاكەدا ئاشــكرا دەبێــت. كــارل یاســپەرزیش بەشێوازێكی تاڕدایەك نزیك لەم شێوازە دەڵێت كە (( مانـای بنـەڕەتی هونـەر بریتییـە لـە ئــەركی ئاشــكراكردنی ، چــونكە لــەرێی بەخــشینی شــێوەیەكەوە بەوشــتەی كــە دەركــی ئەكەین، بوون ئاشكرا دەكات)).(٢٠) ئەوە بوو پێشتریش ئاماژەمان بە لێدوانی یاسپەرز و سەرسامبوونی بەو بینا بوودابیە سەرسـورهێنەرانەدا كـە پێـی دەڵـێن(( بـۆرۆ بـەدۆر Boro Buddor)) بەو پێیەی جۆرێك لـە زمـانی ناوشـەیی كـە لـە ئاشـكراكردنی بووندا ئەمانباتـە ئەودیو جفرەكانیشەوە، كاتێ پەی بەبڵندی و خەسڵەتی گشتگیرانەی دەبەین)).

بەهــەرحاڵ نێـەش ئامـاژەی بـەوەداوە كـە گەڕاندنـەوەی هـەموو هونـەرەكان بـۆ تاقـە پرنسیپێك شتێكی ئەستەمە و ، دەشێ بمانخاتە مەترسیی بە گشتیكردنەوە.

کەواتە بائەوەندە بەس بێت کە بڵێین ڕۆحیەتێك باڵی بەسەر هونەری هاوچەرخدا کێشاوە و بەشێوەیەکی فراوان کارایە، کە لەرۆحیەتی فەلسەفەی بوونگەرایی دەچێت.

## ٦.بوونگەرایی و ئاکار

ئێمە لە چەند شوێنێکی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان بۆ بابەتی ئاکار کردووە و پێویست ناکا ئەوە بڵێینەوە کە پێشتر وتوومانە. بەڵام کارێکی سوودمەندە گەرێتو ئەو سەرنجە پەرۆبڵاوانە سەبارەت بە ئاکار پوخت بکەینەوە، لەبەرئەوەی هەڵسەنگاندنی هەر فەلسەفەیەك تارادەیەکی زۆر بەو ئاکارەوە بەندە کە ئەو فەلسەفەیە دەیخاتە ڕوو.

بەشێوەیەکی گشتی. ئاکاری بوونگەرایی هەموو جۆرە خۆبەستنەوەیەکی دەقاودەق بەرێساویاساوە ڕەت دەکاتەوە. لەبەرئەوەی فەلەسەفەی بوونگەرایی وادەڕوانێتە ئەم رێسا و یاسایانە کەکۆمەڵێك پرنسیپ لەدەرەوەی ئادەمیزادەوە سەپێنراون بەسەریدا و ناچاری دەکەن پێشوەخت پەیڕەوی لە ڕەفتارێکی دیاریکراو بکات و دەبنە کۆسپ لە بەردەم وەدیهاتنی خودی دانسقە و ڕەسەنیدا و ، بەمجۆرە بوونگەرایی هانی ئەو جۆرە ئاکارە ئەدات کەپێی دەوترێ ((هەڵوێست))ی ئاکاری . لەم جۆرە ئاکارەدا ئەو هەڵوێستە دەگمەنەی کە بکەر خۆی تیا دەبینێتەوە ئاراستەی کردارەکە دیاری دەکات.

بەڵام ئاخۆ لەم هەڵوێستەدا چۆن لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆ دەبێت؟ هەروەکو بینیشمان مادامەکی خودی ڕەسەن ڕەهەندی کۆمەڵایەتی هەیە، کەواتە مرۆڤ دەکەوێتە دژایەتیەوە لەگەڵ خۆیدا گەرێتو ئەوپێوەرەی کردار بە هەڵوێستی بکەرەوە دەبەستێتەوە ، بەتەنها لە چوارچێوەی خودێکی شەخسیدا قەتیس بکات.

لەراستیدا هەموو ئاکارێك دوو توخم لەخۆی دەگرێت، توخمی هەڵوێست و توخمی ڕێسا. تەنانەت ئەو ئاکارەی کە دەقاودەق بە ڕێساکانەوە بەندە، لە هەندێ ڕووەوە هەندێ حاڵەتی ئاوارتە لەبەرچاو دەگرێت. لەزۆر حاڵەتیشدا ئەم سیستمی ڕێساو یاسایانەمان بینیوە کە لە پراکتیکدا نەرمییان نواندووە. بەڵام ئاکاری بوونگەرا پتر بایەخ بە توخمی

هەڵوێست ئـەدات نـەك ڕێسا، بگـره هەنـدێ جـار ڕێسا بەهەنـد وەرنـاگیرێ و ، مـرۆڤ لـە ئاقارێكی دژ بەیاسا antinomianismنزیك دەبێتەوە، دەشێ نموونـەی بـەرزی بوونگـەرا لـە سیاسەتدا ئاژاوەگەرایی بێت، گەربەوردی لەماناى ئەم وشەیە بگەین.

هەڵبەت ڕەخنەگرتن لەهەڵوێستێكی توندڕەوانـەی ئاكـاریی لـەمجۆره كـارێكی ئاسـانه. لەبەرئەوەی گەلێ خاڵی لاوازی تیا دەبینینەوە، لەوانـه: تاكگـەرایی و خودگەراییـەكی زۆر و زاڵكردن و پەسەندكردنی هەڵبژاردن بەسەر حیكمەتی ئاكاری و فەزیلەتدا.

وێڕای هەموو ئەمانەش، ناتوانین لەوە تێبگەین كە یاسا چۆن دەبێتە شتێكی ناوەكی و دەروونی، كەسی بوونگەرا زەحمەتـە بەلایـەوە ئـەم وشـانەی خـاوەنی (( مـەزموورەكان)) قبووڵ بكات كەدەڵێت: (( بۆ هەتا هەتا پەیڕەوی لـە شـەریعەتەكەی تـۆ دەكـەم و ئازادانـه ڕێ دەكـەم لەبەرئـەوەی داوای وەسـیەتەكانی تـۆم كـردووه لەبـەردەمی پادشاكانیـشدا شایەتمان بەتۆ ئەدەم لەو كارەشم شـەرم ناكـەم لەبەرئـەوەی مـن چـێژ لـەو وەسـیەتانەت دەبیـنم كـە خۆشـمـدەوێن وەسـیەتە خۆشەویـستەكانت بـەرز ڕادەگـرم و لەبەرخۆمـەوە فەرزەكانت ئەڵێمەوە .

(مەزموور ١١٩ — ٤٤ — ٤٨)

بەڵام سەرباری ئەم خاڵە لاوازانە و ئەو مەیلی دوژمنایەتیەی كە لە ئاكاری بوونگەراییـدا هەیە بەرامبەر بەرێسا و یاسـاكان، لایـەنی باشـی خۆیشی هەیـە و ئـەم لایەنـە باشـانەش تائێستا بەهای خۆیان هەیە.

ئەو ئاكارەی جەخت لەسەر یاسا دەكاتەوە، بەشێوەیەكی گشتی ئاكارێكـه دەڕوانێتـه ڕابردوو و داب و نەریت و شێوازی باوی ڕوودانی شـتەكان. ئـەم جـۆره ئاكـاره سـەقامگیری لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. بەڵام مەترسی سستی و وەستانیش لەگەڵ خۆیدا دەهێنێـت. وەلێ بەپێچەوانەوە، ئەو ئاكارەی جەخت لەسەر هەڵوێست دەكـات، دەڕوانێتـه ئاینـده وئـەوەی نوێیە، كرداریش تیایدا بەڕەچاوكردنی شتی نوێ دیاری دەكرێ. ئەوەبوو پێشتریش وتم كە هەمو ئاكارێك شتێك لەگرژی لەخۆدەگرێت.

بەڵام ئاکاری بوونگەرایانە ڕیسك لەسەر جەختکردنەوەی هەڵوێست دەکات نەك یاسا، لەسەرئەوەی کە لە ئایندەدا ڕوو ئەدات و نوێیە، نەك ئەوەی کە سوننەتییە، بەئەنقەستیش وشەی (( ڕیسك)م بەکارهێنا. چونکە لە ڕاستیدا هەموو کردارێك جۆرێك لەڕیسکی تیایە. لەگەڵ ئەوەشدا ، لەم سەردەمەدا کە هەلوومەرجەکانی ژیان زۆر خێرا دەگۆڕێن، پێویستە لەسەرمان ڕووبەڕووی ئەو هەڵوێستانە ببینەوە کە شەقڵێکی تازەیان هەیەو یاسا و ڕێسایەکی پێشوەختیان نییە. هەرلێرەوە ، دەشێ جەختکردنەوەی بوونگەرایی لەسەر هەڵوێست و ئایندە، لەسنوورێکی دیاریکراودا و لە جیهانی هاوچەرخدا، سوودبەخش و بنیاتنەربێت.

پێشتر لە شوێنێکی تردا وتوومە کەدەکرێ لەرێی چاوپیاخشانەوەی فیکری مانای یاسای سروشتی، ئەو مەترسیانە لە چوارچێوەیەکی بوونگەرا و داینامیکیدا کەم بکرێنەوە. مەبەستیشم لەمە یاسایەکە کەبەڕاستی هەڵقوڵاوی ناخی ئادەمیزاد بێت و هێی تر نەبێت جگە لە خولیای مرۆڤ بۆ مرۆڤایەتیەکی کامڵتر.

پێم وابێت ئەم تێڕوانینە نابێتە مایەی تایبێکی مردووی بوونی مرۆیی. گەرچی زەحمەتە لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا بگونجێت کەدەڵێت مرۆڤ لە هێچەوە خودی خۆی دەخولقێنێت. ئەمە دەربڕێنێکە کە لەگەڵ شێوە میانڕەوەکانی بوونگەراییدا دەگونجێت، بەڵام نەك لەگەڵ ئەو جۆرە بوونگەراییە توندڕەوی کە خراوەتە پاڵ سارتەر.(٢١)

## ٧. بوونگەرایی و خوداناسی(٨*)

خوداناسی (لاهوت — تیۆلۆجیا) بەدرێژایی مێژوو جۆرێك پەیوەندی (خۆشەویستی — ڕق)ی لەگەڵ فەلسەفەدا هەبووە،. هەڵبەت گومان لەوەدا نییە کە خوداناس پشت بەئیمان وسرۆش (وەحی) دەبەستێت، لەبەرئەوەی لای ئەهلی ئیمان لە بیرو بۆچوونەکانی خۆی

---

(*)ئەم بەشە لەوەرگێرانە عەرەبیەکەدا لابراوە و وەرگێڕە عەرەبەکەش ئاماژەی بەلابردنی داوە. بەڵام لەدەقە فارسیەکەیدا لانەبراوە. — و. کوردی —

بکات و بەزمانێك دەریانبڕێت کە ئاڕاستەی کەلتووری هاوچەرخی بکات، دەزانێت کە بەبێ فەیلەسووف ناتوانێ ئەم کارە ئەنجام بدات. هەندێ جار خوداناسی وا ئاشنا دەبن کە لە کاردانەوەیاندا بەرامبەر بە فەلسەفەیەکی بەڕواڵەت زاڵ، هەوڵ ئەدەن بەهێ جۆرێك خۆیان بە فەلەسەفەوە نەبەستنەوە بەڵام لەراستیدا لەم هەوڵەیان پاشگەز دەبنەوە، یان لەوانەیە وەچەی دواتر لەو هەوڵە پاشگەز ببێتەوە، یان ڕەنگە ڕاستییەکەش ئەوە بێت کە ئەوانە هەرگیز نەیانتوانیوە دەست لە جۆرێك ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ فەلسەفەدا هەڵگرن.

لەڕاستیدا فەلسەفەی بوونگەرایی لەو دەیان ساڵەی دواییدا فەلسەفەیەکی کاریگەر بووە لەنێو خودا ناسەکاندا. بارت و بۆڵتمان وتیلیش و بوری ئون و ئەبلینگ و ڕانەر هەندێك لەوخوداناسە هاوچەرخانەی کە لە زۆر ڕووەوە و بەشێوەیەکی قوول کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی فەلسەفەی بوونگەراییەوە.

ئەم کاریگەرییە شێوەی جۆراوجۆری هەبووە یارت لەژێر کاریگەری کیرکەگۆردا بووە، بۆڵتمان لەژێر کاریگەریی هایدیگەردا و ، بوری لەژێر کاریگەریی یاسپەرزدا. ئەو کاریگەرییەی لەسەر بارت بە ( خوداناسیی Kerygmatic theology) دەشکێتەوە و لای بۆڵتمان بەئەفسانە ناوی بوون و لای تیلیش بە ئۆنتۆلۆجیا. ئیدی شێوەیی جیاوازی کارتێکردنەکە هەرچییەك بووبێت، دەتوانین بڵێین کە برێکی بەرچاو لە داهێنەرترین هزری تیۆلۆجی لەسەدەی بیستدا، لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ فەلسەفەی بوونگەراییدا سەرچاوەی گرتووە.

ئاشکراترین خاڵی یەکگرتنەوەی نێوان فەلەسەفەی بوونگەرایی و خوداناسی ئەوەیە کە هەردووکیان لەبارەی مرۆڤەوە ئەدوێن. گەر زۆربەی فەلەسەفە هاوچەرخەکان پشتیان کردبێتە مەسەلە تیۆرییەکانی بۆ نموونە وەکو بوونی خودا، ئەوا ئەم ڕاستییە دەتوانێ ئەوە بیری خوداناس بهێنێتەوە کە خوداناسی (تیۆلۆجیا)ش مرۆناسی (ئەنترۆپۆلۆجیا)یە، یان دەشێ بتوانین لەبارەی ((خودا — مرۆناسی))یەوە بدوێین.

تیۆلۆجیای مەسیحی بریتی نییە لەتیۆریزەیەك سەبارەت بـەخودا ((خـۆی بۆخـۆی)) ، بـەڵکو تیۆریزەیـە دەربـارەی خـودا لـەرێی بایەخـدان بەمرۆڤـەوە و، هەربـەو پێیـەش، بەئەندازەی ئەوەی کـە تێگەیـشتنە لـەمرۆڤ تێگەیـشتنە لـەخوداش. لـەم بارەیەشـەوە زۆر گوتراوە کە پێویـستە تیۆلۆجیـای هاوچـەرخ پـتر لێـدوان بکاتـە سـەرەتای میتۆدۆلۆجیـای خۆی نەك لێدوان لەسەر مرۆڤ لەسەر خـودا. لەڕاسـتیدا خوداناسـانی بوونگـەرا ئـەم ڕێگایـە ئەگرنە بەر و هەوڵ ئەدەن بـەپێی دیاردەناسـیی بـوونی مەسـیحییانە مانـای باوەڕهێنـانی مەسیحی بخەنە ڕوو. شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئەم ڕێگایە بۆ دوورخـستنەوەی تیۆلۆجیـا لەبناغە ئایینیەکەی لە چاخێکی نائایینیدا یاریدەدەرە. تائێستاش پرسـیارکردن دەربـارەی مرۆڤ دەخرێتە ڕوو، لەکاتێکدا پرسیار دەربارەی خودا بەڕواڵەت والەدیوی پشتەوەدا. بـەڵام لەم سەردەمەدا ، کە پڕە لەتیۆری سەبارەت بەمرۆڤ، تیۆلۆجیـای مەسـیحی شـیکردنەوەی پێکهاتەی خۆرسکیانەی مرۆڤ و ئومێد وعیشق و کۆتابوون و گوناهی، دەکاتە خاڵی چـوونە ناوەوەی ئەم باسە و متمانەی بەوە هەیە کـە لێکۆڵینـەوەی قـووڵی مـرۆڤ ڕەهەنـدی بـاڵاڕۆ (متعالی) ئاشـکرا بکـات. خوداناسـی مەسـیحی لـە ئەنجامـدانی ئـەم لێکۆڵینەوەیەیـدا هـەم تایبەکانی بوون هەم سەرچاوەیەکی زمانی وەها لە فەلەسـەفەی بوونگەرایـدا دەدۆزێتـەوە، کەتیایدا دەکرێ گوزارت لە بونیادەکانی بوون بکرێ.

هەرچۆن دەروونپزیشکیەکان کەوتبوونە ژێر کاریگەری شـیکردنەوەی بوونگەرایانـەوە و هەندێ لە چەمك و زاراوەکانیان لێ وەرگرتووە، بە هەمانشێوە خودا ناسەکانیش.

ئەو دەستوورانەی کە لەکتێبی پیرۆز و لەتیۆلۆجیای باوی مەسیحیدا سـەبارەت بـەمرۆڤ خراونەتە ڕوو، ئێستا پڕن لەزاراوەی کۆن و نیمچە ئەفسانەیی .

لەتەوراتدا پێمان دەوترێ کە مرۆڤ ئاوێتەیەکـە لـەخاك ونـەفخی ژیـان، لـەکاتێکا پـۆڵس پێغەمبەر، سەرباری ئەو بۆ چوونە وردانەی دەربارەی بوونی مەسیحیانە هەیبوو، بەوشـەی نـاڕوون و نـاوردی وەکـو جەسـتە و ڕۆح و دڵ وشـەی تـری لـەم بابەتـە شـتەکانی خـۆی دەردەبـڕی. فەلەســەفەی بوونگــەرایی نموونــەی تــازە و باشــتر و زاراوەی نــوێتر بــۆ

گوزارِتکردن لەتێڕوانینەکانی کتێبی پیرۆز بۆ مرۆڤ وتێگەیشتنی بۆی، دەخاتە ڕوو. هەر بۆ نموونە دەتوانین زاراوەی واقیعیبوون لەبری ((خاك)) و ئیمکان لەبری ( نەفخی ژیان)) بەکاربەرین و بەشێوەیەکی تازە لەم چیرۆکە کۆنە تێبگەین.

فەلسەفەی بوونگەرایی بەتەنها وشەی ئەبستراکتمان ناخاتە بەردەست، بەڵکو بنەمای فراوانتریشمان بۆ لێکدانەوە ئەداتێ. وشەکانی کتێبی پیرۆز دەچنە خانەی ئەفسانە ومێژوو و دامەزراوەی ئایین و شەرعییەوە، یان هەر ناوێکی تری لەم بابەتانە یان لێ بنێین.

(( ئەفساناوییبوون))ی بۆلتمان بەناوبانگترین نموونەی ناولێنانێکی گونجاوی لێکدانەوەی بوونگەرایانەیە بۆ چەند لایەنێکی فراوانی بابەتەکانی پەیمانی نوێ (ئینجیل) و لێکدانەوەی وێناکردن و ئەفسانەکانی سەدەی یەکەمی زایینی، بەزمانی هاوچەرخی بوون.

هەروەها ئەو ڕێبازەی کەپێی دەوترێ ((هێرمنیۆتیکای نوێ)) و لەڕێی ئەبلینگ و کەسانێکی ترەوە هاتە ئاراوە، هەوڵئەدات زیاتر بچێتە ناو وردەکارییەکانی مەسەلەی لێکدانەوەوە و لەم میانەشدا فەلسەفەی بوونگەرایی ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت.

بەڵام ئایا لێکدانەوەی بوونگەرایانە بۆ کتێبی پیرۆز و لێکدانەوەی بیروباوەرە تیۆلۆجیەکان، تا چەند بەهەند وەردەگیرێن؟ ئایا لێرەدا ئێمە نامانەوێ فەلسەفەیەکی نوێ بخەینە جێی بابەتگەلێکی ئایینی باوەوە کە ئێستا کۆن بوون. بێگومان ئەم تەرزە لێکدانەوەیە و ئەم تەرزە مامەڵەیە لەگەڵ تیۆلۆجیادا، وەکو هەر بوارێکی دی، گەر زێدەڕۆیی تیا کرا، شێوێنەر دەبێت. لەگەڵ هەمو ئەمانەشدا ئەو لێکۆلینەوەی لەنێوان تێگەیشتنی کتێبی پیرۆزدا بۆ مرۆڤ و تێگەیشتنی فەلسەفەی بووندا بۆی دەیدۆزینەوە، تارادەیەکە کەدەبێ دڵنیابین لێکدانەوەی بوونگەرایانە بەزۆر بابەتەکانی کتێبی پیرۆز ناخاتە قاڵبی ناتەباوە. هەروەها دەبێ ئەوەشمان بیرنەچێت کە هەر لێکدانەوەیەك لەگەڵ دەقدا پەیوەندییەکی ئاڵۆگۆڕی هەیە. بەڵام ئاخۆ لەم تیۆلۆجیا بوونگەرایانەدا چی دەربارەی خودا دەگوترێ؟ ئایا هەروەکو سارتەر دەڵێت، فەلسەفەی بوونگەرایی جۆرە

مرۆگــەرایی (هیومــانیزم)ێـك نییــە کەبــەکاربردنی لــەتیۆلۆجیادا دەبێتــە هــۆی ئــەوەی مەسیحیەت لە باوەڕهێنان بەخوداوە بگۆڕێت بۆ ئاکارێکی مرۆگەرایانە؟

ئایا ڕاستە کە ئەم شێوازەی تیلۆجیا لایەنی مرۆیی پەیوەندی ئیمان دەگرێت و بـوونی مەسیحیانە لە جیهانـدا بـەیان دەکـات. بەهــەرحالّ، مـن پێـشتر ئـەوەم ڕوونکردۆتـەوە کـە خوداناسـی مەسـیحی لـەو بڕوایەدایـە کـەوەختێ ئـادەمیزاد قـوولآیی بـوون شـیدەکاتەوە، بەهەندێ ئەزموون دەگات کەتیایاندا کەلامی خودا لەگـەڵ تێگەیـشتنی ئـەودا دەگونجێت. هەر لەبەرئەمەشە کە فەلسەفەی بوونگەرایی هیچ ((بەڵگەیەك)) بۆ سەلماندنی بـوونی خـوا ناخاتە ڕوو، بەڵام شیکردنەوەی بـوون مـرۆڤ بەهـەمان ئـەو سـنوورانەی بـوون دەگەیـەنێت کەتیایدا ئیمان سەرهەڵئەدات.

بەبڕوای من هێندەی مەسەلەکە پەیوەنـدی بـەخوداوە هـەبێت، دەتـوانین خوداناسـانی بوونگەرا بکەین بەدوو دەستەی تاڕادەیەك جیاوازە، هێکام لەم دوو دەستەیە لەقسەکردن دەربارەی خوا بێدەنگ نابن، بەڵام شێوازی قسەکردنەکانیان زۆر جیاوازە.

بۆڵتمان و بوری نوێنـەری دەسـتەی یەکـەمن. ئەمانـە پێمـان دەڵـێن کـە مـرۆڤ بەتـەنها لەچرکەساتی ئیماندا دەتوانێ دەربارەی خوا بدوێت. خوا نابێتـە بابـەتێك بـۆ بیرکردنـەوە، بەڵکو لە پێداویستیەکی نامەرجدار (یان لوتفێکی نامەرجـدار) دەچـێت کـە مـرۆڤ لەهەنـدێ چرکەساتی زیندووی ژیاندا هەستی پێ دەکات.

دیارترین نوێنـەری دەسـتەی دووەمـیش تیلیـشە، تیلـیش بەپـەیڕەویکردن لـە هەنـدێ فەیلەسـووفی بوونگـەرا کـە درێـژە بەدامەزرانـدنی جـۆرێکی تایبـەت لـە ئۆنتۆلۆجیـا یـان میتافیزیکـا ئـەدەن، خوازیـاری ئۆنتۆلۆجیایـەك و هـەروەها بناغەیـەکی بوونگەرایانەیـە بـۆ قـسەکردن سـەبارەت بـەخودا. مـن خۆشـم بـڕوام وایـە کـە دواجـار نـاتوانین لـە پرسـیاری ئۆنتۆلـۆجی هــەڵێین، بەتایبــەتیش ئــەوەی مــن لەتێگەیـشتنەکەی هایدیگــەردا بــۆ بــوون دەیبینمەوە کەنموونەیەکی زۆر سوودمەندە بۆ ئۆنتۆلۆجیایـەکی یـەزدانی. هەڵبـەت وابـزانم پێویست ناکا بڵێم کەلەم چوارچێوەیەدا ئێمە بیر لە ئۆنتۆلۆجیایـەکی بوونگەرایانـەی تـەواو

جیاواز لەو ئۆنتۆلۆجیا تیۆرییانەی شێوازی کۆنی میتافیزیکا دەکەینەوە. ئەو ئەگەرەش لە ئارادا دەبێت کە ئۆنتۆلۆجیایەکی بوونگەرایانەی وابخەینە ڕوو کە ڕەنگە بتوانێ ببێتە هاوتایەکی نوێی تیۆلۆجیای سروشتی ( کەپشت بەئەقڵ دەبەستێ)ی شێوازکۆن و بێبەها.

لەو پەیوەندییە زۆرانەی تری نێوان فەلسەفەی بوونگەرایی و تیۆلۆجیا بۆ نموونە دەتوانین باس لەوە بکەین کە تیۆلۆجیای کەشفبوون یاسرووش (وەحی) چەندین نموونەی سوودبەخشی لە فەلسەفەی بوونگەرایدا دۆزیوەتەوە. هەرلەوێناکردنی ڕووبەڕووبوونەوە لای بووبەر و ئەوانی دی، کەخوداناسێکی وەکو برونەر (**Brunner**) بەشێوەیەکی فراوانتر بەکاری برد، تا سەرەتاکانی هزری هایدیگەر، هزرێك کەئوت بەڕوونکەرەوەی دیاردەی کەشفبوون یان سرووش بینیوە.

بەمجۆرە ئاشکرایە کە چ لە خودا ناسیدا و چ لەو بوارانەی دیکەدا کەلەم بەشەدا لێمانکۆڵینەوە، کاریگەریی هزری بوونگەرایی چەند فراوان بووە.

## ١.پیاچوونەوە بەهەندێ ڕەخنەدا

لە سەرەتای ئەم کتێبەدا ئاماژەمان بەوەدا کە سەرباری ئەوەی کۆمەڵێك بابەت هەیە لە بوونەگەرایی‌دا دووپات دەبنەوە، بەڵام جیاوازیی زۆر گەورە هەیە لەنێوان ئەو کەسانەدا کە بەشێوەیەکی گشتی پێیان دەڵێن ((بوونگەراکان)) یان (( فەیلەسووفانی بوون)). هەربەهۆی ئەم جیاوازییانەشەوە بوونگەرایی وەکو دیاردەیەکی وەها بگۆڕ خۆی دەنوێنێت.

کە زەحمەتە بچێتە ژێر ڕەخنەیەکی گشتییەوە . هەر ئەو ڕاستییەش کە هەریەك لە لایەنگرانی بوونگەرایی بە هۆشیارییەوە دژ بەیەکڕەنگی دەجەنگن و قایل نین وەکو ئەندامی (( قوتابخانە))یەك سەیربکرێن، بەسە بۆئەوەی بزانین کە چۆن ئەو بەگشتیکردنانە بەسەر بوونگەرایی‌دا ناهەقی بەرامبەر بەهەندێ لە لایەنگرانی دەکات. هەربۆیە هەندێ لەو ڕەخنانەی کە دەشێ سەبارەت بە هەندێ شێوەی بوونگەرایی ڕاست بن، سەبارەت بەهەندێ شێوەی تری ڕاست نین. بۆ نموونە دەشێ تاکگەرایی تۆمەتێك

بێت بدرێتـه پـاڵ کیرکـەگۆر، گەرچـی بەشـێك لـه ڕاسـتی تیایـه، بـەڵام ئەمـه بەسـەر ((بووبەر))دا ناچەسپێ.

ڕەنگە تۆمەتی نائەقڵانیەت ئاڕاستەی (( دۆنکیخۆتی)) یەکەی ئۆنامۆنۆ بکرێ، بـەڵام یاسپەرز بەشێوەیەکی تایبەتی دژ بەو نائەقڵانیەتە شەیتانیەیە وەستاوەتەوە کـه چـەند جارێك لەسەدەی بیستەمدا پەتی پساندووه.

هەروەها له هزری نیچه و سارتەر و کـامۆدا هەسـت بەڕەشـبینییەکی قـووڵ دەکرێ، کەچـی دەبیـنین (مارسـیل) بـاس لـه ئومێـد دەکـات. ئێمـه لـه هەنـدێ لـەم حاڵەتانـەدا کۆمـەڵێك هـەوڵی جۆراجـۆر بـۆ ڕاسـتکردنەوەی زیادەڕەوییـەکانی نـاو بوونگـەرایی دەبینینـەوە. بـەڵام دەبـێ دان بەوەشـدا بنـێم کەلـەو سـێ حاڵەتـەی ئامـاژەم پـێ دان، بووبەرو مارسیل ویاسپەرز حاڵەتی ئاوارتەن لەنێو ئاقارە باوەکانی بوونگەراییدا. چـونکە زەحمەتـه هـەر فەلـسەفەیەك شـەقڵێکی کۆمەڵایـەتی یـان ئـەقڵانی و یـان گەشـبینانەی بەخۆوە گرتبوو، پێی بڵێن فەلسەفەیەکی بوونگەرایە.

وەك چۆن ناتوانین بەو ئایینه بڵێین ئایینی کاتۆلیکی ڕۆمانی، کە دەسـبەرداری پاپـا و زنجیرە پلەو پایەی کڵێسایی و شێوەی یەزدانی بێت.

کەواتـه هەنـدێ ئاقـار لـه فەلـسەفەی بوونگەراییـدا دەمێننـەوە، کـەدەکرێ نوێنـەری تەوژمی باوی هزری بوونگـەرا بـن، گەرچـی مـەرج نییـه لەهـەموو شـێوەکانی بوونگەراییـدا هەبن، ئێمەش هەر لەسەر ئەم بنچینەیە لەچەند شوێنێکی ئەم کتێبەدا هەندێ لـەو ڕەخنـه و پرسیارانەمان خستۆتە ڕوو کـه ئاڕاسـتەی بوونگـەرایی کـراون. ئێـستاش والێـرەدا ئـەو ڕەخنانـه کۆدەکەینـەوە، پاشـان بـاس لـەو زیانانـه دەکـەین کـه پـرۆژەی بوونگەرایـه دەگەیەنێت.

—١—

با لەو ڕەخنەیەوە دەست پـێ بکـەین کـەدەڵێت بوونگـەرایی ئاقـارێکی نائەقڵانییـه، بەبڕوای مـن گـەر ئـەم تۆمەتـه ڕاسـت بێـت نـاتوانین بـه بونگـەرایی بڵـێین فەلـسەفەیە،

لەبەرئەوەی دەبێ فەیلەسووف گوێ لە دەنگی ئەقڵ بگرێو ئەقڵ بكاتە ڕێپیشاندەری خۆی. چونكە فەیلەسووف ئەوینداری حیكمەتە هەروەكو كاتی خۆی واپێناسەكراوە. ئێمەش بۆیە ڕێز لە فەیلەسووف دەگرین، لەبەرئەوەی ئەو توانایەی تیا دەبینینەوە كەشتەكان وەكو خۆیان دەبینێت، بینێنێك كەتەمی هەڵچوون و هەواو هەوەس نایشێوێنت. هەڵبەت ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت كە پێویستە فەیلەسووف بێلایەن بێت. ڕەنگە كەس نەتوانێ بگاتە ئەمجۆرە بێلانیەیە و ، لەوانەیشە واپێویست بكات كە نەیگاتێ. ئەقلانیەتی فەیلەسووف مانای ئەوە نییە كەنابێ بایەخ بەكاروبارە مرۆییەكان بدات، یان بەتەنها ببێتە بینەرێك بۆ ئەو شانۆ مرۆییە، لە بری ئەوەی بەشداریی تیا بكات.

بەڵام ئێمە تەنانەت لەم حاڵەتەشدا چاوەڕێی ئەوە لە فەیلەسووف دەكەین كە ڕەخنەگر و شیكار بێت و شوێن پێهەڵگر نەبێت و ، خۆی بۆ حەقیقەت تەرخان بكات، بەتەنها حەقیقەت. ئەم خەسڵەتانەش پێویستیان بەكەمێك مەوداگیری هەیە.

بە بۆچوونی من پێویستە لەسەر ئەوە كۆك بین كە بانگەشەی فەیلەسووفی بوونگەرا بۆ بەشداریكردنی ویژدانی یان عاتیفی ئاقارێك دەخولقێنێت، گەر بێتو تەواو جڵەوی نەكەین لەوانەیە دووچاری حاڵەتێكی زەینیی وامان بكات كە لەگەڵ پەیرەویكردنی ئەقڵدا ناتەبابێت.

بۆ نموونە (( دۆن كیخۆتە))ی ئۆنامۆنۆ و شاسواری ئیمان لای كیركەگۆر، دەشێ لەبەر گەلێ هۆ ببنە مایەی سەرسامیمان، بەڵام زەحمەتە هۆی ئەو سەرسامییە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە ئەو دووانە فەیلەسووفن لەوانەیە فەیلەسووفەكان هیچ شتێكی وایان تیا نەبینن كەمایەی سەرسامی بێت. ڕەنگە هـ.جەی. پاتۆن لەوەدا زێدەڕۆیی كردبێت كە دەڵێت: ((باشترین گوزارتی نوێ لە ڕەتكردنەوەی ئەقڵ، خۆی لە نووسینە بێشوومارەكانی كیركەگۆردا دەبینێتەوە، ئەو پەسەندكردنەشی لەلایەن خەڵكێكی

زۆرەوە نیشانەیەکی ئەو ڕێگا مەترسیدارە کەپێی گەیشتووین و ، بەڵگەی نائومێدی و دڵساردییە)).(١).

گەر چی من پێم وایە ئەبێ ئەم ئاگادارکردنەوەیەی بەهەند وەربگرین. ئەم ئاگادار کردنەوەیەش دەڵێت کاتێك خەڵك ئەقڵ پشتگوێ ئەخەن وجۆش و خرۆش بەسەر ڕەخنەی ئەقڵانیدا زاڵ دەبێت و ، پووچی پارادۆکس (موفارەقە) بەرز ڕادەگرن، ئەمە مانای ئەوەیە کە مەترسیەکی سامناك لە ئاسۆدا خۆی دەنوێنێت. مەترسیەکەش بە تەنها مەترسیی نامەعقول نییە، بەڵکو دژایەتیکردنی ئەقڵە کە دەشێ زۆر بە ئاسانی شێوەی توندوتیژییەکی نامرۆڤانە بەخۆیەوە بگرێت، هەروەکو خۆ بەزلزانینێکی دۆن کیخۆتییانە. هەر بۆ نموونە دەتوانین چی دەربارەی ئەوە بڵێین کە (( ئۆلریش سیمۆن)) ناوی دەنێت ((بەشێتیی بتپەرستانە)) و ((نیهیلیزمی نەشئەی ڕەش))ی ئۆشڤایتز*. کەس ناتوانێ نکوولّی لەوە بکات کە هەندێ لێکچوون لەنێوان ئەو شێتییە چاوچنۆکانەیەو هەندێ ڕواڵەتی بوونگەراییدا هەیە.

خەڵك ئامادەگییەکی زۆری تیایە دوای ئەم تەوژمی جۆش و خرۆشە بێمانایانە بکەوێت، ناشبێ ئەرکی فەیلەسووف ئەوە بێت هانی ئەم حاڵەتە بدات. بەڵام بوونگەرایی لە باشترین شێوەیدا ((نامەعقول)) نییە و ((دژی ئەقڵ))یش نییە. بەڵکو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەوڵەمەندیی ئەزموونی مرۆیی لە مپەرەکانی هزری چەمکی تێکدەشکێنێت و ، لەوانەیە ئەقڵانیەتی بەرتەسکیش ژیانمان هەژار بکات. هەروەها ئەگەر بمانەوێ ناهەقی لە هـ. جەی. پاتۆنیش نەکەین، پێویستە بڵێین کەدەبێ ئەم وشانە بخاتە سەر ڕەخنە توندەکەی بۆسەر کیرکەگۆر: ((شتێکی زۆر مەعقولە دان بە

---

* ئۆشڤایتز: ناوی گەورەترین ئۆردوگای گرتن بوو لای نازیستەکان لە پۆلەندا. دەڵێن هیتلەر بەملیۆنەها کەسی تێدا بەگاز کوشتووە، ئێستاش ئەو شوێنە مۆزەخانەیە، ئەمەش نموونەی توندوتیژیی نامرۆڤانەی ئەو ئایدۆلۆجیانەیە کە ڕقیان لە ئەقڵانیەت دەبێتەوە و پشت بەنامەعقول دەبەستن، نووسەری ئەم کتێبەش مەبەستی لەم لایەنەیە.

سنوورەكانی مەعریفەی مرۆییدا بنێین و پێ لەسەر ئەوە دابگرین كەئەبێ لە ژیانی ئایینیدا بڕیار و ئیلتیزامی واهەبێت كە بەرنجامی بیركردنەوەی مەنتیقی نییە)).(٣).

لایەنی ڕاست لە دژایەتیكردنی بوونگەراییدا بۆ ئەقلانیەت نەهێڕكردنێتی بۆ سەر مەنتیق و نەبەرز ڕاگرتنی پووچی، چونكە ئەمانە خەسڵەتی مەترسیدار و نەگەتیڤن و ئەبێ بەناوی ئەقڵەوە بەرهەڵستییان بكەین. بەڵام ئەوەی ڕاستەتێیدا پێداگرتنێتی لەسەر ئەوەی كە كۆمەڵێك لایەنی دەوڵەمەندی زۆر هەیە لە بوونی مرۆڤدا كە نابێ پشتگوێیان بخەین یان بەكەم سەیریان بكەین، هەر لەبەرئەوەی لەگەڵ بنەماكانی ماتماتیك یان مەنتیقی زانستە ئەزموونیەكاندا ناگونجێن.

ئەمەش نەسووكایەتیكردنە بەمەنتیق و نەبانگەشەیە بۆ ئاژاوەیەكی فیكری ، بەڵكو لە باشترین حاڵەتدا هەوڵێكە بۆ پەرەدان بەمەنتیقێك بۆ كەسەكان لەپاڵ مەنتیقی شتەكاندا كە دەیزانین.

— ٢ —

تۆمەتێكی تریش هەیە كە زۆر پەیوەستە بە نائەقلانیەتەوە ، ئەویش تۆمەتی گوێنەدانە بە ئاكار ammoralism (ئەگەر نەشڵێین ناكاری Immoralism) لەبەر مەترسیداریی ئەم تۆمەتە ، ئەوە بوو پێشتر كەمێك هەڵوەستەم لەسەر كردو ، پێویست ناكات ئەوە بڵێمەوە كە گوتوومە، بینیشمان كە چارەسەری ئەم كێشەیە بە گەڕانەوە یان هەوڵی گەڕانەوە نابێت بۆ خۆبەستنەوەیەكی تەواوەتی بە ڕێساو یاساكانەوە.

بەڵام ئەگەر مرۆڤ لافی ئەو ئازادییە ئاكارییە لێبدات كە بوونگەراكان بانگەشەی بۆ دەكەن، ئەوە بەتەنها كاتێك شیاو دەبێت كە هەستكردنێكی بەرز بە بەرپرسیارێتی و شیكردنەوەیەكی ئاكاریی قووڵی وای لەگەڵدا بێت كە ئەو پێودان و ئاقارانە ڕۆشنبكاتەوە كە لە بونیادی بوونی مرۆیی خۆیەوە وەرگیراون. وەك چۆن دانمان بەوەشدا نا كە خەڵك ئامادەگیەكی تەواویان بۆ ئامێزكردن بە نامەعقولدا هەیە، لەبەرئەمە ئامادەگیەكی

تەواویان هەیە بۆ پشتگوێ خستن ئیلتیزامی ئاکاریش . بێگومان هەندێ شێوازی نابەرپرسانە بۆ گوزارشتکردن لەتێڕوانینی بوونگەرایانە هانی جۆرێك لە ڕەفتار ئەدات کە دواجار دەگۆڕێت بۆ ڕەفتارێکی وێرانکەری مرۆڤایەتیمان. بە تەنها بانگەشەکردن بۆ ڕەسەنایەتیش بەس نییە، گەر شیکردنەوەیەکی مەعقولی مانای ڕەسەنایەتیشی لەگەڵدا نەبێت. ئەو ڕەخنەیەی ((هانز جۆناس))یش کە یەکێکە لە فەیلەسووفە بوونگەراکان دەشێ بەسەر زۆریاندا بچەسپێ ، ئەو سەبارەت بە بانگەشەکەی هایدیگەر بۆ بوون بەوپێیەی بانگەشەیەکە بۆ بوونی مرۆیی ڕەسەن، دەڵێت: ((فرهرەر ــ واتە هیتلەریش وابوو، ئەو بانگەوازی چارەنووسی ئەڵمانیا بوو کە لەو سەدەیەدا باوبوو بریتی بوو لە پەردەهەڵماڵینیش لە شتێك و ، بانگەشەبوو بۆ بوون و ، بارگاوی بوو بە چارەنووسی بە هەموو مانای ئەم وشەیە، بەڵام هزری هایدیگەر نە ئەوساو نە ئێستاش پێوەرێکی پێمان نەداوە کە لە ڕێیەوە بزانین کاردانەوەمان بەرامبەر بەمجۆرە بانگەوازانە چی بێت ))(٤). پێدەچێ پەیوەندیی هایدیگەریش بە نازیزمەوە بۆ ئەو ساویلکەییە سیاسییە بگەڕێتەوە کە جگە لەو کەسانەی تریش لە سیەکانی سەدەی بیستدا گرتەوە. بەڵام ئاخۆ لەم مەسەلەیەدا شتێکی تریش هەیە؟ ئاخۆ دەتوانیت ڕیشەی ئەم پەیوەندییە بۆ دانپیانەنانی بوونگەرایی بە پایەی پێوەرە ئاکارییەکان لە ژیاندا بگەڕێنێنیەوە؟

هەروەها بۆ جەختکردنەوەی لەوەی کە پێویستە مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆبێت، ئیدی گرنگ نییە ئەنجامەکەی بەرەوکوێ ئەچێت؟

هەڵبەت من دەرك بەو لایەنە پەنهان و دژانە ئەکەم کە لەم مەسەلانەدا هەن. بڕواشم بەوەیە کە نووسینەکانی خودی هایدیگەر پتر شایانی بەرگرین لەو شتانەی کە هەندێ لە ڕەخنەگرەکانی لەبارەی ئەوەوە وتوویانە.

ئاخۆ دەتوانین لۆمەی نیچە بکەین و بڵێین ئەوبووە هۆی سەرهەڵدانی دیاردەی نازیزم؟ ئەی کەواتە بۆ لۆمەی هیگل نەکەین؟ — کامۆ بڕوای وابوو کە ئەم دووانە لەو

کاره بەشدارن * . بـەڵام پێویسـه بڵـێین کـه کیرکـەگۆر بیرۆکەیـەکی تـەواو مەترسـیداری خستەڕوو کاتێ بۆ یەکەمجار باسی لە ((هەڵپەسـاردنی مەبەسـتگەرایانەی ئاکـار)) کـرد. من پێشتر لەوه دواوم که پێویسته هەندێ جار ڕیسکی ئەم مەترسـییە تـاقی بکەینـەوه، ئەگینا ناتوانین دۆخی باو تێپەڕێنین.

بەڵام مـن دەمـەوێ لێـرەدا مەترسـیی مەسـەلەکە بخەمـە ڕوو و بڵـێم و کـه نـاڕوونیی ئاکاری بوونگەرا خاڵێکی لاوازییه لەو فەلسەفەیەدا. ناشتوانین بەسەر ئـەم لاوازییـەدا زاڵ بـین ئـەو کاتـه نـەبێت کـه لێکدانەوەیـەکی ڕوونـتر و ئیجابیترمـان بـۆ پێگـەی پێـوەر و پرنسیپه ڕێنوماییکەرەکانی ڕەفتار هەبێت، ئەمەش لێکدانەوەیەکە کە دەشێ شێوەی (( یاسایەکی خۆڕسکی)) یـان ((یاسـایەك بـۆ بـوونی مرۆیـی)) (٥) بەخۆیـەوه بگرێـت، کـه بەشێوەیەکی داینامیکی پەره دەسەنێت.

– ٣ –

ئێـستاش دەچـمه سـەر ئـەو ڕەخنەیـەی کـه دەڵێـت فەلـسەفەی بوونگـەرایی فەلسەفەیەکە تووشی دەردی تاکگەرایەکی ناپەسـەند بـووه. لەهـەمان کاتـدا چـاوێکیش بەو ڕەخنەیـەدا دەخـشێنین کـه پەیوەسـته بـەم ڕەخنەیـەوه و دەڵێـت کـه بوونگـەرایی ئاقارێکی خودگەرایه.

له ڕاستیدا هـەم تـوخمی تاکگـەرایی و هـەم تـوخمی خودگـەراییش لـه بوونگەرایـیدا دەبینینەوه و ، بڕواشم وایه کە تاڕادەیەك دەتوانین بەرگری لەم توخمانه بکەین.

له کاتێکـا دادوەریـی تاکەکەسـانه و بەرپرسـیاریی تاکەکـەس دەکەونـه بەرمەترسـی فەوتان له ئەنجامی زاڵبوونی ڕێبازێکی دەسته جەمعییـەوه، ئالـەم کاتـەدا زۆر پێویـسته

---

* بەستنەوەی نیچه به نازیزمەوه له زۆربەی ئەو کتێبانـەدا بـاوبوو کـه لـه سـاڵانی دووەم جـەنگی جیهـانی و دواتـردا نووسـران. بـەڵام بەسـتنەوەی هیگـڵ بـه نازیزمـەوه، دەگەڕێتـەوه بـۆ (( کـار پۆپـەر))ی فەیلەسووف له کتێبەکەیدا(( کۆمەڵگای کراوه و دوژمنەکانی)).

لایەنی مافەکانی تاکەکەس بگرین. هەروەها مادامەکی بابەتێتی ( مەوزوعیەت)ی تـەواو و بێلایەنی تەواو لە فەلسەفەدا خەیالاتێکە و هیچی تر، بۆیە لەسەر فەیلەسووف پێویستە دان بەوەدا بنێیت کە گۆشەنیگایەکی تایبـەت و دۆخێکـی مێـژوویی تایبـەتی و هـەروەها فاکتەرێکی شەخسیش لە فەلسەفاندنیدا هەیە.

کاتێکیش هەردوو فاکتەری تاکگەرایی و خودگەرایی بەو شێوازە میـانڕەوە لـە ئـارادا دەبێـت کـە پێـشنیارم کـردن، نابنـە جـێی ڕەخنـە. بـەڵام ئـەو کێـشەیەی کـە دەبـێ ڕووبـەڕووی بینـەوە ئەوەیـە کـە : ئـاخۆ ئـەم دوو خەسـڵەتە ئـەو سـنورە میـانڕەوە تێدەپەڕێنن، واتە لە زۆربەی فەلسەفە بوونگەراکاندا جڵەویان بۆ شل دەکرێ؟ من خـۆم یەکێك بووم لەوانەی کە هەندێ جار دەموت تاکگەرایی لای بوونگەراکان قۆناغێکی کـاتی و تێپـەڕە و ، هـۆی سەرهەڵدانیـشی دەربڕینـی نـاڕەوایی بـووە بەرامبـەر بەوێنـە شێوێنراوەکانی بوون ــ لەگەڵ ــ ئەویتردا.

هـەروەها نـابێ وابـزانین کـە ئاقـارە خودگەراکانیـشیان لـە تێڕوانینـی بنـەڕەتیی فەلسەفیاندا ڕەگوڕیـشەی داکوتـاوە، بـەڵکو بـۆ کۆمـەڵێك فاکتـەری مێـژوویی دیـاریکراو دەگەڕێتەوە. بەڵام من بڕوام وا نییە کە ئەم بەرگریکردنە بەرگریکردنێکی قایم بێت.

هەربۆ نموونە، بابۆ تاوێك باوکی بوونگەرایی نـوێ، واتـە کیرکـەگۆر بهێنینـەوە یـادی خۆمان. ئاقاری تاکگەرایی لای کیرکەگۆر زۆر ڕوون و ئاشکرایە.

ئەو دوو دڵ نییە لەوەی کـە لـە یـەکێك لـەدوا کتێبەکانیـدا بڵێـت کـە ((هاورێیـەتی)) کاتیگۆرییەکی نزمترە لە ((تاکی دانسقە)) کە دەشێ هـەموو مرۆڤێك وابێـت و دەشـبێ وابێت.(٦).کاتێك ئەم سەرنجەش دەخاتەڕوو کە ژیانی مەسـیحیانە شـی دەکاتـەوە، کـە لای کیرکۆگـەر بـاڵاترین شـێوەی بـوونی مرۆیـی و ڕەسـەنترینیانە. هـەر ئـەم نووسـەرە بەزەقی نوێنەرایەتیی ئاقاری خودگەرایی بوونگەراییانەش دەکـات. لەبەرئـەوەی زۆرجـار بەڵگـەکانی لـە ئـەزموونی شەخـسی و تایبـەتیی خۆیـەوە وەردەگیرێـت، بـە تایبـەتیش پەیوەندییەکانی لەگـەڵ بـاوك و دەزگیرانەکەیدا . ئێمـە ئەگـەر دان بەوەشـدا بنـێین کـە

فاكتەری شەخسی لە فەلسەفەدا ڕۆڵی خۆی هەر دەبینێت، بەڵام چاوەڕوانی ئەوەنین فەلسەفە بەپلەی یەكەم ببێتە جۆرێك لە ژیاننامە. گومان لەوەدا نییە كە پێویستە فەیلەسووف گۆشەنیگای بەرتەسكی شەخسیی خۆی تێپەڕێنێت.

دیسانەوە، گەرچی ((هـ. جەی. باتۆن)) تارادەیەك لەراكەیدا دڵرەق بووە، بەڵام زۆر لە ڕاستیش دوور نەكەوتۆتەوە كە دەڵێت: ((دەبێ وریابین كاتێ ڕێنوماییكەر لافی ئەوە لێنادات كە پەنای بۆ بیركردنەوەی بابەتی بردووە كە پشت بە بەڵگەی سەربەخۆی دەرەوەی بیرمەند دەبەستێت خۆ گەر كەسێكیش هەبێت كە بەتەوەری خودی خۆیدا سووڕابێتەوە، ئەوا ئەو كەسە كیركەگۆرە: چونكە زەحمەتە بەلایەوە جگە لەخۆی بیر لە كەسێكی تر بكاتەوە)) (٧).

ئەوەی دەربارەی كیركەگۆر دەوترێ، دەربارەی گەلێ كەسی تری دوای ئەو لەكەلتووری بوونگەرایدا دەگوترێ. هەر بۆ نموونە ، سارتەریش حاڵەتێكی لەم جۆرەیە. ڕاستە ((بووبەر)) و ((مارسیل)) لە ئاقاری تاكگەرایی بەرتەسكەوە بەرەو تیۆرییەكی پەیوەندی لە نێوان خودەكاندا چوون ، بەڵام دەشتوانین بپرسین كە ئاخۆ توانیویانە بەڕادەی پێویست لە ئاقاری تاكگەرایی دووربكەونەوە. پەیوەندی نێوان خودەكان و ، نێوان كەسەكان كەلێیان دواین، زیاتر بەرە و ئەوە دەچێت لەسەر ئاستی هۆگریی شەخسی و ژیانی خێزان بێت.

چونكە ئەمانە پەیوەندی نێوان كۆمەڵێك تاكەكەسن، بەڵام زۆربەی كێشە قورسەكانی جیهانی هاوچەرخ وابەستەن بە پەیوەندیی نێوان كۆمەڵە و ڕێكخراوە دەستە جەمعییەكان و دامەزراوە نەتەوەیی و نێودەوڵەتی و كۆمپانیا و ڕەگەز مرۆییەكان و سەندیكاكانی كرێكاران و ڕێكخراوی تری لەم بابەتانە. ئەوەندەی پەیوەندی بەم كێشانەشەوە هەبێت، بوونگەرایی و ئاكاری هەڵوێستی مێژوویی بە هانامان ناگات. دیسانەوە لێرەدا ڕووبەڕووی ڕەخنەی سیاسیی بوونگەرایی دەبینەوە. پێشتر ئاماژەم بەوەدا كە دەشێ ئەو ڕۆڵە سیاسیەی كە بوونگەرایی دەیبینێت ڕەخنەگرتن بێت لە

هەموو شێوەکانی ڕێبازی دەستەجەمعی کە لە ئینسانیەتی ئینسان کەم دەکەنەوە، بەڵام لەم بوارەشدا ئێمە پێویستمان بە ڕێنماییەکەرێکی پۆزەتیڤ دەبێت، گومانیش هەیە لەوەی بوونگەرایی بتوانێ لەم بوارەدا شتی زۆرمان بداتێ.

چونکە وێڕایی ئەوەی بوونگەرایی بە ڕاستی پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە هەربوونێکی مرۆیی بوونە ــ لەگەڵ ــ ئەوانیتردا، بەڵام زۆربەی فەیلەسووفانی بوونگەرا بوونی تاکەکەس دەکەن بەخاڵی سەرەتا ، هەر ئەوەندە ئەم یەکەم هەنگاوەش نرا ، ئیدی لایەنگیریی بوونی تاکەکەسی دانسقە دێتە گۆڕێ تا لە هەموو شیکردنەوەکانی دواتریشدا ئەمە بچەسپێنرێ.

—٤—

هەندێ جار مرۆڤ ڕووبەڕووی ڕەخنەی وا سەبارەت بە بوونگەرایی دەبێتەوە کە دەڵێت تێڕوانینی مرۆگەرایانەی زۆر بەرتەسکە. ناشبێ واسەیری ئەم ڕەخنەیە بکرێ کە فەیلەسووفانی بوونگەرا بەوە تاوانبار دەکرێن کە بایەخ بە خۆشگوزەرانیی مرۆڤ و بەختەوەریی ئەدەن ، چونکە هیچ ناڕەزاییەك لەم تێڕوانینە مرۆگەرایانەیە نییە بەمانا فراوانەکەی بەڵکو ڕەخنەکە لەوەدایە کە مرۆڤ کراوە بە پێوەری هەموو شتەکان ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی هەموو شتەکان ، لە چوارچێوەیەکدا سەیر بکرێن کە تەوەرەکەی مرۆڤە . بۆ نموونە لای بوونگەراکان شتێك نییە پێی بوترێ فەلسەفەی سروشت ، هەروەها هیچ بایەخێکیش نادرێ بەو زیندەوەرانەی کە زانستە سروشتیەکان لێیدەکۆڵنەوە.

گەرچی ئەم ڕەخنەیە زیاتر بەسەر ئەو بوونگەراییەدا دەچەسپێ کە سارتەر نوێنەرایەتیی دەکات ، کە بە ئاشکرا بە ئاقارێکی مرۆگەرا وەسف دەکرێ، بەڵام تاڕادەیەك بەسەر ئۆنتۆلۆجیا و میتافیزیکای بوونگەراییشدا دەچەسپێ. هەرلێرەوە ، گەرچی هایدیگەر لە لێکۆڵینەوەکەیدا ((کورتەیەك سەبارەت بە ئاقاری مرۆگەرایی) جیاوازییەکی بنجبڕانە لەنێوان هەڵوێستەکەی خۆی و هەڵوێستەکەی سارتەردا دەکات و

دەڵێت کە فەلسەفەکەی بایەخ بە بوونی گشتی ئەدات، نەك بوونی مرۆیی ، بەڵام ئەویش شتێکی ئەوتۆی دەربارەی سروشت و واقیعیغەیرە مرۆیی پێ نییەو ، بایەخێکی زۆر کەمی بە زانستە سروشتیەکان داوە.

مەترسیی فەلسەفەیەکیش کە خۆی لە مرۆڤدا قەتیس بکات بە تەنها لەوەدا نییە کە تێگەیشتنێکی ئەنترۆپۆلۆجیانەی وشکی بۆ واقیع دەخاتە ڕوو، بەڵکو لەوەدایە کە دواجار دەشێ بە شێوەیەکی زیانبەخش بەسەر مرۆڤ خۆیشیدا بشکێتەوە. لەبەرئەوەی کاتێ مرۆڤ وەکو سەنتەری بایەخدان دائەبڕین و ، کاتێ واسەیری گەردوون دەکەین کە شانۆی ژیانی مرۆڤە و گۆڕەپانی سەرکەوتنەکان و چەوساندنەوەکانێتی ، ئەمە دەبێتە مایەی کۆمەڵێك دۆخی ئەسەفبار کە ئێستا بوونەتە کێشەی سەرەکی — وەکو لەوتانی ژینگە و شوێنەوارە چاوەڕوان نەکراوەکانی تەکنۆلۆجیا و شتی تری لەم بابەتە، لە ڕاستیدا گرنگیی ژینگەناسی و کەشفکردنی سەرلەنوێی مەغزای ((هاوسەنگیی سروشت)) پێویستی بەسەر هەڵدانی فەلسەفەیەکە لەسەر بناغەیەکی فراوان دابمەزرێ. پێویستە فەلسەفەیەکی لەمجۆرەش ڕێز لە زیندەوەرەکانی تری غەیری مرۆڤ بگرێ و ، وەکو خۆیان و بۆخۆیان بایەخیان پێ بدات. بەڵام بوونگەرایی ئەمەی فەراهەم نەکردووە.

— ٥ —

دەڵێن بوونگەرایی فەلسەفەیەکی ڕەشبینە، بگرە دەشڵێن فەلسەفەیەکی نەخۆشانەیە و لایەنگرەکانی بەوە تاوانبار دەکرێن کە سەیری دیوە تاریکەکەی ژیان دەکەن، هەر چۆن پێیان دەوترێ کە بەتایبەت لە ئاست جیهانی هاوچەرخی مژدەدەر بەهیوا چاوی خۆیان دەنووقێنن و ، دژی تەکنۆلۆجیا و دیموکراسین و لەگەڵ ئامانجەکانی کۆمەڵگای نوێ و دەسکەوتەکانیدا هاوسۆز نین.

لەڕاستیدا لەم تاوانبارکردنانەدا هەندێ لایەنی ڕاست هەیە. وێڕای ئەوەی بەسەنتەربوونی مرۆڤ لە بوونگەراییدا زەمینەی بۆ چەوساندنەوەی تەکنۆلۆجی

خۆشکردووە ، هەر وەکو پێشتر کاتێ دەربارەی تێگەیشتنی بوونگەرایانە بۆ جیهان دوایین ئاماژەمان پێدا.

بەمجۆرە ئاقاری شەخسگەرایی (شەخسانیەت) لای فەیلەسووفی بوونگەرا لەگەڵ شەخسیەتی پەرەسەندوی تەکنۆلۆجیادا بەیەکداهاتن و ، ئەمەش لەهەندێ حاڵەتدا بووە هۆی سەرهەڵدانی جۆرێك لە سۆز بۆ تایپێکی سادەی ژیان کە شێوەی خۆدزینەوە و جۆرێك لە پەرستنی سەرەتای بەخۆوە دەگرێت.

لێرەشدا دیسانەو دەبینین لە کاتێکدا رامانی بوونگەرایانە بەناو هەموو شتە دەرەکیەکاندا تێدەپەڕێت تا دەگاتە سەرچاوە ڕەسەنەکانی بوونی مرۆیی ، بەجۆرێك کە تەواو لەگەڵ هەندێ لایەنی نموونەی بەرزی دیموکراسیدا دەگونجێت ، کە چی هەمان گوڕ بۆ ڕەسەنایەتیو تایبەتمەندی هانی نموونەی بەرزی ((بالأمرۆ)) ئەدات و سووکایەتی بەجەماوەر دەکات. بەلام من نازانم تاچەند دەتوانین ئەم ڕەخنانە بەهەڵسەنگاندێکی نەگەتیڤانەی بوونگەرایی لە قەڵەم بدەین. زۆربەی ئەم ڕەخنانە هی خەڵکانێکی گەشبینی رووکەش پەرستن، کە بوونگەراکانیش ڕەخنەیان لێ گرتوون کە ناتوانن پەی بەتراجیدیاکانی ژیان بەرن.

هەڵبەت گومان لە وەدانییە کە جیهانی هاوچەرخ و دامەزراوەکانی ئالۆزن. کەواتە بادان بەوەدا بنێین کە بوونگەراکان بەشێوەیەکی زێدەڕۆیانە لە هەڵسەنگاندنی ئەوەدا کە لە دونیای ئەمرۆدا ڕووئەدات ، نەگەتیڤ بوون ، بەلام لە هەمانکاتدا ئەبێ دان بەوەشدا بنێین کە توانیویانە ئاماژە بۆ کۆمەڵێك خراپە (شر) و مەترسیی ڕاستەقینە بکەین و ، گەر ئەو ڕەخنانەی ئەوان نەبووایە ئێمە لە زۆر ڕووەوە کەموکورتیمان دەبوو.

## ٢. دواسەرنجەكان

لە كۆتاییدا، چی دەربارەی ئەو فەلسەفەیە بڵێین كە كۆمەڵێك بیرمەندی گەورەی سەدەی بیستی شەیدا كرد و كاریگەرییەكی فراوانی هەبوو؟ بوونگەراییش ، وەكو هەر فەلسەفەیەكی دی خاڵی لاوازی و لایەنی نەگەتیڤ و زێدەڕۆیی خۆی هەیە. من هەوڵم داوە بەویژدانەوە ئەم فەلسەفەیە بخەمەڕوو ، بەبێ ئەوەی چاو لە خەوشەكانی بپۆشم ، بە پێچەوانەوە هەوڵم داوە چی ڕەخنە لەسەری هەیە بیخەمە بەرچاو. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا من پێم وایە كە لایەنە باشەكانی ئەم فەلسەفەیە لە لایەنە خراپەكانی زیاترە. بوونگەرایی گەلێ ڕوانینی تازەی قووڵی سەبارەت بەنهێنییە تایبەتیەكەی بوونمان پێ بەخشین و ، بەمەش لەپاراستنی ئینسانیەتماندا ئەمڕۆ لە ڕووبەڕوو بوونەوەیدا لەگەڵ هەموو ئەو شتانەدا كە ئەمڕۆ هەڕەشەی لێ دەكەن ، بەشداریی كرد . بوونگەرایی وەكو فەلسەفەیەك پێودانێكی وای پێ بەخشین كە دەتوانین لەڕێیەوە ڕووداوە سەرسووڕهێنەرەكانی جیهانی هاوچەرخمانی پێ لێكبدەینەوە و هەڵیسەنگێنین.

سەبارەت بە خۆیشم، ناتوانم بڵێم كە لایەنگری هیچكام لە شێوەكانی فەلسەفەی بوونگەراییم . بەڵكو هەروەكو لە لێدوانەكاندا دەركەوت ، من دەمەوێ لە زۆر ڕووەوە شێوازی بوونگەرایی لە فەلسەفاندندا ڕاست بكەمەوە یان گۆڕانكاری و فراوانكاریی تیا بكەم و لەم بارەشدا ئەوەی پەیدا دەبێت ناكاتە ((بوونگەرایی)) بەمانا باوەكەی . لەگەڵ ئەمەشدا هەر سوورم لەسەر ئەوەی كە ئێمە دەتوانین كۆمەڵێك ڕاستیی وەها لە بوونگەراییەوە فێرببین كە بۆ دۆخی مرۆییمان پێویستە ، كۆمەڵێك ڕاستیی وەها كە هیچ فەلسەفەیەكی مرۆڤدۆستانەی دروست ناتوانێ لە پاشەرۆژدا دەسبەرداریان بێت.

## پەراوێزەکان:

### (( بەشی یەکەم ))

١.جان پۆڵ سارتەر : (( بوونگەرایی فەلسەفەیەکی مرۆگەرایە)) لە کتێبی ((بوونگەراییی لە دستۆیڤیسکیەوە تا سارتەر))ەوە ، ڤاڵتەر کاوفمان ، ل ٢٨٩.

٢.٢–ئێچ . دیم : (( سەرەتایەك بۆ کیرکەگۆر)) وەرگێڕانی د. گرین . ١٩٦٦ ، ل ٨١.

٣.پۆڵ سپۆنهایم (( هەڵوێستی کیرکەگۆر)) لە مەسیح و پەیوەندیی مەسیحیانە)) ساڵی ١٩٦٨ ل ١٤.

٤.مارتن هایدیگەر : (( بوون و زەمان)) وەرگێڕانی جۆن ماکواری و ئە. س . رۆبنسۆن ، ١٩٦٢ ، نیۆیۆرك و لەندەن ل ٤٩.

٥.تۆماس لانجان : (( مانای فەلسەفەی هایدیگەر)) : لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەییە لە فینۆمینۆلۆجیای بوونگەرایی ساڵی ١٩٥٩ نیۆیۆرك ل ٤١ پەراوێزی ژمارە ٤٦.

٦.میگیل دی ئۆنامۆنۆ : (( مانای تراجیکی ژیان)) وەرگێڕانی ج. ئە. س. فلیچ (١٩٥٤ نیۆیۆرك) ل٢٨.

٧.سارتەر (( بوونگەرایی فەلسەفەیەکی مرۆگەرایە)) ه. س. پ ل ٢٩٠.

٨.جۆن ماکواری : (( خود وەکو بکەرێك)) نیۆیۆرك و لەندەن ١٩٥٧ ، ل ٨٤ و دواتر.

٩.رۆجەر ل . شن : (( سەرچڵیەکی دڕدۆنگ : چەند وتارێك سەبارەت بەشێوەکانی بوونگەرایی هاوچەرخ)) ل ١٣ نیۆیۆرك ساڵی ١٩٦٨.

١٠.سۆرین کیرکەگۆر : (( پاشبەندێکی کۆتاییهێنی نازانستی)) و : د. ف . سونیسن ( پرینستۆن ساڵی ١٩٤١) ل ٩٦ — ٩٧.

١١.کارل یاسپەرز: (( نیچە و مەسیحیەت)) و : ئە. ب. ئەشتۆن ( شیکاگۆ ساڵی ١٩٦١) ل٦.

١٢.بەراوردی بکە بە ریچارد کرۆنەر : (( ئایینە تایبەتیەکەی هایدیگەر)) وتارێکە لەژمارە ١١ی گۆڤاری Union Seminary Quarterly Review (ل ٢٣ — ٣٧) .

١٣.بەراوردی بکە بە وتارەکەی هانز جۆناس : (( هایدیگەر و خواناسی)) لە ژمارە ١٨ی گۆڤاری میتافیزیکا ساڵی ١٩٦٤ ( ل ٢٠٧ — ٢٣٣).

١٤.ئەم برگەیە و ئەوی پێشووشمان لەکتێبەکەی هایدیگەرەوە کورت کردۆتەوە (( بوون و زەمان)) ل ٤٩ — ٦٣.

١٥.بەراوردی بکە : جان پۆڵ سارتەر (( بوون و نەبوون وتارێك سەبارەت (( ئۆنتۆلۆجیای فینۆمینۆلۆجی)) و : هازل بارنز ، نیۆیۆرك ساڵی ١٩٥٦.

١٦.نیکۆلای بێردیاییڤ : (( سەرەتا و کۆتایی)) و : م . فرێنچ نیۆیۆرك ١٩٥٧ ، ل ٦٢.

١٧.ه. س. پ.

١٨.رۆجەر ل . شن : (( مرۆڤ : رێبازی نوێی مرۆگەرایی)) ڤیلادلیڤا ١٩٦٨ ل ١٧٠ و دواتر.

١٩.هایدیگەر : (( دەربارەی رێبازی مرۆگەرایی)) فرانکفۆرت ساڵی ١٩٤٩ ل ١٠.

٢٠.هایدیگەر : (( میتافیزیکا چیه‌یە؟)) چ ٧ ، فرانکفۆرت ساڵی ١٩٤٩ ، ل ١٥ —١٦.

٢١.جان پۆڵ سارتەر (( بوون و نەبوون)).

٢٢.بێردیاییڤ (( سەرەتا و کۆتایی )) ل ٤٧ — ٤٨ .

٢٣.خۆزێ ئۆرتیگائی گاسێت : (( مرۆڤ لە قەیراندا)) و : ئێم . ئادامز (نیۆیۆرك ساڵی ١٩٥٩) ل١١٢.

٢٤.کارل یاسپەرز : (( نیچە و مەسیحیەت )) ل ٩١.

## ((بەشی دووەم ))

١.کار یاسپەرز (( سەرەتاو ئەنجامی مێژوو)) و : میشیل بۆلۆك ، ١٩٥٣ ، ل٢.

٢.هنـــری فرانكفـــۆرت : (( سیـــستمی پادشـــایی و خواوەنـــدەكان: لێكۆڵینەوەیـــەك لـــەئایینی كـــۆنی خۆرهـــەڵاتی دوور بەوپێیـــەی نموونـــەی تەواوكـــەری نێـــوان كۆمـــەڵگا و سروشتە)).

٣.بـەروارودی بكـە بـە مێرچیا ئیلیـاد (( گـەردوون و مێـژوو : ئەفسانەی گەڕانـەوەی هەتاهەتایی)) نیۆیۆرك ١٩٥٩.

٤.مارتن بووبەر : (( ئیمانی پێغەمبەرانە)) و : س . ویتۆن دایڤز، چ٢ نیۆیۆرك ١٩٦٠، ل٩٦ و دواتر .

٥.رۆدۆڵف بۆڵتمان : (( مەسیحیەتی یەكەم و دۆخی هاوچەرخی )) و : ڕ . هـ . فولەر .

٦.ئەی . ئار . دۆدز : (( یۆنان و نامەعقول)) ل ١٧ و ل ٢٥٤ (ساڵی ١٩٥١).

٧.بەراوردی بكە بە جۆرج . ج . سیدل : (( مارتن هایدیگەر و فەیلەسووفانی پێش سوكرات )) (١٩٦٤).

٨.سۆرین كیركەگۆر : (( كۆپلە فەلسەفیەكان)) و : دەیڤید ف . سـونیس (١٩٣٦) ل ٦.

٩.د. ت . سوزوكی : (( سەرەتایەك بۆ بوودیزمی چینی )) نیۆیۆرك ١٩٦٤.

١٠.یوشو نـوری تاكوشـی : (( بـوودیزم و بوونگـەرایی: گفتوگۆیـەك لـە نێـوان هـزری خۆرهەڵاتی و هزری خۆرئاواییدا)) لە كتێبی (( ئایین و ژیـان))دا (١٩٥٩ نیۆیـۆرك) ل ٩٢١ — ٣١٨.

١١.بەراوردی بكە : رۆدۆڵف بۆڵتمان (( تیۆلۆجیـای چـاخی نـوێ ـــ ئینجیـل ـــ)) و : كیندرێك گرۆبڵ ، ساڵی ١٩٥١ بەرگی یەكەم ل ٣ — ٢٢.

١٢.هـ. س ل ١٨٧ و دواتر .

١٣.هـ. س ل ١٦٤.

١٤.هانزجۆناس : (( ئایینی گنۆسی)) چ٢ ١٩٦٣. ل ٣٢٤.

١٥.ئـەدۆلف هـارتۆك : (( مێـژووی دۆگمـا)) ب . بـرۆس و : ب . بـروس ( ١٨٩٧ لەندەن) بەرگی یەكەم ل ١٧.

١٦.هـ . س .

١٧.ئەم كۆپلانە لەمەوە وەرگیراون : (( سێنتێسزی ئۆگستین)) بلاوكـەرەوە : ئـی . پرزیوارا ( نیۆیۆرك ١٩٥٨) ل ٤٢١.

١٨.هـ .س ل ٣٣.

١٩.هـ . س ل ٣٣.

٢٠.هـ . س ل ٧٥.

٢١.هـ . س ل ٧٥.

٢٢.مایستەر ئیكهارت ، وەرگێرانێكی نوێیە كە ب. ریمۆن بلۆكنی كردوویەتی ( ١٩٤١ — نیۆیۆرك) ل ٢٤٣.

٢٣.هـ . س ل ٢٤٦.

٢٤.جیۆڤانی بیكۆدێلا میراندۆلا : (( گوتارێك سەبارەت بە كەرامەتی مرۆڤ)) و : ئـەی . رۆبرت كابونگری ( شیكاگۆ ١٩٥٦) ل ٤—٥.

٢٥.رۆنالـد گریگـۆر سمیـپ : (( یۆهـان گیـۆرگ هامـان : لێكۆڵینەوەیـەك سـەبارەت بەبوونی مەسیحیانە و هەڵبژاردەیەك لەنووسینەكانی )) (لەندەن ١٩٦٠) ل ٢٢.

٢٦.هـ .س ل ٢٥٣.

٢٧.هـ .س ل ٤٠.

٢٨.هـ .س ل ٤٢.

٢٩.سۆرین كیركـەگۆر : بیرەوەرییـەكان — وەرگێـڕان و بلاوكردنـەوەی ئەلێكساندەر درۆ (نیۆیۆرك ١٩٥٩) ل ٤٠.

٣٠.سۆرین کیرکەگۆر : (( یان ئەم – یان ئەو )) و : والتەر لوری ( پرینستۆن ١٩٤٤) ، ل ١٤١.

٣١.سۆرین کیرکەگۆر : (( چەمکی دردۆنگی)) و : والتەر لوری ( پرینستۆن ١٩٤٤) ل ٥٥.

٣٢.سۆرین کیرکەگۆر : (( دواساڵەکان : بیرەوەرەییەکان ١٨٥٣ – ١٨٥٥ ، بلاوکەرەوە : گریگۆری سمیپ (نیۆیۆرک ١٩١٠) ل ١٢٥.

٣٣.فریدریش نیچە : (( ئەودیو چاکە و خراپە )) و : فرانسیس گۆلفینیگ (نیۆیۆرک ١٩١٠) ل ١٢٥.

٢٤.فریدریش نیچە : (( زانستی شاد)) و : تۆماس کۆتی ( چ لەندەن و نیۆیۆرک ١٩١٠) ، ل ١٢٥.

٢٥.م . م بۆتسمان : (( پێشەکیی وەرگێڕانەکەی ئەی . کایلێ بۆ کتێبەکەی نیچە : (( زەردەشت وای گوت)) ( لەندەن ١٩٣٣).

٢٦.مارتن هایدیگەر : (( میتا فیزیکا چییە؟)) فرانکفۆرت ١٩٤٩ ، ل ٤٥.

٢٧.ئێف – تێمیلێ کینگستۆن (( بوونگەرایی فەرەنسی : ڕەخنەیەکی مەسیحیانە)) تۆرنتۆ ساڵی ١٩٦١ ، ل ٢٦– ٢٧.

٢٨.جان پۆل سارتەر : (( بوون و نەبوون : وتارێك دەربارەی ئۆنتۆلۆجیای فینۆمینۆلۆجی)) و : هازل بارنز ، نیۆیۆرک ١٩٥٦ ، ل ٦٧٧.

٢٩.جەیمس سۆمەرڤیل (( پابەندبوونێکی گشتگیر : کردار لای بلۆندل )) ل ٢٦ . ١٩٦٨.

## (( بەشی سێیەم ))

١.میلتۆن ك . مونتیز : (( نهێنی بوون)) ١٩٦٥ نیۆیۆرك ، ل ٧٢ و دواتری.

٢.مارتن هایدیگەر : (( دەربارەی ڕێبازی مرۆگەرا)) فرانكفۆرت ، ساڵی ١٩٤٩ ، ل ١٧.

٣.سۆررین كیركەگۆر : (( پاشبەندێكی كۆتاییهێنی نازانستی )) و : د. ف . سونیسن (١٩٤١) ل ٢٦٧.

٤.هایدیگەر (( بوون و زەمان)) و : جۆن ماكورای ئەی . س . رۆبنسۆن.

٥.هایدیگەر (( دەربارەی ڕێبازی مرۆگەرا)) ل١٥.

٦.جان پۆل سارتەر (( بوونگەرایی فەلسەفەیەكی مرۆگەرایە)) لەكتێبەكەی كاوفماندا ، ل ٢٩٠.

٧.جان پۆل سارتەر : (( بوون و نەبوون)) و : هـ. بارنز ل ٢٣٠.

٨.كارل یاسپەرز (( ئیمانی فەلسەفی و سرووش)) و : ئەی . ب . ئەشتۆن . نیۆیۆرك ١٩٦٧ ، ل ٦٣– ٦٦.

٩.تیۆدۆسیۆش دۆبجانسكی (( بایۆلۆجیای بایەخی ڕەها)) نیۆیۆرك ساڵی ١٩٦٧ ل ٥٢.

١٠.جان پۆڵ سارتەر : (( بوونگەرایی ڕێبازێكی مرۆگەرایە)). هـ . س ل ٢٩٢.

## ((بەشی چوارەم))

١.جان پۆڵ سارتەر (( بوون و نەبوون)) ل ١٠٤.

٢.هایدیگەر (( بوون و زەمان)) ل ٩١ — ١٤٨.

٣.سارتەر (( بوون و نەبوون)) ل ٢٠٠.

٤.هایدیگەر (( بوون و زەمان)) ل ١٠٢ و دواتر .

٥.ئـەی . ئـێس . ئێـدینگتۆن (( سرشـوتی جیهـانی فیزیکـی)) نیۆیـۆرك ١٩٢٨. لەپێشەکیەکەوە .

٦.مۆریس میرلۆپـۆنتی : (( ئامـاژە گـەلێك)) و : ریـچارد ئـێس مـاکلیری ( ١٩٦٤) ل ١٦٦.

٧.سارتەر (( بوون و نەبوون) ل ٣٠٥.

٨.بڕوانـە چـەمکی سـانت پـۆلس بۆجەسـتە لـەم کتێبـەی ئێمـەدا: جـۆن مـاکورای ((تیۆلۆجیایەکی بوونگەرایانە : بەراورد لەنێوان هایدیگـەر و بۆڵتمانـدا )) چ٢، نیۆیـۆرك و لەندەن ، ١٩٦٠ ل ٤٠ — ٤٦.

٩.هایدیگەر (( بوون و زەمان)) ل ١٤٦.

١٠.هـ . س

١١.هێنـری بێرگسـۆن : (( زەمـان و ئـیرادەی ئـازاد)) و : ئێـف . ئـای . پۆگسـۆن ( نیۆیۆرك ١٩١٠).

١٢.نیکـۆلای بێردیـاییف : (( مانـای کـرداری داهێنەرانـە)) و : د. لـوری ( نیۆیـۆرك ١٩٥٥) ل ١٥.

١٣.هایدیگەر (( بوون و زەمان)) ل ٧٥.

١٤.جۆن ماکمۆری : (( خود بەو پێیەی بکەرە ( ١٩٥٧ نیۆیۆرك و لەنـدەن ) ل ٣٣ و دواتر.

١٥.جۆن هابگود : (( حەقیقەتەكان لەگرژیدا) ( نیۆیۆرك ) ١٩٦٥ ل ٦٢.

## ((بەشی پێنجەم))

١.مارتن بووبەر : (( من وتۆ)) و : ئار . جی . سمیپ چ٢ ( ئەدنبەرە و نیۆیۆرك ساڵی ١٩٥٨) ل ٤.

٢.نیكۆلای بێردیاییڤ : (( مانای كرداری داهێنەرانە)) ١٨٠ — ١٨٤.

٣.مارتن هایدیگەر (( سەرتایەك بۆ میتافیزیكا)) و : د. مانهایم (نیوهاڤن ١٩٥٩) ل ١٥٦.

٤.سەبارەت بەم خاڵانە بڕوانە كتێبی (( من و تۆ)) ی بووبەر ل ٣— ٤.

٥.هـ . س ل ٦.

٦.هـ . س

٧.هارڤی كۆكس : (( شاری دونیایی)) نیۆیۆرك ١٩٦٥ ل ٤٤— ٤٥.

٨.هایدیگەر (( بوون و زەمان)) ل ١٥٨ — ١٥٩.

٩.گابرییا مارسیل : (( من و پەیوەندیی بەویترەوە)) لە (( مرۆڤی گەڕۆك : سەرەتایەك بۆ میتافیزیكای هیوا)) و : ئی . كراوفۆرد ( نیۆیۆرك و لەندەن ١٩٥١) ل ٥١.

١٠.بەتایبەتی بڕوانە (( بوون و نەبوونی))ی سارتەر ل ٣٣٩ —٣٤٠.

١١.هـ . س ٣٤٥.

١٢.هـ . س ٣٥٢.

١٣.ئارتۆر گیبسۆن (( ئیمانی خوانەناسێك )) نیۆیۆرك، ١٩٦٨ ل ٧١.

١٤.سۆرین كیركەگۆر : (( ڕوانگەیەك بۆ كارەكانم وەك نووسەرێك)) و : واڵتەر لۆری (نیۆیۆرك ١٩٣٩) ل ١٩٣.

١٥.سۆرین كیركەگۆر (( نەخۆشی تامەرگ)) كە لەگەڵ كتێبی (( ترس و لەرز))دا بڵاوبۆتەوە . و : واڵتەر لۆری ( گاردن سیتی ، نیۆیۆرك ١٩٥٤) ل ١٩٣.

١٦.هـ . س ل ١٦٥.

١٧.فریدریش نیچە (( ئیرادەی هێز)) و : ئەی . ئێم . لۆدڤیچی ( ئەدنبەرە ، لەندەن، نیۆیۆرك ١٩٠٩) بەرگی یەکەم ل ٢٢٨.

١٨.هایدیگەر : (( بوون و زەمان)) ل ١٦٣ و دواتر.

١٩.هـ . س . پ

٢٠.فریدریش نیچە : (( ئیرادەی هێز )) بەرگی دووەم ٢٣٦.

٢١.بڕوانە هیگلڵ : (( دیاردەناسیی رۆح )) و : جەی . بی . بایلی ( نیۆیۆرك و لەندەن ١٩٣٦) ل ٢٣٤ — ٢٤٠.

## (( بەشی شەشەم))

١.مارتن هایدیگەر : (( بوون و زەمان )) ل ٨٨.

٢.جۆن ماکموری : (( خود بەو پێیەی بکەرە)) نیۆیۆرك ل ٨٧.

٣.بڕوانە لێدوان لەسەر ئەم مەسەلانە لە سەرچاوەی پێشوودا ل ١٠٠– ١٠٣.

٤.نیکۆلای بێردیاییف : (( مانای کرداری داهێنەرانە)) و : د.لوری (نیۆیۆرك ١٩٥٥) ل ١٢٣.

٥.بڕوانە پێرستی شیکارییانەی کتێبی (( بوون و زەمان)) گەر ویستت لیستێکت بەبەکارهێنان و سەرچاوەکان دەست بکەوێت.

٦.هایدیگەر : (( کانت و کێشەی میتافیزیکا)) و : جەی . ئێس چەرچڵ بلومینگتۆن ، ١٩٦٢، ل ٩٤.

٧.کارل یاسپەرز : (( بواری هەمیشەیی فەلسەفە)) و : ئاڕ . مانهایم (١٩٥٠) ل ١٤ – ٢٠.

٨.نیکۆلای بێردیاییف : (( سەرەتاو کۆتایی)) ل ٦٠ –٦١.

٩.مارشاڵ ماکلۆهان : (( میدیای تێگەیشتن : کشانەکانی مرۆڤ)) (نیۆیۆرك ١٩٦٤).

١٠.سۆرین كیركەگۆر : (( پاشبەندێكی كۆتاییهێنی نازانستی)) ل ٣١٩.

١١.مارتن هایدیگەر : (( بـوونی مرۆیـی و بـوونی گـشتی )) ڤێرنـەر بـرۆك ، و : ئـار . ئێف . هۆلّ و ئالان كریك (١٩٤٩) ل ٢٩٢.

## (( بەشی حەوتەم))

١.سۆرین كیركەگۆر : (( پاشبەندێكی كۆتاییهێنی نازانستی)) ل ١٣٧ –١٣٨.

٢.سۆرین كیركەگۆر : (( هەندێ كۆپلەی فەلسەفی)) ل ٤٧.

٣.رۆنالّد گریمس: (( هزری بوونگەرایانە)) ل ١٦٩.

٤.مارتن هایدیگەر (( بەچی دەوترێ بیركردنەوە ؟ )) ئێف . دی . ڤیك و جەی گـرای ، نیۆیۆرك ١٩٦٨ ل ل٣.

٥.هایدیگەر : (( میتافیزیكا چییە؟ )) فرانكفۆرت ١٩٤٩ ل ٣٧.

٦.كارل یاسپەرز (( ئیمانی فەلەسەفی و سرووش)) ل ١٢٥.

٧.مارتن بووبەر : (( من و تۆ)) ل ٤.

٨.بڕوانە هایدیگەر (( بوون زەمان)) ل ٢٠٣ — ٢١٠.

٩.سارتەر (( بوون و نەبوون)) ل ٣٧٢.

١٠.هـ . س ، ل ٣٧٣.

١١.كیركەگۆر : (( دواساڵەكان : بیرەوەرییەكان)) ، ١٨٥٣ — ١٨٥٥ ، ل ٢٦٢.

١٢.هایدیگەر : (( بوون و زەمان)) ل ٢١٢.

١٣.دەیڤید جەنگنز : (( سەروەریی مرۆڤ)) ا ١٤ — ١٥ نیۆیۆرك ١٩٦٧.

١٤.هایدیگەر : (( سەرەتایەك بۆ میتافیزیكا)) و : ئاڕ مانهایم ، ل ١٥٦.

١٥.هایدیگەر : (( دەربارەی ڕێبازی مرۆگەرا)) ل ١٠، ٢١، ٤٣.

١٦.هایدیگەر : (( سەرەتایەك بۆ میتافیزكا)) ل ٥٧.

١٧.كارل یاسپەرز : (( ئیمان و سرووش )) ل ٩٥.

١٨.هـ . س ل ١٤٠.

١٩.هـ . س ل ٢٦٥.

٢٠.هـ . س

## ((بەشی هەشتەم))

١.ریچارد ولهایم : (( ئێف . ئێچ . برادلی)) لەندەن ساڵی ١٩٥٩ ل ٢٢٦.

٢.پۆڵ ریکۆر : (( مرۆڤی خەتادار)) و : س. کێلبلی ، شیکاگۆ ١٩٦٥ ل ١١٨.

٣.هـ . س ١٥٦.

٤.بڕوانە فەرهەنگی ڕاندۆم بۆ زمانی ئینگلیزی (( لێدوان لەسەر هاو واتا و نیمچە هـاو واتاکان)) .

٥.مارتن هایدیگەر : (( بوون و زەمان )) ل ٢٢٧ پەراوێزی ١.

٦.هـ . س ٤٩٢.

٧.سارتەر (( بوون و نەبوون)) ل ٢٩.

٨.سارتەر : (( هەڵچوونەکان : کۆی تیۆرییەك)) و : بیرنارد فریچمان، نیۆیۆرك ١٩٤٨ ل ١٦ .

٩.هـ . س

١٠.کیرکەگۆر (( چەمکی دڕدۆنگی)) وەرگێڕانی لوری ( پرینستۆن ١٩٤٤) ل ٣٨.

١١.جـۆرج پــرایس : (( دەرووی تــەنگ : لێکۆڵینەوەیــەك بـۆ چــەمکی مــرۆڤ لای کیرکەگۆر )) (نیۆیۆرك ١٩٦٣) ل ٤٦.

١٢.مارتن هایدیگەر (( بوون و زەمان)) ل ٢٢٦.

١٣.هـ. س ل ٢٣٠.

١٤.هـ . س ل ٢٣١.

١٥.هـ . س ل ٢٣٢.

١٦.سارتەر : (( بوون و نەبوون )) ل ٢٩ .

١٧.هـ . س

١٨.هـ . س

١٩.هـ . س

٢٠.هایدیگەر (( سەرەتایەك بۆ میتا فیزیكا)) ل١ .

٢١.هایدیگەر (( بوون و زەمان)) ل ٢٣٤.

٢٢.پۆڵ ڕیكۆر (( مرۆڤی خەتادار)) ل ١٦١.

٢٣.هـ . س

## (( بەشی نۆیەم))

١.كیركەگۆر (( بیرەوەرییەكان)) وەرگێڕانی ئەلێكساندەر درو ، ل ٤٤.

٢.هـ . س ل ٤٦.

٣.گابریل مارسیل : (( مرۆڤ دژ بەكۆمەڵگای حەشامات)) و : جەی . ئێس . فریـزەر شیكاگۆ ١٩٥٢ ل١.

٤.دۆنالد ئەی . لاری (( بوونگەرایی مەسیحیانە)) ل ١٣٦ ، ٤٧ ( نیۆیۆرك ١٩٥٦).

## ((بەشی دەیەم))

١.ئۆستن فارەر : (( ئازادیی ئیرادە )) ١٦٣.

٢.هـ . س ل ٢٠٩.

٣.پۆڵ ڕیكۆر : مرۆڤی خەتادار.

٤.خۆزی ئۆرتیگائی گاسێت (( بابەتی مۆدێرن)) و : جەیمس گلوچ (نیۆیـۆرك ١٩٣٣) ل ٩٥.

٥.تیۆدۆسیس دۆبجانسكی : (( بایۆلۆجیای بایەخی ڕەها)) نیۆیۆرك ١٩٦٧، ل ٧٢.

٦.مارتن هایدیگەر : (( بوون و زەمان)) ل ٢٧٩ — ٣١١.

٧.هـ . س ل ٣٠٧.

٨.ئەلبێر کامۆ : (( مرۆڤی یاخی )) و : ئەنتۆنی بۆوەر ( نیۆیۆرك ١٩٥٦) ل ١٠٠.

٩.ئارتۆر گیبسن : (( ئیمانی خوانەناسێك )) نیۆیۆرك ١٩٦٨ ل ٩٦ –٩٧.

١٠بڕوانە ڕیکۆر : (( مرۆڤی خەتادار)) وەرگێڕی ئەم کتێبە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ڕێکۆر بۆئەوەی گوزارشت لەوە بکات کە لە زەینیدایە وشەی وەکو (( شکان)) و ((درز)) و ((کەلێن)) کردووە.

١١.بڕوانە هایدیگەر (( بوون و زەمان)) ل ٣٢٥ — ٣٣٥.

## (( بەشی یانزەیەم))

١.جان پۆڵ سارتەر (( بوونگەرایی فەلسەفەیەکی مرۆگەرایە)) ل ٢٩٨.

٢.هـ. س ل ٢٩٢.

٣.هـ . س . ل ٢٩٣.

٤.ئەلبێرکامۆ (( مرۆڤی یاخی)) ل ١٠.

٥.هـ . س ل ٢٥٠.

٦.سۆرین کیرکەگۆر (( ترس و لەرز)) و : واڵتەر لوری ل ٧٥.

٧.هـ . س

٨.جۆرج پرایس (( دەرووی تەنگ )) : لێکۆڵینەوەیەك بۆ چەمکی مرۆڤ لای کیرکەگۆر ، نیۆیۆرك ١٩٦٣ ل ١٩٢.

٩.فریدریش نیچە (( زەردەشت وای گوت)) و : ئەی . تایڵ ، ل ١٧٦، لەندەن ١٩٣٣.

١٠.هـ . س ل ٢٥٣ — ٢٥٤.

١١.مارتن هایدیگەر (( بوون و زەمان)) ل ٣٢٣.

١٢.هـ . س ل ٣١٩.

١٣. ١٣. هـ . س ل ٣٢٢.

١٤.کارل یاسپەرز (( ئیمانی فەلسەفی و سرووش)) ل ٣١٠.

١٥.سۆرین کیرکەگۆر (( دواساڵەکان)) بیروەرییەکانی ١٨٥٣ — ١٨٥٥، نیۆیۆرك ١٩٦٥ — ل ٢٢٦.

١٦.هایدیگەر (( بوون و زەمان)) ل ٢٢٧ و ل ٢٣٨ —٢٣٩.

١٧.مارتن . جەی . هێنکسن (( چرکەساتی ئامادەبوون لەحزووری خوادا)) ڤیلادلیڤا ، ١٩٥٦ — ل ٣٦١.

١٨.کیرکەگۆر (( ژیان لەناو مەسیحییەتدا)) و . لوری ل ١١٧ ساڵی ١٩٤٤.

١٩.سۆرین کیرکەگۆر (( دوا ساڵەکان)) ل ١٥٦، هەروەها بڕوانە لێدوانەکانی هایدیگەر لەسەر تێڕوانینی کیرکەگۆر بۆ زەمان و ئەبەدیەت لە کتێبی (( بوون و زەمان))دا، ل ٤٩٧.

## ((بەشی دوانزدەیەم))

١.ئێچ . ئەی . هۆجز . هەندێ بڕگەی هەڵبژاردە لە دیلتای ، لە کتێبی (( سەرەتایەك بۆ ڤیلهلم دیلتای)) ( نیۆیۆرك ١٩٦٨) ل ١٤٢.

٢.مارتن هایدیگەر (( بوون و زەمان)) ل ٤٤٩ — ٥٥.

٣.سۆرین کیرکەگۆر ((دواساڵەکان)) ل ١٥١.

٤.سۆرین کیرکەگۆر ((کۆپلە فەلسەفیەکان)) ل ٤٢.

٥.سۆرین کیرکەگۆر (( دواساڵەکان)) ل ١٤٣.

٦.سۆرین کیرکەگۆر (( دووپاتبوونەوە)) و : و. لوری ل٤.

٧.فریدریش نیچە (( سوود و زیانی مێژوو)) چەند بیروبۆچوونێکی ناوەخت ، و : ئەی . ئێم . لۆدۆڤیچی و ئەی . کولنز ، ئەدنبەرە ، لەندەن ، نیۆیۆرك ١٩٠٩ لەدوو بەرگدا ل ١ —١٠٠.

٨.هـ. س ل ١٩.

٩.هـ . س ل ٣٧ .

١٠.هـ . س ل ٢٧ .

١١.هـ . س ل ٥٥.

١٢.فریدریش نیچە : (( زەردەشت وای گوت)) ل ١٩٤.

١٣.هـ . س

١٤.هایدیگەر (( بوون و زەمان)) ل ٤٣٣.

١٥.هـ. س ل ٤٤٠.

١٦.هـ . س ل ٤٤٣.

١٧.هـ. س ل ٤٣٦.

١٨.هـ . س ل ٤٤٨ — ٤٤٩.

١٩.مارتن هایدیگەر : (( سەرەتایەك بۆ میتافیزیكا)) و : د. دانهایم ( ١٩٥٩) ل ١٥٥.

٢٠.دەبلیو . جەی . ڕیچاردسۆن (( هایدیگەر : لەفینۆمینۆلۆجیاوە بۆ هزر)) ل ٢٠- ٢١ .

٢١.مارتن هایدیگەر (( گوتەكانی ئەنێكسماندەر))، هۆلزڤیچ — فرانكفۆرت — ١٩٥٧ ، ل ٣١١.

٢٢.كارل یاسپەرز (( ئیمانی فەلسەفی و سرووش)) و : ئەی . بی شتۆن ( نیۆیۆرك ١٩٦٧) ل ١٨٦.

٢٣.یۆهانز میتز (( تیۆلۆجیای جیهانی)) و : ویلیەم گلین دۆپلّ ( نیۆیۆرك ١٩٦٩) ل ١٠٧ و دواتر.

٢٤.نیكۆلای بیردیاییڤ (( مانای كرداری داهێنەرانە) و : د. لوری ( نیۆیۆرك ١٩٥٥)) ل ٢٨٧.

٢٥.ئەلبێر كامۆ : (( مرۆڤی یاخی )) و : ئەنتۆنی بۆوەر ( نییۆرك ١٩٥٦) ل ٢٤١.

## ((بەشی سیانزدەیەم))

١.نیکۆلای بێردیاییڤ : (( سەرەتاو کۆتایی)) و : م . فرێنچ ( نیۆیۆرك ١٩٥٧) ل ٩.

٢.هـ . س ٣٩.

٣.کارل یاسپەرز (( ئیمانی فەلسەفی و سرووش)) و : شتون ، ل ٧٥.

بڕوانە پۆڵ ئەی . شیلّپ (( فەلسەفەی کارل یاسپەرز)) ( نیۆیۆرك ١٩٥٧) ل ٧٧.

٤.ئارِ . گریمسلی (( هزری بوونگەرایانە)) (١٩٥٥) ل ٢١٢.

٥.کارل یاسپەرز (( بواری هەمیشەیی فەلسەفە)) و : ئارِ . مانهایم ( نیوهاڤن – لەندەن ١٩٥٠) ل ٦٤.

٦.هـ . س ل ٦٥.

٧.کارل یاسپەرز (( ئیمانی فەلسەفی و سرووش)) ل ٢٥٥.

٨.هـ . س

٩.بڕوانە یاسپەرز (( بواری هەمیشەیی فەلسەفە)) ل ٣٤ و دواتر.

١٠.یاسپەرز (( ڕێگا بەرەو حیکمەت)) و : ئایدن و سیدەر پۆڵ ( نیۆیۆرك و لەندەن ١٩٥١) ل ١٥٩.

١١.میگیل دی ئۆنامۆنۆ (( دۆن کیخۆتە : ڕاڤە و قسە لەسەرکردن)) و : ئەی . کیریگان (پرینستۆن ١٩٦٨) ل ١١٤.

١٢.ئی . تی . لۆنگ (( یاسپەرز و بۆڵتمان)) ١٩٦٨ ل ١٢١.

١٣.ئێف . ئێچ . برادلی (( ڕواڵەت و حەقیقەت)) ئۆکسفۆرد ١٩٣٠، ل ٥.

١٤.میگیل دی ئۆنامۆنۆ (( مانای تراجیکی ژیان)) ل ٣٩.

١٥.هـ . س ل ٢٦٣.

١٦.دەبلیو . پانینبێرگ (( مرۆڤ چیە ؟)) ١٩٦٢، هەروەها بڕوانە کتێبی (( مەسیح – خودا و مرۆڤ) ، وەرگێڕانی : دوان پریب و لویس و یلکنز ( ڤیلادلڤیا ١٩٦٨) ل ٨٣ – ٨٨.

## (( بەشی چواردەیەم ))

١.كارل یاسپەرز (( سایكۆ پاپۆلۆجیا گشتی )) و : جەی . هۆینگ و هامیلتۆن (شیكاگۆ ١٩٦٣) ل ٣٥٠.

٢.سارتەر (( بوون و نەبوون)) و : هازل بارنز (نیۆیۆرك ١٩٥٦) ل ٥٥٧ و دواتر.

٣.میداربوس (( شیكاریی مرۆڤ و دەروونپزیشكی)) لەكتێبی (( دەروونشیكاری و فەلسەفەی بوونگەرایی)). بلاوكەرەوە : ئێچ رۆیتنبیك ( نیۆیۆرك ١٩٦٥) ل ٨١ –٨٢.

٤.ل. بنز ڤانگەر (( بوون — لە — جیهاندا)) و : جەی . نیدلمان (( نیۆیۆرك ١٩٦٣)) ل ١٨٢ –١٨٣.

٥.هـ . س ل ١٨٩.

٦.ئارِ . دی . لەینگ (( خودی دابەشكراو)) لەندەن و نیۆیۆرك ١٩٦٠ ل ١٩.

٧.هـ . س ل ٢٣.

٨.بۆس (( شیكاریی مرۆڤ و دەروونپزیشكی)) ل ٨٢.

٩.رۆڵـۆ مـای (( مەترسی لەپەیوەندیی بوونگەراییدا بەدەروونپزیشكییەوە)) لە كتێبی ((دەروونشیكاری و فەلسەفەی بوونگەرایی). ل ١٨٠.

١٠.ئاماژەدان بەنوسینەكانی دكتۆر هۆبنەر كەبلاو نەكراونەتەوە ، بەرەزامەندیی نووسەر بوون.

١١.لیۆنیل تریلینگ (( خودی بەرهەڵستكار)) نیۆیۆرك ١٩٥٨) ل ٣٨ — ٣٩.

١٢.ویلیەم بارێت (( بوونگەرایی بەو پێیەی نیشانەیەكی قەیرانی مرۆڤی هاوچەرخە)) لە كتێبی ((كێشە رۆحیەكان لەئەدەبی هاوچەرخدا )) بلاوكەرەوە: ئێس . ئارِ . هۆپەر ( نیۆیۆرك ١٩٥٨) ل ١٤٤.

١٣.خوێنەر دەتوانێ دەقی ئەڵمانیی ئەم بەیتانە لەو کتێبەدا بدۆزێتـەوە کـە میـشیل هامبورگـەر بـڵاوی کردۆتــەوە و نــاوی (( هۆڵـدەرلین: کۆمــەڵێك شــیعری هەڵبــژاردە)) (باڵتیمۆر ١٩٦١) ل ١١١ — ١١٢.

١٤.ڤاڵتەر کاوفمان (( بوونگەرایی لە دۆستۆیڤسکی یەوە تاسارتەر )) نیۆیۆرك ١٩٥٦ ل ١٤.

١٥.جەی . ئی . بارتۆن (( مەبەست و سەرسامبوون)) لەندەن ١٩٣٢) ل ١٣٣.

١٦.پۆڵ تیلیش (( چـەند لایـەنێکی بوونگەرایانـە لـە هونـەری نوێدا)) لـە کتێبـی (( مەسـیحیەت و بوونەگـەراکان)) کـە کـارل میـشلۆن بـڵاوی کـردەوە ( نیۆیـۆرك ١٩٥٦) ل ١٣٨.

١٧.سامۆییل تێرین (( نیگاری نـوێ و تیۆلـۆجی)) لـە (( ئـایین و ژیـان)) دا ، سـاڵی ١٩٦٩ ل ١٧٢.

١٨.ئـەلبێر هۆفـشتادەر (( هونـەر و سـەلامەتیی رۆحـی)) وتارێکـە لـە گۆڤـاری (( ئیستاتیکا و رەخنەی ئەدەبی)) ژمارە ٢٢ ساڵی ١٩٦٣ ل ١٠.

١٩.مارتن هایدیگەر (( سەرچاوەی کاری هونەری )) هۆلژڤیگ ( فرانکفۆرت ١٩٥٧) ل ٧.

٢٠.کارل یاسپەرز (( فەلسەفە)) بەرلین ١٩٣١ ل ٧١٦.

بڕوانە جۆن ماکواری (( سێ مەسەلە لە ئاکارناسیدا)) ( نیۆیۆرك ساڵی ١٩٧٠) بەشی چوارەم.

## ((بەشی پانزدەیەم))

١.ئێچ . جەی پاتۆن (( قەیرانی سەردەم)) نیۆیۆرك ساڵی ١٩٦٢ ل ١٢٠.

٢.ئۆلدیش سیمۆن (( تیۆلۆجیای ئۆشڤایتز)) لەندەن ١٩٦٧ ، ل ٨٨.

٣.پاتۆن (( قەیران سەردەم)) ل ١٢ — ١٢١.

٤.هانز جۆناس (( هایدیگەر و خوداناسی)) وتارێکە لە گۆڤاری میتافیزیکادا، ژمارە (٢٨) ساڵی ١٩٦٤ ل ٢٠٧ — ٢٣٣.

٥.بڕوانە جۆن ماکواری (( سێ مەسەلە لە ئاکارناسیدا)) نیۆیۆرك ١٩٧٠، بەشی چوارەم.

٦.سۆرین کیرکەگۆر (( ژیان لەناو مەسیحیەتدا)) و : و . لوری ( پرینستۆن ساڵی ١٩٤٤) ل ٢١٨.

٧.ئێچ . جەی پاتۆن (( قەیرانی سەردەم)) ل ١٢٠.

**.سەرنج** : تەواوی سەرچاوەکانی ئەم کتێبە بەزمانە بیانیەکان نووسراون و لە بەردەستی خوێنەری کورددا نین ، بۆیە نووسینەوەی ناوی کتێبەکانم بە پێویست نەزانی _ و . کوردی_.

**سەرچاوە:**

*سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە هەردوو دەقە عەرەبی و فارسیەکەن بە بەراوردکردنیانەوە بەیەکتری (و بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە زیاتر پشت بە دەقە عەرەبییەکە بەستراوە) کە ئەمانەن:*

*١–الوجودیه، تألیف: جون ماکوری، ترجمه: د. امام عبدالفتاح امام، مراجعه: د. فؤاد زکریا – اکتوبر ١٩٨٢ – الکویت.*

*٢–فلسفەی وجودی، جان مك کواری، ترجمه: محمد سعید حنایی کاشانی، چاپ اول ١٣٧٧ (١٩٩٨) – انتشارات هرمس – تهران.*

**JOHN MACQUARRIE**

**(EXISTENTIALISM)**

## کتێبە چاپکراوەکانی تری وەرگێڕ

- ***تەرمی نەناسێك*** ( کورتە چیرۆك)
  چاپی یەکەم ٢٠٠٤
- ***چاوەکانی*** (ڕۆمان)
  بوزورگی عەلەوی ١٩٩٧
- ***جۆناسانی نەورەس*** (کورتە ڕۆمان)
  ڕیچارد باخ/چ٢ ٢٠٠٢
- ***خەونێك لەوڵاتی پیاوە بچکۆلەکاندا***
  (کورتە چیرۆکی جیهانی)١٩٩٧
- ***بەناوی ژیانەوە*** ( وتار و لێکۆڵینەوەو گفتوگۆ)
  ئەریك فرۆم –(چاپی یەکەم ١٩٩٧)
- ***شۆڕش یا ڕیفۆرم***
  (گفتوگۆ لەگەڵ مارکۆزو پۆپەردا)١٩٩٨
- ***پیدرۆ پارامۆ*** (ڕۆمان)
  خوان ڕۆڵفۆ_(بەهاوکاری لەگەڵ ڕێبوار سیوەیلیدا)١٩٩٩

- ***چەند وێستگەیەكی فیكریو ئەدەبی***
  (وتار و باسی فیكری و ئەدەبی)٢٠٠٠

- ***تریفەی تەنیایی***
  (ژیانو شیعری سوهراب سپهری)٢٠٠٠

- ***توركیا لەسەردەمی گۆڕاندا***
  محەمەد نورەدین ٢٠٠١

- ***لەگەڵ ئەقڵی خۆرئاوادا***
  (چەند گفتوگۆیەكی فەلسەفیو ئەدەبی)٢٠٠١

- ***نیچە***
  پۆڵ ستراتێرن ٢٠٠١

- ***ژنێ لەبەردەم وەرزێكی سارددا***
  (ژیان و شیعری فروغ فەڕوخزاد)٢٠٠٢

- ***سارتەر***
  پۆڵ ستراتێرن٢٠٠٢

- ***مۆدێرنەكان***
  رامین جەهانبەگلو٢٠٠٣

- ***مارکۆز و پۆپەر***
( باس و گفتوگۆ) ٢٠٠٣
- ***کیرکەگۆر***
پۆڵ ستراتێرن٢٠٠٣

- ***دەربارەی ئەقڵی مۆدێرن***(گفتوگۆی فەلسەفیو ئەدەبی)
(بە هاوکاری لەگەڵ ئاوات ئەحمەددا)٢٠٠٤
- ***چاکەو خراپە***
کریشنا مورتی_٢٠٠٤

- ***ئاوریشم*** ( ڕۆمان)
ئەلێساندرۆ باریکۆ ٢٠٠٤

- ***بەفر*** ( ڕۆمان)
ماکسێنس فێرمین٢٠٠٤
- ***کەمانچە ڕەشەکە( ڕۆمان)***
ماکسێنس فێرمین ٢٠٠٥

- ***نامەی مناڵان بۆ خوا***
ستیوارت هامپڵ و ئیریك مارشاڵ ٢٠٠٥
- ***فەلسەفەی بوونگەرایی***
جۆن ماکواری ، ٢٠٠٥

- ***لاپەڕە پەرشەکان***
*( چەند دەقێکی وەرگێڕاو و نووسراو) ٢٠٠٥*

❖ ***هەنگوین (ڕۆمان)***
ماکسێنس فێرمین ٢٠٠٧

❖ ***حکایەتەکانی دوێنێ و ئەمڕۆ***
پاولۆکۆییلیۆ چ١ ٢٠٠٦

❖ ***مێژووی شارستانێتی (ب١ چاپی کوردی، بە هاوکاری لەگەڵ دانا ئەحمەدو نەبەز کەمالدا)***
ویڵ دیورانت ٢٠٠٧

❖ ***سازی ئاسنین (شانۆنامە)***
جۆزیف ئۆکۆنۆر ٢٠٠٧

**بەعەرەبی:**

❖ ***مضيق الفراشات*** (قصيدة طويلة للشاعر الكردي شيركو بيكه س)
**ترجمة آزاد البرزنجي**, دار الرازي –بيروت– لبنان.١٩٩٦

❖ ***عار تماماً كالماء*** (مختارات شعرية لدلاوةر قرةداغي)
**ترجمة آزاد البرزنجي**, دار الطليعة الجديدة – سوريا – دمشق.٢٠٠٠

❖ ***سفرالروائح*** (قصيدة طويلة للشاعر شيركو بيكه س)
**ترجمة آزاد البرزنجي**, دارنينوى –دمشق –سوريا.٢٠٠١